# قەندیل
# بەغدای هەژاند


**ناوی کتێب : قەندیل بەغدای هەژاند**

**بابەت : یاداشتەکانی پێشمەرگایەتی لە ساڵانی ١٩٧٦ - ١٩٨٠**

**نووسەر : رێباز**

**پێداچونەوەو نەخشەسازی کۆمپیوتەر: بەختیار عەلی حەمە**

**هەڵەبڕ : م / جەمیل عیسا**

**تایپ : رووبار**

**چاپی دووەم : سلێمانی ٢٠٠٨**

**تیراژ : ٢٠٠٠ دانە**

**چاپ : چاپخانەی پەیوەند.**

**لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی بنکەی رۆشنبیری شەهید ژمارە ( ٢٠ )**

**ژمارەی سپاردنی ( ٢٥٢٨) ی ساڵی ( ٢٠٠٨ ) ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە**

**لەسەر ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری بە چاپ گەیەندراوە .**

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

# پێشەکی

دانا سەعید سۆفی

(قەندیل بەغدای هەژاند) بە تەنیا یاداشتنامەی رۆژانی سەختی کۆنە پێشمەرگەو تێکۆشەرێکی میللەتەکەمان نیە ، بەڵکو راستییەکی مێژوویی گەورەیەو سەرچاوەیەکە بۆ خوێندنەوەو نوسینەوەی مێژووی نوێمان ، چۆن خاوەنەکەی کاک رێباز شایەتی یەکەمی رووداوەکانەو لە دەرەوەی مێژوو نەهاتوە ئاماژە بۆ مێژوومان بکات ، بەڵکو زادەی قەیرانەکانی ئەو مێژوەیەو لەگەڵ هاورێ پێشمەرگەکانیدا ئازارەکانی ئەو مێژووەیان هەڵگرتوەو بزوێنەری دۆخەکانی ئەو مێژووەن . شێوازەکانی بزاوتنی ژیانیش ، جۆرێکە لە داهێنانی مێژوو. لێرەوە ئەم راستییە دەشێ پشتیوانیەك بێت بۆ ئەو چینە قوربانیدەرەی کە بەر خوردی راستەوخۆی لەگەڵ قەیرانەکانەوە هەبوەو ژانی بەرودوای کێشەکانی چەشتوە ، نەوەك ئەو چینە حازر خۆرەی کە سوکە ژانێکیشی بە کێشەکانەوە نەگرتوە، ئەو چینە پەیوەندیەکی ئەوتۆشی بە ژێرخان‌و کۆمەڵەوە نیە، کەچی سوپەرمان ئاساو ئوتوماتیکیانە دەبێتە خاوەنی مێژوو .. ! .

بە تێروانین لەو کەشە بێ ئەمەکەو لەو بارە مێژووییە دەشێ بەرداشتی بەو شێوەیەمان هەبێت :

✓ دوای ئەوەی کۆمەڵ بە قۆناغی رزگاری نیشتمانیدا تێدەپەرێ‌و هەنگاو بۆ پرۆسەکردنی بونی نەتەوەیی دەهاوێت ، لە گشت بوارەکانی پرۆسەکەدا ، هەرلە سیاسیەوە بگرە تا کۆمەڵایەتی‌و کەلتوری‌و زانستیەوە ، پێویستی بە ئەندامەکانی دەبێ ، بۆیە هەر یەکێ لە ئەندامەکانی بۆ پیادەکردنی پرۆسەی بوونی نەتەوەیی رادەسپێرێ‌و بوارێك لە بوارەکانی پرۆسەکەی پێ رەوا دەبینێت .

✓ هەر کۆمەڵگایەك بەگوێرەی دابەش بوونی کاری ئەندامەکانی‌و پەیوەست بونیان بە بەرەیەك لە بەرەکانی بەر لە قۆناغەکانی رزگاری دابەش دەبن بەسەر دوو چینەوە ، چینی قوربانیدەرو چینی پسپۆڕ .

✓ چینە قوربانیدەرەکان بەرلەوەی بە شۆڕشی نیشتمانیەوە پەیوەست بن ئەندامی پسپۆڕیشیان تێدا هەبوە ، بەڵام لەبەرئەوەی تەوەرەی سەرەکی کارەکانیان بۆ رزگاری نیشتمانیە ، هەر خەریکی مەسەلە سیاسی‌و پێشمەرگایەتیەکان دەبن‌و لەو پرۆسەیەشدا بەهۆی کەمبونی کادیرەوە کاری جۆراو جۆر لە ئەستۆ دەگرن، بۆیە لە پسپۆرێتی دەچنەوە ، چینی پسپۆڕیش

مەبەست ئەو چینەیە کەلەگەڵ هاتنە ئارای پێویستەکانی شارستانیەتی تەکنەلۆجی پەیدا دەبن‌و لە بوارەکانی بەڕێوەبردن‌و بەگەڕ خستندا قاڵ دەبنەوە .

✓ بەو جۆرە چینی تەکنۆکراتیش لە چینە پسپۆڕەکانن کە خۆیان لەگەڵ گشت گۆڕانکاریە شارستانیە هەرێمیەکان رادێنن‌و بەزۆریش لەگەڵ رواڵەتەکانی هەڵسوکەوت دەکەن لەوەوە دەردەکەوێ کەوا چینی قوربانیدەر مامەڵە لەگەڵ لایەنە رۆحیەکەی شارستانیەت دەکاو چینی پسپۆڕیش لەگەڵ لایەنە مادیەکەی سەروکاری هەیە .

✓ ئیدی دوای پرۆسەی رزگاری ، کۆمەڵ دەکەوێتە قۆناغی بەڕێوەبردن‌و پیادەکردنی ئاسایش‌و پەیوەندیەکانەوە بۆ پێگەیاندنی بونێکی نەتەوەیی پتەو، ڤێرا ناوەندی بڕیاردان‌و ناوەندی دەسەڵات ، هەوڵ دەدەن سود لە چینی پسپۆڕ وەرگرن ، کە خۆیان بە زانستەکانی بەڕێوەبردن‌و بەگەڕخستنەوە تەیار کردەوەو شارەزان بە زمانی گفتوگۆو روبەڕوبونەوە لەگەڵ شارستانیەتی ئەمڕۆ ، جگە لەوەی کە خۆیان لەشەڕ ئەو پایەیە ، پەیوەندی پایە مادیەکانی دروست بوون ، مادەش لە شارستانیەتی ئەمڕۆدا بە پێوەدانگی بەرژەوەندیەکانەوە بە رەوانی جێگای خۆی دەکاتەوە . بەو شێوەیە لایەنی رۆحی فەرامۆش دەکەن کە چینی قوربانیدەر نوێنەرێتی و شوێنێك بۆخۆ دەرخستنی ئەم چینە لە پرۆسە نەتەوەیی و شارستانیەکاندا نامێنێتەوە ، ئیدی لە بەڕێوەبردنی وڵات دوور دەخرێنەوەو دەکەونە پەراوێزەوە ئەمەش بە بیانوی ئەوەی لەم قۆناغە نوێیەدا روبەڕوی چەند نیاز مەندێکی تازە بونەتەوە کە واقیعەکە دەیخوازێ‌و لە توانای چینی پسپۆڕدایە کە نیازەکان بەجێ بگەیەنێت. کارەکانیش بە سۆنگەی ئاراستە کردنی دیموکراتیەتەوە وازی دەکرێن .

✓ جا لەو وڵاتانەی یاسای پەرلەمانی بەر قەرارە ئەم مەسەلەیە دوجا دەکەوێتەوە ، چۆن ئەو پارت‌و لایەنانە جگە لەوەی پێویستیان بە چینی پسپۆڕ دەبێ تا خۆیان بەخاوەن روخساری شارستانیەتی نوێ نیشان بدەن . سیاسەتی کۆکردنەوەو لایەنگری زۆرتر بەڕێوە دەبەن تا هەر چەند زۆرتر دەنگ‌و پاڵپشت بۆ خۆیان پەیدا بکەن ، ئیدی دیسان پێگەکەی خۆیان لەیاد دەکەن کە چینی قوربانیدەرە . لەم کردەیەدا بەناوی پیادەکردنی دیموکراتیەتەوە ، کۆمەڵ روی لەو چینە قوربانیدەرە وەرگێڕێ ، بیرۆکراتیەت سەر هەڵدەداو شورەیەك لە نێوانی جەماوەرو دەزگا دەوڵەتیەکان دروست دەبێ .

✓ ئەوسا ئایدۆلۆژیای حیزبایەتیو ئامانجە مرۆڤایەتیەکان لە یاد دەکرێنو هەمو پرۆسەکان لە جغزی کارەکانی رۆژانەدا دەخولێنەوەو بزاڤێکی مەکیاڤیلیانە وەردەگرن واتە ستراتیژ گومڕاو تاکتیك سەرداری مەیدانە کە دەبێ .

✓ وێڕای چینی پسپۆڕ بەرە بەرە شوێنی خۆی لە دەزگا ناوەندیەکاندا دەکاتەوە ، کەچی چینی قوربانیدەر بواری ئەوەی نابێ بیەزکەو کارە لێوەشاوەکانی خۆی بەرەو قۆناغی پراکتیك کردن ببات‌و تەڕ دەستیو کارامەیی خۆی بنوێنێت .

✓ بەم جۆرە بونی دەکەوێتە مەترسیەوەو گومان لە خۆی دەکات ، جا لەبەر ئەوەی چینی قوربانیدەر لە گۆڕەپانی ژیانا درك بەبونی ئامادەیی خۆی ناکات دەکەوێتە خۆ خواردنەوەو دورەپەرێزی لە کۆمەڵ دەگرێو سەرەتا دوچاری نامۆبونی کۆمەڵایەتی دەبێو دواتریش گشت نامۆ بونەکان کە نامۆبونی خودو خاکیش دەگرێتەوە . نامۆبون لەگەڵ ئەو خاکەی کەقوربانی لە پێناوی داوە. ئیدی چینی قوربانیدەر چینێکی گۆشەگیرەو لە دنیای خەونەکانو یۆتۆپیادا شەو و رۆژان دەکاتەوە .

✓ لە کاتێکا کۆمەڵ ، توانای بەکارخستنی ئەو ئەندامانەی خۆی هەیە بەڵام بەخەڵکی پسپۆڕ شوێنەکانیان پڕ دەکاتەوە ، کەلەوانەیە یەکێك لەو پسپۆڕانە چەندان کاری جیا جیا بەرێوەببەن..کەچی چینی قوربانیدەرکەوتۆتە پەراوێزەوە وەك کەسێکی شازو نامۆ بە گشت شتەکان ، هەڵسوکەوت لەگەڵ ژینگەو تەوژمە شارستانیەکان دەکات ، لێرەوە هەقی خۆمانە گەر بپرسین دەشێ لەو کۆمەڵگایانە ئەزمەی مرۆڤ بێت ؟

✓ ئیدی چینی قوربانیدەر دەکەوێتە بەرتانەو تەشەری دەزگا ناوەندیەکانو لەوانەیە بەئەندامی بەرەیەك لەبەرەکانی دژ بەبەرەی نیشتمانی بۆی بڕوانن .. ئیدی ئەوە گەورەترین خەتایە کە کۆمەڵ سەبارەت بەو چینەوە دەینوێنێتو نائاگان لەوەی کەوا ئەو چینە قوربانیدەرە لە پرۆسەی رزگاری کردنیدا ، پێشڕەو بوە ، ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کۆمەڵ پاداشتێکی مەعنەوی بداتەوە ... دەبێ بزانین ئەو مرۆڤەی درەختێك دەچێنێ چاوەڕێی بەرەکەیشی دەکات.

✓ ئەوسا لەبەر ئەوەی ئەو چینە لەگەڵ ڕێسا داسەپاوەکان هەڵناکات بە بەئەنارشیستی لە قەڵەم دەدەن ، هەر چەندە لەگەڵ کۆمەڵیشدا بایکۆتی پێکراوە ، بەڵام لەگەڵ دۆگمایی رانایەت ، چۆن ئەوەتا خەریکە شۆڕشێکی لەسەرخۆ و ئارام ساز دەکاو ، تۆوی یاخیبون دەچێنێتەوە بە شێوازێکی تازەو ئامانجو زمانی نوێوە. هەر پرۆسەیەکی نەتەوەییو شارستانی بەبێ بەشداربونی هەر دو لایەنی مادیو مەعنەوی یاخود بەبێ بەشداربونی هەر دو چینی

قوربانیدەرو پسپۆڕ لە پیادەکردنی بونێکی نەتەوەیی سەراپاگیری بوارەکان ، پرۆسەیەکی ناکامڵو نا تەواوە بەرامبەر روداوەکانو کۆمەڵگایەکەش بە کۆمەڵگایەکی بەجێماو دەدرێتە قەڵەم کە ناتوانێ لەگەڵ چەمکە مرۆڤایەتیەکانی شارستانیەت بگونجێو لە خۆیدا بیانتوێنێتەوە ، جگە لەوەی ئەم کۆمەڵگایەش توانای هەرسکردنی تەوژمو پایە ژیاریەکانی سەردەمی نابێ کەیەکێ لە بنچینەیی ترین پایەکانیش دیموکراتیەتە .

دەشێ ناو لەو جۆرە کۆمەڵگایانە بنێین کۆمەڵگای لاسەنگ !

✓ ئیدی لە دەرئەنجامی پرۆسە بونی ( کۆمەڵگا ) و دابەشکردنی کارەکانی بەسەر هەردو دەستەی قوربانیدەرو پسپۆڕەوە ، ئەو شەقڵەی بەسەر روخساری رەوتی کۆمەڵەوە خۆی دەنوێنێت، بەرەو پێش چونی رەوڕەوەی مێژووە بەهێزو قوربانی چینی قوربانیدەر ، ئەوەش لە ململانێو کێشە کز داگیرساوەکەی نێوان هەردو چینەوە خۆی بەرقەرار کردوە ، بە رواڵەت کێشەیەکی خامۆشو ناوەکیە ، چۆن قوربانیدەرەکان بەشێوەیەکی مەلوس خۆیان دەرناخەنو لە گۆشە کەنارەکانا خورجی کێشەکانیان هەڵدەڕژن .. یاخود کێشەکانیان لە توێی خۆیانا بەخێو دەکەنو چێژێکی رۆحی لێوەردەگرن و لەبەر ئەوەش ، کە هەرچەندە گیانی سەرکێشیو شۆڕشگێڕێتیان لاماوە ، بەڵام لەگەڵ روبەڕوبونەوەی تەوژمە ژیاریەکانو پێداویستیە نوێکانی ژیان و خۆ خستنە ژێر باری قانونەکانی شار ئەم هەستەیانی لا خەفە کردوە .. بۆیە کێشەکانیان دەچنە نستەوەو بە راستییەکان هەڵدەشاخێن ، کەچی لەخانەی راستیدا بەتاریکی گوزەر دەکەنو ناچنە ناو ناپۆڕەی کێشەکانی کۆمەڵەوە ، خاوەن مەسەلەش بە نیوە هەستەوەو بەچاوێکی نیوە وازەوە هەڕمینی مەزاتگەی کێشەکانی خۆی ، ژیان بەسەر دەکاتەوە .. ئەگەر لە پەنا دیوارێك و نیمچە کوڕێکیشا منگە منگێکی لێوە دێ یان کێشەکەی دەکەوێتە سەر زمانی تەتەڵەوە ، بۆ دڵنەوایی شڵەژانی سەرچاوەکەیەتیو هیچی تر .. منگە منگو تەتەڵەی زمانیش کرۆکی مەسەلەکانن و لەدەریای پەنگخواردوی ناخەوە فوارە دەکەن .

✓ وێرا بۆمان دەرکەوت چینی قوربانیدەر جگە لەوەی رەوتی مێژوو هەڵدەکشێنێت ، خۆیو کێشەکەی دەبنە سوتەمەنی هەرگیزارەی قۆناغەکانی ئەو مێژوە نەگریسەو ... بەڵام چ سود خۆیو کێشەکەی لەبەردەکەی سیزیف خۆیان دەدۆزنەوەو لەگەڵ هەر ئاکامێکا ریسی لێدەبێتەوە خوریەکی خاو ، خاو ، خاو .. ئەوەتا لەدوای قۆناغی رزگاری نیشتمانی بینیمان کێشەیەکی نەتەوایەتی نیشتمانی بە کێشەیەکی کۆمەڵایەتیو مرۆڤایەتی گۆڕیەوە ، ئیدی ئەوە گواستنەوەیە کەلە روخساری شتەکانەوەو هیچ پەیوەندیەکی بە بونیادەکانیانەوە نیەو

پرنسیپەکان یەك پرنسیپن ، کێشەکە ئازادی مرۆڤەو لەکایەی خۆناسیندا دەچێتە پراکتیکەوەو ئارمان ، گەڕانەوەیە بۆ سروشتی بونی مرۆڤ دوایش تەنێبونی مرۆو پەتیبونی سروشت لە هەموو گەردو خۆڵی قۆناغەکانی مێژو بە ئەهریمەنو ئاهورمەزداوە .. خۆ تەکاندن لە گشت مەدارەکانی پۆخڵەواتی عەقڵو دڵ ، دەرباز بون لەتەڵەکانی زانستو ئەدەب ، لە درۆو دەلەسەی نیشتمانپەروەرێتیو ملهوڕێتی ، لە ڕەهاییو پەیوەست بون . یان قوتار بون لە هەموو ئەو قانونانەی دۆگمایی بە دوادا دێنن ، چۆن مرۆڤ پەدیدەیەکی سروشتی غەریزیە .

✓ چینی قوربانیدەر چونکە لەگەڵ دەستورەکانی بازاڕی ڕەشی ژیان ڕانایەتو بەردەکەی سەر شانیشی هاکا ..گلۆر دەبێتەوە .. لە چاوەڕوانی دایەو چاوەڕوانی ئەو پیاوچاکەی کە خۆی چاوەڕێیە .

✓ کە دەڵێم مێژو مەبەستم هەموو ئەو قۆناغە ڕابردوانەی ژیانی مرۆڤایەتی نیە ، لێرەدا مەبەستم باری ژیانە . یا بزاڤتن لە ژیانە .. مەبەستم ڕابردویەکی پلە بە پلەی ڕۆژمێری نیە بەڵکو تێڕامان لە باری ساتەوەختی هەستکردنو داگیرسانو هەڵچونی کێشەکانە ، ئەو کێشانەی لە ڕەوشتو نەریتیەکانی مرۆڤ خۆی دەکەونەوە کە خۆی خولقێنەرێتیەو سەرئەنجام دەستەیەك لە مرۆڤایەتی ، یاچینی قوربانیدەر هەوڵی تێکشکاندنیان دەدات ، کەچی چینی پسپۆڕ کە هیچ ئیعتباراتێکی لانیە جگە لە مەکیاڤیلیەتو خوی ئۆپۆرتونیستانە نەبێ بۆ گەیشتن بە ئامانجە مادیەکانیان پیادەیان دەکەن ، لەگەڵ ئەوەش بانگەشە بۆ یاساو ڕەوشتو نەریتە کۆمەڵایەتیەکان دەکەن ، بەمەش ڕێ لەچینی قوربانیدەر دەگرنو چاوبەستێی دەکەن .. یا بانگەشە بۆ هەرچی چاکەو چاکەکاریەکانی ئاینو دەستورە سەرەتاییەکان هەیە دەکەن ، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لە شارستانێتی نوێدا عەقڵ داوەڕێتیانو بیر لە باری سروشتیو پەتیبوەکان ناکەنەوە .

✓ مێژوی ڕۆژمێری ، مێژوی هەموو ئەو کوشتو کوشتارو داگیرو داگیرکاریەکانەو سەربردەو قارەمانێتی خاوەن مێژوانی وەك هۆلاکۆ و هیتلەر و فرانکۆ و ستالین و سەدام و بنێوشەیە بەڵام مێژوی بزاوتنی ژیان ، کوڵەکەی کۆمەڵو سوتەمەنی مێژوو و قوربانیدەرەکانن ، کەچی ناویان بەسەر تۆماری ئەو مێژوەشەوە نیە ، مێژوی بزاوتنی ژیان باری ئاگایانە دەگەیەنێ سەبارەت بە کێشەکانو بونی مرۆڤ لە گەردوندا .

✓ لەوەوە ، من لە پۆلبەندی چینەکانی کۆمەڵدا بەو پێوەرەوە ئاماژە بۆ تاکەکانی کۆمەڵ دەکەم ، کە ئایا قوربانیدەر یان پسپۆڕن ، نەوەك پۆلپەندیەکانی وەك کرێکارو سەرمایەدار . یا

لەڕوانگەی هەر ئایدولۆژیەتێکی ترەوە بێ ، لای من توانای پۆلبەندی کردنی تاکەکان نیە ، قوربانیدەرو پسپۆڕەکان دابەش بونەتە سەر هەموو ئەو چینانەی کە پێشتر چونەتە خانەی پۆلبەندیەوە ، بەڵام بەزۆریش لە چینەکانی پاین دان و بڕێکیش لە سەروی پاینەوە ، ئەلبەتە ئەم ئەندازە گرتنە ڕێژەییە .

✓ چینی قوربانیدەر دوای ئەوەی قۆناغی رزگاری نیشتمانی بە ئاکام دەگەیەنێت ، یا لەدوای بزاوتنی ژیان‌و هاتنە ئارای پەیوەندیە شارستانیە نوێکان ، کارێکی شایستەی خۆی بەرنەکەوتوە، ئەویش بەهۆی چاپلوسی چینی پسپۆڕو نەدیتکەیی نێوەندی دەسەڵات ، وەکی دی نێوەندی دەسەڵات و بڕیاردان تازە روبەڕوی بزاوتێکی نوێی ژیان بونەتەوە ئەویش لە چاپلوسی و هەڵسوکەوت کردن بە زمانی ئەو سەردەم و گۆڕانە ، لەلایەن چینی پسپۆڕەوە مەیسەر دەبێ ، وەنەبێ ئەو رەوشتەشیان لە بونیادەکانی گۆڕان‌و باوەڕەوە سەری هەڵدابێ ، بەڵکە ئەو چینە کوڕی ئاکتیک‌و رۆژەو تەنیا وەك پرۆسەیەکی ئەزمونکاری بێ گیان ئەو کارەی کە لێی ئاگادارەو بە ئەنجامی دەگەیەنێت . بەڵام چینی قوربانیدەر پێی وایە گۆی زەمین لەسەر شانی ئەوەو بەسەر پاکی کێشەکان گەمارۆ دراوە ... هەروایشە .

✓ لێرە بە دواوە ، چینی پسپۆڕ دەستی بەهەموو نێوەندیکا رادەگا ، چون نێوەندی دەسەڵات کۆشی سۆزو میهری بۆ نازەکانی کردۆتەوەو ، لە دوایشدا پێویستیان بە نێوەندی دەسەڵات نامێنێ ، چونکە خۆیان بون بەبەشێك لە نێوەندەکان .

✓ چینی قوربانیدەریش بۆئەوەی کەمێ خۆی دەرخاو بڕێ لە گیانی درۆزنانەی دامرکێنێتەوەو هەوای واقیع هەڵمژێ ، یاسای گونجان پەیڕەو دەکا ، گونجان لەگەڵ هەمو ئەو کەسانەو ئەو یاسایانەی کە بۆ تواندنەوەیان تێکۆشاوە . بەم کارەشی شۆڕشی یاخی بون کپ دەکاتەوە ، کەژیانیش بە یاخیبونەوە لە ژیان دەکا .

✓ چینی قوربانیدەر چینێکی بێ بارەو سیفەتی وردە بۆرژوایانەی هەیە ، ئیدی کە کەسایەتیەکەی دەمدەمیە ، تۆ بڵێی هەر لەژێر ئەو بارەدا بمێنێتەوە ؟! .

✓ قەندیل بەغدای هەژاند- بەرگری نامەیەکە لەو چینە قوربانیدەرەو راستییەکە کە هەزر لە ئاستیا بێدەنگە، مەگەر تەنیا دڵو هەست زاتی درکاندنی ئەو راستیە گەورانە بکەن، چینی قوربانیدەر ئامادەییەکی بەرچاوی لە ستادیۆمی هەنوکەیی کوردستاندا، لە کایەکانی .. دوای راپەڕین و ئەزمونی پەرلەمان و حکومەتدا نیە ، بۆیە دەشێ ئەم بەرگرینامەیە ئیعتبارێکی رۆحیو مەیدانی بۆ ئەم چینە هێنابێتەوەو راستییە شاراوەکانی بۆ باوەشی مێژو گەڕاندبێتەوە .

# وتەیەك

لەبەشی یەکەمی ( قەندیل بەغدای هەژاند ) بەڵێنم بە ئێوەی تامەزرۆی خوێندنەوەی یاداشتی پێشمەرگایەتی دابوو کە بەشی دووەمو سێیەمتان بەو زووانە پێشکەش بکەم ، دەترسم بەڵێنەکەم پێ نەچێتە سەر چونکە خەرجی چاپکردن ئەوەندە گران بووە مەگەر بەکەسێکی دەوڵەمەند یان سیاسەت مەدارێکی دەست رۆیشتو و بێ منەت لە پارە ژماردن بکرێ . ئەگینا لەکوێ ئەو پارەیە بە کابرایەکی وەکو من جێبەجێ دەکرێ ، بە کوردی تا پارەی بەشی یەکەمی ئەو یاداشتەم کۆکردەوە کارمەندانی چاپخانەی زانکۆم وەڕس کرد ، کوڕوکچە کرێکارەکانی چاپخانەش لێم زویر بوون ، وایاندەزانی منیش وەك لێپرسراوەکانی تر جێگا لەماڵم نەماوە پارەی لێدابنێم . بێ ئاگا لەوەی تا پارەی بەشی یەکەمم پەیداکرد لە دەرگای زۆر کەسمدا ، زۆریان لە داواکاریەکەم رای کردو بەحەق هەندێکیش یارمەتی چاکیاندام کە شایەنی رێزن ، کە یاداشتەکانم تەواو نوسیوەو کۆم کردەوە ، دام بە برادەران تاکو هەڵەو کەموکوڕیەکانم بۆڕاست بکەنەوە ، ئەوانیش مەردانە وتیان چاپەکەشی تەکبیر دەکەین ، هەرنا بە قەرز بە چاپی دەگەیەنین ، شوکرانەی دەوێ پیاو بەڵێنی بهێنێتە دی .

کەبەشی یەکەم کەوتە دەستی خوێنەران بە پەلە هەندێ گلەییو گازاندەم بۆ هات ، کە هەر یەکە راو بۆ چونی خۆی بەرامبەر یاداشتەکەم دەری بڕیبوو سوپاسی هەر هەمویان دەکەمو سودم لێوەرگرتون ، لە رۆژنامەکانیش لەسەری نوسرا بەچاكو بە خراپ ، ئەوانیشم هەر رازییە چونکە هەقی خۆیانە بە چ چاوێك دەیخوێننەوەو بە چ تەرازویەك هەڵی دەسەنگێنن ، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەرچی دەنوسن بە ویژدانەوە بێ ، چونکە من وەك پێشمەرگەیەکی گەلەکەم ئەوەی بەراستم زانیبێ نوسیومەو نەمویستوە هیچ شتێك لەگەلەکەم بشارمەوە ، هەرگیز نیازم نەبووەو نیازیشم نیە لە نوسینەوەی یاداشتەکانم کەس بەر پەلار بدەمو کەسیش ببەمە ئاسمان ، بەڵکو هەموو ئاواتم ئەوەیە گەلەکەم بە رابردوی ئاشنا بکەم ، تا لە رۆژانی داهاتوی خەباتو تێکۆشانی کارە نابەجێو نارەواکان دوبارە نەکاتەوە . وەك شەڕی برا کوژیو پێشبڕکێی حزبایەتیو رێگای ناشەرعی . جاران دەمانوت کورد دەوڵەتی نیە ، لێناگەڕێن دەوڵەتێك بۆ خۆمان دروست بکەین ، دراوسێکانمان شۆڕشمان هەرەس پێ دێنن ، خۆ ئێستا کە حکومەتمان هەیە ئەوە سێ ساڵە ئازادینو کەس نەهاتۆتە سەرمان ، ئێستاکە چەکی دراوسێکانمان ئەوەندە بڕ ناکا ، کەچی داخی گرانم لەبەر پێشبڕکێی ناشەریفانە زۆر کاری سەرەکیو ئەرکی سەرشانمان لەبیرکردوە ، وەك

پێشمەرگەیەکی ماندوو دێرینیش ئەم حکومەتەی بە بەرهەمی خۆم و هاوخەباتو هاورێ شەهیدەکانم دەزانم بۆیە هەقمە دڵم بۆی بسوتێو بڵێم تا دیوارەکەمان بە سەردا نەڕوخاوەو بیەوێ لە کردەوە نابەجێکانی خۆمان بکەینەوە ، چونکە کە ڕوخا دادو فیغان چارەمان ناکا ، دڵنیابن خۆشەویستی گەل ئەو کەسەیە خزمەتی گەل بکات ، با هەمومان ئەگەر هیچ نەبێ بەرنامەی حزبەکانمان جێبەجێ بکەین کەلە بەرنامەی هەموو حزبەکان هاتوە ئەندامی حزب دەبێ لە خزمەتی حزبەکەیدا بێو حزبەکەش لە خزمەتی گەل دابێ بەڵام کوا ..! .

با چیتر ماوە بەو کەسانە نەدەین کە جگە لە تاڵاوە نانەوەو بەرژەوەندی تەسکی تایبەتی خۆیان، نە حزب ، نەگەل ، بەڵکو باوکی خۆشیان ناناسن ، دیارە هەمومشمان دەزانین ئەو جۆرە کەسانە کێنو لە کوێن ، چۆن جێگایان بۆخۆ کردۆتەوەو چ حەشارگەیەکیان هەڵبژاردوە، من پێتان ناڵێم کێن ، بەڵام پێتان دەڵێم ئەوەی دوو ڕۆژ چەکی پێشمەرگایەتی بە پاکی لەشان کرد بێو لە ڕۆژانی بەعس هەڵوێستی خۆی نەدوڕاندبێ لەبەرەی گەلەکەش مابوبێتەوە ، دورن لێیانو هەمیشە بەتەنگ بەرژەوەندی گشتیو هەمیشە لە خزمەتی ڕەشو ڕووتی میللەتەکەیان دان ، ڕوداوەکان ئەوە دەسەلمێنن ئەو حزبەی ئەمڕۆ کوردایەتی بکاتو حزبایەتی وەلانێ زەرەر دەکاو زەرەری کردوە ، بەڵام ئەو حزبەی حزبایەتی بکاتو بەپارەو مەنسەب خەڵك بکڕێ قازانج دەکا ، کە دیاردەیەکی تا بڵێی سلبیو زەرەر مەندە بۆ گەلەکەمان بەڵام کێ گوێت لێ رادەگرێ لەم پێشەکیە دەمەوێ بە هەمو ئەو کەسانە بڵێم کە زوڵم لە میللەت دەکەنو خەڵك دەچەوسێننەوە ، باش بزانن گەلێك بەعسی ڕەگ قایمی تەمەن (٣٠) سی ساڵە لەرەگەوە هەڵبکێشێ دەتوانێ هەموو شتێکی تریش بکا ، ئەگەر خوێنی شەهیدەکان نەبێ لە کوێ ئەو ناکەس بەچانە دەتوانن لاف لەسەر میللەت لێ بدەن .

لە بەشی دووەمی قەندیل بەغدای هەژاند زۆر کارەسات دەخوێننەوە ، زۆر کاری نا ڕاستو دوور لە مەنتق دێتە بەرچاو ، زۆر داستانی گەورەو شەڕی قارەمانانەی پێشمەرگە گیان بازەکانی کوردستان نوسراوەتەوە ، لەوانەیە زۆر کەس لە خوێندنەوەی هەندێ ڕووداو دڵگیر بێ بەڵام ئەمە ڕاستیەو ئەگەر دوێنێش چاوپۆشی لێ کرابێ ئەمڕۆ دەبێ بزانرێ ، تا کاری چاکەو خراپ بزر نەبێ ، ئەوەی لە هەموو ژیانی پێشمەرگایەتی پێی دڵگیر بوومە دیل کوشتنە ، لە یەك دوو ڕوداو باسم کردوە ئەگەر لای هەندێکیش پەسەند نەبووبێ ، من ویژدانی خۆم ئاسودە کردووە ، ئەوەی زۆر شانازیشی پێوە دەکەم تەمەنی پێشمەرگایەتی خۆمە کە بە درێژایی شۆڕشی نوێ (١٧) حەڤدە ساڵی تەمەنم پێ بەخشیوە ، پێشمەرگە ئەو کەسەیە گەلەکەی لە حزبەکەی خۆشتر

بۆیێ ، دژی زوڵم و زۆرداری ، بجەنگیێ ئەوسا بەرامبەر هەر کوێ بێ لە پێناوی یەکسانی کۆمەڵایەتی لە خەبات دابێ ، هەمیشە خەباتی بۆ خۆشکردنی ژیانی خەڵك بێ هەرگیز بیر لە پارەو سامان نەکاتەوە پێشمەرگە نابێ پارەو کورسی‌و کچی جوان‌و سەیارەی دوا مۆدیل لە خشتەی ببەن ئەگەر بەدوای ئەوانە کەوت پێشمەرگەی چی !، ئەو ساتە ئەگەر ئەو کەسە بڵێ پێشمەرگەم، وشەی پێشمەرگە دەبێ لەم وڵاتە بار بکا ، هەرگیز کەسێك ناتوانێ خزمەتی میللەت بکات ، ئەگەر رۆژێك لەگەڵ ئێش‌و ئازارەکانی نەژیابێ لە تەنگانە سەنگەری میللەتەکەی نەگرتبێ ، خەڵکی شۆڕشگێر بە کردەوە ئەگیناسرێ ، زمان لوسی‌و مەرایی‌و ساردکردنەوە رەوشتی بەرزی میللەتەکەمان تێك دەداو هەر لەپیاوەکانی بەعس دەوەشێتەوە ، زۆر پێویستە خۆیان لێ بەدوور بگرین‌و نەفرەتیان لێ بکەین ، چونکە ئەوەندە گەلۆرن دەیانەوێ بە دەعوەتێك ، بەدیارییەك گرەوی شۆڕشگێڕی پێشمەرگە کۆنەکان‌و کەس‌وکاری شەهیدان ببەنەوە ، ژیانی پێشمەرگایەتی ژیانێکی سادەیە ، مرۆڤ بە هیواو ئاوات دەژی ، بیر لە سەروەت‌و ماڵ‌و پارەو پول ناکەیتەوە، خۆزگە ژیان هەمووی پێشمەرگایەتی دەبوو ، تەڵەکەبازی ، مەرایی ، زمان لوسی ، خۆبردنەپێش کردن ، خۆپیشاندان ، خۆرامکەیی ، لە پێشمەرگەی راستەقینەی دوورن، بەداخەوە رۆژگاری سپڵە ئەم ناوە پیرۆزو رەسەنەی وەکو رۆژانی بەر لە راپەڕین نەهێشتووە ، هەرچی چەك بەدەستە دەڵێ پێشمەرگەم ، خۆزگە وابوایە ، کورد هەمووی پێشمەرگە بوایە ، بەڵام پێشمەرگەی بە بیرو باوەڕو راستەقینەو کوڕی تەنگانە ، چما ئێستا لە خۆشیان شا گەشە نەدەبووم ، لە کۆتاییدا ، هیوادارم لەکەم‌و کوڕیەکانم ببورن ، سەرنج‌و تێبینی خۆشتانم لێ مەشارنەوەو چیتان هەیە لێتان وەردەگرم‌و سوپاستان دەکەم ، هەر لێرەدا سوپاسی برای بەڕێز کاك عەبدلواحید ئدریس شەریف دەکەم کە ئەرکی پێداچونەوەی بەشی دووەمی قەندیل بەغدای هەژاند خستە ئەستۆی خۆیی‌و پاك نووسی کرد .

**ئیتر خۆشیتان ئاواتمە**

**براتان رێـــاز**

# رووداوه‌گرنگه‌كانی دنیا له‌ ساڵی

# ١٩٨٠

١ - **شۆڕشی گه‌لانی ئێران :**

بێگومان هه‌ر گۆڕانكاریه‌ك له‌ دونیا روبدات كاریگه‌ری راسته‌وخۆ یان ناڕاسته‌وخۆی له‌سه‌ر كوردستان ده‌بێت ، شۆڕشی كوردستان له‌ ساڵانی پێشوو تووشی چه‌ندین نوچدان‌و شكست هات، چه‌ندین سه‌ركرده‌ی شاره‌زاو لێهاتووی یه‌كێتی نیشتمانی كوردستان شه‌هید بوون كاك عه‌لی عه‌سكه‌ری، د/ خالید ، حوسێن بابه‌ شێخ ، ئارام ، شه‌هاب ، جه‌عفه‌ر، ئه‌نوه‌ر ، مامۆستا عه‌زیزن كاره‌ساتی دڵته‌زێنی هه‌كاری شۆڕشی كوردی تووشی شكستی سه‌ربازی گه‌وره‌ كرد ، هێرشه‌ یه‌ك له‌دوای یه‌كه‌كانی رژێمی عێراق بۆسه‌ر سه‌نگه‌ره‌كانی هێزی پێشمه‌رگه‌ كه‌ چه‌ندان فه‌رمانده‌و پێشمه‌رگه‌ی ئازاو نه‌به‌زی تێدا شه‌هید بوون‌و ، ناكۆكی توندو تیژی نێوان هێزه‌كانی كوردستان به‌بێ ئه‌وه‌ی ئاسۆی یه‌كبوون‌و ته‌بایی له‌ نێوانیان دیار ببێت هه‌موو ئه‌وانه‌ به‌ زه‌ره‌ر بۆ كوردو شۆڕشه‌كه‌ی ده‌گه‌ڕایه‌وه‌ ، كه‌چی سه‌ره‌ڕای ئه‌م هه‌موو شكست‌و نوچدانه‌ شۆڕش هه‌ر به‌ره‌و سه‌ركه‌وتن هه‌نگاوی ئه‌گینا چونكه‌ پشت به‌ستن به‌ گه‌ل‌و وه‌ستان له‌سه‌ر قاچی خۆو پێداگرتن له‌سه‌ر داوا ره‌واكان ئه‌نجامی هه‌ر به‌ سه‌ركه‌وتن گه‌یشتنه‌ .

ئه‌گه‌ر رۆژانێك گۆڕانكاریه‌كانی دنیا له‌ به‌رژه‌وه‌ندی حكومه‌تی عێراقدا بوبێ ، گومان له‌وه‌دا نییه‌ كه‌ گۆڕانكاری هه‌ندێ دۆخ له‌ دنیا ئه‌م جاره‌یان به‌ قازانجی گه‌لی كوردو شۆڕشه‌كه‌ی بوو به‌تایبه‌تی سه‌ركه‌وتنی شۆڕشی گه‌لانی ئێران ، روخانی رژێمی په‌هله‌وی‌و هاتنه‌ سه‌ركاری كۆماری ئیسلامی له‌ ئێران گۆڕانكاری بنه‌ڕه‌تی بوو له‌ رۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست كۆماری ئیسلامی سیاسه‌تی نه‌ رۆژهه‌ڵاتی نه‌ رۆژئاوایی راگه‌یاند ، ده‌ركردنی باڵوێزی ئیسرائیل له‌ ته‌هران‌و كردنی به‌ باڵێوزخانه‌ی فه‌له‌ستین‌و به‌گژداچوونی ئیمپریالیزمی ئه‌مریكی‌و ده‌وڵه‌تی سه‌رمایه‌دارن، پشتگیری كردن له‌ رێكخراوه‌ ئیسلامییه‌كانی جیهان به‌ تایبه‌تی له‌ لوبنان ، عێراق ، میسر ، جه‌زائیر، ده‌وڵه‌ته‌ خه‌لیجیه‌كان ..... هتد پشتیوانی له‌ ئیسلامیه‌كانی ئه‌فغانستان، لایه‌نگیری له‌ شۆڕشگێڕانی نیكاراگوا ( سانده‌یتا ) برینی نه‌وت له‌ ئیسرائیل، گۆڕینی ده‌ستوری ئێران‌و نوێكردنه‌وه‌ی به‌ ده‌ستوری ئیسلامی ، هاندانی ئیسلامیه‌كان له‌ ( تاجكستان ، اوزبكستان ، توركمنستان ، كازخستان ، ازربایجان ) له‌ یه‌كێتی سۆڤیه‌ت ، له‌ گرنگترین سیاسه‌ته‌كانی كۆماری ئیسلامی ئێران ده‌ژمێردرێ .

ئێـران یەکێکـە لـەو چـوار دەوڵەتـەی کوردیـان بەسـەر دابـەش کـراوەو سـاڵەهایە کـورد دەچەوسێنێتەوەو لە خێرو بێری خاکەکەی دەخۆن ، گەلی کـوردیش لـە ئێـران وەك گـەلانی تـری ئێـران ( فـارس ، ئـازەر، تورکمـان ، عـەرەب ، بلـوج ، رۆڵـی گرنگـی هـەبوو لـە دەرپەڕانـدنی شاهنشـاو روخـانی رژێمەکـەی بۆیـە لـەو هەلـە کـەڵکی وەرگـرت تـا رادەیـەك بـە روخـانی شـا ئازادییەك لە کوردستانی ئێران سەری هەڵدا .

چونکە کۆمـاری ئیسـلامی هێشـتا نـەیتوانی بـوو کـۆنترۆڵی هـەموو ئێـران بکـاو چـەندان گێروگرفتی ناوخۆی هەبوو هەم لەگەڵ رێکخراو و حزبە سیاسـیەکان هـەم لـە نـاو خـودی دەزگـا مەلایەکان لە سـەرەتا رێکخـراوی ( مجاهیـدی خـەڵك بەرابـەری مەسـعود رەجـەوی ، رێکخـراوی چریکهای فیدائی خەڵك ) لە ئێران دەستی باشیان دەرێشت ، لە نێوان خـودی مەلایـەکان دوو بیرو بۆچون هەبوو لەسەر مەسەلەی ( ویلایەتی فقیە ) هەندێك لە پیاوە ئاینیەکان رایـان وابـوو کە نابێ بە هیچ شێوەیەك ئەوان دەسەلات بگرنە دەست ، دەستەیەکی تر لە پیاوە ئاینیـەکان بـە رابەری ئیمام خومەینی (ر.ض) بڕوایان وابوو کە دەبێ ئایین لە حوکمو سیاسەت جیانەکرێتەوەو ئەو دەستەیە لە ئەنجام سەرکەوتن .

لە ئێران پیاوە ئاینیەکان بە پلەی خوێندنو اجتهـاد پلـەیان پێـدەدرێ بـۆ نمونـە ( علامـة ، حجة اسم ، اية الله ، اية الله العظمى ) لەرۆژگاری شا لـەژێر پاڵـە پەسـتۆی پیـاوە ئایینیـەکان بڕیارێکی گرنگ دەرچوو کە : بە هیچ شێوەیەك اية اللة عظمى نابێت لە سـێدارە بـدرێت ، لـە ئێران سەدان هەزار لەو پلـەو پایـەی سـەرەوەیان هەیـە کەچـی چـەند کەسـێك دەرەجـەی اية الله العظمى یان هەیە لەوانـە ( اية الله العظمـى خومـەینی ، اية الله العظمـى مـرعش ، اية الله العظمى منتظری ، اية الله العظمى اراكى ، اية الله العظمى طليا طليـاتی ) بەسـەدان اية الله هەیە یەکێك لەوانە اية الله العظمى خامنئی رابەری کۆماری ئیسلامی ئێرانە

ئەو گۆڕانە لە سیاسەتی ئێران کاری راستەوخۆی هەبوو لەسـەر کوردسـتانو کـوردی گشـت پارچەکانی تـر ، شۆڕشـی ئێـران دەرگـای خسـتە سـەر پشـت بـۆ حیـزبو لایەنـە سیاسـیەکانی کوردستانی عێراق ، باشتر بڵێم کورد لـەو ئابلۆقەیـە رزگـاری بـوو کـە چـەندین سـاڵ بـوو ئـەو دەوڵەتانە بە مەرامی گلاوی خۆیان کوردو شۆڕشەکەیان بەکار دەهێنا .

ئەوە بەو وتایە کە کۆماری ئیسلامی سیاسـەتی پشـتگیری تـەواوی گـەلی کـورد دەکـات نـا بەڵکو هەلو مەرجی ئـەو کـاتی شۆڕشـی ئێـران پێویسـتی بـە دۆسـتو هاوپـەیمانان هـەبوو بـۆ پاراستنی دەسەلاتی خۆیو دژ بەناحەزانی وەلە هەمان کاتیش هێزەکانی ئێران بۆ یەکەمین جار

پاش کۆماری مەهاباد سنورەکانیان چۆڵ کردو دەسەڵاتی ناوەندی لە سنورەکان نەما هەر بۆیەش نەیدەتوانی پاڵپەستۆ بخاتە سەر شۆڕشی کوردستانی عێراق .

هەموو حزبو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان سەرەڕایَ جیاوازی بیرو باوەڕیان هەموویان پێخۆش حاڵی خۆیان دەربڕی لە شۆڕشی گەلانی ئێران چەندین وەفدی کوردی کوردستانی خوارو وتووێژیان لەگەڵ کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی کرد لە تاران وە هەندێك لەو نوێنەرانە چاویان بە ئیمام خومەینی کەوت

ماوەی تێپەڕی زیاتر سنورە دەستکردەکانی کە کوردستانیان دابڕ دابڕ کردوە بوونیان نەما ، پێشمەرگەکانی کوردستانی خوارو و کوردستانی رۆژهەڵات بنکەو بارەگاکانیان لەنزیك یەکتر دانا. لەو هەلو مەرجە لەبارە نوێنەری شۆڕشی کوردستان دەیتوانی بەڕێگای تاران بچێتە ئەوروپاو وڵاتانی تر . تا دەنگی کوردی زوڵم لێکراو بەمرۆڤ دۆستو ئازادیخوازانی جیهان رابگەیەنێ کە پێشتر ئەو کارە زۆر بەئاستەنگ ئەنجام دەدرا ، هەر لە رێگای ئێران چەندین هەزار پارچە چەك لە وڵاتانی دۆستی کورد گەیشتە دەستی پێشمەرگەکانی کوردستانی خوارو .

چەندین رۆژنامە نووسو نوێنەرانی قەومی عەرەبیو حزبی بەعسی سەر بەسوریا هاتنە کوردستانو ئاڵوگۆڕی بیرو رایان لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشی کوردستان کرد .

شۆڕشی گەلانی ئێران قازانجێکی تری گەورەی هەبوو بۆ هەموو گەلی کورد ئەویش لەناوبردنی شای ئێران کە بکوژی شەهیدان قازیو سەیفو سەدرو مەلا ئاوارەو ئیسماعیل شەریف زادە، ئەندازیاری لەناو بردنی شۆڕشی ئەیلول بوو، یەکێك لە گەورەترین دوژمنانی گەلی کورد بوو ، جگە لەوەش تاقی کردنەوەی گەلانی ئێران چاوی هەموو گەلانی دنیای کردەوەو ئەو تیۆرەی سەلماندەوە کە دەسەڵاتداران هەرچەند بەهێز بن ناتوانن تاسەر بەرانبەر هەقیانەتی کێشەی گەلان خۆیان راگرن ، شۆڕشی گەلانی ئێران زەمینەی لەباری دروستکرد بۆ گەشە کردنو پەرە پێدانی شۆڕش چ لە کوردستانی ئێران چ لە کوردستانی عێراق تا کۆتای ١٩٨٠ هێزەکانی پ. م لەروی ژمارە زیادی کردو لەرووی چەکیشەوە پۆشتەو پەرداخ کرا لە زۆر ناوچە پێشمەرگە زەبری کوشندەی لە دوژمن وەشاند . شۆڕشی گەلانی ئێران نزیکەی تێپەڕی خایاند ، ئیمام خومەینی لە ١٩٧٩/٢/١ لە پاریس گەڕایەوە تاران یەك ملیۆن خەڵك لە فڕۆکەخانە پێشوازیان لێکرد وەك لە ١٩٧٩/٢/١١ شۆڕشی گەلانی ئێران سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدەست هێناو کۆتایی بەرژێمی شاهنشاهی لە ئێران هێنا .

## ٢ - گۆڕینی سەرۆک کۆمار لە عێراق :

لە ١٩٦٨/٧/١٧ تاکو تەموزی ١٩٧٩ ئەحمەد حەسەن بەکر بەناو ئەمینداری قیادەی قطری حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بوو لە عێراق لەهەمان کاتیش سەرۆکی کۆمار بوو .

لەسەرەتا سەدام حسێن ناوی لە کولەکەی تەرپش نەبوو لەپاش بەیانی ١١/ئازار/١٩٧٠ بەرەبەرە سەدام وەکو کەسایەتیەکی بەهێزی حکومەت و حزبی بەعس لە عێراق ناوی دەرکردو بۆخەڵکیش ئاشکرا بوو کە ئەو کارو باری سیاسی ، عەسکەری ، دەولی ، عێراق رادەپەڕێنێ بە تایبەت پاش رێکەوتن نامەی جەزائیر پاش ئەوەی یەکە یەکە پیاوە بەهێزەکانی ناو سوپاو حزبی بەعسی کوشت و لەناو برد.

لە هەموو فەرمانگەو خوێندنگەکاندا وێنەی سەدام حسێن کە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو لە پاڵ وێنەی سەرۆکی کۆمار هەڵدەواسرا کە یەکەمین جارە کاری وا روودەدات لە عێراق خۆ ئەگەر یاسا وێنەی سەرۆک و جێگر بووایە ئەی باشە بۆچی ئێستا وێنەی عزەت دوری کە جێگای سەدامی گرتەوە هەڵناواسرێ .

بەرە بەرە جێگای بە ئەحمەد حەسەن بەکر لەق کردو تاکو وای لێکرد بە زمانی خۆی بڵێ هەرسەدام شایستەی ئەوەیە سەرۆکی عێراق بێت . بەهەر حاڵ گۆڕینی سەدام بە سەرۆك کۆمار بە رواڵەت گۆڕانێکی لە کوردستان دروست نەکرد بەڵکو وای کرد کە سەدام ببێتە تاکە کەس لە حکومەتی عێراق .

ئەگەر هەتا دوێنێ چەند ئەندامێکی پایە بەرزی ناو حزبی بەعسی لە پەنا ئەحمەد حەسەن بەکر هەندێ قەوچە قەوچیان کردبێ ئەوا لەمەودوا ئەوەیشیان بۆ ناچێتە سەر روداوەکان ئەوەیان سەلماند ، هەر زوو سەدام حسێن نەیارەکانی سزا داو لە سێدارەیدان و بیانوی لێ دۆزینەوە غانم عبدالجليل و عدنان الحمداني و محمد عايش و محمد محجوب و محي المشهداني کە هەر پێنج ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمی بوون لە سێدارەیدان و هەڤاڵەکانیشیان هەندێکیان دەرکران و ئەوانی تریش زیندانی کران.

سەدام کۆمەڵێك خەڵکی ماستاو کەرو ترسنۆك و هەلپەرستی هێنا پێش بۆئەوەی کەس قسە لە قسەی ئەو نەکا .

ئیمام خومینی هەر زوو بە کاربەدەستانی عێراقی وت: ئێوە درندەن وەحشن دەبێ رێگای راست بگرن ئەحمەد حەسەن بەکر پاش چەند رۆژێك بروسکەی بۆ خومەینی نارد کە لەلایەن

سەدام نووسرابوو ، ئیمام خومەینی لە وەڵامدا وتی : ( والسلام علی من اتبع الهدی ) واتە سەلام لەو کەسانەی ڕێگای ڕاست دەگرن .

زەمانی خۆی پێغەمبەر ( د.خ ) نامەی وای بۆ کافرەکان دەنووسی کاربەدەستانی عێراق بەو وەڵامە زۆر دڵگیر بوون کەوتنە پڕو پاگەندە دژی شۆڕشی گەلانی ئێران .

سەدام حوسێن ئەو هەلەی قۆزتەوە وای نیشاندەدا کە گوایە لەمەو دوا عێراق دەبێ سەرۆکێکی بەهێزو توانای هەبێت تا بتوانێ بەربەرەکانی ڕژێمی ئێران بکات و پێش لە بڵاوبونەوەی بیرو ڕای ئیسلامی بگرێ بە تایبەت کە عێراق لە ٥٥٪ ی لە مەزهەبی شیعەن...

سەدام حسێن لێبووردنی گشتی دەرکرد زیندانە سیاسیەکانی ئازاد کرد هەموو ئەو پێشمەرگانەش ئازاد کران کەلەشەڕ گیرا بوون ئەوانەی لە ژووری سێدارەش بوون ئەوانیش جارێکی تر بە ژیان شاد بوونەوە .

هەندێك لەو زیندانە سیاسییانەی کە ئازاد کران لە پاشان بوون بە سەرکردایەتی ی.ن.ك لەوانە هەڤاڵان فەرەیدون عبدالقادر ، جەبار فەرمان ، عومەر سەید عەلی ، ئەرسەلان بایز ، هەندێکی تریان بوونە فەرماندەی هێزی پێشمەرگەو کادیری پێشکەوتو لەوانە شەهید ئەنوەر حەسەن ، شەهید جەمیل ڕەنجبەر ...... هتد .

سەدام حسێن یەکسەر کەوتەخۆ بۆئەوەی شەڕ لەگەڵ ئێران بکات بۆئەوەی پارسەنگ ڕاست بکاتەوە لە زۆربەی شوێنە گرنگەکانی کوردستان دەستی کرد بە کشانەوەی هێزەکان بە تایبەتی لە ناوچەی هەولێر ( دۆڵی بالیسان جادەی هیزۆب شەقلاوە - طق طق - ئالتون کۆپری - کلێسە حاجی قەلا هتد) سنوری چالاکی هێزی پێشمەرگە بەرەو فراوانی بوون دەچوو .

لە هەمان کاتدا دەستی کرد بە مفاوەزات لەگەڵ حزبی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردستان هەڤاڵ د. مەحمود عوسمان سەردانی بەغدای کرد

کاك د. مەحمود لە بەغدا چاوی بە سەرانی ڕژێمی بەغدا کەوت لەوانە د. فاضل براك لە قسەو باسێك کاك د.مەحمود بە د. فاضل براك دەڵێ پێویستیمان بە یارمەتی هەیە ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ : هوایە ساعدناکم بالفلوس بالکوادر ..!

حکومەتی عێراق پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ کوردەکانی ئێران بست ئەویش دەیویست گیو گرفتێك بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران دروست بکات بەڕاستی لێکدانەوەیەکی سەیر هەبوو لە کوردستان، ئێران پشتگیری لە حزبە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق دەکرد دژی ڕژێمی عێراق.

عێراق پشتگیری حزبە سیاسیەکانی کوردستانی ئێران‌و ئێرانیەکانی دەکرد دژی رژێمی ئێران ، هەردوو رژێم داگیرکەری خاکی کوردستانن ، هیچیان دان بە مافی کورد نانێن ، هەردوو رژێم بە هەزاران لە رۆڵەکانی میللەتی کوردیان شەهید کردو شەهیدی دەکەن ، ئەقڵی سیاسی کورد دەبێ زۆر وشیارانەو زیرەکانە ئەو لێکدانەوەیە بزانێ لە گەڵی هەڵس‌وکەوت بکات وە راستی مەسەلەکەش هەردووکیان باشترین‌و چاکترین رێگا هەڵدەبژێرن بۆ نەمانی گەلی کورد.

٣ - ئەفغانستان و سۆڤیەت :

شیوعیەکان لە ئەفغانستان شا زاهیریان دەرپەراند ، بۆئەوەی سۆڤیەتیەکان لە ئاوەکانی گەرم نزیك تر ئەکەونەوە نەوتی ناوچەکە نەکەوێتە دەستیان ئەمریکا بەپەلە کەوتە کار بۆ روخانی رژێمی کۆمونیستی لە ئەفغانستان ، سۆڤیەتیەکان هەوڵ‌و تەقەلای بێ وچانیاندا بۆئەوەی کۆمەنیستەکان خۆرابگرن کەچی سعودیە- پاکستان - ئەمریکا - ئێران - چین وە دۆستەکانیان نەیارەکانی کۆمونیستەکانیان چەکدار کرد بە گژیان وەنانەوە ، کۆمۆنیستەکانیش لە.ناوەخۆیان دوو باڵ بوون هەمیشە لەناکۆکی توند دا بوون ... بۆ چەسپاندنی رژێمی تازەی ئەفغانستان سوپای سوری سۆڤیەت لە ناکاو چونە ناو ئەفغانستان سەرۆك کۆماریان گۆڕی‌و شەڕ بە گەرمی دەستی پێکرد لەگەڵ لایەنگیرانی ئەو دەوڵەتانەی لە سەرەوە باسم کرد

زۆرجار قسەو باس دێتە گۆڕێ هەندێ کەس وادەزانێ ئەمریکا پێش بینی روداوەکان دەکات‌و دەزانێ چی دەبێ، بەبۆچونی خۆم ئەوە دوورە لەئەقڵ‌و مەنتق داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن سۆڤیەت ، ئەمریکا وەکو دنیا زانی پێشتر هیچ زانیاریەکی نەبوو چونکە ئەو کارە چاوەڕوان نەکراوبوو .

لادانی شای ئێران ، هاتنە سەر کاری خومەینی ، دەست تێوەردانی سۆڤیەتی لە ئەفغانستان، شەڕی عێراق‌و ئێران، داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراق هیچیان بەئارەزوی ئەمریکا نەبوو بەڵکو هەموویان بە زەرەری ئەمریکا کۆتایی هات .

شا بەکرێگیراوێکی ئەمریکا بوو ، خومەینی سەرئێشەیەکی زۆری بۆ ئەمریکا دروستکرد بووە هۆی دەرنەچونی سەرۆك جیمی کارتر بیەو باوەڕی خومەینی رۆژ بەرۆژ مەترسی گەورە لەسەر ئەمریکا دروست دەکات داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن سۆڤیەت بڕبڕەی پشتی ئەمریکای شکاند ، ئەگەر ئەمریکیەکان ئەو کارانەیان کردبێ دیارە دژی بەرژەوەندیەکانی

خۆیان ڕەفتاریان کردووە ، هەردوو شەڕەکەی کەنداو لە پاشان دێینە سەری‌و بە درێژی باسی دەکەین ئەگەر ئەو دوو شەڕە بە قازانجی ئەمریکاش بێت ، بەڵام ناتوانین بڵێین بە فیتی ئەو کراوە.

حایم هرزوك سەرۆکی ئیسرائیل لە قسەکردنێك لە هۆڵەندا لە سەرەتای ئازاری ۱۹۹۳ وتی ئەوانە هەموو مفاجەئات بوون .

بێ شك باری ئەفغانستان ڕۆڵی گرنگی دەبێ لەسەر دۆخی ناوچەکە بەتایبەتی لەسەر ئێران، عێراق ، سۆڤیەت کە هەرسێکیان بەشێك لە خاکی کوردستان داگیر دەکەن .

٤ - **شەڕی عێراق - ئێران :**

پاش شەڕی جیهانی دووەم هیچ ڕووداوێك هێندەی شەڕی عێراق - ئێران کاریگەری لەسەر کوردستان نەبووە ، ئەو شەڕە هەر لە سەرەتای تا کۆتاییەکەی کە ۱۹۸۸/۸/۸ بووە لە بەرژەوەندی کوردا بوو ، هیچ نەبێ دوژمنانی کورد ئەو نەخشەو پیلانانەیان لێ هەڵوەشایەوە ، کە پێشتر بۆ گەلی کورد دایان ڕشتبوو ، بەتایبەتی ڕژێمی بەعس لە عێراق لە مێژ ساڵ بوو دەیویست بەرە بەرە کورد لە نیشتمانی باوك‌و باپیرانی دەربەڕێنێ‌و ئاوارەو سەر گەردانی بکات، هەڵگیرسانی شەڕی عێراق- ئێران نەك هەر ئەو پیلانەی پوچەڵ کردەوە بەڵکو بە سەرکەوتنێکی مەزنیش بۆ گەلی کورد گەڕایەوە هەقم بەسەر ئەوەوە نیە کە گەلی کورد خۆی نەیتوانیوە لەو هەلە سود وەربگرێ‌و هەر خەریکی خۆ خۆری بووە ..!

لە مێژ ساڵە عێراق‌و ئێران ناکۆکی توندو تیژیان هەیە لەسەر دیاری کردنی سنوری وشکایی‌و ئاوی بەتایبەتی لەسەر ڕوباری ( شط العرب ) لە ئازاری ۱۹۷۵ عێراق دانی پیانا کە نیوەی شط العرب دەبێ بە هی ئێران بەرامبەر بەوەی کە ئێران پشت لە شۆڕشی کورد بکات یارمەتی لێ ببڕێ سەدام حسێن زۆرجار لە ئێزگەو تەلەفزیۆن ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە ئێمە عێراقمان خۆش دەوێ ، بۆیە بەشێك لە شط العرب ناچارین بدەینە ئێران نەوەك هەموو عێراق بدۆڕێنین ...!؟

شا لەبەر لافاوی توڕەیی خەڵك خۆی نەگرت‌و هەڵات‌و خومەینی‌و جەماعەتەکەی هاتنە سەر حوکم لەو هەل‌و مەرجە پشێوی لە ئێران دروست بوو ، سوپای ئێران وەکو پێشتر ئەژماری بۆ نەدەکرا زۆربەی ئەفسەرە دەرەجەدارە بەرزەکان کوژران یان هەڵاتن یان دەرکران هەندێك لە

سوپای ئێران چەکەکانیان بەتالاّن رۆیشت ، دەزگای سەربازی لەلایەن کاربەدەستانی ئێران بە گومانەوە سەیر دەکرا وایان لەقەڵەم دەدا کە پەروەردەی ئەمریکاو شای ئێرانن لە هیچ کاتێك جێگای متمانە نین کە کۆماری ئیسلامی ئێرانی پشتی پێ ببەستێ بەرامبەر بەوەش سوپای پاسداران دروستکرا کە لەلایەن ئیسلامیەکان سەرپەرشتی دەکرا ، ملیشیاتی جیا جیا دروست بوو مجاهیدی خەلق و چریکهای فدائی خەڵکێکی زۆر پشتگیری لێدەکردن لە پێشدا مجاهیدی خەلق پشتیوانیان لە خومەینی دەکرد کوردەکان زۆربەی ئوردوگای سەربازیەکانیان لە ناوچە کوردنشینەکان چەك کردو هەندێ لەشارەکانیان ئازادکرد ، دەسەلاّتی رژێمی تازەی ئێرانی لێ نەما ، عێراق بە هەزاران پارچە چەکی دابەش کردە سەر عەرەبەکانی خوزستان ( ئەهواز ) لەوێش شەڕ دەستی پێکرد ئێران بۆ تەمبێ کردنی عەرەبەکان جەنەرال مدنی بە فەرماندەی هێزەکانی ناردە عەرەبستان و بەهەزاران کەسی کوشت ، تورکمانەکان لە ناوچەی ( تورکمان صحرا ) لە حکومەت هەڵسان و شەڕو کوشتارلەوێش دەستی پێکرد کۆنە پیاوانی رژێمی شا لە تاران و تەورێزو هەندێ شاری گەورەی ئێران هێشتا سەریان لە جولاّن نەکەوتبوو سەریەشەی زۆریان بۆ رژێمی تازە دروستکرد ناکۆکی نێوان ئەمریکاو ولاّتانی رۆژئاواو ئێران گەیشتە ئەو پەڕی ناخۆشی ئێران زیاتر لە چوار سەد ئەمریکی بە بارمتە کردو حکومەتی کارتەری تووشی سەرلێشێوان کرد ، بلوجەکان کەلە رۆژهەلاّتی ئێران دادەنیشن ئەوانیش ویستیان داوای مافەکانی خۆیان بکەن بەلاّم رژێم ئەوانیشی خستە بەر هێرش و پەلامار، زنجیرەیەك کاری تیرۆرستی لەئێران دەستی پێکرد کە بووە هۆی کوشتنی دەیان حجة الاسلام و ایات اللة کەلە بنچینەدا رژێمی ئێران پشتی بەوانە بەستبوو بەوجۆرە دەردەکەوێ کە بەدەیان گێوگرفت رووبەرووی رژێمی تازەی ئێران ببۆوە سەرەڕای ئەوانەش هەرچی کارگەی ئێران هەبوو لەکار کەوتبوو خەڵکێکی زۆر بێ کارو کاسبی لە ئێران دەسوڕانەوە .

عێراق بەهەڵی زانی کەزەبرێکی کوشندە لە ئێران بدات پێی وابوو بە هێرشێك رژێمی تازەی ئێران دەڕوخێنێ ، چونکە دەسەلاّتدارانی ئێران داوایان لە خەڵکی عێراق دەکرد کە ئەوانیش بەعسیەکان بڕوخێنن لە زانکۆی موستەنسریەی بەغدا نارنجۆکێك تەقیەوە بووە هۆی بریندار بوونی طارق عزیز جێگری سەرۆکی وەزیران ، سەدام حسێن هەڕەشەی کردو وتی: ( ئەو خوێنەی لە زانکۆ رژاوە نابێ بەفیڕۆ بڕوات ) ئەمەش دەقی قسەکەیەتی ( واللة واللة الدماء التی سالت علی ارض جامعة المستنصریة لن تذهب سدی ) ( ئەمریکا هەرچی بیەوێت دەیکات ) بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٨٠ چونکە زۆر بەڵگەی بەرچاو هەیە بۆ نموونە لەساڵانی

١٩٦٠تاكو ئيستا ئەمريكا هەوڵ دەدات فيدڵ كاسترۆ لە حوكم لاَدا يا رژێمی كۆمۆنيستی لە كوبا بروخێنێ كەچی تا ئيستاكە هيچی پێنەكراوە وە ئەگەر بە ئارەزووی ئەمريكا بووايە حەزی نەدەكرد لە پەنا ئەو پياوێك سەر هەڵبدا دژايەتی بكات .

ئەمريكا هەوڵو كۆششی زۆری كرد بۆئەوەی معمر قذافی لە ليبيا نەمێنێ بە فرۆكە بوردمانی ماڵی قذافی كرد سەركەوتوو نەبوو ، هەروەها لە ساڵانی پێش شەڕی عێراق - ئێرانو دواتريش پشتگيری جوڵانەوەی ( يونياتای ) ئەنگۆلای كرد كەچی شكستيان خوارد ، كەواتە ئەمريكا هەرچی بيەوێ پێی ناكرێ بەڵكو بە پێچەوانەوە گەلانی دنيا ئەگەر بيانەوێ خۆيان رزگار بكەن دەتوانن .

ئەگەر سەدامو خومەينی بە فيتی ئەمريكا هەڵسنو دابنيشن ئەو هەموو بێنەو بەرەدەی بۆچييە .... بەرژەوەندی ئەمريكا لە زەمانی شا لە ئێران زۆر بوو بە دەيان كۆمپانيای ئەمريكی كاريان دەكرد بەهاتنی خومەينی ئەم كۆمپانيايانە دەركران زەرەرو زيانی زۆريان لێكەوت .. شا بنكەی پێشەوەی ئەمريكا بوو بەرامبەر سۆڤيەتی كۆن كەچی بە هاتنی خومەينی نەك هەر ئەو بنكەيە تێك چوو بەڵكو پياوێكی ئەمريكی نەيدەوێرا بە گەشتياريش بچێتە ئێران ئەگەر ئەمريكا بەكرێ گيراوی وای هەبێت بە راستی حاڵی زۆر خۆش دەبێت ..!

كۆماری ئيسلامی ئێران بەرژەوەنديەكانی ئەمريكای لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست خستە مەترسی هەر بەفيتی كۆماری ئيسلامی ئێران حزب الله ی ئێران لە لوبنان سەدان سەربازی ئەمريكايان كوشتو دەريان پەڕاند ... حزب الله لە عێراق شيعەكان زيندوو بوونەوە ئەگەر چەند تێپەڕی پێش هاتنی خومەينی هيچ پشت و پەنايان شك نەدەبرد ئەوا بە هاتنی خومەينی پشتو پەنايان پەيدا بوو.

لەسەرەتای هاوينی ١٩٨٠ بەرەبەرە شەڕە تۆپ لە نێوان ئێرانو عێراق دەستی پێكرد هەر وەكو پيشەی هەميشەييان لايەك لايەكەی تری تاوانبار دەكرد ئەوەش لەوە هاتووە چونكە هيچيان كارەكەی خۆيان بە يەكسانی نەدەزانی ، دەوڵەتانی جيهانی سێ يەم چونكە تەماگيرىو دكتاتۆريەتی سەرۆكەكانيان زاڵە بە سەريان بۆيە لەكاتی شەڕكردنيش هەر خۆيان بە هەق دەزانن ئەگەر دەست پێشكەريش لەوان بوو بێ تا رۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ عێراق لە چەندين قۆڵ هێرشی كردە ناو خاكی ئێران ناوچەيەكی فراوانی لە خاكو وڵاتی ئێران داگيركرد بە بۆچونی خۆم عێراق دەيويست ناوچەی ئەهواز داگير بكاتو لەگەڵ هەندێ ناوچەی تری ستراتيژی لەوێ بهێنێتەوە بەو خەياڵەی شەڕەكە چەند رۆژێك دەخايەنێ لە پاشان ئەنجومەنی

ئاسایش (مجلس الامن) بە بەیانێك شەڕەکە رادەگرێو وەکو ئیسرائیل بۆی دەچێتە سەر کە چۆن جۆلانو کەرتی رۆژئاوە (الضفة الغربية ) و غەزەی داگیر کردوە

بێ خەبەر لەوەی ئێرانیەکان رازی نابن بە شەڕ راگرتن تا تەواوی خاکی داگیر کراویان چۆڵ نەکرێ بەو شێوەیە شەڕ دەستی پێکرد نزیکەی هەشت ساڵی خایەند خەڵکی عێراقو ئێران تووشی زەرەرو زیانی گەورە هاتن زۆر جار باسو خواس دێتە پێشەوە گوایە سەدام حسێن بەفیتی ئەمریکا ئەو شەڕەی هەڵگیرساندو هەم باسی ئەوەش دەکرا کە گوایە بە دەستی ئەمریکا رژێمی شا رووخاو خومەینی هاتە سەرحوکم ئەو جۆرە قسانە ناکۆکی لەناو مێشکی خەڵك دروستدەکرد . جارێ دەبێ ئەو راستیە بزانین ئەو بیر و بۆچونە لە جێگای خۆی نیە کە دەڵێ لە خوارووی لوبنان تاکو ئەمڕۆ بە توندی بەگژ ئیسرائیلدا دەچن کە بنکەی بەرایی ئەمریکایە لە رۆژهەڵاتی ناوەراست جا ئەوجۆرە بەکرێ گیراوانە نازانم هەر بۆ ئەوە دروست کراون کە لە بەرژەوەندی ئاغاکانیان بدەن !!

سەدام حسێن پیاوێکی دکتاتۆرو مل هوڕو پیاو کوژو شۆڤینیە ، هەرچی مافی مرۆڤ هەیە دەنێتە ژێر پێی هەزاران رۆڵەی تێکۆشەری عەرەبی عێراقی کوشتوە بەسەدان هەزار کوردی شەهید کردووە چی خراپە وای کر دووە ..

بەڵام لێم روون نییە کەپیاوی ئەمریکا بێت وە ناکرێ بڵێین راستەوخۆ بە قسەی ئەمریکا ئەو شەڕەی هەڵگیرساند ئەو کاتەی کە شەڕ لەگەڵ ئێران دەستی پێکرد عێراق پەیوەندی دیبلوماسی لەگەڵ ئەمریکا نەبوو ، بە گەرمی دژی سیاسەتی ئەمریکا جولایەوە بەڵام دەکرێ بڵێین لە لایەن سەرانی دەوڵەتانی کەنداوو ئوردن هان درابێ بۆ ئەوەی زەبرێك لە ئێران بدات جا رەنگە بێ ئەو قسەی بە شا فەهدو ئەو کسانە راگەیاند بێ ئەوەی سەدام حسێن هەستی پێ کرد بێ.

## هۆیەکانی شەڕی عێراق و ئێران

١. ( تصدير الثورة ) ئێرانیەکان دروشمی ناردنە دەرەوەی شۆڕشی ئیسلامیانْ بەرز کردبۆوە پێیان وابوو دەبێ ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی ببوژێنەوە لە پێشەوە عێراقو دەوڵەتانی کەنداو بگرێتەوە ، ناردنی شۆڕشی ئیسلامی بۆ دەوڵەتانی تری ئیسلامی مەترسی گەورەی خستە دڵو دەروونی سەرانی دەوڵەتە ئیسلامیەکان بە تایبەتی دەوڵەتانی کەنداو . بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرو بۆچونە کەوتنە دارشتنی پیلان دانان بۆ راوەستانی شۆڕشی ئێران لە شوێن خۆی

٢. چاو چنۆکی عێراق ، عێراق دەیویست ناوچەی ئەهواز داگیر بکات بە تایبەتی خورمشەهرو عبادان ، کە دوو بەندەری گرنگنو کونترۆڵی کەنداو دەکەن .

٣. گەڕانەوەی تەواوی ئاوی ( شط العرب ) بۆ عێراق کەلە ساڵی ١٩٧٥ نیوەی لەدەست دابوو لە ئەنجامی ئەو رێك کەوتنەی لە نێوان سەدامو شا لە ساڵی ١٩٧٥ مۆر کرابوو.

٤. لاوازی سوپای ئێران ، عێراق پێی وابوو بە هێزێکی کتو پڕ هەرچی داوای لە ئێران هەیە بۆی جێبەجێ دەکرێو ئێران ناتوانێ خۆی رابگرێ یان شەڕێکی درێژ خایەن بکات .

٥. قڕان کردنی شیعەکانی عێراق کە لەلایەن شیعەکانی ئێران هان دەدران.

٦. کێشەی کورد کە هەمیشە دەیانەوێ مەرامەکانی خۆیان پێ جێبەجێ بکەن شۆڕشی ئیسلامی دەرگای بۆ کوردەکان والاّ کردەوە کە بە ئازادی هاتوچۆ بکەن .

٧. داواکردنی ئێران لەسەر ئیماراتی بەحرێن کە بووە مەترسیەکی گەورە لەسەر دەوڵەتانی کەنداو .

بێ گومان هۆی تریش هەبووە پاڵی بەو دوو رژێمە ناوە کە ئەو شەڕە ئەوەندە دوورو درێژ بخایەنێ.

ئەنجامی ئەو شەڕە بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە یەك ملیۆن خەڵکی بێ تاوان لەهەردوو لاو داتەپینی ئابوری هەردوو وڵاتو لە کارخستنی کارگە گرنگەکانی هەردوو دەوڵەت ، دابەش بوونی وڵاتی عەرەبی سوریاو لیبیا تاکۆتایی شەڕەکە لایەنگیری ئێرانیان دەکرد ، هەرچەندە عێراق زۆرجار ئەو شەڕەی بە شەڕی عەرەبو فارس لەقەڵەم دەدا سعودیەو کوێتو ئوردنو یەمەنو میسرو مۆریتانیا بەتەواوی پشتگیری عێراقیان دەکرد عومانو جەزائیرو هەندێ وڵاتانی عەرەبی نەیان دەویست تەرازوەکە لار بێت .

ئەنجامێکی تری ئەو شەڕە بووە هۆی بەهێز بوونی سوپای عێراق چ بە ژمارە چ لە رووی چەك‌و تەکنۆلوژیای شەڕ، گرنگترین ئەنجامی ئەو شەڕە کێشکردنی عێراق بوو بۆ داگیرکردنی ئیمارەتی کوێت‌و دەوڵەمەند بوونی سەدان ئەفسەری پایەداری عێراق‌و ئێران لەسەر خوێنی هەژاران .



# کوردو شـــــەڕی
# عێراق و ئێران

عێراق‌و ئێـران دوو دوژمنـی گـەورەی گـەلی کـوردن دوو پارچـەی خۆشەویسـتی نیشـتمانی ئێمەیان داگیرو بەش کردوە ، دوو دەوڵـەتی بـەهێزی ناوچـەکەن بـە نـەوتی خۆمـان توشـی ڕۆژی ڕەشیان کردووین هیچیان بەڕاستی دان بە بوونی کـورد لـە کوردسـتان نـانێن ، لـە مێـژ ساڵە کورد هەلی وای بۆ نەڕەخساوە دوو دووژمنی بکەونـە گیـانی یـەکتر بـەڵکو هەمیشـە دوژمنـانی کورد بۆ لێدانی کورد ڕێك بوون ، دەیان جار بۆ سەر کوتکردنی کورد پـەیمانیان مـۆر کـردوە ، ئەگەر لەپارچەیەك گەلی کورد سەرکەوتنێکی بچوکی بەدەست هێنابێ هەر زوو ئەو داگیرکەرانـە دەستیان لە مل یەکتر کردووە ، هێزیان یەك خستووە بۆئەوەی ئەو سەرکەوتنەی کورد لەبار ببەن چ لەوەی خۆشتر هەیـە ئـەو دوو دوژمنـە سـەنگەر لەیـەکتر بگـرن ، عێـراق نیـازی وابـوو کـورد لەرەگ‌و ریشەوە لە ولاتانی خـۆی هەڵتـەکێنێ‌و دەربـەدەری بکـا ، ناوچـەکانی سـەر سـنوری بـە قولایی ١٥- ٣٠ کم چۆڵ کردبوو لە ناوچـەی کـەرکوك کەنـدیناوەو خانـەقین‌و سـنجار بەرەبـەرە عەرەبی نیشتەجێ دەکرد ئەگەر تووشی شەڕێکی وا گەورەو ترسـناك نـەبێ کـێ هەیـە پـێش لـە پیلانی دوژمن بگرێ ، ڕاسـتە پێشمەرگە دەسـت بـەکار بـوو شـەڕی دەکـرد تێکۆشـەران تـادوا هەناسە درێژەیان بە خەبات دەدا بەڵام هێزی دوژمن لەگەڵ هێزی پێشـمەرگە بـەراورد نـەدەکرا ، شای ئێرانیش ئامادە بوو هاوکاری عێراق بکات .

هێزەکانی عێراقی زۆربەی ناوچە گرنگەکانی کوردستانیان چۆڵ کردو بەرەو بـەرەکانی شـەڕ ڕۆیشتن دژی ئێران ، سنوری چالاکی پێشمەرگەی کوردستان فراوان بوو، توانای هێرشی دوژمن بۆ سەر بنکەو مەفرەزەکانی پێشمەرگە لاواز بوو، کۆپتەرەکانی دوژمن سەرقاڵی شەڕی عێـراق‌و ئێران بوون کە چەکێکی کوشندە بوو بەرامبەر پێشمەرگەی کوردستان .

ئـەو هەلـە زێڕینەیـە هـەر بـەوە دەقۆزرایـەوە کـە هـەموو هێـزو توانـای کـورد یـەك بخرێ‌و ناکۆکییەکانی نێوان حزبە سیاسیەکان وەلا بنرێت‌و هەرچی هەیە بەگژ دوژمنی سـەرەکی کـورد بکرێت، سەرکردەی ژیرو زانـاو بـەتوانا دەبـێ پێشـبینی ڕوداوەکـان بکـات هـەرنا دەبـێ لەگـەڵ ڕووداوەکاندا بێت نابێ بەدوای ڕووداوەکان بـڕوات . دەبوایـە شۆڕشـی کـورد حزبـە سیاسـیەکان هەرزو بەرەیەکی یەکگرتووی فراوانیـان دروسـت بکردایـە هـەرنا بەرەیـەکی سـەربازی بـەهێزیان

دامەزراندایە چونکە دوژمنانی کورد بە راستی زەبوونو لاواز ببون وێرا نەدەگەیشتن لەچەند بەرەیەك لە یەك کاتدا شەڕ بکەن .

کە شەڕ دەستی پێکرد هێزە سیاسیەکانی کوردستان هیچ هەنگاوێکی بەکردەوەیان نەنا بۆ سود وەرگرتن لەو شەڕە گەورەیە بەڵکو هەر لە بارەگاکانی خۆیان خەریکی لێکدانەوە بوون چۆن ئەو رژێمە دەڕوخێ ..! وە هەر لایەنێك ناوچەیەکی پاوان کردبوو ڕێگای نەدەدا بە ئازادی هەموو بەیەکەوە زەبر لە دوژمن بدەن بە کوردیەکەی هەر یەکە خەریك بوو لە پەنا ئەو شەڕە حزبەکەی یا هێزەکەی خۆی بەهێز بکات لە بیری چوبۆوە کە بەهێزی گەلی کورد بەو واتایە کە حزبە سیاسییەکان بەهێز دەبن .

حزبە سیاسییەکانی کوردستان بوون بە دوو بەش لە جیاتی ئەوەی بەیەکەوە پلانێك دابنێن . ئەوانەی کوردستانی ئێران بڕوایان وابوو رژێمی ئێران سامناکەو عێراق دەیروخێنێ پێویستە هاوکاری عێراق بکەن لەو بارەیەوە .

حزبە سیاسیەکانی کوردستانی عێراقیش بڕوایان وابوو عێراق دەڕوخێ و هەقە لەگەڵ ئێران هاوکاری بکرێ وە هەندێك لە حزبە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق پێیان وابوو ئێران عێراق دەروخێنێ پێویست ناکا ئەوەندە خۆمان ماندوو بکەین .

ئەو دوو بۆچونە هەردووکیان جێی خۆی نەبوو نە عێراق رووخاو نە ئێران دەبووایە هەردوولا هاوکاری توندو تۆڵی یەکتر بکەن هەردوولا بەگژ داگیرکەراندا بهاتنایەتەوە .

مەسەلەی کورد یەك مەسەلەیە، ناکرێ کوردستانی ئێران داگیرکراو بێ‌و کوردستانی عێراق ئازاد بێت دوژمنان ئەو مەسەلەیە چاك دەزانن پێش هەموو کەسێك درکی پێدەکەن .

کورد یەك نیشتمانی هەیە ئەویش کوردستانە بەزۆر دابەش کراوین ئازادبوونی هەر پارچەیەك زەمینەی لەبار خۆش دەکا بۆ رزگار بوونی بەشەکانی تریش بۆیە یەکگرتنی هێزە سیاسیەکانی سەرانسەری کوردستان مەرجی سەرەکی سەرکەوتنی گەلی کوردە .

بە هەر حاڵ هەق وابوو لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕی عێراق - ئێران هێزە سیاسیەکانی کوردستان ناکۆکیەکانیان وەلا بنایە ، هێزو توانایان یەك بخستایە کەچی بە پێچەوانەوە لەگەڵ هەڵگیرسانی ئەو شەڕە ناکۆکییەکانیان توندو تیژتر دەبوو لە زۆر شوێن دەتوانم بڵێم لە سەرانسەری کوردستانی رۆژهەڵات وخواروو شەڕی براکوژی دەستی پێکرد ، هێزەکانی هەردوو دوژمن لە کوردستان لاواز بوو سەیری شەڕی ناوخۆی کوردیان دەکردو گەرمتریان دەکرد

بەڕاستی هەلێکی زێڕینی‌و مێژوویی لە دەست خۆیداو ئۆباڵەکەشی دەگەڕێتەوە ئەستۆی ئەو کەسانەی کە دەستیان هەبوو لەو ڕووداوە ناخۆشانە .
لە ئەنجامدا کوردو شۆڕشەکەی زیانی مەزنی لێکەوت‌و توشی شکستی گەورەهات کە لە پاشان دێینە سەر ئەو باسە

**مێژوو سەلماندنی ئەو دەوڵەتانەی خاکی کوردستان داگیردەکەن بە خۆشی دەست هەڵناگرن شا فەیسەڵ‌و عەبدولکەریم قاسم‌و عەبدوالسلام عارف‌و عەبدوالرەحمان عارف‌و ئەحمەد حەسەن البکرو سەدام‌و شاو خومەینی‌و عوسمانیەکان‌و کەمال ئەتاتورک‌وو ئیڤرین‌و دیمیریل‌و ئەجەویدو ئۆزاڵ ... هتد بەرامبەر گەلی کورد یەك هەڵوێستیان هەبووەو هەیە ئەوانەی لە دوای ئەوانیش دێن ڕەچاوی کاری باشیان لێناکرێت مەگەر هێزو توانایان نەبێت . پاککردنەوەی کوردستان لە داگیرکەران ئەرکی سەرەکی تێکۆشەرانی گەلەکەمانە لێکدانەوەی بێ بناغە یا ڕوخانی کەسێك هاتنە سەرکاری یەکێکی تر چارەی دەردی کورد ناکات یەکگرتنی گەلی کورد بەردی بناغەیە بۆ ڕزگار کردنی خاکی کوردستان .**

ئەو ڕۆژەی کە شەڕی ( عێراق - ئێران ) دەستی پێکرد لە ناوچەی دەشتی هەولێر بووین، ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو بۆ یەکەمین جار بە ڕۆژ لە گوندەکان سوڕاینەوە بە ئۆتۆمبێل هەتا دەورو بەری بێستانەی گەورە لە ناحیەی قوشتەپە هاتین، ئومێدی شۆڕشگێڕان بە شۆڕشەکەیان زیاتر بوو خەڵکیش هەرچەندە ترس‌و سامی بەعسیەکان لە سەری نیشتبوو بەڵام بەو شەڕە کوردایەتی سەر لەنوێ لە دڵ‌و دەروونیان بوژایەوە هیواو ئاواتیان پەیدا کردەوە
ڕۆژانە فڕۆکەکانی ئێرانی لە شارە گرنگەکانی عێراقیان دەدا بە تایبەتی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك کە شادەماری ئابوری عێراقە .

کورد زۆری پێ خۆش بوو کە فڕۆکەکانی ئێران لە نەوتی کەرکوکیان دەدا چونکە چاك دەیزانی بەو نەوتە چەك‌و تەقەمەنی پەیدا دەکرێ‌و کوردی پێ دەکوژرێ .
کەشەڕ دەستی پێکرد هەندێك لە هەڤاڵێ بڕوایان وابوو ئەوە دەبێتە ڕووخانی ڕژێمی عێراق لە کاتێکدا هێزەکانی (عێراق) سەرکەوتنی مەزنیان بەرامبەر( ئێران ) بەدەست هێنابوو
ئەو هەڤاڵنە بە بێ ئەوەی پشت بە هیچ بەڵگەیەك ببەستن ئەو بیرو رایەی خۆیان بڵاو دەکردەوە، لەو ڕۆژەی شۆڕشی گەلی کوردستان کەوتە قۆناغێکی تازەترو بەرەو گەشەکردن هەنگاوی دەهاویشت لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕ بێ سەرو بەری لەناو شارەکان پەرەی سەندو ڕژێم نەیدەتوانی کۆنترۆڵی دۆخەکە بکات هەندێك خەڵك لە شارەکان هەڵاتن لە ترسی لێدانی

فرۆکەی ئێرانی بەو جۆرە دیاردەی سەربازی راکردوو لە کوردستان سەری هەڵدا  کە دەوری خۆی هەبوو لەسەر  باری کوردستان بۆیە هەقە باسی ئەو دیاردەیەش بکەین .



## سەربازی راکردو و

## شۆڕش

حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی خەڵك بەرەو پێی سەربازی بچێت توانای زۆر تەرخان کرد، زیاد بوونی مووچەی ئەفسەرو سەربازەکان، ئەوانەی کە لە شەڕ دەکوژران نزیکەی ( ٣٨ ) سی‌و هەشت هەزار دیناریان بۆ خێزانەکانیان بەجێ دەهێشت لە جیاتی خوێنی خۆیان ( زەوی بۆ خانوو ، ئۆتۆمبێل ، پارەی نەقدی ) وەگەلێ ئیمتیازاتی تر... ئەفسەرەکان کە دەکوژران کەس‌وکاریان زیاتریان پارە وەردەگرت لە کەس‌وکاری سەربازەکان ، جگە لەو پارەدانە ، سەرۆکی عێراق بە بیانوی ئەوەی کەهەندێ ئەفسەرو سەرباز ئازاو چاو نەترس بوونە لە شەڕدا نیشانەی ئازایەتی پێ دەبەخشین، لەتێلەفزیۆن بە دیاری دەخستن‌و قسەی بۆ دەکردن، بە شان‌و باڵی هەڵدەوتن، لە ساڵانی شەڕ لەگەڵ ئێران لە (٨٠ ٪ ) بوودجەی عێراق بۆ هێزە چەکدارەکان تەرخان دەکرا، هەموو کارگەوئیش‌وکارەکانی تر راوەستا بوون لە سەرەتا هێزەکانی عێراق سەرکەوتنی عەسکەری لە بەرەکانی شەڕ بەدەست هێنابوو، حکومەتی ئێران لەبەر باری شلۆقی ناوخۆی تاچەند مانگێك نەیتوانی هێزەکانی خۆی رێك بخاتەوە وە هێرشی بەرانبەر(الهجوم المقابل) بکات، تا سەرەتای(١٩٨١) هێزەکانی عێراق بڕوایان وابوو شەڕەکە بە ماوەیەکی کورت رادەوەستێ‌و ئەفسەرو سەربازەکان لەگەڵ ئەو مەسەلەیە خۆیان لێ رادەهێنا نەیاندەزانی خومەینی نایەوێ سازش لەسەر خاکی ئێران بکات لە (١٩٨١/١/٥) ئێران هێرشێکی گەورەیان کردە سەر هێزەکانی عێراقی لە ناوچەی(خفاجیە) کە لە ئێران بە (سونگرد) بە ناوبانگە لەو شەڕە زیاتر لە هەزار سەربازی عێراقی بە دیل گیران.

بەهەزاران ئەفسەرو سەربازو دەرەجەداریش کوژران یان بریندار کران لەو هێرشە بە تەواوی وورەو زاتی هێزەکانی عێراقی رووخاو، هەرچەندە ئێران لەو هێرشە نەیتوانی پاشەکشە بە هێزەکانی عێراق بکات بەڵام زیان‌و زەرەری مادی‌و مەعنەوی‌و گیانی لە هێزەکانیدا، لەو شەڕەدا خۆبەدەستەوەدانی سەربازو ئەفسەرەکانی عێراق بووە کارێکی سروشتی. پاش ئەو شەڕە بە هەزاران سەرباز لە ریزەکانی سوپای عێراق رایان کرد چ عەرەب چ کورد هەتا هەندێ لە عەرەبە بەعسیە دڵسۆزەکانیش بە پێچەوانەی بیروڕای حزبەکەیان کاریان دەکرد .

کوردستان شوێنێکی قایم‌و سەختە، چیاو دۆڵ‌و دارستانە، هەمیشە گەلی کورد بۆ خۆپاراستن لە دوژمنانی پشتی داوەتە شاخ‌و چیاکان، سەرەڕای بەهێزی دوژمنانی کورد هێزی پێشمەرگەی

کوردستان له زۆربەی ناوچەکان دەسەڵاتی هەبووە، بۆیە سەربازە کوردە راکردووەکان هەمیشە بۆ پشودانو خۆپاراستن له کاتی تەنگانە لەو شوێنانە بوونە کە هێزی پێشمەرگە دەسەڵاتی هەبووە لەلایەن شۆڕشو پێشمەرگە پێشوازی کراون وە داڵدە دراون.

تێپەڕی پێنەچو ژمارەی سەربازی راکردوو گەیشتە چل هەتا پەنجا هەزار کەس راستەوخۆ کاریان له سوپای عێراق دەکرد ئەو دیاردەیە بوو بە چاو لێکەری، زۆربەی هەرە زۆریان لەو ناوچانە نیشتە جێ بوون کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەسەڵاتی تێدا هەبوو وە دوژمن نەیدەتوانی راویان بنێ، زۆربەی سەربازەکان مەشقی رێكو پێکیان کردبوو لەسەر چەکە جۆراو جۆرەکانی حکومەت وەك دەبابە، تۆپ، هەندەسە، موشەك، چەکی دژە ئاسمانی، هێزەکانی تایبەتی (قوات خاصه)، مغاویر، هتد هەندێکیان ماوەیەکی زۆر بوو لە خزمەتی سەربازی بوون له نیزامی عەسکەری زۆر شارەزا بوون کەلە بنچینەدا شۆڕشی کورد پێویستیەکی زۆری بەو جۆرە کەسانە هەبوو. لەو ژمارە زۆرە دەتوانم بڵێم ١٥- ٢٠٪ بوون بە پێشمەرگە بەڵام سەربازە هەڵاتووەکانی تر خۆیان لەو کارە پیرۆزە بوارد.

ئەگەر گلەیی‌و گازاندە لە سەربازە راکردووەکان بکەین تەنیا ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە دیاردەی خراپیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو ، دەبێ ئەو راستیە بڵێین هەندێك لەو سەربازانە لە ریزەکانی پێشەوەی خەباتدا بوون ئەرکی نیشتمانی خۆیان جێبەجێ کرد هەندێکیان شەهید بوون وە هەندێکیان لەبەر ئازایی‌و دڵسۆزی‌و لێوەشاوەیی پلەی بەرزیان لەریزی هێزەکانی پێشمەرگە وەرگرت‌و رۆڵی دیاریان هەبوو بۆ گەشەپێدانی شۆڕش کەچی هەندێك لەو سەربازە راکردووانە دیاردەی ترسنۆکی‌و خۆ دوور گرتن لە پێشمەرگایەتی‌و گەڕان بە دوای کەم‌و کوڕیەکانی شۆڕشیان لەگەڵ خۆیان هێنا، له کاتێکدا ئەوان لە ترسی مەرگی خۆیان رایان کردبوو له گوندەکان گلەیی‌و گازاندەیان لە پێشمەرگەکان دەکرد کە گوایە لە فلانە جێگا دوژمن لاوازە هێرش ناکەنە سەریان، کەم و کوڕی سادەی پێشمەرگەیان گەورە دەکرد ... سەربازە کوردەکان زۆربەی تەمەنیان ١٨- ٣٠ ساڵ بوو لە هەرەتی لاویدا بوون شۆڕش لە رووی پێشمەرگایەتی زۆر سودی لێوەرگرتن ناکرێ بەتەنیا ئۆباڵ بخەینە سەر سەربازەکان بەڵکو ئۆباڵیش دەکەوێتە سەر سەرکردایەتی شۆڕش‌و کادیرەکانیش کە هیچ هەنگاوێکی جدی نەنرا بۆ رێك خستنیان دەتوانین بڵێین گوناحەکە دوو لایەنی بوو هەم خۆیان لەگەڵ شۆڕش تێکەڵاو نەدەکرد وە هەم سەرکردایەتی شۆڕشیش هەوڵی جدی نەدا بۆئەوەی وشیار بکرێنەوە .

کـادیرو تێکۆشـەرانی نـاو هێـزی پێشـمەرگەو ڕێکخسـتنە نهێنیـەکانی نـاو شـارەکان هـەوڵو کۆششی زۆریان دەکرد تا بتوانن چەند کسێك ڕێك بخەن وە مەسەلەکانیان روون بکەنەوە کەچی ئەو هەموو سەربازە لەناو جەرگەی شـۆڕش‌و ناوچـە رزگـار کراوەکـان پشـت گـوێ خرابـوون کـە دەبوایە ڕۆژانە کۆڕو کۆبونەوەیان بۆ ئامادە بکرایە تـا مێشـکیان دەشـۆراوە لـە پاشـماوەی بـاری نالەبار ..! ئەو سەربازە راکردوانە لە قسەو باسەکانیان وادەردەکەوت کە رژێمی عێـراق بـەزوویی دەڕووخێ‌و ئێران لە شەڕ دەیشکێنێ چونکە هەر لەروانگەی تەسکی خۆیان سـەیری دۆخەکـەیان دەکرد بە بەلاغێکی عەسکەری دەمردن‌و زیندوو دەبوونەوە هەموو هیواو ئاواتیان ئەوە بوو شەڕ کۆتایی پێ بێت خۆیـان لـەمردن رزگـار بکـەن لـە هەنـدێ شـوێن بوونـە هـۆی سـاردکردنەوەی پێشمەرگە، لە هەندێ شوێن هەندێکیان پەیوەندیان بـەدام‌و دەزگاکـانی رژێـم کـرد دەنگوباسـی پێشمەرگەیان رادەگەیاند لە هەندێ شوێنیش بوونە مایەی سەرئێشە بۆ حزبەکان، هەندێکیان بۆ پاراستن‌و خۆهەڵکێشان‌و خۆبردنەپێشەوەو پەیوەندیان بـەو حـزب یـا بـەو ڕێکخـراو کـرد قسـەی خراپیان دەکرد، زۆرجار لەسەر ئەو جۆرە کەسانە حزبەکان لـە نێـوان خۆیـان تووشـی گێروگرفـت بوون .

سەربازە راکردوەکان لە چینە جۆراوجۆرەکـانی کۆمـەڵ بـوون، کرێکـار جووتیـار، مامۆسـتا، مەلا، پارێزەر، ئەندازیار .... هتد لە بارەی ژیانیان دەوڵەمەند، مام ناوەندی، هەژار ..!

رژێمی عێراق لە تەمووزی ١٩٨٢ لێبووردنی گشتی دەرکرد بە ماوەیەکی کورت زیاتر لە چل‌و پێنج هەزار سەربازی راکردو تەسلیم بە رژێم بوونەوە .

لاوەکانی کورد هەمیشە دەیانەوێ خزمەتی سەربازی نەکەن کە دیاردەیەکی زۆر خراپـەو بـەزەرەر گەڕایەوەتەوە بۆ گەلەکەمان، لە کاتێکدا کورد پێویستی بەوە هەیە کە رۆڵەکانی لە ریزی سـوپا کـار بکـەن بـۆ ئـەوەی رۆڵـی کـورد دیاربێـت لـەناو سـوپا بـۆ کـاتی پێویسـت وە هـەم فێـری بەکارهێنانی چەك بن وەلە هەمان کات ئاشنایەتی لەگەڵ رژێم‌و ڕێکخستن‌و گۆرج‌وگۆڵی پەیدا بکەن لاوانی کورد کە نەیانتوانی لە ریزی سوپا درێژە بـە خزمـەتی سـەربازی بـدەن وە بۆئـەوەی دوور بکەونەوە لە رژێم‌و ڕێکخستن‌و گۆرج‌وگۆڵی وە بۆئەوەی خۆیان لە شەڕی عێراق ئێران دوور بخەنەوە بوون بەچەکداری رژێم بەشـێوەیەکی تـر وە خۆیـان لـە ( ئـەفواجی سـوك ) دۆزیـەوە کـە لەلایەن گەلەکەمان بە چاوی سوك سەیر دەکرا .

لە کاتێکدا رۆڵەکانی گەلی کورد پێویستە هەمیشە لە ریزی پێشەوەی خەبات دابن وە هەموو فەرمانەکانی رژێم رەت بکەنەوە بە سەربازیشەوە بەڵام نابێ رۆڵەکانی لە جیاتی سەربازی بچنە ئەفواجی سوكو خۆیان ناو نووس بکەن وە ناوی جاش لە خۆیان بنێن .

سەربازە راکردوەکان چاوەڕێی شەڕی عێراق - ئێران بوون، خۆیان تێکەڵاوی شۆڕش نەدەکرد بەو نیازە ئەگەر عێراق سەرکەوت ئەوان دژی رژێم نەبوون بەڵکو وەکو کارێکی سروشتی نەیان توانیوە لە ریزی سوپا کار بکەن، خۆ ئەگەر رژێم رووخا ئەوا دەتوانن بە مەرایی‌و چەنەبازی خۆیان بەرنەپێش‌و سوود لەو دۆخە وەربگرن .

دیاردەی سەربازی راکردوو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە کوردستان لایەنی چاکەو خراپەی هەبووە بە کورتی ئەوانەی دەیانەوێ میللەتەکەیان سەربکەوێ دەبێ بێ دوو دڵی لە رۆژی رەش لە پێشەوەی خەباتدا بن ئەگینا هیچ تەرازوویەك نیە بەراوردیان بکات لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی کە لە رۆژانی سەخت بەهانای گەلەکەیان دێن .... ئەگەر لە دۆخێکی نائاسایی هەندێك بێ ماندوو بوون دەسکەوتی تێکۆشەرانیان خوارد بێ‌و جێگای ئەوانیان گرتبێتەوە بێ گومان تیشکی رۆژ بە بێژنگ ناگیرێ هیچ کارێك لە میللەتەکەمان شاراوە نابێت .

بەدڵنییایەوە دەڵێم ئەوانەی لە رۆژی پێویست خزمەتی میللەتی خۆیان نەکردبێ ناتوانن ببنە جێگای رەزامەندی خەڵك، مەگەر پیاوی نیشتمان پەروەر رۆژانی خەبات‌و تێکۆشانە، گەلەکەمان دوژمنی زۆرە هێشتا رێگای خەبات دوورو درێژە رۆژانی سەخت‌و هەورازو نشێوی لەبەردەم دایە، هێشتا دوژمنان بەو هیوایەن جارێکی تریش وڵاتی کوردستانمان داگیر بکەنەوە ئینجا ساغ دەبێتەوە کێ لە پێشەوەی فیداکاری دەبێت وە کێ هەمان رێگای چەوت‌و شەرمەزاری دەگرێتە بەر، ئەگەر ئەو هەموو ساڵە بۆ کورد تاقی کردنەوە نەبێت خۆ لەداهاتوو باشترین تاقی کردنەوە دەبێت ... هاتنە سەر ئامادەکاری گوناحێکی گەورەیە لە ئەستۆی ئەو کەسانەدایە کە دەیزانن‌و خۆیان لێ بێ دەنگ دەکەن .

ئەرکی حزبە سیاسیەکان هەر ئەوە نیە کە خەڵکێك رێك بخەن‌و بەگژ دوژمنیدا بدەنەوە بەڵکو ئەرکی گرنگیش خەڵك فێرە فیداکاری کردن‌و خۆ نەویستنە نابێ گەلەکەمان فێرە خۆ پەرستی‌و خۆخوری بکەین چونکە دەبێتە دیاردەیەکی یەکجار سامناك‌و خراپ لە پاشە رۆژ بەئاستەنگ دەتوانرێ بەر بەرەکانی رژێم بکەین کە هێشتا چەند هەنگاوێك لە شارەگرنگەکانی کوردستان دوورە بەشێکی گرنگ‌و دەوڵەمەند لە وڵاتی کوردستان داگیر دەکات .

به کورتی‌و به کوردی سەربازە راکردوەکان‌و حزبەکان هەردوولا گوناحبارن، چونکە ئەم حزبە سیاسیانە هەنگاوی جدیان نەنا بۆ رێك خستنیان وەهەم خۆشیان ئامادەیی تەواویان نەبوو .



# گەشەکردنی شۆڕش

شەڕی عێراق ئێران رۆڵێکی گرنگی گێڕا بۆ گەشەکردنی شۆڕش چەند مانگێك شەڕ درێژەی کێشا بە دەیان فرۆکەی عێراق لە ئاسمان سوتێنرا بە دەیان زرێپۆشو تانك تێك شکێنرا، بە سەدان ئۆتومبێلی عسکەری لە کارخران ، بەدەیان تۆپو راجیمە لە ناو چوو، چەندین فرقەی سەربازی بەتەواوی لەناو چوون، باشترین لیوا، فەوج لەشەڕ وەدەرنران و سەربازو ئەفسەرەکانیان کوژران یان بریندار یان بەدیل گیران. هێزەکانی ( قوات خاصەو مغاویر ) کە سالەها بوو دوژمن خزمەتی دەکردن و بەگژ شۆڕشگێڕانی کوردی ئەگینا لە شەڕەکانی خورەم شەهرو عەبادان و لە هێرشەکانی بەرامبەر بەتەواوی شپرزە بوون و زنجیرەی رێکخستنیان نەما. هەموو کارگە گەورەکان لەلایەن فرۆکەکانی ئێران بۆردومان کرا، بەهۆی داخستنی ( شط العرب ) نیوە لە نیوەی ئەگیناردرا بۆ دەرەوەی عێراق نەیدەتوانی پاپۆڕەکانی لەکەنداوی عەرەب هاتوچۆ بکات دەستی کارکردن بەتەواوی مەترسی لێدەکرا چونکە رژێم بەرە بەرە خەلکی بۆ سەربازی دەگرت یا لە هێزەکانی بەناو ( جیش الشعبی ) رێکی خستن، چەکی عێراق زۆربەی سۆڤیەتی بوو ئەوانیش چەکی تازەیان نەدا بە عێراق زەخیرەی چەکەکانیش بە تەواوی لە کەم بوون دابوو.

سەربازەکانی عێراق لە ترسی مردنی مەحەقەق خزمەتی سەربازیان بەجێ دەهێشت ، ئەو هەموو خالانە هەموو بە قازانج بۆ شۆڕشی کوردو میللەتی کورد دەگەڕایەوە. هەر زوو هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەسەلاتی بەسەر کوردستان زیاد بوو. بەهۆی کێشانەوەی هێزەکانی دوژمن لە هەندێ ناوچە هێزی پێشمەرگە بارەگای لێدامەزراند، دوژمن نەیدەتوانی ئەو هێزو توانایەی کە هەیەتی بەرامبەر بە شۆڕشی کورد بەکاری بهێنێ، چونکە مەترسی گەورەی لە ئێرانیەکان پەیدا کرد هەرچی هەیبوو بەرەو بەرەکانی شەڕی دەبرد دژی ئێران کۆێتەرەکانی دوژمن کە چەکێکی کاریگەر بوو دژی پارتیزانەکان زۆربەیان لە بەرەکانی شەڕی ئێران و عێراق کاریان دەکرد . رژێم هیچ هێزێکی رێك و پێکی لە کوردستان نەمابوو وەکو قوات خاصە ، مغاویر تاکو دژی پێشمەرگە بەکاربهێنێ ، بەلکو جەیشی شەعبی پیرو پەك کەوتوو خوێندکاری قوتابخانەکان لە شوێنی ئەو سەربازانە دانرابوون کە هیچ جۆرە تاقی کردنەوەیان لە شەڕ کردن نەبو . لەو ماوەیە هیچ جۆرە پێك دادانێك رووی نەدا ، هەرچەندە لە سنورەکان هەندێ جموجۆلی پێشمەرگە روویدا وەکو خۆپیشاندان دژی یەکتر بەلام خۆش بەختانە نەبووە هۆی هەلگیرساندنی شەڕی گەورە . هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەستی کرد بە چالاکی نواندن

لـه زۆربـەی ناوچـەکانی کوردسـتان، مـەفرەزەکان بەرەبـەرە خزانـە نـاو شـارەکان هەنـدێ لـە بەکرێگیراوانی رژێمی عێراقیان تەمبێ کرد .
چەکی گەورەی دوژمن مەفرەزە خاسەکانو جاش بوو ئەوانیش نەیان دەتـوانی بەرامبـەر وورەی بەرزی پێشمەرگە خۆ رابگرن چەند جارێك دوژمن لە ناوچەکان خۆی تاقی کردەوە وە لـە هـەموو هێرش‌و پـەلامارەکانی شکسـتی خـوارد بەتایبـەتی لەشـەڕی قـەلاّ سـنج کـە لەلایـەن هێزێکـی نیشتمانی کوردستان تەفرو تونا کران بووە هۆی بـەرز بوونـەوەی ورەی جەماوەری گەلەکـەمان . ساڵە هایە کوردسـتان چوار دەوری بە دوژمـنان گیراوە ئامانجیش لە دابەشکردنی کوردستان هـەر ئـەو خاڵـە بـوو کـە کـورد نـەتوانێ بـە یـەك هێـزو توانـا بـەرەنگاری دوژمنـانی بێتـەوە کەچـی لەسەرەتای دەست پێکردنی شەڕی عێراق‌و ئێران سـنورەکانی کوردسـتانی رۆژهـەلاّت لەلایـەن پێشمەرگەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران‌و کۆمەڵەی ئاستەنگ کێشان‌و شۆڕشگێڕانی کوردستانی ئێران پارێزگاری دەکرا کەواتە شۆڕشی کوردستانی خواروو قوڵایی سـتراتیژی خـۆی هەبوو وەچیتر دوژمـنان نەیانتوانی مەرجی خۆیان بەسەردا بسەپێنن . دەبێ پەنجە بۆ ئەو مەسەلە گرنگـە رابکێشـین کـە : **تـەبایی‌و هاوکـاری لەگـەڵ هێـزە سیاسـیەکانی کوردسـتانی گـەورە مەرجێکی سەرەکییە بۆ رزگار بوونی کوردستان‌و سـەرکەوتنی شۆڕشـەکەی . فەرامۆشـکردنی ئەو مەرجە گرنگە زەبری کوشندە لە کێشەی گەلەکەمان دەدات تـەنیاو تـەنیا دوژمـن سـودێ لێوەردەگرێ تاقی کردنەوەی ساڵانی رابردوو ئەو راستیەی سەلماندوە .**
هێزی زۆرو زەوەندی گەلی خۆمـان بەسە بۆئەوەی زۆربەی گیرو گرفتەکان چارەسەر بکەین . نابێ بەهیچ شێوەیەك دوژمـنی سـەرەکی گـەلی کـورد فـەرامۆش بکـەین کـە بـریتین لـە داگیرکـەرانی کوردستان، کوردەکانی پارچە جیاجیاکان پشت‌و پەنای شۆڕش‌و دۆستی راستەقینەن، لـە رووی ژمارەشەوە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەتەواوی گەشەی کرد بە سەدان بگرە بە هەزاران کـەس لەو سەربازانەی کە سوپای عێراقیان بەجێ دەهێشت هاتنە ریزی هێـزە پێشـمەرگەی کوردسـتان لەوانە دەیان کەسیان وەکـو کـادیری سیاسـی‌و پێشـمەرگە رۆڵـی خۆیـان گێـڕا لـە گەشـەکردنی شۆڕشەکەمان کە ئاماوەیەك پێش شەڕی عێراق‌و ئێران هـەموو هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان خۆی لە ( ٤٠٠٠- ٥٠٠٠ ) هـەزار کـەس نـەدەدا ( مەبەسـتم لـە پێشـمەرگەی هـەموو لایەنـە سیاسیەکانی کوردستانە ئەوانەی لە کۆڕی خەبات دابوون ) .
بە دەیـان خـەڵکی رۆشـنبیرو نوسـەرو شـاعیر هاتنـە ریـزی شـۆڕش بـە پێنووسـەکەیان کـۆڕی خەبات‌و تێکۆشانیان گەرم کرد. سـەرکردایەتی شـۆڕش بـە ئاشـکرا بنکـەو بارەگـای دامەزرانـد

مەترسی ئابلوقەدانی نەما، دەتوانرا کۆڕو کۆبوونەوەی فراوان بۆ کادیرەکانی ساز بکاتو ئاڵو گۆڕی بیرو ڕا بۆ دەوڵەمەند کردنی شۆڕشی کورد بکات .

هەردوو ڕژێمی ئێرانو عێراق هەریەکەیان خۆشحاڵی خۆی نیشاندا کە هاوکاری کورد بکات، عێراق هاوکاری کوردەکانی ئێران، ئێرانیش هاوکاری بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کوردی کوردستانی خواروو ( نابێ هەرگیز ئەوەمان لەبیر بچێتەوە هەرچی بیکەن تەنیا بەرژەوەندی خۆیان لێ ڕەچاو دەکەن، هەر کاتێك گەلی کورد نزیك بێتەوە بۆ زامن کردنی مافەکانی ئەو دەوڵەتانە یەکیان گرتووە بۆ لەبار چوونی مەسەلەی ڕەوای کورد ئەو نموونەیە لە کۆبونەوەکانی وەزیرانی دەرەوەی ئێرانو سوریاو تورکیا لە بارودۆخی ئێستا خۆی دەبینێتەوە ) . شۆڕشی کورد زۆر سودی وەرگرت لە ناکۆکی نێوان ئەو دوو دوژمنە دێرینە بەڵام داخەکەم سوود وەرگرتنەکە تا سەر نەبوو . ماوەیەکی زۆر بوو دەرگای هاتووچۆ بۆ دەرەوەی کوردستان داخرابوو لە رووی نوێنەرایەتی شۆڕشی کورد بەهۆی ئەو ناکۆکیە ئەو دەرگایە بۆ ماوەیەك خرایە سەر پشت نوێنەرانی شۆڕشی کورد بەکەیفو ماشای خۆیان هاتووچۆی ئەورووپاو وڵاتانی دۆستی کوردیان دەکرد . بەڕێز مام جەلال بە ڕێگای تاران گەڕایەوە کوردستان کە تێپەڕی زیاتر لە وڵاتانی ئەورووپاو عەرەبی مایەوە، سەدان پارچە چەك بە ڕێگای ئێران گەیشتە دەستی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە بێگومان خاڵێکی گرنگە بۆ پێشخستنی شۆڕشی کوردستان ئێران خۆشی چەکیدا بە هەندێ لایەنی سیاسی کوردستانی خواروو .

ئەو خەیاڵەش لە مێشکی سەرانی ڕژێمی عێراق دەرچوو کە دەیانگوت شۆڕشی کورد پەك دەخەنو لەناوی دەبەن . ئەگەر پێشتر هەر هەندێ لە تێکۆشەران ڕژێمی عێراقیان بە زۆردارو دکتاتۆر دەزانی ئەوا بە هەڵگیرسانی شەڕ لەلایەن عێراق دژ بە ئێران، هەڵکردنی ئەو ئاگرەکە ڕۆژانە سەدان کوڕی خەڵکی عێراقی تیا دەسووتا ئەو ڕاستیەی بە زەقی روون کردەوە وە گەلی عێراقیش ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو بێزار بوون دەڕۆیشتن . حزبە سیاسیەکانی کوردستان کەوتنە خۆڕێك خستنەوەی ئەندامو لایەنگیرەکانیان لە شارو شارۆچکەکانو بەستنی کۆبونەوەی فراوانی کادیرانو کۆنفرانسو کۆنگرە کە بێگومان ئەو جۆرە کۆبونەوانەتەکانی گەورە بە شۆڕش دەداتو سەر لەنوێی دەکاتەوەو خوێنی تازەی پێدەدات . حکومەتی عێراق کەوتە کلکە سوتە بەهۆی هەندێ لە دۆستانی خۆی بە نهێنی نوێنەری ئەگینارده لای سەرکردایەتی حزبەکان تا لەو بارودۆخە ئەستەمەی کە عێراق پێیدا تێدەپەڕی وتووێژ بکەن .

ئەمانەو گەلێ خاڵی تری گرنگ لەو هۆیانە دەژمێردرێن کە بوونە هۆی گەشەکردنی شۆڕش .

## جیاوازی بیروڕا
## لەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان

هیچ حزبو ڕێکخراوێك نیە لەدنیا جیاوازی لە نێو ئەندامەکانیدا نەبێت، جا ئەو جیاوازیانە لە حزبێك تا حزبێك، لە ڕێکخراوێك تا ڕێکخراوێك دوورو نزیك هەیە، کۆمەڵە لە هەلو مەرجێکی نهێنی لە ساڵی ۱۹۷۰ لە دایك بووە بێگومان کۆمەڵە لەسەرەتا خۆی بە مارکسی لینینیو هەڵگری بیرو باوەڕی ماوتسی تۆنگ دەزانی هەرزوو لە نێو ئەندامەکانی ناکۆکی توندو تیژ دروست بوو بەڵام لەبەرئەوەی لە خەباتی ژێر زەمینی دابوو ئەوەندە نەبوو بووە جێگای باسو لێکۆڵینەوە وەهەم کۆمەڵە لەسەرەتا وەکو ڕێکخراوێکی بچوك هاتە مەیدان دەوری کاریگەری ئەوەندە لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان نەبووە تا کۆمەڵانی خەڵك بە پەرۆشەوە سەیری ئاڵوگۆڕەکانی ناو خودی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بکەن .

پاش هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول، پاش ئەوەی گەلەکەمان تووشی ئەو کارەساتە هات کۆمەڵە وەکو ڕێکخراوێکی بابەتی بەو ئیمکانیەتە لاوازەی خۆی هاتە مەیدانو ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی هەبوو لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بووە مایەی دڵخۆشی خەڵك . هەرزوو کۆمەڵانی خەڵك بەتایبەتی خوێنکارە دڵ گەرمو شۆڕشگێڕەکان خۆیان لەناو ئەو ڕێکخراوە دۆزیەوە . کۆمەڵە هێشتا تەواو خۆی نەگرتبوو توشی چەندین زەبری کوشندە هات هەر زوو تێکۆشەران شەهابو جەعفەرو ئەنوەر لە سێدارەدران وەهەندێ لە کادیرە تێکۆشەرەکانی زیندانی کران لەوانە کاك فەرەیدون عبدالقادر ، کاك عومەر سەید عەلی ، کاك جەبار فەرمان ، کاك ئەرسەلان باییز ، کاك عەلی بچکۆل ... هتد لەو هەلو مەرجە سەختە کۆمیتەی هەرێمەکان دامەزراو شەهید ئارام سەر لەنوێ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی زیندوو کردەوەو دەست کرا بەخەباتی چەکداری تێپەڕی بەسەر خەباتی چەکداری تێپەڕی نەکرد چەندین کادیری ئازاو لێوەشاوەی کۆمەڵە لە شاخو شار لە سێدارە دران یان لەلایەن هێزەکانی ڕژێم لە شەڕو پێکداداان شەهیدکران لە ۳۱/۱/ ۱۹۷۸کاك ئارام سکرتێری کۆمەڵە لەناوچەی قەرەداغ شەهید کرا ئەو زەبرە یەکجار زۆر کاریگەر بوو لە کۆمەڵە کەوت هێشتا ئەو برینە قوڵو سامناکەی سارێژ نەکردبوو ، هێشتا خوێنی شەهید شەهابو جەعفەر گەرم بوو خوێنی ئارامیش ڕژا ئەو زەبرە یەك لەدوای یەکانەی بە کۆمەڵە کەوت ئەگەر بە هەر حزبو

کۆمەڵە غەدری لێکرابێ ، هەر لە پیرە ژنی ( پیرانە رەشە ) ی پشدەرە رەقە بگرە تا رەشماڵ نشینەکانی جافایەتیو مەنتكو قەرەداغو مەنگورایەتیو خەڵکی شار دەزانن کۆمەڵە هەمیشە باڵا دەستی تەواوی هەبووە لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان .

بورژوازییە خۆ بەمارکسی زانەکانی خۆمان وایان بلاوەکردەوە گوایە مارکسیەت (کراس گۆڕین نیە - بەڵکو پراکتیكو بۆ چوونو هەڵوێستە ) ئەی باشە هەموومان ئەندامی هەمان رێکخراو نەبووین بۆچی ئەو تانەو تەشەنەیە تەنیا لە هەندێ تێکۆشەر بدرێ با هەموومان بگرێتەوە . هەڵوێستو بۆچوونو پراکتیك رۆژانی خەبات دەیسەلمێنێ ئەوە بە دوو قسە ساغ نابێتەوە .

کوردستان وڵاتێکی دواکەوتوە، هێشتا نەریتی خێڵەکی بە سەریدا زاڵە، هەزاران مەلاو فەقێ لە مزگەوتەکان کە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەستراوەتەوە، شیوعی بە لادینو کافر دەزانێ، هەڵەی حزبی شیوعی عێراقیش یەکجاری لاملی کردووە جا ئەگەر لەو دۆخە شۆڕشی کورد دژایەتی دینی ئیسلامی بکات دەبێ بکەوێتە ناو کام دەریای بێ بنو بیخنکێنێ ؟

ئەوە بەو واتایە نایەت کە هەڵگری ئەو بیرو بۆچوونە دژی مارکسیەت بێت بەڵکو بەو واتایە دێت هەندێ کەس بۆ بەرژەوەندی خۆی مارکسیەت دەکا وای لێ کردووە خەڵك لە جیاتی ئەوەی مارکسیەتی خۆش بوێت دژی بوەستێ ..!؟. مارکسیەت هەڵگری بیروڕای کرێکارانە، بورژوازییە بچوکەکان هەرچەندە خۆیان لەو مەسەلەیە هەڵدەقورتێنن بەڵام هەر دەگەڕێنەوە بۆ بنچینەی خۆیان . بەهەرحاڵ من وەکو ئەندامێکی کۆمەڵە کە هەڵگری بیرو باوەڕی مارکسیزم بووە هەرگیز ئەو جۆرە جیاوازیەم هەست پێنەکردووە لە نێوان سەرکردەکان، بە پێچەوانەوە ئەوانەی خۆیان زیاتر بە مارکسی دەزانی هەقی پێشمەرگەیان دەخوارد، جێگای نووستنیان خۆشتر بوو، بە فیزتر بوون، جلو بەرگیان باشتر بوو، خواردنیان چاکتر بوو، خزم خزمێنەو برادەرایەتیان زیاتر دەکرد، هەستی خەڵکیان رانەدەگرت زۆرجاری وا هەبوو ئەوانەی بە نامارکسیزم لە قەڵەم دەدران کردەوەکانیان مارکسیانە بوو تەنیا بە زمانی خۆیان وایان نەدەووت جا هەر کەسێك مارکسی بێت دەبێ بە کردەوە ئەو مەسەلەیە بسەلمێنێ ئەگینا قسەی بێ بناماو لووس جێگای ناگرێت . ئەو جۆرە ناکۆکیانە لەناو کۆمەڵە رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەبوو جگە لەناو رێکخستنەکانی هەرێمو کەرتو مەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانیشی گرتەوە .

کۆمەڵە تا ئەو کاتە هیچ کونفرانسێکی نەبەستبوو تەنیا چەند کۆبونەوەیەکی فراوانی کردبوو کە کادیرەکانی شاخ بەشداریان هەبوو بۆیە پێویستی دەکرد کۆمەڵە لەو هەلو مەرجە کۆنفراسێك ببەستێ بۆ هەڵسەنگاندنی کارەکانی چەندین ساڵەی خەباتی وە هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی تازە کە چەند زۆرتر ئەندامی بەشداری تیادا بکەن کاریگەرتر دەبوو .

پێش ئەوەی کۆنفراس ببەسترێ کۆمەڵە مەترسی پارچە پارچە بوونی لێدەکرا زۆربەی فەرماندەی هەرێمەکانی هێزی پێشمەرگە جگە لە هەرێمی هەولێر کە لەلایەن هەڤاڵ سەید کەریم سەرپەرشتی دەکرا هەموویان یەکیان گرتبوو ئەوان لەبەرئەوە نەبوو خاوەن بیرو باوەڕێکی تایبەتی خۆیان بن یان لەگەڵ لایەنە راستەکە بن بەڵکو بۆئەوەی لە دەسەڵاتیان کەم نەبێتەوە هەر حاکمیەتی خەڵك بکەن وایان نیشان دەدا کە لەگەڵ خەتی شەهید ( ئارام ) دان پەیڕەوی مارکسیزم - لینینزم دەکەن . بۆ مێژوو دەڵێم هەندێك لەو برادەرە مارکسیانە ئەوەندە پەرۆشی (ئومەمیەت) بوون وایان لێهاتبوو رقیان لە خەڵکی هەولێر ببێتەوە چونکە ئەوانە وا لە (ئومەمیەت ) حاڵی ببون ..!؟ ئێمە لە کەرتی یەکی دەشتی هەولێر هەرێمی هەشت بووین رۆژی نەورۆز لە گوندی گۆپتەپەی وڵاتی کۆیە بووین ناوچەکەمان بەسەر کردەوە نامەیەك لە سەرکردایەتی هات کە هەموومان بچین لەبەر دوو هۆ :

یەکەمیان: پارێزگاری لە سەرکردایەتی ی . ن. ك بکەین چونکە دەنگو باس وا هاتبوو کە گوایە پارتیو بزوتنەوە نیازیان وایە زەبرێك بوەشێنن ( لەپاشان ئەو قسەیە بە درۆ خرایەوە ) .

دووەمیش: کۆنفراسی یەکەمی کۆمەڵە دەبەسترێ . بە رێکەوتین بەهار بوو دەرەشێو کوێستانی ساوسێوەکەمان بڕی لە گوندی وەرتێ بارەگەمان دامەزراندو رۆژی دواتر بە رێکەوتین، پاش (١٥) کاتژمێری پیادە رۆیشتن، ماندوو بوون بە هەموومانەوە دیار بوو لە ١٩٨١/٥/٧ گەیشتینە سەرکردایەتی، لەو حەدو سەدە کۆنگرەی حزبی سوسیالیستی یەکگرتووی کوردستان لە دۆڵە توو ( گوندێکی کوردستانی ئێرانە ) دەستی بە کارەکانی کردبوو چەند فڕۆکەیەکی عێراق هێرشیان کردە سەر شوێنی کۆنگرەکە بەڵام لە زیندانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیدا بەدەیان لە زیندانیەکانی شەهید کرد . سەرەڕای ناکۆکی توندو تیژی نێوان یەکێتیو حسك دکتۆرەکانی یەکێتی بەپەلە چوون بە هاواری ئەوان بە گوێرەی ئەو توانایەی لەبەردەستا بو یارمەتیاندان کە جێگای دڵخۆشی هەمووان بوو . پێش بەستنی کۆنفراس ناکۆکیەکان بە تەواوی دەرکەوتو دڕدۆنگیو پروپاگەندەی نا بەرپرسانە دەستی پێکردبوو هێشتا هیچ بە هیچ نەکرابوو، شۆڕشی کوردستان تازە دەیویست خۆی بگرێتەوە

کەچی لێپرسراوەکان دەستیان لە یەکتری کردەوەو ( کەو بە چیاوە شەڕی لەسەر دەکرا ..!!) لە دۆڵی مالیمۆس لە ئاقاری گوندی (کانی زەرد) ی کوردستانی رۆژهەلاتی داگیرکراو لە پەنا چیای ( بلفەت )بەو بەهارە بەو بارانە کۆنفراس لەگەڵ بارگرژی ئەو هەموو ناکۆکیانە بە ئامادە بوونی نزیکەی (١٨٢) ئەندام کە زۆربەیان پێشمەرگە بوون وە هەندێکیش لە هاوڕێیانی شار بەشداریان کرد دەستی پێکرد .

کۆنفراس دوو هەفتەی خایاند لە هەفتەی یەکەم هەڵبژاردن کرا بەلاّم تا کۆتایی کۆنفراس دەنگەکان ئاشکرا نەکرا چونکە هاوڕێیانی شار بواری یەك هەفتەیان هەبوو لە بەشدار بوون لەبەر مەترسی چونکە دواکەوتنیان لە ئیش‌و کارەکانی شاریان دەبووە هۆی ئەوەی کە دوژمن هەستیان پێبکات . لەوێ هەرچی لەتەمەنی کۆمەڵەدا کرابوو خرایە بەر باسو خواس‌و لێکۆڵینەوە، هەندێ تێکۆشەر لە جیاتی ئەوەی پاداشتی بدرێتێ کە چۆن لەرۆژانی ناخۆشیدا بەسەرو ماڵ ئامادەبووە پارێزگاری لە کۆمەڵە بکات کەچی درایە بەر تانەو تەشەنەی منالاّنەو نابەرپرسانە کە هەرگیز لە ئەندامانی رێکخراوێکی وەکو کۆمەڵە نەدەوەشایەوە کە ئەندامانی وا ئازاو چاونەترسن . بەناهەق هەندێ لە هاوڕێکان ئەو خەبات‌و تێکۆشانەیان خرایە ژێر پێ وەکو ئەوەی هیچیان نەکردبێ‌و هەر کاری خراپیان کردبێ . بۆیە دەڵێم ئەو ناکۆکیانە تەنیا بەرژەوەندی تاکە کسی بووەو هیچی تر .

راستە هەندێك لە هاوڕێیان لە ژیانی خەباتی رۆژانە تووشی هەڵەو کەم‌و کوڕی بوون ئەوە کارێکی سروشتییە بەو واتایە نیە کە کاری چاکی نەکردوە، لە پێشەوەی هەموان سەرکردایەتی هانی ئەندامەکانی دەدا کە رەخنەی ( تێکدەرانە ) بگرن . سەرکردایەتی حزب یان رێخراوێك هەر وا لە گۆترە ناکرێ سەرکردەکان دەبێ بە پەرۆشی ئەندام‌و پێشمەرگەکان بن، لە کاتی تەنگانە یارمەتیان بدەن، بیان گێڕنەوە سەر رێگای راست لە کاتی هەڵەو لادان، بەیەك چاو سەیری هەمووان بکەن، هەرگیز نابێ سەرکردەکان لە پاش ملە قسە لەسەر ئەندام‌و کادیرەکان بکەن چونکە دەتوانن بانگیان بکەن راست‌و دروست کەم‌و کوڕیەکانیان پێڕابگەیەنن ، هەموو لێپرسینەوەو سزادان‌و لادان دەبێ بەپێی پەیڕەو و پرۆگرام ( یاسا و قانون ) بێت، نابێ سەرکردەکان بوخزو قین هەڵبگرن، دەبێ کاری چاکی ئەندامان‌و پێشمەرگەکان پاداشت بکرێت تا بزانی کاری چاك چاکەی لە دوا دێت، هەقە سەرکردە بزانێ برا گەورەی برا بچوکەکانە واتە سەرکردەو ئەندام .

لەناو خەڵك‌و كۆڕو دانیشتنی سەركردەكان نابێ رازی بن باسی هیچ ئەندامێك بە خراپە بكرێ ... هتد بەو كارانە سەركردەكان لەناو ئەندام‌و پێشمەرگەكان خۆشەویست دەبن بە پێچەوانەوە ئەو حزب‌و رێكخراوە دەبێتە جێگای شكانی دڵسۆزان‌و تێكۆشەران وە دەبێتە مایەی بەرەڵلایی‌و سەرە رۆیی‌و مل ملانێی نادروست‌و ناهەق .

ئەندامی ناو كۆنفراسی كۆمەڵە هەموویان چارەنوسیان بەیەكترەوە بەستبۆوە، هەموویان لەدەیان هەڵوێست تووشی ناخۆشی ببوون كەچی بێ گوێدانە پرنسیپی حزبایەتی وەكو دوژمن بەر ببونە گیانی یەكتر، خەبات‌و تێكۆشانی یەكتریان بەهیچ دەزانی جا نازانم كێ هەیە بەو جۆرە مامەڵەیە رازی بێت ..! كۆنفراس زۆر مەسەلەی بە تێرو تەسەلی خستە بەر باس‌و لێكۆڵینەوە هەڵوێست لەحزبە سیاسیەكان ، لە سۆڤیەت ، لە ئێران ، لە عێراق ، بەرەی عێراقی ، جود ، رێكخراوەیی ، پێشمەرگەیی ، مالی ، ئیعلامی ، دیبلوماسی ، ژیان لەگەڵ یەكێتی نیشتمانی كوردستان وە هەڵبژاردنەوەی سەركردایەتی تازەی كۆمەڵە .

بریاردرا كە پێویستە لە هەڵبژاردندا ئەو كسانە ببنە ئەندامی سەركردایەتی كە لەنێوەی دەنگی ئەندامەكان زیاتر بهێنێت، پاش ئەوەی دەنگ خوێندرایەوە ئەم هاورێیانە بوون بە ئەندامی سەركردایەتی كۆمەڵە :

- كاك نەوشیروان مستەفا ئەمین - سكرتێر
- كاك فەرەیدون عبدالقادر .
- كاك د . كمال خۆشناو .
- كاك مەلا بەختیار .
- كاك عومەر سەید عەلی .

كاك عومەر سەید عەلی لە جەلك‌و دوو گۆمان لە بناری كێوە ڕەش لە پشدەرە ڕەقە بەتەقەی كۆپتەرەكانی دوژمن بریندار بوو ، لە دەرەوەی وڵات لە نەخۆشخانە چارەسەری دەكرا هەر بۆیە شەرەفی ئەندامی سەركردایەتی پێدرا

بە بۆچونی خۆم رێكخراوێكی وا شۆرشگێرو لەناو جەرگەی خەباتی چەكداری پێویستی بە (١٠-١٥) ئەندامی سەركردایەتی هەبوو، نەك چوار كەس كەلە بنچینەدا هەر دەیانتوانی بەسەر ئیش‌و كارەكانی یەكێتی نیشتمانی كوردستان رابگەن . كۆنفراسێك كە نەتوانێ سەركردایەتی هەڵبژێرێ بۆ رێكخراوەكەی خۆی دەبێ چ كۆنفراسێك بێت .

پاش کۆنفراس هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی کۆن کەلە هەڵبـژاردن دەرنەچوون لـە خەبات سارد بوونەوە کە هەق وانەبوو ئەو هەڵوێستە وەربگرن، هەرچەندە کاك مەلا بـەختیار بـە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردرا کەچی لە پێشەوەی نارەزاییەکان بوو ، بەرەو تاران کەوتـە رێ بە نیازی ئەوەی سەر هەڵبگرێ ، خواو راستان لە تاران توشی مام جەلال دەبێ پاش قسـەو بـاس لە کەلی شەیتان دێتە خوارێو گەڕایەوە خۆی ناو زەنگ پـاش ماوەیـەك دەسـتی بـەکار کـردەوە، پاش کۆنفراس رێکخستنەکانی کۆمەڵە لەسـەر شـێوەی تـازە دامـەزرایـەوە، هەرێمـەکانی هێـزی پێشمەرگە هەڵوەشایەوە چەندین هێز لە سەرانسەری کوردستان دروست بوون :

- قوەتی دەشتی هەولێر - کاك شاخەوان
- هێزی خۆشناوەتی - کاك ملازم خولە
- هێزی کۆیە - مامۆستا عەزیز
- هێزی کۆسرەت - شەهید مەلا حسەن
- هێزی قەرەداغ
- هێزی گەرمیان
- هێزی باڵەك
- هێزی سۆران
- هێزی مەرگە
- هێزی هەورەمان
- هێزی شارباژێر
- هێزی کەرکوك
- هێزی جافایەتی

لەو لاش کۆنگرەی حزبی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردستان توشی شکستی گـەورە هـات، کاك د. مەحمود کەلە بنچینەدا لەگەڵ بزووتنەوە لە یەکێتی خۆی دڕدۆنگ کرد بۆئەوەی بوو کـە ببێتە سەرکردەی یەکەمی حزبی داهاتوو کەچی لە کۆنگرە شکسـتی خـواردو خـۆی هەڵنەبـژارد لێیداو رۆیشت هەندێك لەوانـەی کـە بیرو بۆچوونەکانی ئـەو لـە مێشـکیاندا رەنگـی دەدایـەوە بارەگایان لە گوندی شێنێ دانا، پاشان خۆیان حەل کرد هاتنـە نـاو ریـزی یـەکێتی نیشـتمانی کوردستان لەوانە :کاك شێخ محەمەد، شەهید سەرباز، شەهید ئازاد حەمە گەمان ، کاك مـولازم

فوئـاد .... هتـد. کـاك رەسـوڵ مامەنـد بـوو بـە سـكرتێری حزبـی سۆشیالیسـتی یـەكگرتووی كوردستان وە ئەوانەش بە ئەندامی سەركردایەتی هەڵبژێردران :

- کاك رەسوڵ مامەند - سكرتێر
- کاك قادر عزیز .
- مامۆستا سەعد .
- کاك سەید كاكە .
- کاك حەمەی حاجی مەحمود .
- کاك ئەحمەد خۆرەش .
- خاڵە حاجی ( هەڤاڵ جوجەڵە )
- کاك عادل موراد .
- کاك شێروان شێروەندی .
- کاك عەبدولخالق زەنگەنە .
- کاك قادر شۆڕش .
- شەهید شێركۆ شێخ عەلی .

پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراق بەرە بەرە برینەكانی خۆی سارێژ دەكردو لە كۆنە قیـادە مۆقتەكان خۆی رزگار دەكرد لەگەڵ ئێران دۆستایەتی بەهێزی هەبوو، بەرە بـەرە لەگـەڵ حیزبـی دیموكراتی ئێـران ناكۆكیـەكانیان زیـاتر دەبـوو، عێـراق‌و ئێـران دەسـتیان هـەبوو لـە تێكـدانی پەیوەندیەكانی ئەو دوو حزبـە هەریەكـە نۆكـەرانی خـۆی هـان دەدا كـە شـەڕی براكـوژی دەسـت پێبكات .

# گەڕانەوەی مام جەلال

ساڵێك‌و چەن مانگێك تێپەڕی‌و چەند مانگێك بەرێز مام جەلال لە دەرەوەی وڵات بوو، بڕیار نەبوو مام جەلال ئەوەندەی پێ بچێ بەڵام ڕژێمی ئێران ڕێگای نەدا بە ڕێگای ئێراندا بگەڕێتەوە، پاش گفتوگۆ لەسەر داوای هەندێ لە وڵاتانی دۆستی کورد ئێران ڕێگای دا بە خاکی ئێران بگەڕێتەوە کوردستان .

شۆڕشی کورد پێویستی بە خۆسازدان هەبوو، پێویستی دەکرد ئەو پێشمەرگانەی کە تازە هاتوون چەکدار بکرێن، پێویستی دەکرد پێشمەرگە یارمەتی بدرێت، هەندێ چەك پەیدا بکرێت، بەتایبەتی چەکی دژی ئاسمانی بۆ ئەوەی بەرگری لە سەرکردایەتی بکات لەبەرئەوەی کوردستانی خوارو لە هەر چوار لاوە بە دوژمن دەوری درابوو هێنانی چەك‌و کەرەستە لە دەرەوەی کوردستان کارێکی زۆر ئاستەنگ بوو.

ئێرانیەکان هەمیشە دەیانەوێ شۆڕشی کورد بخەنە داوەوە ئەگەر بە شەڕو شۆڕ پێیان نەکرێ ئەوا ڕێگای دۆستایەتی بەکاردێنن، چەندین جار ئێرانیەکان بەڵێنیاندا کە چەك‌و تەقەمەنی بدەنە (ی.ن.ك ) پاش هاتووچونێکی زۆر بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ نەکرد

دەبێ ئەو ڕاستیە درك پێ بکەین لە هیچی خۆڕایی ئێران چەك بە میللەتی ئێمە نادات بەڵکو دەیەوێ کورد بە دیلی و ژێر دەستی بژی .

حکومەتی ئێران مەرجی دانابوو بۆ ( ی.ن.ك ) بەرامبەر ئەو چەکانەی کە پێی دەدا مەرجەکانی بریتی بوو لە :

١. یارمەتی دانی پاسدارو سوپای ئێران بۆ لێدانی حزبی دیموکراتی ئێران‌وکۆمەڵەی ئاستەنگ کێشان .
٢. چاوساغی کردنی ئێران بۆ هێرش بردنە سەر سوپای عێراق لە کوردستان .
٣. پێدانی زانیاری تەواو لەسەر جێگاو ژمارەی هێزەکانی عێراق لە کوردستان .

(ی.ن.ك) ئەو مەرجانەی ئێرانی ڕەت کردەوە، لە مێژووی کوردستان جارێك نەبووە ئەو ڕژێمانەی کوردستانیان داگیرکردوە بەبێ بەرانبەر چەکیان بە کورد دابێ وکۆمەکی کوردیان کردبێ ئەوانە قازانجیان زیاتر وەرگرتووە، تێکۆشەرانی گەلەکەمان دەبێ لە پاشە ڕۆژیش چاوەڕوانی یارمەتی و کۆمەك‌و هاوکاری لە دوژمنان نەکەن .

هەموو یارمەتیەکانیان بۆ کورد بە کارێکی (سلبی)دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەشە لەو پەنایەدا مەرامە گڵاوەکانیان جێبەجێ بکەن .

لە حوزەیرانی ۱۹۸۱ مام جەلال گەڕایەوە بارەگای سەرکردایەتی لە توژەڵەو ناو زەنگ ئەوەی جێگای داخە حزبی دیموکراتی کوردستان لایەنگیانی خۆی هان دابوو کە گوایە (ی.ن.ک ) بە فیتی ئێران کار دەکات‌و دەیەوێ لە شۆڕشی کوردستانی رۆژهەڵات بدات .

چەندین پێشمەرگەیان چەك کرد کە لە ناوچەکانی هەورامان‌و شارباژێڕو شارەزوور دەیانویست بە خاکی کوردستانی رۆژهەڵات بگەنە سەرکردایەتی .

ژیری‌و هەست بە لێپرسراوێتی نەتەوایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وای کرد کە چاو لەو کارە شەڕ فرۆشتنە بپۆشێ رووداوەکانیش راستی‌و دروستی هەڵوێستی (ی.ن.ك ) یان سەلماند .

پاش ئەوەی سوریا دەخالەتی کرد ئێران رێگای دا هەندێ چەك‌وکەرەستە بە رێگای ئێران لە سوریاوە بگاتە کوردستان چەکەکان بەسەر هێزی پێشمەرگە دابەش کرا جۆشی دایەوە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان .

مام جەلال .. مەلا بەختیارو ملازم عومەری لە تاران دیبوو پاش ئەوەی دۆخی شۆڕشی لەگەڵ باس کردبوون بڕیاریاندا کە بگەڕێنەوە دەست بەکار کردن بکەنەوە، بە ئامادە بوونی مام جەلال کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی ( ی.ن.ك ) دەستی پێکرد مەکتەبی سیاسی ( ی.ن.ك ) بریتی بوون لە:

١. بەڕێز مام جەلال سکرتێری ( ی.ن.ك ) .
٢. کاك سالار ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك ( کۆمەڵە ) .
٣. کاك جەعفەر ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك ( کۆمەڵە ) .
٤. کاك د. فوئاد مەعصوم ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك (خەتی گشتی )
٥. کاك د . کەمال خۆشناو ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك ( خەتی گشتی ) .
٦. کاك جەمال ئاغا ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك (بزووتنەوە ) .
٧. کاك عەلی حەوێز ئەندامی مەکتەبی سیاسی ( بزووتنەوە )

کاك د. کەمال خۆشناو پێش کۆنفراس بە نهێنی لە ریزەکانی کۆمەڵە کاری دەکرد، گوایە کەس نازانێ لە کۆنفراس خۆی ئاشکرا کرد لەلایەن ئەندامانی کۆنفراس بە چەپڵە رێزان پێشوازی لێکرا، رادەی وشیاری ئەندامی کۆنفراسی یەکەمی کۆمەڵە ئەوەندە نزم بوو ئەو جۆرە فرۆفێڵە هەڵی دەخەڵەتاندن!؟

کاك د. کەمال خۆشناو لە هەموو ئەو تێکۆشەرانە زیاتر دەنگی هێنا کە ساڵەها بوو کاریان بۆ کۆمەڵە دەکردو لەسەر کۆمەڵە توشی دەیان گیروگرفت ببوون .

ئەگەر کۆمەڵە خۆی بەهێز نەبوایە پێم وایە زۆر کەس نەدەبووە کۆمەڵە دەتوانم بڵێم دژایەتیشی دەکرد کەچی کۆمەڵە کە پەیڕەوی مارکسی - لینینی دەکرد جێگای هەموو کەسێکی لێ دەبۆوە لە ئاغاو دەرەبەگ بگرە تا مامۆستاو دکتۆرو ئەندازیارو خوێندکاری و جوتیارو کرێکار .... هتد.

کاك نەوشیروان هەرچەندە ئەندامی مەکتەبی سیاسی نەبوو بەڵام لەهەموو کۆبوونەوەکان بەشداری دەکردو سکرتێری کۆمەڵەو جێگری سکرتێری گشتی ( ی.ن.ك ) بوو، پاش ماوەیەك کاك سالارو مامۆستا جەعفەر هەردووکیان وازیان لە ئەندامی مەکتەبی سیاسی هێنا بڕوایان وابوو کە کارەکانیان مەیسەر نابێت .

بەرە بەرە ناکۆکیەکانی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە لایەكو بەرەی جود لە لایەکی تر توندو تیژتر دەبوو بەرەی جود پێك هاتبوو لە ( پارتی دیموکراتی کوردستان - حزبی شیوعی عێراق - حزبی سۆسیالیستی کوردستان ) هەر چەندە حزبی شیوعیو حزبی سۆسیالیست لە سوریا لەگەڵ ئەو بەرە فراوانەی عێراقیشدا بوون بەڵام بۆئەوەی باری کوردستان ئاڵۆز بکەن بەڕاستی دژی ی.ن.ك ئەو بەرەیان دامەزراند کە پاشان بووە هۆی شەڕێکی نابەرانبەر لە نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردستان کە دەیان رۆڵەی دڵسۆزو تێکۆشەرو ئازای میللەتەکەمان بە ناهەق شەهید کران و دوژمنی سەرەکی گەلی کورد فەرامۆش کرا .

# شەڕی براکوژی لە کوردستانی خوارو

پێنج ساڵ بوو شۆڕش لە کوردستان دەستی پێکردبۆوە دەیان جار هێزە سیاسیەکان بە چەك ڕێگای چارە سەرکردنی ناکۆکیەکانیان دەگرتەبەر، ئەو هەموو حزبە دەیویست بۆخۆی کوردستان پاوان بکات ڕێگا بەحزبەکەی تر نەدات چالاکی سیاسی‌و هەتا پێشمەرگەیش دژی ڕژێمی عێراق بکات، بەبێ ئەوەی هیچ ڕێککەوتن نامەیەك لە نێوانیان هەبێ کەلە هەل‌و مەرجی ئاوا دژواری کوردستان هەق وابوو بەرەی کوردستانی لە هەموو حزبەکان پێك بێت بۆئەوەی هێزو توانای کورد یەك بخرێت‌و بە گژ دوژمنی سەرەکی میللەتی کورددا بکرێت ، ئەو هەموو لێپرسراوانە کە زۆربەیان هەستیان بە لێپرسراوێتی نەدەکردهەر یەکە خۆی بە حاکمی ناوچەکە دەزانی ئەوەی تری بە میوان‌و بارگرانی دەزانی چۆن شەڕ نابێت ؟

وەرگرتنی باج و سەرانە لە جوتیارەکان، سزادانی خەڵك بەبێ هۆ، لێدان‌و کوشتن کاری ڕۆژانەی هەندێ لە لێپرسراوانی شۆڕش بەبێ جیاوازی، جوتیارەکان بۆ ڕزگارکردنی خۆیان بۆ پاراستنی کەرامەت‌و شەرەفیان، هانای دەبردە بەر ئەو حزبەی دەسەڵاتی زیاتر بوو لە ناوچەکە .

ڕاستە فرەحزبی دیاردەیەکی شارستانیە بەڵام دیاردەی فرە هێزی چەکداری دیاردەیەکی دزێو ناشرین‌و ترسناکە، ڕاستە فرەهێزی ڕێگای لە کاری خراپی لایەنێك دەگرێت چونکە ناتوانێ هەرچی بیەوێ بیکات لە هەمان کات دەبێ ئەو حزبانە لەناو بەرەیەك یەك بگرنەوەو ململانێ دروست لەنێوان خۆیاندا بکەن .

ناکۆکیەکانی هێزە سیاسیەکان کوردستانی خوارو لەسەر هەڵوێست لە ئێران، هەڵوێست لە حزبی دیموکراتی کوردستان‌و کۆمەڵە بوو، هەر لایەنێك بیرو بۆچوونی خۆی هەبوو، پێی لەسەر دادەگرت‌و لەسەری نەدەهاتە خوارێ تا وای لێهات شەڕ لە سەرانسەری کوردستان هەڵگیرسا .

# چۆن شەڕ دەستی پێکرد

سەرەتای مانگی ئاب کاک مەلا بەختیار بەهێزێکی گەورەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هاتە ناوچەی سلێمانی بۆ دۆڵی جافایەتی بۆئەوەی هێزەکە لە ناوچەکە جێگیر بکات، شەهید جەمال عەلی باپیر لەگەڵ ئەم هێزەدا بوو، هەرچەند بەفەرمی کاک جەمال لە فەرماندەی هەرێم لابرا بوو، نازانم هۆی چی بوو لەگەڵ هێزەکەدا بوو .

شەهید شێخ شێرکۆ عەلی، ئەندامی سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیستی کوردستان فەرماندەی پێشمەرگەکانی ناوچەی جافایەتی و مەرگە بارەگای لە ئەشکەوتێکی گوندی سێ کانیان دانابوو لە ئەنجامی دەعوەت و دۆستایەتی شەهید جەمال دەچێتە بارەگای حزبی سۆسیالیست لە سێ کانیان دەبێتە شەڕ کاک شێرکۆو کاک جەمال هەردووکیان شەهید دەکرێن، لەگەڵ دوانزە پێشمەرگەی تر (٨) هەشت پ.م/ ی (ی.ن.ك) و (٤) چوار پ.م/ ی حزبی سۆسیالیست لەوانە شەهید ئیسماعیل گەورە دێی کە پیاوێکی تێکۆشەرو دڵسۆزی میللەتەکەمان بوو، چەکی تەنیا بۆ بەرگری لە گەلەکەمان هەڵگرتبوو زۆر رقی لەو بەر بەرەکانیە دەبۆوە، شەڕی سێ کانیان بە چەندین جۆر باس و خواسی لێ دەکرا دوو رۆژ پاش ئەو شەڕە لەگەڵ کاک سەفین مەلا قەرە لە سەرکردایەتی دەگەڕاینەوە لە گوندی چالاوە تووشی هێزەکەی خۆمان بووین لە لایەن شەهید دڵشاد ( کادیرێکی پێشکەوتوو بوو ) بە درێژی بۆی گێڕاینەوە کە خۆی لە رووداوەکە ئامادەیی هەبوو زۆر پێی دڵگیر بووم . !؟.

● لەو شەڕە ناشەریفانە گەلی کورد چوارده رۆڵەی مەیدانی خەباتی لەدەست چوو وە دوو فەرماندەی لێ وەشاوەو ئازاو وشیاری لە دەستدا کە خوێنی ئەو شەهیدانە بووە ئاگرێك و دەیان رۆڵەی تری گەلەکەمانی بەناهەق سووتاند، بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو شکستە حزبی سۆسیالیستی کوردستان هێزێکی بە فەرماندەی کاک سەید کاکە ناردە ناوچەی جافایەتی لە چەندین شەڕو پێك دادان هێزەکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی پاشەکشە پێکرد بۆ دۆڵی سەفەرو زەروون، هێزێکی تری ی.ن.ك کە بە فەرماندەی کاک مستەفا چاوڕەش بە فریای هێزەکەی تر هات لە چەندین شەڕو لێك دان هێزەکەی (ح.س.ك) ی شکاندو پەراندیەوە بەری چیای کۆسرەت، لە بناری چیای کۆسرەت هێزەکەی (ح.س.ك) چەندین پێشمەرگەی (ی.ن.ك) ی

بریندار کردو پێشمەرگەیەکیش شەهید کرا، هەمان هێز پەڕیەوە ناوچەی خۆشناوەتیو چەندین کادیرو پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی چەك کرد .

هێزەکەی ئێمە کە لەلایەن هەڤاڵ شاخەوان سەرپەرشتی دەکرا لە دەشتی هەولێر پەڕینەوە بۆ دەشتی کۆیەو بناری چیای حاجی قەلا لەگەڵ هێزی کۆیە یەکمان گرتەوە دوو بارە هاتینەوە دەشتی هەولێر .

لە گوندی کانی ماران هێزەکەی ی.ن.ك ئێوارە لە کاتی نان خواردن ئابلوقەی هێزەکەی حزبی سۆسیالیستیدا پاش شەڕێکی کورت پێشمەرگەیەکی (حسك ) شەهید کراو چەندی تریشیان لێ بەدیل گیرا کە بە ڕیزەوە پاش ئەوەی چەکەکانیان لێ وەرگرتن بەرێ کران، ڕۆژی دواتر هێزەکەی (حسك ) لە نزیك گوندی میرکە لە بەستی شەرغە کەمینیان بۆ هەشت پێشمەرگەی ی.ن.ك دانا، پاش شەڕێکی کورت چوار پێشمەرگەیان بە برینداری بەدیل گرت چەکەکانیان بەتالان برد، بەڵێ تالان کردنی چەك ئەو وشەیە بۆ هەموو ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە کەوا دەکەن ڕۆژی دواتر بریندارەکانیان ئازاد کرد لەوانە کاك بەکرە قیتو کاك عەلی مەخموریو کاك مەلا برایم مەلا قەرە .

پاش ئەو ڕووداوانە دەمان ویست بپەڕینەوە دەشتی کۆیە لە نزیك گوندی شیواشۆك رادیۆکەم کردەوە دەگەڕام بزانم دنیا چ باسە، خستمە سەر ئیزگەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە پڕ قسەیەکم گوێ لێ بوو کە هەرگیز نەمدەویست گوێم لێ بێت ئەویش هەڵگیرسانی شەڕبوو لە نێوان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بەڕاستی تفم لە خەباتو تێکۆشانی خۆمان دەکرد باشە بۆچی کورد دەبێ ئەوها نەزانو بێ هۆش بێ لە بەرژەوەندی کێ ئەو هەموو شەڕە ؟.

سەرم بڵند دەکرد دەمووت هەقە جووتیارەکان یەك لەتە نانمان پێ نەدەن بەڵکو کورد کوژی وەك ئێمە لە برسان دەمرێو سەری میللەتەکمان ئارام دەبێت، حەیف و سەد مەخابن لەو شەڕو شۆڕە بێ سوودە بگرە دەیانو سەدان ڕۆڵەی ئازا خوێنیان ڕژا بێ ئەوەی هیچی لە جێگای شین بێتەوە لە هەموان خراپتر زۆر جار دیلەکانیش دەکوژران ..!؟ هەندێك لەو تێکۆشەرانەی کەبەیەکەوە بڵێسەی یەکەمی شۆڕشیان هەڵگیرساند لەناخۆشترین دۆخو کات بەیەکەوە بوون کەچی ئەمڕۆ بوونە دوژمنی یەکتری کە لە مێژ بوو ڕژێم ئاواتی بۆ دەخواستو مەبەستی بوو .

سەربازە هەڵاتووەکان کە تا دوێنێ بە جلو بەرگی (قوات خاصە) ڕاوە پێشمەرگەیان دەکرد، ئەمڕۆ لەترسی مردن بەناچاری هاتبوونە ڕیزی شۆڕش بۆئەوەی جێگای پاروی خۆیان خۆش

بکەنو سنگ دەرپەڕێننو خۆیان بەرنەپێشەوە، بە شەڕی برا کوژی رازی نەدەبوون بەڵکو پاکانەی شەڕی خۆ کوژیان دەکرد، گێلیەتیو نەفامیو نەزانی گەیشتبووە ڕادەیەك پیاو سەری سوڕدەما .

پێتان وانەبێ بەو قسانە خۆم لەو تاوانە دەرباز ئەکەم، نەخێر بەڵام دەبێ ئەو راستیە بڵێم کە پێشمەرگە بیت دەبێت فەرمان جێبەجێ بکەیت ..!؟

بەهەرحاڵ لە دەشتی کۆیە بەرەوخوار بووینەوە بۆ گوندەکانی سێوەسەنو شیواشان، قڵاز بەگیان، پاشان سەرکەوتینو پەڕینەوە بناری چیای کۆسرەت لەوێش پەڕینەوە چووینە خۆشناوەتی، لەگوندی بالیسان ماینەوەو خەوتین،کاتێك زانیمان وەك لێشاو بەو شەوە تاریکە پیاوەکانی سواراغا هاتن دەتووت بە دوای سەربازو پاسداردا دەگەڕێن ئەوەندە لە خۆیان بایبوون پیاو دەبوایە خۆیان لێ لابدا، کەسێك کە خەمی کوردی لە دڵدا نەبێ، چ باکی بە کوشتو بڕینە هەواڵیان داینێ کە کاك نەوشیروانو کاك سەید کەریم لە دۆڵی مەلەکانن بەیانی بەلاکە لاك کەوتینە ڕێ بە دەرەدار ئاودیوی مەلەکان بووین لەسەر چیا سەیرم کرد لە قۆپی جوانەگا شەڕە کورد بوو سەنگەر لەیەکتر گیرابوو هەر دەتووت جوانەگا شاری کەرکوکە دەبێ رزگار بکرێ

لەلای کاك نەوشیروان فەرمانمان وەرگرت ئێمە بووینە کەمین لە دەرەشێو دەرەزێوە شەڕ لەپشتی بلەی سەرو خواروو تا ڕۆژی دواتر شەڕ بەگەرمی بەردەوام بوو لە پاشان شکاو بڵاوەیان لێکرد، لەسەر لووتکەی کوڕەكو دارە وشك ئەفسەرەکانی عێراق قاقا بە شێتیەتی پێشمەرگەی کورد پێدەکەنین .

هێزێکی تری حزبی سۆسیالیست بە فەرماندەی کاك سەید کاکە بە هانای شەڕەکە هات لە گوندی خەتێ گەڕانەوە بۆ سەری هەورێ ڕۆژی دواتر هێزێکی ی . ن . ك بە فەرماندەی شەهید سەید کەریم هێرشیان بۆ کردن پاش چەند سەعاتێك شەڕ شکانو پاشەکشەیان کرد بۆ دۆڵی نازەنین لەوێ تەرمی کاك حەسەن وەرتێ بەجێ مابوو کە فەرماندەی کەرتی ح . س . ك بوو پیاوێکی زۆر ئازاو دلێر بوو دەیان شەڕی لەگەڵ ڕژێم کردبوو .

لە ١٩٨١/١٠/١٢ بڕیار درا کە هێزێك بنێردرێتە دەشتی هەولێر بۆڕاونانی پاشماوەی هێزەکانی نەیاری یەکێتی لە ١٩٨١/١٠/١٤ لەسەر ڕووباری کرۆژ خۆمان ڕێك دەخست هەندێك خەریکی جلو بەرگیان بوون بۆ شتن بارانێکی پاییزی بەتین باری شەوێ درەنگ خۆمان گەیاندە ڕەشماڵەکانی دۆڵە چەمۆلە لە نزیك گوندی قورتەلاسو کانی بی لە نزیك دێگەڵە لە ماڵی کاك تۆفیق مەنتك بووین زۆر رێزیان گرتین . بەیانی لە گوندی زیارەت بووبە شەڕ لەگەڵ

هێزێکی تری یەکێتی بە فەرماندەی سەید کەریم رژێم دەیزانی خەریکی یەکترین ویستی لەو هەلە زەبرێك بوەشێنێ بەراستی ئازایەتی سەید کەریمو پێشمەرگەکان پیلانەکەی دوژمنیان هەڵوەشاندەوە .

بە هانای شەڕەکە چووین ئێمەش توشی شەڕەکە بووین شەو لە زیارەت ماینەوە ، رۆژی دواتر بەرەو ولآتی کۆیە رۆیشتین کە لەناو هێزی پێشمەرگە بە دەشتی هەولێر بەناوبانگە دواتر بە گوندەکانی گۆمە شین ، شاخە پیسکە ، بانی ماران ، بەردبڕ ، بەلەمان ، میرکە ، نێرەگین ، بانە مورد دا رۆیشتین لەوێ بووین بە دوو بەش بەشێکمان چووینە جل بەسەر وە بەشەکەی تری بەرەو گوندی بەردە سپی لەوێ لەگەڵ پێشمەرگەکانی ح . س . ك توشی یەکتر بووین لە نزیك گوندی کانی سلێمانە شەڕ دەستی پێکرد ئەوان لای کەلی سوورو گردە بۆریان بەدەستەوە بوو تا تاریکایی داهات پێشمەرگەی کوردستان لە یەکتریان دا پاشان هەر کسە گەڕایەوە شوێنی خۆی ئەوان دەستیان کرد بە شەڕی پارتیزانی، چەند جارێکی تر لێك نزیك بووینەوە بەڵام خۆش بەختانە توشی یەکتر نەهاتین .

پێویستە بوترێ پاش شکانی حزبی سۆسیالیست لە شەڕی هەورێ شەهید عەولآ سور کە خۆی حەزی لە شەڕی براکوژی نەدەکرد داوای لە کاك سەید کاکە کرد کە بگەڕێتەوە سەرکردایەتی، کاك عەولآ سوور سەید کاکەی بە سەلامەتی گەیاندەوە سەرکردایەتی .

شەو بوو هەموومان لە گوندی گۆمەشین خەوتبووین، دەمانویست بەیانی زوو بپەڕینەوە چیای پیرەرو باوە قوب لە پڕ هەندێ قاچاخچی هاتن هەواڵی شەهید بوونی عەولآ سووریان راگەیاند لە دڵەوە پێم ناخۆش بوو نەمدەویست قسەکانی قاچاخچیەکانم گوێ لێبێت لێفەکەم بەسەری خۆمدا دەدا بەڵام هەواڵەکەی ئەوان راست بوو زۆر خەفەتبار بووم چونکە دەمزانی چەند ئەندامێکی بەکەڵك بوو بۆ میللەتەکەمان دەمزانی شەهید بوونی عەولآ سوور چەند ی لە دڵی ئاکۆیان دروست دەکا دەمزانی جووتیارەکانی ئاکۆو پشدەر چەند عەولآ سورێ خۆش دەوێت دەمزانی خەڵکی سماقوڵی چەند عەولآ سوور بە قارەمان دەزانن .

بەڵێ دەمزانی حکومەتی عێراق چەند رقی لە عەولآ سورە شەڕی سماقوڵی ساڵی ١٩٧٩ کە زیاتر لە حەفتا لاشەی ( قوات خاصە ) بەجێ مابوو، ئازایەتی ئەو پیاوە چاو نەترسە بوو، دەمزانی تازە عەولآ سوور رۆیشتو ناگەڕێتەوە نەدەبوایە عەولآ سوور لە دڵە رەقە شەهید بکرێ ، جێگای شەهید بوونی عەولآ سوور لەسەر ترۆپکی چیای حەمرین بوو ئەو رۆژەی کورد بەتەواوی بە ئاواتی خۆی دەگەیشت، بەڵام چی بکەین ( تجری الریاح بما لاتشتهی السفن ) لە

سماقوڵی گرتك لەگەڵ کاك سەید کریم یەکمان گرتەوە لەوێ لەگەڵ کاك شاخەوان لە یەکتر دڵگیر بووین رۆژی دواتر گەیشتینە نازەنین ئێزگەی پارتی هەواڵی گرتنی وەرتێ و دۆڵی خانەقاو چیای کاروخی لەلایەن پێشمەرگەکانی (جود) ەوە بلاوکردەوە ، بە دەیان پێشمەرگەی یەکێتیان لەوێ چەك کردبوو نامەی کاك نەوشیروان هات کە بگەینە دۆڵە رەقە پاش ماندوو بوون و شەوخوونی ١٥/١١/١٩٨١ گەیشتینە گولان لە ١٧/١١/١٩٨١ هێرشمان کردە سەر زینوی ئەستێرۆکان و لووتکەی هەڵە موندو کاروخ بەچەند هێرشێك پاش دوو رۆژ شەڕ لە ١٩/١١/١٩٨١ هێزەکانی جود کشانەوە پشت ئاشان و بۆ کریسکان و کونە کۆتر بەم جۆرە شەڕ کۆتایی هات پاش ئەوەی چەندین گفتوگۆ لە نێوان لایەنەکان کرا رێکەوتن لە نێوان یەکێتی و شیوعی و سۆسیالیست ئیمزا کرا ئێمەش تارۆژی ١/١/١٩٨٢ لە گوندی وەرتێ و سەرنەوس و رەژوکەریان و دەرگەڵە و خانەقا ماینەوە . بڕیار درا بکرێم بە فەرماندەی کەرتی سێی تیپی (٨٣) ی هەورێ کە کاك مولازم خولە سەرتیپ بوو، شەڕیش لە نێوان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستان بە گەرمی لەو دیو بەردەوام بوو لە شەڕی ئەوێش بەدەیان رۆڵەی کورد شەهید کران .

هێزەکانی (ی.ن.ك) و (ح.ش.ع) و (پ.د.ك) و پاسۆك و (ح.س.ك) حزبی دیموکراتی ئێران و کۆمەڵەی ئاستەنگکێشانی کوردستان لە ماوەی (٥) مانگ هەر خەریکی شەڕی براکوژی بوون لە چەند شوێنێکی جیا جیا نەبێت ئەگینا هیچ شەڕ لەگەڵ رژێم نەکرا لەکاتێکدا کە دوژمنی سەرەکی گەلی کورد لە دۆخێکی زۆر ناخۆش دابوو لەرزۆك و بودەڵە ببوو توشی شەڕێکی قورسی گران ببوو .

گومانت نەبێ حزبەکان بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەنە شەڕەکە هەریەکیان ئەوی تری تاوانبار دەکرد بەرەی جود یەکێتی تاوانبار دەکرد کە گوایە بە فیتی رژێمی عێراق ئەو شەڕە دەکات زۆر جار پڕوپاگەندەیان دەکرد گوایە چەك و تەقەمەنی لە رژێم وەردەگرن بۆ مێژوو دەڵێم ئەو شەڕانە هیچیان بە چەك و فیشەکی رژێم نەکراوە خۆ ئەگەر وتو وێژیش هەبووبێ ئەوە شتێکی سروشتیە بەڵام نابێ بڵێین ئەو شەڕانەی لە سەرەوە باسمان کرد بە فیتی رژێم کرابێ .

نایەکسانی و ناهەقی ئەو شەڕانە بەوە پێنە ناکرێ یەکێك ئەوی تر تاوانبار بکات لە پەنا هەر پەردەیەك بێت وەهەر بیانویەك بێ شەڕی برا کوژی حەرامەو نابێ بکرێ ، لەو هەموو شەڕانە راستە بە رواڵەت هێزێك هێزێکی شکاندوە کەچی ئەو جۆرە شەڕانە سەرکەوتوو و ژێرکەوتووی

نییه هەموو هێزەکان ژێرکەوتن چونکە مافی ئێمە داگیرکەرانی کوردستان زەوتیان کردوە هەر دەبێ لەوانی وەریگرینەوە .

نابێ ئەوەندە بیر تەسک‌و کورت بین بین کە نابێ هیچ ناکۆکی لە نێوان حزبەکان هەبێ ، دەبێ لەناوچە جیا جیاکان چەند مەفرەزەیەك توشی شەڕ بن لەگەڵ یەکتر بەڵام بڕیاردانی شەڕ لەسەر یەکتر کارێکی ناڕەوایە بەناچاری دەڵێم: ( التكرار قبيح ولو كان مليحا ) .



# شەڕی سێکانی

هـاوین‌و پـاییزی ١٩٨١ شـەڕی براکـوژی سەرانسـەری کوردسـتانی گرتبـۆوە، بـە دەیـان پێشمەرگەو کادیری لێوەشاوەو دڵسۆزو ئازا بوونە قوربانی ئەو شەڕە ناهەقە .

لە سەرەتای پاییز بە هەوڵ‌و تەقەللای هەموو لایەك شەڕ ڕاگیرا ڕێك کەوتن نامەیەکی لاوازو بێ بڕوا لە لایەن هێزە سیاسیەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان مـۆر کـرا، هێزەکـانی یـەکێتی نزیکەی چل ڕۆژ لە دۆڵی خانەقاو وەرتێ‌و دەرگەڵە مایەوە، سێ ژەمە ئـەو هـەموو پێشمەرگەیە بەسەر ماڵە جووتیارەکاندا دابەش دەبوون لـە دەمـی مـاڵ‌و منـاڵی ئـەو هەژارانـە خـواردن کـەم دەکرایەوە .

خەڵکی وەرتێ‌و دۆڵی خانەقا هەژارن، جووتیارەکـان زۆربـەیان بـێ زەویـن، ئەوەنـدەی هەشـە بەشی ئەو خەڵکەی نەدەکرد ژن‌و پیاویان لەگەڵ زەردەی ڕۆژهەڵات دەچوونە شاخ و کوێستانەکان بۆ دابین کردنی ژیـانی ڕۆژانـەیان بۆیـە دەبوایـە هێـزی پێشـمەرگە ڕەچـاوی بـاری ئـابووری ئـەو خەڵکەی بکردایە، سەرەڕای ئەوەش خەڵکمان وەڕس کرد ناکرێ بڵـێین ئـەو هـەموو پێشمەرگەیە هیچ هەڵسوکەوتی خراپیان نەکردوە بەڵکو دەبێ نەیشارینەوە کاری خراپیش کراوە .

لە ١٩٨٢/١/١ هەموو دنیا ئاهەنگی دەگێڕا بە بۆنەی ساڵی تازە لەو کاتەی لاوانـی دنیـا شانازیان بە وڵاتی خۆیان دەکرد، لەو ڕۆژە ئێمەش بە دڵێکی پـڕ لـە هیـواو ئـاوات، بـە ئـاواتی ئەوەی کورد لەسەر دەستی تێکۆشەرانی ئازادی بە دەست بێنێ، بـەو زسـتانە دژوارە بـەفر هـەتا ئەژنۆ باریبوو، بە ئاستەنگ ڕێگا بە هەموو کەسێك دەبـڕا، دەبوایـە چـەند پێشـمەرگەیەك پـێش بکەون تا بەفرەکە دەشکێنن چونکە(کوتەك) نەبوو ، کەوتینە ڕێگا بەرەو ناوچـەکانی بالیسـان، دەشتی هەولێر، گەڕاینەوە بە ڕێگای سەران کۆلانی گادەرو دەرەشێر بەرەوخوار بوینەوە بۆ دۆڵی بالیسان دیسان لەناو خەڵك دەستمان کردەوە بە لۆمەو گازاندە لە یەکتر (ح.س.ك ) و (ح.ش.ع) یش بە گوێرەی ڕێککەوتن نامەکە گەڕانەوە ناوچەکانیان ڕاستە شەڕ لە نێوانمان نەمابوو، ڕاسـتە ڕێك کەوتبووین، بەڵام خوێنمان لـە نـاو ڕژابـوو هێشـتا هەنـدێ برادەرمـان ریشـی نەتاشـیبوو، هێشتا خوێنی شەهیدەکان هەر تەڕ بوو، ناهەق نەبوو لێك دڕ دەنگ بین، هات‌وچۆی یـەکترمان نەدەکرد بەیەکەوە لە گونـدێك نەدەمایـنەوە هـەر لایـەك لایەکـەی تـری پـێ دڕنـدەو ناهـەق بـوو ئەوەنـدە زەم‌و باسـی یـەکترمان کردبـوو زۆرجـار شـەڕمان دەکـرد لـەلای لادێیـەکان بەیەکـەوە ڕابوەستین ئەو لێك تێنەگەیشتنەش ڕۆڵی هەبوو لە گەرم کردنـی ناکۆکیـەکان چـونکە لەپاشـان

ساخ بۆوە کە هەندێ لەو برادەرانەی بە دڕندە یا بە خراپ باس دەکرا لە نزیکەوە روون بۆوە کە پیاوی چاکو تێکۆشەرە .

لەو گەشتەی خۆمان بۆناوچەی بالیسانو دۆڵی نازەنینو سماقوڵیو دەشتی هەولێر دەیان گوندمان بەسەر کردەوە کۆڕو کۆبونەوەمان بەست رووداوە تازەکانمان بە خەڵك راگەیاند خەڵك زۆر پێخۆش حاڵبوو کە دەستمان لە شەڕی براکوژی هەڵگرت، بەڕاستی جووتیارەکان لەگەڵ پێشمەرگە دەژیانو لە خۆشیو ناخۆشی لەگەڵ ئێمەبوون، ئەوان دەیانزانی چەند بەڕەزالەت ئەو شۆڕشە هەڵگیرساوەتەوە، بەگشتی شەڕی براکوژیان تاوانبار دەکرد هەردەم دەیانگوت نابێ ئەو شەڕە بکەن تەنیا چەند کەسانێکی خاوەن بەرژەوەندو خۆبەرەپێشو ناکورد نەبێ کە ئاگرەکەیان خۆش دەکرد ئەگینا بەگشتی خەڵك لەگەڵ تەبایيو برایەتيو هاوکاری نێوان هێزەکان دابووە .

بەیانی بوو تازە زەردە لە (کۆتانەکانی)دەوروو پشتی گوندی ئۆمەر گومبەتی دەدا، تازە لالە حەمەو ئەحمەو مەڕیان ئاودێوی لولەکانی پشت ماڵان کردبوو هاژەی تەقەو گرمەی ئارپیجی هەموو خەڵکی (قوراغ) کردبوو لەولا خەڵك کۆمەڵەی دەکردوو حەزی دەکرد زوو خەبەری تەقە بزانێ

ئۆمەر گومبەت گوندێکە دەکەوێتە سەر رووباری کۆیە ( ١٥ ) کم لە تەق تەق دورە، خەڵکەکە بە زمانی دەربەندی قسە دەکەن جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ شێوەی خۆمان بە کچ دەڵێن ( دۆتە ) بە خاڵ دەڵێن ( لالە ) ئەگەر یەکێك زۆر لەناویان نەژی لە زمانیان تێ ناگات (٢٥٠) دوو سەدو پەنجا خێزانی لێ دەژی، زۆر کاسبو ماڵداری کەرن لە کوردستان مەگەر هەورامیەکان ئەگینا کەس نیە لە ئیشو کار خۆیان لە قەرە بدات، هەموویان خزمی نزیکی یەکترن، زۆر ڕێز لە ئایینی موسڵمان دەگرنو ژنو پیاو و منااڵیان نوێژ کەر بوون، مەلاو شێخ لەلای ئەوان بە شتێکی پیرۆزی دەزانن، بە کشتو کاڵو مەڕداری خەریکن زۆربەی هەرە زۆریان نەخوێندەوارن، دابو نەریتی تایبەتی خۆیان هەیە لە جەژندا لە مزگەوت گۆشت دابەش دەکەن ئەگەر پیاوێك مانگایەك سەر ببڕێ وەکو خەڵکی بە گوێرەی دانیشتوانی خۆی بەشی خۆی وەردەگرێ، بە دەگمەن جاسوسو جاشو نۆکەری ڕژێمیان تێدا بووە، لەگەڵ گوندی سێ گرد کان خزمایەتی نزیکیان هەیە .

ئێمە کۆبوونەوە نزیکەی حەفتا پێشمەرگە دەبووین هێزی دەشتی هەولێرو هێزی خۆشناوەتی، ئەو کات لە ت ٨٣ ی هەوری فەرماندەی کەرت بووم، بەرەو لای تەقە ڕۆیشتین لەسەر گردو بەرزاییەکان هەستمان رادەگرت دەمانزانی لەگەڵ سۆسیالیست یان شیوعی شەڕە

چونکە ئەوانەی جەماعەتی یەکێتی بوون لەگەڵ خۆمان بوون، پاش دوو کاتژمێر نزیک شەڕەکە بووینەوەو بووین بە دوو قۆڵ : قۆڵێك بەرەو سێ گردکان ئەوی تریش بەرەو سێ کانی دوژمن دەیویست لە حزبی شیوعی بدات لە گوندی سێ کانی شەڕ بەگەرمی بەردەوام بوو، مدەرەعەکان نزیکی گوندەکە ببوون، ئێمە لە خوارەوە هێرشمان کرد چەند مەترێك مابوو بگەینە ناو گوندەکە هێرشیان کرد لەوێ بۆ یەکەم جار پاش ئەو هەموو کارەساتە دڵ تەزێنە پێشمەرگەی هەموو لایەنەکان بەیەکەوە مەردانە شەڕیان لەگەڵ دوژمن دەکرد، چەند ڕۆژێکی خۆش بوو، چەند شیرینە کورد هەموو بەیەکەوە تۆڵەی هەزار ساڵەی نا هەقی لە دوژمن بکاتەوە، کاتژمێر بوو بە (١٢)ی نیوەڕۆ ڕۆژی ١٩٨٢/١/٢٧ لە پڕ حەوت هەلیکۆپتەر دەرکەوتن ئێمە هەموومان لە گۆڕەپانێك بووین، بەردێك نەبوو خۆمانی لێ حەشار بدەین، لە پشتی پێشمەرگەوە دوژمن جاش‌و (قوات خاصە) ی دابەزاند بەرەی شەڕ فراوان بوو، بوو بە تەقەیەکی یەکجار زۆر، چونکە پێشتر (تنسیق) مان نەکردبوو، هێزەکە پچڕ پچڕ بوو نەمانتوانی کۆنترۆڵی شەڕەکە بکەین هەر لایەنێك زۆر بە ناڕێك‌و پێکی کشایەوە شەڕ تائێوارە بە گەرمی بەردەوام بوو، ئێوارە باران وردە وردە لەسەرخۆ دەباری، دنیا ببوو بە قوڕو چڵپاو هەوری ڕەش دنیای تاریك کرد، چاو چاوی نەدەبینی، لێك دابڕاین هەندێکمان بەیانیش نانمان نەخواردبوو برسیەتی‌و ماندوو بوون هەموانی هیلاك کرد، شەو درەنگ یەکتریمان دۆزیەوە، هەرچەندە لەناو جەماوەری گەلەکەمان سەدای زۆر باشی هەبوو زۆر جێگای دڵخۆشی خەڵك‌و پێشمەرگە بوو کەچی جێگای داخە لەو شەڕەدا (١٣) ڕۆڵەی تێکۆشەری گەلەکەمان شەهید بوون کە زۆربەی هەرە زۆریان لە حزبی شیوعی عێراقی بوون‌و چەندین تێکۆشەریش برینداربوون، شەڕەکەمان کرد، ئینجا زانیمان برادەرانی سۆشیالیست دوو خەبیری فەڕەنسیان لە قەرەچوغ بارمتە کردبوو کە لەلایەن هەڤاڵان غەفور ئەحمەد غەزال‌و کاك سەید عەبدوڵا ئەنجام درابوو ڕژێم بەو کارە زۆر نارەحەت بوو دەیزانی حەیای پێدەچێت یەك هەفتە زیاتر دوژمن لە ناوچەکە مایەوە بە دەیان سەربازیان لە لافاوی بەستی شەرغە خنکاو چەندین پارچە چەکی بە ئاودا ڕۆیشت، شەڕی سێ کانیان لاپەڕەیەکی تازەی لە پەیوەندی ناو هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان کردەوە .

لە زستانی ١٩٨٢ کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بڕیاریدا کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێر دابمەزرێنێ لە هەڤاڵان دکتۆر کەمال خۆشناو و کاك سەید مەجیدو بەڕێز مامۆستا نازم، هەر چەند سەید کەریم هیچ لێپرسراوی ئەو ڕێکخستنە نەبوو بەڵام کاك

نەوشیروان بەنامەیەکی فەرمی ئەو کۆمیتەی ئاگادار کردەوە لە کاتی شەڕو شۆڕ کاک سەید کەریم دەبێتە لێپرسراوی هێزەکان کەچی کاك سەید مەجید دانرا بوو بە لێپرسراوی سەربازی !؟

لەسەرەتای بەهاری هەمان ساڵ کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێر داوای کۆبونەوەی سەر تیپەکانو لێپرسراوانی ڕێکخستنی کرد هەمومان بەڕێ کەوتین لە ١٩٨٢/٣/٦ گەیشتینە (وەرتێ) بارەگای کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێر، لەوێ چاوم بە برادەران کەوتو لەگەڵ هەڤاڵ سەید کەریم باسی بارو دۆخی گشتیمان کرد

لەوێش ململانێی نادروست دەستی پێکرد دیسان هەر ڕێکخراوێك دەیویست لە پێکهاتنی تازە دۆستو برادەری خۆی دابنێت بێئەوەی گوێ بداتە دڵسۆزیو لێوەشاوەییو کەسی شیاو .

لە یەکەم ڕۆژی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناکۆکی لەناو خودی ئەندامەکانی دەستی پێکردو بەرە بەرە بووە جێگای ڕەخنەو ڕەخنەکاری، بەربوونە گیانی یەکتر لەبەر گلەییو گازندەی ناو خۆیان کارە سەرەکیەکەی خۆیان لەبیرکرد ئەویش سەرپەرشتی هێزەکانو ڕێکخستنەکانو سەرپەرشتی ناوچەکە بوو، تاوای لێهات هەریەکەیان بوون بە لیپرسراوی مەفرەزەکەی خۆیانو لە کونجی خانوەکەی خۆیان پرتەو بۆڵەیان دەهات .

لە ١٨ و ١٩٨٢/٣/١٩ هێزەکانی ئێران هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر هێزەکانی عێراقیو لە ناوچەکانی (شۆش و دیزەفول) بەماوەیەکی کەم سوپای عێراقیان لەو ناوچە گرنگە دەرپەڕاند زیاتر لە(١٩) هەزار کەسیان لە هێزەکانی عێراق بەدیل گرتو بە هەزارانیشیان لێ کوشتنو بریندار کردن لە ١٩٨٢/٣/٢١ گەیشتینە دۆڵی بالیسان زۆربەی برادەران بۆچونیان وابوو ئەم جارە سەدام حوسێن دەڕووخێو ناتوانێ خۆی بگرێتەوە، ئێرانیش عێراق دەگرێت ..! هەندێك لە برادەران زۆر پەلەیان دەکرد گوایە ئەگەر زوو نەگەڕێینەوە نزیك هەولێر ئەوا دۆخەکەمان لەناو دەچێت بە بڕوای ئەو برادەرانە سوپای عێراقیش لە هەولێر تەسلیم دەبێ ..! ئەو کات بۆچونی خۆم بە برادەران ووت وە بڕوام وابوو سەدام بەو هێرشانەی ئێران ناڕووخێ چونکە باری نێو دەوڵەتانو کەنداو ڕێگای لە ئێرانیەکان دەگرت، نەك هەر بڕوام بەقسەی برادەرەکانم نەبوو بەڵکو گاڵتەشم بەو بۆچوونانە دەهات ..!

لە سەرانسەری کوردستان پێشمەرگە کەوتنە چالاکی نواندن دژی هێزەکانی دوژمن لەهەندێ شوێن هێزەکانی عێراق لەرووی تەقەمەنی تووشی کەمو کوڕی ببوون، سەرەڕای ئەو شکستە گەورەی هێزەکانی عێراق لە بەرەکانی شەڕ لەگەڵ ئێران، سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هیچ

هەنگاوێکی بە کردەوەی نەنا بۆئەوەی هێزی پێشمەرگە بە یەکگرتوویی ناوچەیەك لە کوردستان رزگار بکات .

لە ٢٤/٤/١٩٨٢ بە بۆنەی یادی بۆردمانی شاری قەلآدزێ، ١٩٧٤ کە فڕۆکەکانی رژێمی بەعس بە سەدان کەسیان کوشت‌و بە سەدانیان برینـدار کـرد خـەلکی قـەلآدزە دەسـتیان بـە خۆپیشاندان کرد ئەو تروسکەیە زۆربەی کوردستانی گرتەوە بە تایبەتی ناوچەکانی (سۆران) ئەو شۆڕشـە نوێیـە بـەرە بـەرە بلێسـەی سـەند رانیـەو چـوار قوڕنـەو سـلێمانی‌و کۆیـەو لـە پاشـان هەولێریشی گرتەوە ئاگری ئەو شۆڕشە دوژمنی هێنایە هەژان .

یەکێتی نیشتمانی کوردستان رۆلی کاریگەری هەبوو لـە هەلگیرسـاندن‌و پشـتگیری کردنـی خۆ پیشاندانەکان، ئیزگـەی گـەلی کوردسـتان کـە ئەوسـا بـە ئیزگـەی دەنگـی شۆڕشـی عێـراق ناسرابوو بە قسەو وتارە بە نرخەکانی خەلکی جۆش دەدا وە هـەر بـە ئیزگـە یـەکێتی نیشـتمانی کوردستان رێ و شوێنی بۆ خۆپیشاندەرەکان دیاری دەکرد، هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش بەو هێزو توانایەی لەبەر دەستی دابوو هەمووی لە خزمەت جەماوەری شارەکان دانا، هێزەکەی ئێمە لەگەلّ تیپی دەشتی هەولێر بۆ پشتگیری خەلکی هەولێر چوونە ناو شارو ئومێدی زۆریان خستە دلّ و دەروونی خەلك، هەروەها دوو جاریش چوونیە ناو شاری کۆیە .

داخەکەم ئەو خۆپیشان دانە پڕ واتایە زۆری نەخایاند دوژمـن بـە ئـاگرو ئاسـن بـێ بەزەییانـە خامۆشـی کـرد، وە یـەکێك لـە هەلـەکانی خۆپیشـاندانەکە هـەموو چـین‌و توێـژەکانی گـەلی نەگرتبۆوەو یەك سەرکردایەتی رێك‌و پێکی نـەبوو، خوێنـدکارە تێکۆشـەرەکان رۆلێکـی دیـاری گرنگیان هەبوو وە چەندین خوێندکاری تووشی راونان‌و گرتن بـوون‌و دوارِۆژیـان لەدەسـتدا ئـەو خوێندکارە هەژارانە بە هۆی ئەوەی دژی رژێم بـوون نـەیان تـوانی کۆلێـژی خۆیـان تـەواو بکـەن کەوتنە سەر ساجی عەلی وەکو پێشمەرگە دێرینەکانیان لێهات بێ بڕوانامەی بەرز مانەوە ئێستا دەبێ چاویان لە دەستی ئەوانە بێت کە رازی بوون بە سیاسەتی رژێم‌و توانیان خوێنـدنیان تـەواو بکەن .

بەهەرحالّ ئەو هەلە دێرینەش لە دەسـت درا وەکـو پێویسـت سـوودی لێ وەرنـەگیرا جارێکی تریش دەنگی زولالّی گەلی کورد گوێی لێ نەگیرا دەولەتـە مـرۆڤ پەرسـتەکان لەبـەر بەرژەوەنـدی خۆیان کورد کوشتنیان حەلال کردبوو .

ئەگەر ئەو شۆڕشە نوێیە خۆی لەسەر پێ رابگرتایەو درێژەی بـەکارەکانی خـۆی بدایـە رەنـگ بوو بلێسەی گەورەتر دەبوو پریشکی دەپەڕاندە ناوەراسـت‌و خـواروی عێـراق ئـەو کـات دەبـووە

باسێکی تر، له وێدا برایەتیو هاوکاری عەرەبو کورد بەتێن دەبوو حکومەتی عێراق دەستی له زۆرکاری نارەوا هەڵدەگرت نەیدەتوانی وابەئاسانی بکەوێتە گیانی خەڵك چی بیەوێ بیکات .

میللەتی عێراق له دۆخێکی ئابوری ناخۆش دەژیا، بێ کاری سەرانسەری عێراقی گرتبـوو، دەسەڵاتدارانی رژێم له دزین و بەرتیل خۆری و بێ رەوشتی لەو پەری دابـوون رۆڵـەکانی عێـراق رۆژانه له بەرەکانی شەڕ دەکوژران، کۆمپانیاکان زۆربـەیان لەکارکـەوتبوون، بـەڵام یـەك کـەلێن هەبوو ئەویش یەك نەبوونی بەرهەڵستکاری عێراقی لەناو بەرەیەکی بەرفراوانی یەکگرتوودا، بـە تایبەتی کوردەکان له جیاتی ئەوەی هەموو هێزو توانایـان بخەنـە گـەڕ بـۆ لـەناو بردنـی رژێمـی عێراق بە پێچەوانەوە هێزو توانای خۆیان دژی یەکتر بەکار دەهێنا ئەو هەموو خەڵکە لـە خـۆڕاو سەربەخۆ یەك ناگرێ دەبێ هێزە سیاسیەکان یەکیان بخەن و هانیان بدەن و پێشڕەویان بکەن هەر راپەرینو خۆپیشاندانو مانگرتنێك ناوچەیەکی بچوك بگرێتەوە دوژمن دەتـوانێ هـەر بـەزوویی تێکی بشکێنێ و سەرکوتی بکات .

بەهاری ۱۹۸۲ هەمووی بەزەرەری رژێمی عێراق بـوو لـە مایسـی ۱۹۸۲ ئێـران هێرشـێکی تری بەرفراوانی کردە سەر ناوچەی ستراتیژی محمرە ( خرمشهر ) و عەبادانو بەچـەند هێرشـێکی یەك لەدوایەك هێزەکانی عێراقـی تـەفروتونا کـردو گەڕاندیـەوە سـەر سـنووری دەولی لـە نزیـك بەسرە، شاری (محمرە) کە عێـراق زۆر شـانازی پێـوە دەکـرد ئـازادی کـرد دەتـوانم بلـێم داگـیری کردەوە محمرە شارێکی عەرەبیە رضا پەهلەوی لە نیسـانی ۱۹٦۲ نیزامـی فارسـی بـە یـەکجاری لەسەر چەسپاندن پاش ئەوەی شێخ خزعل لەتاران دەست بەسەر کرا. لەو شـەڕە گـەورەیـە عێـراق دیسان (۱۸) هەزار سەربازی بەدیل گیرا بە هەزارانیش کوژرانو لە ئاوی شط العرب خنکـان وە بە هـەزارانیش بریـندار بـوون، بـەو دوو هێرشـەی ئێـران سـوپای عێـراق شـپرزە بـوو، شـیرازەی تێکچوو، فرقەو لیواو فەوجەکانی هەڵوەشانەوە، هێزەکانی ( محمد القاسم ) کە بە فرقـەی پێـنج دەوترێ دەوریان هەبوو لەو شەڕە، عێراق پاش ئـەو شـەڕە چـەندین فەرمانـدەو سـەرکردەی ئـازاو شارەزای سوپای کوشتو لەوانە عمید رکن ( جواد اسعد شیتنەیی ) پاش ئەو شکستە عێراق لە هەوڵێك دەگـەڕا بیانوێـك بدۆزێتـەوە لـەناو خـاکی ئێـران بەتـەواوی بکشـێتەوە چـونکە هێشـتا لەهەندێ شـوێن سـوپای عێـراق لـەناو خـاکی ئێـران دابـوو، لـە حوزەیرانی ۱۹۸۲ هێزەکـانی ئیسرائیل لە پشتیوانی حزبی کەتائیبی لوبنانی بە سەرۆکایەتی ( بیرجیـل ) هاتـە نـاو خـاکی لوبنانو شەڕ دەستی پێکرد لەگەڵ فەڵەستینیەکان تا وای لێهات سوپای ئیسرائیل (رۆژهەڵاتی بـەیروتی) گـرت رۆژانـەش بـە دەیـان فڕۆکـەو تـۆپ و سـاروخ لـە خۆرئـاوای بـەیروتی دەدا کـە

فەڵستینیەکان ئەو شوێنەیان لەدەست بوو، ڕێکخراوی ئازادی خوازی فەڵستین بەڕاستی بوونە نموونەی خۆڕاگریو ئازادی چەندین مانگ خۆیان ڕاگرتو بە هەزارانیان لێ شەهید کرا بەبێ ئەوەی یەك وڵاتی عەرەبی کە زۆرجار زمان درێژی دەکەنو بۆ فەڵستین دەگریان یەك سەرباز بنێرنە هانایان .

هێزەکانی سوریا لە کاتێك وەك دڕندە بە گژ فەڵستینو لوبنانیەکاندا دەهاتەوە بە مەلوولی بە ئاڵای سپی لوبنانیان جێ هێشت پێشمەرگەی فەڵستینو لوبنانیەکان بێ پشتو پەنا هێشتەوە، یاسر عەرەفات خۆی سەرپەرشتی شەڕەکەی ناو بەیروتی دەکرد، سۆڤیەتیەکان خوا جەزای خۆی لێ وەرگرتنەوە لەو دۆخە ئاستەمەدا خۆیان لە گێلیدا (لە سەبراو شاتیلا) دوو ئوردوگای ئاوارەکانی فەڵستینیەکان هەبوو، سوپای ئیسرائیل بە فەرمانی (ارئیل شارون) بەهاوکاری بەشیر جمیل کوڕی (بیر جمیل) هەزاران ژن و منداڵ و پیاوی فەڵستینیەکانیان کوشتو بێ ڕێزییان پێکردن، مافی مرۆڤ لە مێشکی دەوڵەتە گەورەکان ڕەش کرابۆوە ..!؟ .

ئێران خۆی بە میرات گری پێغەمبەرانی ئیسلام دەزانی بە قسە زۆر دژی ئەو شەڕە بوو دەیفەرموو: ڕێگام نییە ئەگینا قودس ئازاد دەکەم. عێراق بەو بیانووە هێزەکانی کێشایەوە داوای لە ئێران کرد ئەگەر شەڕ ڕابگرێ ئەوا ڕێگای دەدرێ بچێت، ئێران قسەی عێراقی بە ژانەسەر ئەزانی ئەویش لەهەل دەگەڕا وای دەزانی دنیا هەمووی بە شەڕی بەیروت خەریکە ئەویش لەو پەنایە عێراق داگیر دەکات لە کەربەلا دەچێتە عەمانو لەوێش قودس دەرگای کراوەیە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان تاکو١٩٨٢/٧/٣١ پێنج هێرشی گەورەو خوێناوی کردە سەر ڕۆژهەڵاتی بەسرە لە هیچیان سەرکەوتوو نەبوو شکستی گەورەی خوارد لەوێ عێراق چەکی کیمیاوی بەکارهێنا هەرچەندە هەندێ (فلتە فلت) لە ئێزگەکانی ڕۆژئاوا کرا بەڵام بلقی سەر ئاو بوو، ئێران لە گێلیەتی نەکەوت دەبوایە ڕۆژی تێبگات لە دنیا چ باسە، داگیرکردنی عێراق وڵاتێکی ئاوا بەخێرو بەرەکەتو پڕ نەوتو ئاو لەسەر لێواری کەنداو، داگیرکردنی وائاسان نییە بۆ وڵاتێکی وەکو ئێران، بەتایبەتیش مەلاکانی ئێران، سعودیە، کوێتو میسرو دەوڵەتانی تری عەرەبی چۆن ڕازی دەبن ئیسلامیەکان وابەئاسانی بێنە سەر ملیان .

بەدیل گرتنی نزیکەی چل هەزار سەرباز بە سێ چوار مانگ، کوشتنی هەزارانی ترو برینداربوونی هەزاران، تێکشکاندنی سەدان دەبابەو گرتنی سەدانی تر، تێکشکاندنی تۆپو ئوتومبیلو کەرەستەکانی ڕژێمی عێراق دەبوایە: بەرهەڵستکارانی عێراقی دژی بوەستانایەتەوەو سوودیان وەربگرتایە کەچی ناوخۆی عێراق بەتایبەتی شاری بەغدا شەڕی پێوە

دیارنەبوو، یەك كەس نەبوو قسە بكات، لەو كاتەوە عێراق بەرەو بەهێزی دەڕۆیشت تا وای لێهات كۆنترۆڵی هەموو عێراقی گرتەوە دەست . لە بیرمە لەو رۆژانە لەگەڵ سەید كەریم بووم بەووردی بە دوای دەنگ‌و باسی شەڕەكانەوە بووین دیسان هەندێك برادەر هەوای شەڕی محەرەو رۆژهەڵاتی بەسرە لەسەری دان دەستیان كرد بە لێك دانەوەی رووخانی سەدام حوسێن . لەهەموان سەیرتر زۆرجار ئێران لە ژێر زەمانەوە دەیووت: بابە لەشەڕەكە شكام برادەرانی خۆمان نەیاندەویست دوژمنەكەی خۆمان بناسین دەیانووت: نەخێر عێراق شكاوە، باشە ئەگەر كادیرو سەركردە زانیاری تەواوی لەسەر ئەو جۆرە شەڕانە وەزنەگرێ‌و ئەنجامەكەی نەزانێ دەباشە كاری چییە؟ بۆچی كادیرە..!؟ لێكدانەوەی زانستی زۆر پێویست‌و گرنگە چونكە دوژمنەكەت ئەگیناسی دەتوانی بەو شێوە مامەڵەی لەگەڵ بكەی بە پێچەوانەوە لێكدانەوەی (نا مەنتقی) هەموو كارەكانت لێ تێك دەدا ..!؟

## کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە

لەو دۆخە لەبارەی رەخسابوو، بزووتنەوەی کوردایەتی نەیدەتوانی سوودی لێوەربگرێت، کۆمەڵە بەهێزترین رێکخراو بوو لەناو کوردستان، رێکخستنەکانی زۆر بەهێز بوو لە شارەکان، پێشمەرگەی لاو بە بیرو باوەڕ بە بیروڕای کۆمەڵە خۆی پەروەردە دەکرد کەچی کۆمەڵە لەناو سەرکردایەتی تووشی تەنگو چەڵەمەی گەورە بوو، بیروڕای عێراقچییەتی رۆژ بەڕۆژ لە گەشەکردندا بوو، ناکۆکی تاکو کەسی دۆخەکەی ئاڵۆز دەکرد، سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانو کۆمەڵە ئەوەندە سەرقاڵی گێوگرفتەکانی ناوخۆ ببوون، ئەوەندە بەتەنگ دوژمنی سەرەکی نەبوون. بۆیە بڕیاردرا کۆنفراسی کۆمەڵە ببەسترێت بۆ یەکلا کردنەوەی ئەو کێشانەو پێداچوونەوەی کارەکانی ساڵی رابردوو، وەئاراو بۆچون وەرگتن لەسەر گفتوگۆ کردن لەگەڵ میری. من ئەندامی کۆنفراسەکە نەبووم لە بنچینەدا خۆم هەڵنەبژارد، بەڵام بەنامەیەك بۆچونی خۆم پێشکەش کرد بە برادەران چونکە ئەو کات لە قەڵاسنجی سەرەوە بووین لەگەڵ شەهید سەید کەریم .

کۆنفراس لە خڕی ناوزەنگ بەسترا کێشەو گێوگرفت لە نێوان هەڤاڵان دروست بوو، ئەو جارەش کۆمەڵە بە ئاشتی لە مەترسی دوو بەرەکی رزگاری بوو توانی سەرکردایەتی تازە بۆ کۆمەڵە هەڵبژێرێتەوە لەم هاورێیانە:

١. کاك نەوشیروان مستەفا - سکرتێری گشتی .
٢. کاك فەرەیدون عەبدولقادر .
٣. کاك ملازم عومەر .
٤. مامۆستا جەمال .
٥. کاك د . کەمال خۆشناو .
٦. کاك عەلی بچکۆل .
٧. کاك مەلا بەختیار .

کاك نەوشیروانو کاك فەرەیدونو مامۆستا جەمال بوون بە ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە. بە گوێرەی رێککەوتننامەی نێوان لایەنە سیاسییەکانی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان بارەگاکانیان هێنایە ناوچەکانی هەولێرو سلێمانیو کەرکوك دەستیان کرد بە چالاکی پێشمەرگانە . ئەو هەنگاوە لەلایەن جەماوەری کوردستان پێشوازی لێکرا . بارەگای لقی دووی

پارتی دیموکراتی کوردستان هاته دژلی بالیسان زۆر به تەبایی‌و برایەتی بەیەکەوە دەستمان لە دوژمن وەشاند، پاش ئەو هەموو دژایەتی‌و خوێن رشتنەو دڕدۆنگیە برایەتیمان چێژێکی تایبەتی هەبوو، سەردانی یەکتریمان دەکرد. پارتی بەبۆنەی یادی دامەزراندنی لە ١٩٨٢/٨/١٦ لە گوندی چێوەی سەروو ئاهەنگی گێڕا من بە ناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وتارم خوێندەوە باسی کوردەکانی ئێرانم کرد بیر خەڵکم هێنایەوە کە ئەوانیش هەقیانە داوای مافی رەوای خۆیان بکەن .

لەو سەرو بەندانە رژێمی عێراق لێبووردنی گشتی بۆ سەربازە راکردووەکان دەرکردو داوای لێکردن بگەڕێنەوە . کورد هەمیشە پێی خۆشە خزمەتی سەربازی نەکا کە زانیان ئەو خاڵەی تیایە بێگوێ دانە شەرم، بێ ئەوەی قسەکانیان لە بیر بێت کە دژی سەدام دەیانکرد بە ماوەیەکی کورت نزیکەی پەنجا هەزار کەس تەسلیم بە عێراق بوونەوە لە پاشان بوون بە کەرەستەیەکی چاك بۆ دروست بوونی ئەفواجی خەفیفە (جاشی سووك) .

لەسەر کێشەی رێککەوتن کە باسێکی تایبەتییە حەزم کرد ئەوە فەرامۆش نەکەین کە رژێمی عێراق هەرزوو بە هۆی کاك ( حاجی محەمەد شێخ رەشید لۆلان ) ویستی قسە لەگەڵ ی.ن.ك بکات بۆئەو مەبەستە لە ساڵی ١٩٧٧ شەهید عەلی عەسکەری چووە بەغدا وادیار بوو سەدام دەیویست چەکەکانمان تەسلیم بکەین .. ئێمەش دەمانووت دەبێت لەبەرەی (الصمودو التصدی) کە لە لیبیاو سوریاو فەڵەستین‌و جەزائیرو عێراق پێك هاتبوو دەوری کاریگەری عێراق دیار بێت بەو واتایە عێراق لە پاش شەڕی ئێران پێویستی بە هێزی مرۆیی کورد هەبوو، دەیویست کوردستان ئارام بێت تا دەستی بەتاڵ دەبێت ئینجا حیسابمان لەگەڵ بکات، ناوە ناوە خەڵکی ئەگینارد بۆئەوەی سەرکردایەتی ی.ن.ك رێککەوتنی لەگەڵ بکات بەهەمان شێوەش بەهۆی (عزەتی سلێمان بەگی دەرگەڵە) قسەی لەگەڵ پارتی دەکرد کە لەناو خەڵکیدا وا ناوبانگی دەرکردبوو. هەرچەندە لە کۆنفراس بیرو باوەری جیا جیا هەبوو بەڵام حەتمەن بۆچونی سەرکردایەتی گرنگترەو ئیعتباری زیاتر بۆ دەکرێت بۆیە رێککەوتن لەو کاتەوە بەگەرمی باسی لێدەکرا .

لە کۆنفرانس تیپەکان بە شێوەیەکی تازەتر دامەزرانەوە، رێکخراوەکانی کۆمەڵەش ئاڵوگۆڕی بنەرەتی تیاکرا، ئەو کەسانەی لەناو کۆمەڵە بە عێراقچیەتی ناو دەبران لە زۆربەی ناوچەکان دەسەڵاتیان لێ سەنرایەوە لەوحەدەو سەدە حزبی سۆسیالیستی کوردستان لە ناوچەکانی هەولێر بە تایبەتی لە دەشتی هەولێر رۆژ بە رۆژ لە رووی پێشمەرگەوە لە زیاد بووندا بوون، هەرچەندە

هەندێ بەرژەوەندیو بێ رێكو پێكی وای كردبوو كە هەندێ كەس لەو حزبە سوود وەربگرێو خۆی دەوڵەمەند بكات چونكە لەناو سۆسیالیستەكان وشەی لێپێچینەوە نەبوو هەر كەسە بە ئارەزووی خۆی دەجولایەوە، راوەرووت، بێ رێزی، سوكایەتی، لێدان لە خەڵك كاری رۆژانەی لێپرسراوانی ئەو حزبە بوو، هیچ فەرماندەی هەرێمو كەرتێك بەراستی پابەند نەبوون بە سەركردایەتی، سەركردایەتی سۆسیالیست بۆئەوەی شوێنی بەرزیان لێ نەوی نەبێت ئەوانیش قازانج بكەن لە جیاتی ئەوەی لێپێچینەوە لە خەڵكانی دزو جەردە بكەن بەرگرییان لێدەكردن .

پاش كۆنفراسی دووی كۆمەڵە یەكێتی نیشتمانی كوردستان كەوتە قۆناغی تازەی خەبات .

## دامەزراندنی مەڵبەندەکان

لەسەر داوای کۆنفراسی دووی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانو بریاری مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك)و دەست پێشخەری کاك نەوشیروان، کۆمیتەی مەڵبەندەکان دەمەزرا، بۆ ئاسان کردنی ئیشو کاری پێشمەرگەو جەماوەرو جێگیرکردنی چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی لە ناوچەکان بۆئەوەی ئیشو کار بە رێكو پێکی بەرێوە بچێ، چونکە زۆر گیروگرفتی، کۆمەلایەتی، مالی پەیوەندی لەگەڵ حزبە سیاسیەکان بەبێ چارەسەر کردن دەمایەوە، یان زۆر کێشەی گەورە لە نێوان (سەرتیپەکان) دروست دەبوو، هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرەو گەشەکردن دەچوو، مەکتەبی عەسکەری دەستی پێ رانەدەگەیشت . شۆرشی کورد بۆ خۆپاراستن هەمیشە بنکەی سەرکردایەتی لە شاخی سەختو سەر سنورەکان دادەمەزرێنێ بۆئەوەی دوژمن نەتوانێ بەئاسانی بیگرێت. لە هەندێ ناوچە پێشمەرگە بە پیادە ١٠بۆ١٥ رۆژی دەویست تا دەگەیشتە سەرکردایەتی، هەندێ جار بۆ ئیشێك یان بۆ لێپرسینەوە لە لێپرسراوێکی شۆرش ماوەی مانگێك بەسەر رووداوەکە تێپەر دەبوو. کارەکە بەسەر دەچوو یان سارد دەبۆوە، بۆیە دەبوایە ئەو مەسەلە گرنگە چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، ئەوەبوو دەسەلاتی کۆمیتەی مەڵبەندەکان دیاری کرا.

دانانی فەرماندەی مەفرەزە، جێگری فەرماندەی کەرت، فەرماندەی کەرت، جێگری فەرماندەی تیپ، پێشنیار کردنی فەرماندەی تیپ، لێکۆلینەوە لە هەموو کاروبارەکانی، کۆمەلایەتی، شەرکردن، مەسەلەی ژن، ناکۆکی جووتیارەکان لەسەر زەویو زار .. ، سزادانی پێویست لەرووی مالی، یارمەتی کۆکردنەوە، یارمەتی خێرخوازان، لە رووی سیاسی پەیوەندی کردن لەگەڵ حزبە سیاسیەکان، لەرووی شەر کردن کۆکردنەوەی چەند تیپێك لە کاتی پێویست، دەرکردنی چەند بەیانێك یا بلاوکراوەیەك گەلێ ئیشو کاری تری رۆژانەی خەلكو پێشمەرگەو رێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان .

کۆمیتەی مەڵبەندەکان راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی دەبەست وە هەر بە فەرمانی ئەویش لێپرسراوی مەڵبەندو ئەندامەکانیو سەرتیپەکان دادەنرانو لادەدران، هەرچەندە سەرتیپەکان پاش دانانیان راستەوخۆ پەیوەندیان لەگەڵ مەڵبەندەکان هەبوو .

راستە هەندێ شۆرشی ئازادی خواز لە دانانی مەڵبەندەکان زەرەرو زیانیان کرد، شۆرشی ئەریتریا لە دانانی مەڵبەند وای کرد هەر مەڵبەندێك ببێتە حزبێك، ئەو تاقی کردنەوەیە نزیك

بوو له مەڵبەندی یەك لە ناوچەی سلێمانی رووبدات بەڵام هۆشیاریو زیرەكی سەركردایەتی ی.ن.ك پیلانی ئەو كەسانەی پوچەڵ كردەوە .

كوردستان دابەش كرا بەسەر چوار مەڵبەند بەم شێوەیەی خوارەوە : -

١. **مەڵبەندی یەك :** بارەگای لە گوندی ( حاجی مامەند ) لە شارباژێر بوو، لێپرسراوەكەی كاك مەلا بەختیار بوو، لێپرسراوی عەسكەری كاك بەكری حاجی سەفەرو تیپەكانی ٣٣ ی سلێمانیو ٣٧ ی شارباژێرو ١٥ ی شارەزوورو ١١ ی هەورامانو ٥٥ ی قەرەداغ ٥١ ی گەرمیان سەر بەو مەڵبەندە بوون .
٢. **مەڵبەندی دوو :** بارەگای لە گوندی ( سەرگەڵو ) لە ناوچەی جافایەتی بوو، ت٢١ ی كەركوكو ت٢٣ ی سورداشو ت٤٧ پیرە مەگرونو ت٤٣ ی ئاسۆسو ت٦١ ی جووتیاران سەر بەو مەڵبەندە بوون .
٣. **مەڵبەندی سێ :** بارەگای لە گوندی ( وەرتێ ) بوو، لێپرسراوەكەی كاك سەید مەجید بوو، ت١٤ ی ئاكۆ، ت١٢ ی سۆران، ت٧٤ ی باڵەك، ت ٧٧ ی كۆدۆ لەلایەن ئەو مەڵبەندە سەرپەرشتی دەكرا
٤. **مەڵبەندی چوار :** بارەگای لە گوندی ( بالیسان ) بوو، لە ناوچەی خۆشناوەتی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر، ت٩١ ی سەفین، ت٩٣ ی كۆیە، ت ٩٩ ی بیتوێن لە ژێر دەسەڵاتی ئەو مەڵبەندە بوو كاك سەید كەریم لێپرسراوی عەسكەری بوو .

ئەندامانی مەڵبەندێك پێك دەهات لە :

١. لێپرسراوی مەڵبەند ( دەبوایە ئەندامی سەركردایەتی بێت ) .
٢. بەشی عەسكەری .
٣. بەشی ماڵی .
٤. بەشی كۆمەڵایەتی .
٥. بەشی راگەیاندن .

لەو چوار مەڵبەندە سێ لێپرسراو ئەندامی سەركردایەتی كۆمەڵە بوون. كەوتنە كاری مەڵبەندەكانو جۆشێكی تری بە شۆڕشو خەباتی بێ وچانی گەلەكەمان دا ئیشو كاری پێشمەرگەو جەماوەری ئاسانتر كرد، لە زۆر شوێن كوشتنی ناهەق نەما كە جاران لە سنووری تیپەكان هەندێ كەس دەكوژران كە هەق نەبوو بكوژرێن، پارە كۆكردنەوە قەدەغەكرا، لە نزیكەوە چاودێری ئیشو كارەكان دەكرا، ئیشو كارەكانی مەڵبەند بە گوێرەی زیرەكیو

دڵسۆزی لێپرسراوی مەڵبەندەکەو ئەندامانی حسابی بۆ دەکرا. مەڵبەندەکان توانیان لە رۆژی هێرش و پەلاماری دوژمن و ناحەزانی ی.ن.ك هێزەکان کۆبکەنەوەو بەرگری لە مانی یەکێتی بکەن . هەرچەندە مەڵبەندەکان تاقی کردنەوەیەکی تازە بوو لە شۆڕشی نوێی کوردستان بەڵام قازانجی مەزنی بۆ ی.ن.ك هەبوو، توانیان یەکێتی لە ناوچەکان بچەسپێنن دیارە ئەو تاقیکردنەوەیە سەرکەوتوو بوو هەر بۆیە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش ناوچەکانی بەسەر چوار مەڵبەند دابەش کرد ، مەڵبەندی سپی سەنگ، مەڵبەندی باکوری کوردستان، مەڵبەندی باشوری کوردستان، مەڵبەندی دوو . کوردستان پاش دروست بوونی مەڵبەندەکان بە فەرماندەی کەرتی سێی تیپی ٨٣ ی هەوری چوومە ناوچەی دەشتی هەولێر لەگەڵ کەرتی یەکی تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر بە هێزێکی باش بەرەو کەندیناوەو قەراج رۆیشتین و پشتمان لە چیای قەرەچوغ، ئەو شاخەی کە دوژمن لە مێژ ساڵە دەیەوێ بیکاتە پەناگەی عەرەبەکان. زۆر بە رێك و پێکی دەستمان بە چالاکی کرد لە ماوەی یەك هەفتە چوار چالاکیمان ئەنجامدا وە جارێکیش چووینە ناو مەخمور چەند پارچە چەکێکمان دەست کەوت و چەند خائین و خۆفرۆشێکیشمان تەمبێ کرد لەو چالاکیانە شەهید هاورێ کاوەو کاك سەفین و برادەرانی کەرتی یەکی دەشتی هەولێرو کەرتی سێی تیپی ٨٣ ی هەورێ بەشداری باشیان تێدا هەبوو . پاش ئەوەی نزیکەی (٢٠) رۆژ لەناوچەی دەشتی هەولێر ماینەوە گەڕاینەوە دۆڵی خۆشناوەتی . ماوەیەك بوو هێزەکانمان هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی سەردانێکی بادینان بکەن کە ملازم خولە خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەو ئەرکە پیرۆزە بەڵام داخی گرانم شەڕی براکوژی رێگای نەدا ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات شەڕ لە کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران) دەستی پێکرد بەناچاری هێزەکانی ی.ن.ك بەرەو سەرکردایەتی کەوتنە رێ کاك ملازم خولە لەو شەڕە بەشداری بەرچاوی تێدا هەبوو بە گوللەی دوژمن لەسەر خاکی پیرۆزی کوردستانی رۆژهەڵات بە خەستی بریندار کرا ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانەی شۆڕش مایەوە نەتوانرا بە تەواوی چارەسەر بکرێ بۆیە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی بۆ چارەسەر کردن چووە سوید لەوێ بە کارەساتی ئۆتومبێل بەیەکجاری ماڵ ئاوایی لێکردین .

# هێزی پشتیوان

هێزی پشتیوان بەو پێشمەرگانەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەوترا کە بۆ پشتیوانی گەلی کورد چوو بوون لە کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران) کۆماری ئیسلامی ئێران‌و نەیارانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ کۆتایی هاتنی هاوینی ۱۹۸۲ بۆئەوەی دیسان هەموو کوردستان بخەنەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، بۆئەوەی بزووتنەوەی رزگاری خوازی کوردستانی رۆژهەڵات لاواز بکەن دەستیان کرد بە هێرشێکی بەربلاو بە تایبەتی لەناوچەکانی پیرانشەرو مهابادو سەردەشت‌و بۆکان‌و سەقز، پێشتر زەبریان لە حزبی دیموکرات دابوو لە ناوچەی سوماو برادوست .

حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەم لەرووی هێزو توانای کەم‌و هەم زۆر شارەزا نەبوون لە شەڕ نەیدەتوانی بەتەنیا پێش لەو هێرشانەی دوژمن بگرێ، زەبری کوشندەی خوارد لە بەرەی پیرانشەر زیاتر لە هەشتا پێشمەرگەی دیموکراتی هێزی ئاوارە شەهید کران. وەپێشڕەوی بەرچاوی کرد هێزەکانی ئێرانی گەیشتنە نزیك خدراوەو کوێستانەکانی قەندیل، ی.ن.ك بۆ سەلماندنی بیرو باوەڕی کوردستانیەتی، وەبۆ ئەوەی ئەو ئەرکە نیشتمانیە فەرامۆش نەکات‌و بۆ دۆست‌و دوژمن بسەلمێنێ کە مەسەلەی کورد یەك مەسەلەیە، بڕیاریدا کە هێزەکانی کۆبکاتەوەو بەشداری لەو رۆژە ناخۆشەی گەلی کورد بکات لە کوردستانی ئەودیو. لە پێشدا باسمان کرد بارەگاکانی ی.ن.ك لەسەر سنووری هەردوو کوردستانی داگیرکراو بوو بێگومان شکستی حزبی دیموکراتی کوردستان لەو شەڕە، هاتنەوەی هێزەکانی ئێران بۆ سنوورەکانی کوردستان مەترسی دەخاتە سەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان .

لە ۱۹۸۲/۹/۳ سەرکردایەتی ی.ن.ك بە بروسکەیەك چەند هێزێکی داواکرد ئەو هێزانە لە ۱۹۸۲/۹/٤ بەرێکەوتن بەرەو کوردستانی رۆژهەڵات ئەو هێزەی ی.ن.ك کەلە هەزار پێشمەرگە زیاتر بوو تووشی چەندین شەڕی سەخت‌و دژوار بوون لەگەڵ هێزەکانی ئێران‌و نەیارەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ی.ن.ك بێگوێ دانە بەرژەوەندی تەسکی خۆی ئەو هەنگاوە مێژووییەی فەرامۆش نەکرد هەرچەندە ئەو هەنگاوەی یەکێتی وای کرد لەچەك‌و تەقەمەنی‌و یارمەتی‌و رێگای دەرەوە بێبەش بکرێت سەرەڕای دوژمنایەتی رژێمی ئێران . بەبۆچونی خۆم ئەو هەنگاوە یەکێکە لە سەروەریە هەرە شکۆدارەکانی ی.ن.ك وە مێژوو بۆ نەوەکانی داهاتوی دەگێڕێتەوە . لە تشرینی دووەم ی.ن.ك بۆ بەهێزکردنی هێزەکانی خۆی لە بەرەکانی شەڕ لەگەڵ

ئێران داوای هێزی تازەی ئەکرد یەکێك لەو هێزانـە کەرتەکـەی ئێمـە بـوو لەگـەڵ کـەرتی یـەکی دەشتی هەولێرو ، هەموومـان بەیەکەوە بەرەو سەرکردایەتی کەوتینە رێ، سـەرمای پـایز چـەندی بلێی کاریگەرە، دەمانزانی تووشی کوێستانی ئەستەم دەبین، بەفرو باران دەست پێدەکات جـل و بەرگی کوێستانمان پۆشی زۆر بە دڵێکی خۆش بـەرەو پـیری ئـەو شـەڕە دەڕۆیشـتین ئەگـەر هـەتا ئێستا لەگەڵ هێزەکانی رژێمی عێراق شەڕمان دەکرد ئەوە بۆ یەکەمین جـار لـە مێـژووی نـوێی گەلی کورد هێزێکی سیاسی تازە پی رو بەرەنگاری دوو دوژمنی دێرینـی کـورد دەبێتـەوە هـەق بوو شانازی بە خۆمانەوە بکەین . لە رێگا تووشـی برادەرانـی حزبـی شـیوعی عێراقـی بـووین‌و مـامۆستا مەلا حسەنیان لەگەڵ بوو پاش چاك‌و چۆنی‌و لێـك پرسـین کـاك مـەلا حسـەن وتـی: بەڕاستی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کارێکی خراپ دەکات‌و دوژمنێکی تر بۆ شۆڕشی کورد لە کوردستانی عێراق پەیدا دەکات ئێمـەش داوای رزگـاری کوردسـتانی گـەورەمان دەکـرد کـە کارێکی زۆر رەوایە وامان ئەژمار دەکرد ( ئاش لـە خـەیاڵێك‌و ئاشـەوان لـە خـەیاڵێکی تـر ) . وردە کێشەیەکمان کرد ( ئەو کات حزبی شیوعی عێراقی لەبەرەی جود دا بوو ) .

لە ٢٥/١٠/١٩٨٢ گەیشتینە بارەگای سـەرکردایەتی لـە خـڕی نـاو زەنـگ کـاك نەوشـیروان رەوانەی لای مام جەلالی کردین، پاش نیوەڕۆیەکی درەنـگ چووینە خاکی کوردستانی رۆژهەڵات گوندەکانی ( داوداوە و مامکاوە ) مـان بڕی ئێوارەمـان بسەردا هات گەیشـتینە بارەگـای کـاك مەلا بەختیار لەگەڵ کاك شاخەوان‌و مامۆستا سدیق‌و کاك بەختیار رۆیشتین بـۆلای بـەڕێز مـام جەلال لە کوێستانی ( ساوان ) لەوێ سەرپەرشـتی بەرەکـەی دەکـرد لـە نزیکـەوە لەگـەڵ نوێـژی شێوان گەیشتینە لای مام جـەلال لـە خێمەیـەك بـوو شـەهید سـەید کـەریم لـەلای دانیشـتبوو، تەماتەو نانیان دەخوارد زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکـردین ئـەویش بـە شـەڕێکی مێـژوویی لـە قەڵەمیدا . ئێمەش بە نۆرەی خۆمان باسی بـاری ناوچـەکانی خۆمـان‌و بۆچـونی خـەڵکی لەسـەر شەڕەکەمان بۆ باس کرد. دیار بـوو کـاك شـاخەوان نەیدەویسـت باسـی ئـەوە بکـات کـە هەنـدێ لایەن‌و خەڵك شەڕەکە بە جۆرێکی تر لێك دەدەنەوە ( هەندێ لایەن بێنەوەی لە گرنگـی شـەڕەکە بدوێن ناحەزانە باسی خراپی شەڕەکەیان دەکرد قسەی خۆمان بێت دەیانگوت جاشـی عێـراقن ) ئەو قسەیەم بە مام جەلال وت، زانیم پێی ناخۆشە بەڵام هەمیشە کادیرەکان دەبێ قسـەی راسـت بە سەرکردایەتی رابگەیەنن بەدڵی سەرکردەکان قسە بکەن چونکە دەبێتە هـۆی سـەر لێشـێوان‌و راستی ون کردن .. مام جـەلال هاتـە وەڵام: ( مـن لـە کـەرکوك خـۆم شـارد بـۆوەو کـاك سـاڵح شێرەش لەوێ بوو، تازە سدیق میرانی شـەقلاوە کوژرابـوو، پـارتی دەسـتی لـە کوشـتنی هـەبوو

سالح شێره لەگەڵ هەندێ شیوعی گفتوگۆی دەکرد، شیوعیەکان بۆچونیان وابوو پارتی لە ئاغاو دەرەبەگ پێك هاتووە، سالح نەیدەوێرا بڵێ سدیق میران پارتی کوشتویەتی هەر لەبەر خۆیەوە دەیووت: ( کەلەش دەزانی بابم ) مام جەلال بەو نموونەیە بەر پەرچی ئەو قسانەی دایەوە.

پاش ئەوەی مام جەلال لە دەفتەری یادگاریەکانی رۆژی گەیشتنی ئێمەی نووسی، گەڕاینەوە گوندی مامکاوە بۆ بەیانی ئەو هێزەی ئێمەیان کردە دوو بەش، پێشمەرگەکانی ت ٨٦ بە فەرماندەی کاك شاخەوان رەوانەی قوڵایی خاکی کوردستانی ئێران کران بە هاوکاری کۆمەڵەی ئاستەنگ کێشانی کوردستانی ئێران ئێمەشیان رەوانەی دۆڵە تو کرد لەکوردستانی ئێران بۆ پاڵپشتی هێزەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی رۆژهەلات، بەرەی دۆڵەتوو لەلایەن شەهید سەید کەریم سەرپەرشتی دەکرا. سەنگەری پێشمەرگە لە کوێستانی چیای ( پیران ) بوو دەڕوانیتە دەشتە جوانەکانی (وەزنی و مەردواو ) هێزەکانی ئێرانیش لە گوندی کونە مشکە بوون . لە رۆژی ١٩٨٢/١١/٦ سەرکەوتین بە شاخداو چەندی بڵێی سارد بوو، پێشمەرگەیەك لە سەرماندا خەوی لێنەکەوت، بای ساردی کوێستانان ئەو پەناگەیەی کە بە نایلۆن دروستمان کردبوو لێی تێك داین، درەنگی شەو هەور هات‌و چو هەوا ساردی کردو وردە وردە بەفر دەباری، نەماندەزانی چۆن خۆمان لەو سەرمایە رزگار بکەین، بەفرەکە لەگەڵ رۆژهەلاتن نەماو ئاسمان بوبە ساماڵ، نۆبەتی ئێمە دوو شەو بوو لە بیرمە کاك حامیدی حاجی غالی‌و شەهید سەربازیشمان لەگەڵ بوو. رۆژی ١٩٨٢/١١/٨ ئێمەیان گۆڕی لە جیاتی ئێمە پێشمەرگەی ت ٥٧ی سەگرمەو ناوچەکانی تریان بەسەر شاخ خست لە رۆژی ١٩٨٢/١١/٩ بەفرێکی زۆر باری بوو چیای سپی کرد رێگاو بانی گرت، کرێوەو زریان چیای ون کرد گیانی هەموو ئەوانەی لە شاخ بوون کەوتە مەترسی، رێگاکان گیران، بەناچاری هەرچی پێشمەرگەو خەلکی دۆڵەتوو هەبوو بە هانای ئەو پێشمەرگانە چوون، پاش ماندوو بوون و هیلاکی زۆر ئینجا پێشمەرگەکان توانیان بێنە خوارەوە. بەرەکانمان چۆڵ کرد چونکە ئێرانیەکانیش بەو بەفرە هێرشیان لا کارێکی ئاسان نەبوو .

چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە رۆژی ١٩٨٢/١١/١٢ بەشێك لە هێزەکان گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان، هێزەکەی ئێمە لەو بەشە بوو، زۆر بە سەربەرزی گەڕاینەوە ناوچەکانی سنووری چالاکیمان، بەڕاستی شانازیمان بە خۆمان‌و هێزەکانمان دەکرد چونکە ئەوە یەکەمین جارە پاش کۆماری مەهاباد پێشمەرگەی کوردستان بەرگری لە هەموو خاکی کوردستان دەکات ( لە کۆماری مەهاباد خوا لێخۆشبوو بارزانی مستەفاو بارزانییەکان‌و چەندین تێکۆشەر لەوانە هەر

چوار ئەفسەرە شەهیدەکە مەردانەو دلێرانە لە پاڵ هێزەکانی کۆماری مەهاباد بەرەنگاری رژێمی شای ئێران بوونەوە، بارزانییەکان بە سەرکردەی سەرۆك بارزانی چەندین جار هێرشەکانی شایان پوچەڵ کردەوە )

هەرچەندە پروپاگەندەی دوژمنو ناحەزانی کورد زۆر بە تەوژم بوو، دەبێ هەر لە ناحەزان قسەی خراپ رەچاو بکرێت هەرگیز نابێ چاوەڕێی ئەوە بکەین دوژمن بەو هەنگاوەی ی.ن.ك دڵخۆش بێت . لە دەشتی هەولێر تەنیا کەرتی دووی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر مابۆوە کە ژمارەیان لە ٣٠پ.م تێپەڕی نەدەکرد لەگەڵ چەند کادرێك لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەم لەگەڵ کەرتەکەی خۆمان هەم بۆ جولەو هەم بۆ بەهێزکردنی هێزەکانی خۆمان لە دەشتی هەولێر چووینە ناوچەکە لەگەڵ پێشمەرگەکان یەکمان گرتەوە کاك ملازم سمکۆ فەرماندەی تیپی باوەجی ئەویش لەگەڵ هێزێك هاتە دەشتی هەولێر هەڤاڵ قادر عەزیز ئەو کات لێپرسراوی کۆمیتەی هەولێری حزبی سۆسیالیستی کوردستان بوو، لەگەڵ هێزێکی گەورە هاتبووە دەشتی هەولێر بۆ دوو مەبەست یەکەم رێك خستنەوەی هێزەکانی خۆیان چونکە کەرتو مەفرەزەو هەرێمەکان زۆر ناکۆك بوون لەگەڵ یەکتر، دووەم بۆئەوەی هێز نیشان بدات بەرامبەر خەڵكو یەکێتی . زیاتر لە سێ سەدو پەنجا پێشمەرگەی سۆسیالیست لە دەشتی هەولێر کۆکرابۆوە چوست دەهاتو دەچوون بە مرو مۆچی سەیری ئێمەیان دەکرد، لە زۆر شوێن کۆڕو کۆبونەوەیان دەکرد . دۆخەکە بەرەو ئاڵۆزی دەڕۆیشت، هێزەکانی ی.ن.ك لە دەشتی کۆیە لێپرسراوێکی ( حسك ) یان گرتبوو لەسەر هەندێ کێشە کە پەیوەندی بە خەڵکەوە بووە، دیارە ئەوان داوای ئازادکردنیان دەکردو برادەرانی ئێمەش گوێیان بەو قسەیە نەدەدا . لە ١٩٨٣/١/١٥ نامەیەکمان لە ت ٨٣ ی هەوریێ بۆهات داوای گەڕانەوەی بەپەلەی ئێمەی دەکرد لە رۆژی ١٩٨٣/١/١٧ گەیشتینە گوندی چیوەی سەروو، پاش ئەوەی هەڤاڵ مولازم خولە لە شەڕی کوردستانی ئەودیو بەخستی بریندارببوو هەڤاڵ عەبدوڵا مام عەلی کرا بە سەرتیپی ئێمە دیارە داواکە لەسەر ئەو مەسەلەیە بووە. لە١٩٨٣/١/١٧ هێزێکی حزبی سۆسیالیست دەچێتە گوندی ئاومال لە ناحیەی تەق تەق چەند پێشمەرگەیەکی ی.ن.ك لەوێ دەبن سۆسیالیستەکان داوا لە پێشمەرگەکان دەکەن کە چەك دابنێن ..! پێشمەرگە چەکی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی بەرگری لە مافی رەوای گەلی کورد بکات، چەکی زۆر لا پیرۆزە، ئەو پێشمەرگانەی کەلەلایەن حزبەکانی تر چەك دەکران هەمیشە دەخرانە ژێر هەڕەشەی لێپرسراوەکانیانو دەکەوتنە ژێر لۆمەو گازندەی هەڤاڵەکانیان بۆیە چەك

کردنی پێشمەرگە کارێکی وائاسان نییە کە هەندێ خەڵك بیری لێدەکردەوە پێشمەرگە تەنیا ماف بە لێپرسراوی خۆی دەدات کە لێپێچینەوەی لەگەڵ بکات .

پێشمەرگەکانی ی.ن.ك کەوتنە بەرگری لەخۆکردن، جێگای داخە لەو مەرکێش مرکێشە کادیرێکی ی.ن.ك شەهید کرا ئەوانی تریش چەك کران لە پێش چاوی خەڵك لە گوندی ئاومالێ ئەوانەی خۆیان بە سەرکردە دەزانی دەبێ هەمیشە رێزی ئەو کسانە بگرن کە دژی داگیرکەرانن نابێ ئەوان هانی خەڵك بدەن پێشمەرگە چەك بکرێت، سەرکردەی راستەقینە دەبێ هەموو پێشمەرگەی کوردستان بە یەك چاو سەیر بکات ئەگینا ئەو شەرەفە گەورەیەی لایەق نابێت با خۆشی بە سەرکردە بزانێ .

بە شەهید بوونی ئەو کادیرە، بیانوو دۆزرایەوە بۆ شەرێکی گەورەتر چونکە هەموومان لە بەڵگەو بیانویەك دەگەڕاین، نیەتمان پاك نەبوو، لە هەنجەتێك دەگەڕاین، هەردوولا هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە تا زەبری کوشندە بوەشێننو بۆ خەڵکە هەژارو لادێ نشینەکانیش بیسەلمێنن کە هێزێکی گەورەن، ئەگینا هەموومان بەرامبەر حکومەت ئەو دەسەلاتەمان نەبوو . زەمینە خۆش کرا تا چەند تێکۆشەرێکی تریش شەهید بکرێ تا ئاخ و داخی چەند مانگی رابردوو لە یەکتر دەربکەین ، شەڕی نێرەگین نموونەی شەڕی براکوژیە .

# شەڕی نێرە گین

پاش ئەوەی هێزەکانی حزبی سۆسیالیست ئەو کادیرەی یەکێتیان شەهید کردو چەندین پێشمەرگەیان چەك کرد، پشێوی کەوتە ناوچەکە رۆژ لە دوای رۆژ دۆخەکە زیاتر ئالۆز دەبوو، هەرلایەك خۆی رێك دەخستو خۆی ئامادە دەکرد بۆئەوەی هێزەکەی بەرانبەری لە ناوچەکە دەربپەڕێنێ . هێزێکی گەورەی ی.ن.ك لە مەڵبەندی دوو هاتە ناوچەی سنووری ت ٨٦ ، هیچ لایەنێك نەیدەویست ئۆباڵی دەست پێکردنی ئەو شەڕە ناڕاستە بخاتە ئەستۆی خۆی چاوەڕوانی هەلێکی دەکرد تا زەبری جەرگ بڕی خۆی بوەشێنێ .

هەندێك لە لێپرسراوانی هەردوولا بۆ جێگیرکردنی جێ پێی خۆیان و رەچاوکردنی بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی ئاگرەکەیان خۆش دەکرد. لەو حەدو سەدە (١٩) حزب و رێکخراوی عەرەبی و کوردستانی و عێراقی رێککەوتن لەسەر بلاوکراوەیەکی هاوبەش لە دیمەشق ئالەو کاتەدا شەڕ لە گوندی نێرەگین دەستی پێکرد کە پێشمەرگەکانی حزبی سۆسیالیستی لێبوو . شەڕ لە کاتژمێر (٢) ی پاش نیوە شەوی ٥- ١٩٨٣/٢/٦ تا کاتژمێر (١٠) ی شەوی ١٩٨٣/٢/٦ بە گەرمی لە دەورو بەری نێرەگین، ناو نێرەگین درێژەی هەبوو لەو شەڕو پێکدادانە (٩) پێشمەرگەی حزبی سۆسیالیست و (٣) پێشمەرگەی حزبی شیوعی و (٧) پێشمەرگەی یەکێتی شەهید بوون، چەندین پێشمەرگەی ئازاو نەبەز بریندار کران . شەڕی نێرەگین دەری خست حزبە سیاسیەکان چەند رقیان لە یەکترە، چەند داخ لەدڵن بەرامبەر یەکتر..!؟ ئەو شەڕە سەلماندی هیچ حزبێك ناتوانێ بە هێزی چەکداری حزبەکەی تر بشکێنێ، تەنیا هەڵس و کەوت و خەبات و تێکۆشان و راستی مەسەلەکان حزبێك بەرامبەر حزبەکەی تر پێش دەخات .

شەڕی نێرەگین کارەساتێکی دڵتەزێن بوو، هێزەکانی (ی.ن.ك) و (ح.س.ك) ی ماندوو هیلاك کرد ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە هێزەکان پاش ئەوەی ئەو کوشت و کوشتارەیان لە یەکترکرد بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك بچێتە نێوانیان، بە قسەیەکی تر هیچ کەس ناوبژیوانیان بکات هەر یەك گەڕایەوە شوێنی خۆی هیچیان تواناى ئەوەی نەما بچێتە سەر هێزەکەی تر هەر چەندە لە گوندی سماقە پێك دادانێکی تر رووی دا بەڵام شەڕەکە ماندوو بوونی هەردوو لای پێوە دیار بوو. پاش شەڕەکە نوێنەرانی لایەنەکانی جودو یەکێتی کەوتنە وتو وێژ بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەك پێکهات لە حزبی شیوعی عێراقی و یەکێتی و حسك و چوونە دەشتی هەولێر بۆئەوەی گیرو گرفتەکان چارەسەر بکەن و بارودۆخ وەکو پێشتر لێبکەنەوە، چەند جارێك ئەو لیژنەیە لەگەڵ

هێزەکانی ئەو ناوچەیە دانیشتن، هەرچەند هەتا رادەیەك توانیـان دۆخەکـە ئـارام بکەنـەوە بـەڵام نەیانتوانی کێشـەکان چارەسـەر بکـەن، دیلـەکانیان گۆڕیـەوە کەچـی نـەیانتوانی چـەکەکان کـە گیرابوون بدەنەوە یەکتر، ئەو لیژنەیە گەڕایەوە دۆڵی بالیسان بێئەوەی لە ریشـەوە ئـەو ناکۆکیانـە هەڵتەکێنێ و هۆیەکانی شەڕی نێرەگێن بن بڕ بکات . لە ئازاری هـەمان سـاڵ هێزەکـانی ی.ن.ك ناوچەکەیان چۆڵ کـرد، هێزەکـانی مەڵبەنـدی دوو گەڕانـەوە شـوێنەکانی خۆیـان، ت ٨٦ هاتـە کاموسەك . پاش شەڕی نێرەگێن تا ١٩٨٣/٤/١٥ هـیچ رووداوێـك کـە بـۆنی شـەڕی براکـوژی لێبێت رووی نەدا. هەرچەندە حزبەکان هەریەك خۆی ئامادە دەکـرد، بـەرەی (جـود) وای دەزانـی تەرازووی هێزەکان گۆڕاوە ئەوان بە هێزترن لە ی.ن.ك گیانی تۆڵە کردنەوەشـیان لـە دڵ و دەروون دەخولایەوە . هەرحزبە دەیویست خۆی سەرکارو دەسەڵاتدار بێت لە ناوچەکان ، جیاوازی بۆچوون بۆ چارەسەرکردنی مـسەلە جیا جیاکانی سەر گۆڕەپانی کوردسـتان و عێـراق و ناوچـەکە یـەکێك بوو لە خاڵەکانی جیاوازی نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردستان .

لـە ١٩٨٣/٤/١٥ هـەڤاڵان شـەهید شـەماڵ و شـەهید سـەرباز و هێزەکـەیان هاتنـە چـێوەی خواروو نیوەڕۆ لە بارەگای ئێمە نانی نیوەڕۆیان خوارد کەوتینە قسەو باس و لێکۆڵینەوەی بـاری ئـەو کـاتی کوردسـتان ... دیـارە هـەر پێشـمەرگەیەك بـیرو رای خـۆی دەردەبـڕێ منـیش وەکـو پێشمەرگەیەك و دۆستێکی ئەو تێکۆشەرانە بۆچونی خۆمدا لە بیرمە وتم :

( نابێ بزووتنەوەی کوردایەتی لەسەر پیاوێکی وەکو سورە پەکی بکەوێ و ببێتە بیانویەك شەڕی گەورەو خوێناوی دروست بێت هەمیشە دەمووت بابە ئەگەر هەر لەیەك دەدەین با بەڵگەو بیانوی گەورە بدۆزینەوە چونکە شەرمە ئەو مـسەلە بچووکە ببێتە مایەی شەڕی براکوژی ) داخەکەم ئەو برادەرانە قسەکەی منیان بەهەند هەڵنەگرت لـەو گفتوگۆیـە کـاك عەبـدوڵای مـام عـەلی ف ت ٨٣ی هەوری و کاك قادر دۆشکەو کاك فاروق عەلی مەولودوکاك ئەحمەد کـوردە ئامـادە بـوون .

پاش نان خـواردن ئـەو برادەرانـە ( شـەماڵ و سـەرباز ) و برادەرەکانیـان بەرێکـەوتن بـۆ بنـاری کۆسرەت بەو نیازەی شەڕی براکوژی لە ئێستادا لە ئارادا نیە ، بۆ وەرگرتنی دەنگـو باس و نـان خواردن کاك شەماڵ و سەربازو کاك شۆڕش و سێ پێشمەرگەی تـر بـە ئوتومبیـل دەچـنە گونـدی باداوان لە دۆڵی خەلەکان لەلایەن تاقمێکی حزبـی سۆسیالیسـتی کوردسـتان و حزبـی شـیوعی عێراقی بەبێ دەنگ لێکردنیان و لێپرسـینەوە تەقـەیان لێدەکـەن لـە ئـەنجام دا هـەڤاڵ شـەماڵ و هەڤاڵ سەربازو دوو پێشمەرگەی تر لەگەڵیان بوون شەهید دەکرێن دوو پێشـمەرگەش رزگاریـان دەبێت یەکێك لەوانە کاك شۆڕش حاجی بوو .

شەهید بوونی ئەو چوار تێکۆشەرە رقو تورەیی پێشمەرگەکانی زیاتر کرد ئیسـگەی دەنگ گەلی کوردستان بە بەیانێك هەواڵی شەهید بوونی ئەو چوار تێکۆشـەرەی راگەیانـد ، زەمینە شەڕێکی گەورە خۆش کرا، بووە ئاگرێك سەرتاسەری کوردستانی گرتەوە .



# شەڕی مەڵبەندی یەك

## ناوچەی سلێمانی

یەکێك لە غەوشە هەرە گەورەکان بەڵکو لە بەڵایەکانی کورد ئەوە بوو هەندێ لە سەرکردەکان نەیاندەزانی چۆن ناوبانگ دەربکەن ، چۆن خۆیان لەناو کوردستانو خودی هێزەکەی خۆیان بەهێز بکەن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەرامە حەرامە شەڕی وایان دروست دەکرد جا خەڵك هەوەسی خۆیەتی بەباش لێکی دەداتەوە یان خراپ، گرنگ ئەوە بوو ئەو سەرکەوتوو بێت . لەراستیدا دەبێ هەر کردەوەیەك لەلایەن خەڵکەوە هەڵبسەنگێنرێ ..!؟

لە ١٩٨٣/٤ هێزەکانی ی.ن.ك بە فەرماندەی هەڤاڵ مەلا بەختیار هێرشیان کردە سەر هێزەکانی ح.س.ك و پ.د.ك لەناوچەی سلێمانی شەڕ چەند رۆژێ خایاند بەرەی جود شکانو لەناوچەکە کشانەوە پاش ئەوەی چەندینی تر لە لاوە فیداکارەکان شەهیدو بریندار کران .

کاك مەلا بەختیار رێککەوتن نامەیەکی لەگەڵ کاك بەهادین نوری لێپرسراوی هێزەکانی حزبی شیوعی عێراقی لە ناوچەی سلێمانی مۆر کردبوو، بە گوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە هێزەکانی حزبی شیوعی عێراقی خۆیان لەشەڕی ناوچەی سلێمانی دوور گرت . لە کاتێکدا هێزەکانی ح.ش.ع لە هەولێر زۆر بەگەرمی پیلانیان دادەرشت بۆ گرتنی مەڵبەندی چواری ی.ن.ك . ئەوەی لێرەدا جێگای سەرنج راکێشانە کاك مەلا بەختیار پاش ئەوەی لە ی.ن.ك جیابۆوە دەیان بلاوکراوەی نووسی دژی شەڕی براکوژی ، حزبە سیاسیەکانی دەکوتا بێ هەواڵ لەوەی کە خۆی رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە زۆربەی شەڕەکان بەتایبەتی شەڕی کانی سوور ، ناوچەی هەورامان ، مەڵبەندی یەك ، بۆیە هەقە بڵێین: پاش لێزمەو باران کە پەنگ بۆچی ..!؟.

هاوزەمان لەگەڵ شەڕی مەڵبەندی یەك ، چەند ووردە شەڕێك لە ناوچەی مەرگە روویدا کاك سەید برایم لەوێ لەلایەن پێشمەرگەکانی سۆسیالیست بە دیل گیرا . من نامەوێ لێرە ئۆباڵی شەڕی براکوژی بخەمە ئەستۆی لایەنێك ، هێزێك ، سەرکردەیەك ... ئەوەندە دەڵێم شەڕی براکوژی دەردی گەورەی بەسەر کورد هێنا هەر هەنگاوێك بەرەو خۆشکردنی شەڕی براکوژی قازانجێك بوو بەدوژمنی سەرەکی کورد گەیشت . وانەو پەندو عیبرەت دەبێ وەربگیرێ ، شەڕی براکوژی حەرام بکرێ، دەکرێ ناکۆکیەکان بەشێوەیەکی سیاسی چارەسەر بکرێ . دەرپەڕاندنی سەدان پێشمەرگە لە گۆڕەپانی خەبات سەرکەوتن نییە بەڵکو شکستیە ، بە زەرەری شۆڕشی کورد دەشکێتەوە ، دەبێ ئەو بیرکردنەوەیە بەیەکجاری لە مێشكو دڵو دەروونمان فرێ بدەین باسی چەك لەگەڵ

یەکتر نەکەین چونکە دەست دانە چەك لەیەکتر ، تێکدانی هەموو ئەو کارەیە کە چەندین ساڵە خەبات و تێکۆشانی بۆدەکەین ، هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو شتانەیە کە دروستمان کردوە . لەو کاتەدا لە گوندی بالیسان بووم بۆ ئەوەی پارێزگاری لە مەڵبەند بکەین بە ووردی چاوەڕوانی باری تازەمان دەکرد . پزیشکی ئاگری شەڕ لە ئێمەش نزیك دەکەوتەوە تا وای لێهات دڵی خۆشناوەتیشی گرتەوە .

# شەڕی بالیسان

# مەڵبەندی چوار

ئاگری شەڕ سەرانسەری کوردستانی گرتەوە، حزبە سیاسیەکانی هاوبەشی جەنگ، دابەش بوون بەسەر دوو بەرە :

**بەرەی جود** : پێك هاتبوو لە ( پ . د . ك ) ، ( ح . س . ك ) ، ( ح . ش . ع ) پاسۆك .

**بەرەی دووەم** : ی . ن . ك بوو .

بەرەی جود هەموو هێزەکانی خۆیان لە ناوچەی هەولێر کۆکردەوە ناوچەی بالیسان لە گوندەکانی توتمەو خەتێ و بالوکاوە ، بلەو بلە ...کۆکردەوە لووتکە گرنگو ستراتیژیەکانیان گرتو رەبایەیان لێدامەزراند . ژمارەی هێزەکانیان بە تەخمینی زۆر کەس لە هەزارو دووسەد پێشمەرگە تێنەدەپەڕی . بارەگای حزبی شیوعی عێراقی لە شێخ وەسانان بوو لە هەموو حزبەکانی ناو بەرەی جود بۆ بەستانەوەی هێزەکانیان لەکاتی شەڕ بەرە بەرە فیشەكو ئازوقەیان دابین دەکرد بۆ خزمەتی ئەو شەڕە . هێزەکانی ی.ن.ك لە گوندی بالیسان و بیراوە بوو ، بارەگای مەڵبەندی چوار لە بالیسان بوو ژمارەی هەموو ئەو پێشمەرگانەی شەڕ کەر بوون لە دوو سەد پێشمەرگە تێنەدەپەڕی ، هیچ شوێنێکی گرنگ بۆ شەڕ کردن لەدەستی هێزەکانی ئێمە نەبوو . مەڵبەندی سێ لە گوندی وەرتێ بوو بۆ رێگا گرتن لە هێزەکانی سەرکردایەتی بەرەی جود لە قرناقەو پشت ئاشان نەیانتوانی بێنە هاواری ئێمە . بۆدڵنیاکردنی هێزەکانی ی.ن.ك و بێ خەم کردنی لەسەر داوای ح.ش.ع رۆژی ٢٦/٤/١٩٨٣ داوای کۆبونەوە کرا بەو نیازە کە کتو پڕ لە هێزەکانمان بدەن ئەو رۆژە هەموو خەڵك بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی رێککەوتنی دەکرد ئێمەش پێمان وابوو شیوعیەکان شەڕمان لەگەڵ ناکەن . کات ژمێر (٩ ) شەو بوو شەهید سەید کەریم بەدوای ناردین کە چووم زۆر سەرقاڵ بوو وتی: هەر ئێستا کەرتی ئێوە دەبێ بچنە پشتی گوندی ( شریك ) کەلەپاڵ گوندی بالیسانە کەرتی دووی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی شەهید ئەحمەد قەمبەری‌وکاك عەلی نەبی لووتکەکانی پشت بالیسانیان گرت هەر زوو شوێنەکانی خۆمان گرت هێشتا تاریكو روون بوو، سەگ و گورگ لێك نەدەکرایەوە، هێشتا دارکەرو شوانو گاوانو بەرخەوان لەخەوی خۆشی بەهاردا بوون گرمەی ئاربیجیو رێژنەی تەقەی بی کەی سی کلاشینکوف لەتۆزوخۆڵی وەردایں، دەتووت هێرشە بۆ سەر شاری کەرکوکی داگیرکراو، لە هەموو لایەك هێرشمان کرایە سەر کە رۆژ گزنگی دا شوێنی یەکترمان بۆ ئاشکرا بوو ، ئینجا

بەنیشانە گوللە بۆ سینگی یەکتر ئاراستە دەکرا ، شەڕ درێژەی کێشا ، هەوریش لەداخی ئێمە ئاسمانی گرت، باران بە گوڕو لێزمە دەباری، بووە ڕۆژی حەشر لە شێخ وەسانان بەرەو بالیسان ، لەسەر لووتکەی بڵندی پشت توتمە بۆ سەر بالیسان ، لە بالوکاوە بۆ سەر بالیسان ، لەسەر لووتکەی دەراش بۆ سەر بالیسان هێرشی یەك لە دوا یەك لەلایەن جود دەکرا مەردانە بەرگریمان کرد ، هیچ کەسێك بڕوای نەدەکرد ئەو هێزە کەمەی یەکێتی بە قسەی هەندێ کەس (ئەو سەرکۆت و منالانە ) بتوانن بەرامبەر ئەو هێزە گەورە پڕ تاقیکردنەوەی شەڕ خۆی ڕابگرێ . لە قۆڵی شێخ وەسانان ئەوان هەندێك هاتبوونە پێشەوە لەوێ دوو پێشمەرگە کاك حەیدەر صادق و کاك عوسمان شەهید کران کاك شاخەوان بە سووکی بریندار بوو گوللەیەك بە جیهازەکەی کاك سەید کەریم کەوت لەوکاتەی قسەی لەگەڵ مامۆستا بەکر دەکرد . لە قۆڵەکانی تر نەهاتنە پێش باشتر بڵێم نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن. کەرتی چواری دەشتی هەولێر زۆر بەئاستەنگ توانیان بگەنە لای کەرتی دوو کەلە پشتی بالیسان بوو، کاك ئەحمەد کوردەش هاتە لای ئێمە هەندێ فیشەك و نانی بۆ هێنابووین ، لە کاتژمێر (٥) ی ئێوارە نامەیەکی کاك سەید کەریم هات کە ئەمە دەقەکەیەتی :

ی.ن.ك - مەڵبەندی چوار - بالیسان

برایانی بەڕێز ، هاوڕێیانی خۆشەویستم

کاك عەلی نەبی و کاك سابیر ڕەسوڵ

کاك ڕێباز

هاوڕێ کاوەو کاك سەفین

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

چاوەکانتان ماچ دەکەم ، چاوی یەکە یەکەی پێشمەرگەکان ماچ دەکەم ، بەڕاستی ئەو پیاوەتیەی ئەمڕۆ کردتان سەری ئێمەتان بەرز کردەوە، زۆر مەمنونی هەموتانم، تکایە کاتژمێر (٨) ی شەو لە بارەگای مەڵبەند ئامادە بن وە بە قسەش بە هەڵگری نامەم وتووە .

ئیتر هەر بژین و سەرکەوتوو بن .

برای دڵسۆزتان

سەید کەریم

١٩٨٣/٤/٢٧

که سەیری نامەکەم کرد ناوی ئەحمەد قەمبەری فەرماندەی کەرتی دووی تیا نەبوو، چونکە هەموومان فەرماندەی کەرت بووین، باشە بۆچی ناوی ئەو نەنووسراوە ؟ کاك سەفین جێگری فەرماندەی کەرتە نووسراوە. هەڵگری نامە دەیزانی چەند ئەحمەد قەمبەری خۆشەویست بوو لەلای من لە مێژە هاوڕێی خەباتو پێشمەرگایەتیمە، هەردەم لە دەشتی هەولێر بەیەکەوە دەگەڕاین زۆر پرسیارم لە هەڵگری نامە کرد، پاش ئەوەی ناچار بوو گریاو وتی: وا تەرمەکەی لە مزگەوتە شەهید بووە ... بەجارێ شڵەژام چۆن ئەحمەد قەمبەری هەژارو ڕەشو ڕووت، ئەحمەد قەمبەری پێشمەرگەی ١٩٧٦، ئەحمەد قەمبەری ئازاو زیرەك، وا بەناڕەوا شەهید بکرێت بە دەست خۆم نەبوو فرمێسك لە چاوم هاتە خوارێ، تەقەشمان لەسەر بوو ڕاستە پێشمەرگە دەبێت شەهید بێ شەهید بوون جێگای خۆی هەیە، لەسەرچی قارەمانێکی ئاوا بە دەستی پێشمەرگەی حزبێکی تر بکوژرێ. کاتژمێر (٨) گەیشتینەوە بارەگای مەڵبەند لەوێ کۆبووینەوە بڕیاردرا هێزەکانمان بکشێنینەوە هەموومان چووینە بێراوە، پاش پشوویەکی کورت بڕیاردرا ئێمە بەری مەڵەکان قایم بکەین چونکە لە مەڵەکانیش جود پێشڕەوی کردبوو ئەگەر دەرەشیرمان لێ بگیرایە ئەوە لێمان ڕوون بوو دەکەوتینە ئابڵوقە .

لەو شەڕە (٧) پێشمەرگەی ی.ن.ك و چەندین پێشمەرگەی جود شەهید کران لەوانە هەڤاڵ پێشڕەو لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی ڕەواندز، هەڤاڵ عوسمانو کاك بەکر توتمە لە حزبی سۆسیالیستی کوردستان وە بەدەیان پێشمەرگەش برینداربوون .

سەر لە نوێ بەرەی شەڕ دابەش کرایەوە، کەرتی ئێمە کەرتی چواری تیپی هەشتاو شەشی دەشتی هەولێرو تیپی مەڵبەندو تیپی باوەجی بە فەرماندەی کاك ملازم سمکۆ، دەرەشێرو دەرە زێوەو سەر دەرەدارو کوێستانەکانی ساوسێوەکەمان بۆ دانرا پاش چەند ڕۆژێك کاك د . کەمال خۆشناو هاتە لامان، کاك سەید کەریمو ماوەی هێزەکانی ت٨٦ و هێزەکانی تر لە گوندی بێراوەو شێری مانەوە، بەرەی جود کۆنترۆڵی جادەی گشتی خەلیفان - چوارقوڕنەیان کردو زۆر ئەزیەتی کەسو کاری ئەو پێشمەرگانەیاندا کە لەگەڵ ی.ن.ك بوون .

لایەنە سیاسیەکانی کوردستان هەر بەوەندە نەدەوەستان بەڵکو زۆرجار کەسو کاری یەکتریان ئەزیەت دەداو بێ ڕێزییان پێدەکردن دۆستو لایەنگری یەکتریان دەخستە بەر تانەو جنێو و لێدان داخەکەم ئەوە لە حزبە سیاسییەکان نەدەوەشایەوە ..!؟

هەرچەندە ئەو کات کەمێ لەسەرخۆ بیرمان نەدەکردەوە کەچی ئێستا پاش ئەوەی ئەو هەموو زەرەرو زیانەمان لەیەکتردا، پاش ئەوەی هەندێك لە خەڵکی تێکۆشەر بەناچاری خۆی گۆڕییەوە خۆی پێ ڕانەگیرا ئێستا هەقە لە هەموو کاتو ساتێك ئەو ناخۆشیانە لەبەر چاو بگیرێ .

# شەڕەكانی قەندیل

## قرناقەو پشت ئاشان

قڕناقەو پشت ئاشانو ئاش كولكەو سوورە دێ و .. هتد چەند گوندێكی دلگیرو خنجیلانەن كە دەكەونە بناری چیای سەركەشی قەندیل. رژێمی عێراق لە ساڵی ١٩٧٨ وەكو سەرجەم گوندەكانی تری سەر سنوور ڕای گواستنەوە، خەڵكەكەی لە ئۆردوگا زۆرە ملێكان توند كرد . ئەو ناوچەیە چەند سەیری دەكەیت ئەوەندەی تر جوانو لەبارتر دەبێ . پاش ئەوەی ناكۆكیەكان لە نێوان هێزەكانی كوردستان توند بوو، حزبی شیوعی عێراقیو حزبی سۆسیالیستی كوردستان بارەگای سەركردایەتیان لە ناوچەی مەنگوڕ مامەش لە نۆكانو دۆڵە توو گواستەوە بۆ پشت ئاشانو قڕناقە لە ناوچەی ئاكۆیان. هەروەكو پێشتر باسمان كرد ، هێزەكانی جود بارەگای مەڵبەندی چواری یەكێتی نیشتمانی كوردستانیان گرتبوو، مەترسی زۆریش دەكرا هێرش بكەنە سەر مەڵبەندی سێ لە گوندی وەرتێ ئەگەر ئەو پیلانەی جود سەركەوتایە دەبوایە ی.ن.ك هەموو هێزەكانی لە پارێزگای هەولێر بكێشێتەوەو گۆڕەپانی خەبات چۆڵ بكات بۆ بەرەی جود تا ئەو كاتە تەرازووی هێزەكان لە سەرانسەری كوردستان لە بەرژەوەندی ی.ن.ك بوو گەرچی لە ناوچەكانی هەولێر بەرەی جود بە هەموو حزبە سیاسیەكانیەوە ژمارەی پ . م یان زیاتر بوو ، ی.ن.ك لە كۆكردنەوەو سازدانو خستنە جۆشی هێزی پێشمەرگە نموونەی زۆر كەم بووە لە شۆڕشەكانی گەلی كورد بۆیە هەر كاتێك بیویستایە هێزەكانی لەیەك شوێن كۆدەكردەوە سەرەڕای دووری شوێنەكانیان، بە پێچەوانەوە هێزەكانی لایەنەكانی تر بە ئاستەنگ كۆدەبوونەوە، وە خۆیان بەر پرسیار نەدەزانی لە شكانی هێزەكانی دووری خۆیان هەرچەندە لەیەك رێكخراویش بوون بە تایبەتی حزبی سۆسیالیستی كوردستان كە لەناو ریزەكانی بێسەرو بەریەكی بەرچاو و زەق دەبینرا هەر لێپرسراوێك بە ئارەزووی خۆی دەجولایەوە ، بۆیە بالا دەستی هێزەكانی یەكێتی جێی گومان نەبوو .

بۆ ساغ كردنەوەی ئەو كێشانەی كە دوو ساڵبوو لە نێوان هێزەكانو رزگار كردنی هێزەكانی مەڵبەندی چوار لە خۆشناوەتی هێزێكی گەورەی ی.ن.ك بە سەركردایەتی هەڤاڵ كاك نەوشیروان بەرەو دۆڵی قەلاتوكانو سیوەس و پشت ئاشان جولا لە رێگا لە نزیك دۆڵی رەزگەو مارەدو ئەو هێزەی یەكێتی لەلایەن هێزەكانی رژێمی عێراق زۆر بەخەستی تۆپبارانكرا . بووە هۆی شەهید

بوونی حەوت پێشمەرگە لەوانە کاك بێستون جێگری فەرمانـدەی ت٢١ ی کەرکوك‌و برینـدار بوونی دەیانی تر، هەرچەندە ئەو تۆپ بارانە توانی زیانی قورس بەو هێزە بگەیەنێ بەڵام نەیتوانی ڕێگای پێ بگرێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئامانجەی بۆی هاتبوو .

هێزەکانی جود زانیاری تەواویان لەسەر ئەو هێزە نەبوو لە دۆڵی پشت ئاشان تەنیا دەوری بارەگای سەرکردەکانیان قایم کردبوو، لەیاسای شەڕکردن دەبێ هەمیشە دوور لە بارەگا سەرەکیەکان سەنگەر بگری، چونکە شەڕ گەیشتنە سەر بارەگای سەرکردایەتی پشێوی دروست دەکات‌و شەڕ کردن ئاستەنگ دەبێ .

هێزەکەی ی.ن.ك لەگەڵ ڕۆژی کرێکارانی جیهانی پەلاماری بنکەکانی ئەو حزبانەی دا کە لەوێ بارەگایان هەبوو، بەماوەی بیست‌و چوار کاتژمێر هەموو بنکەو بارەگاو لووتکە بەرزەکان دەستی بەسەردا گیرا، شوێنەواری ئەو حزبانەی تێدا نەما. لەو شەڕە پشتی هێزەکانی حزبی شیوعی عێراق‌و حزبی سۆسیالیستی کوردستان شکاو هەرچی کەل‌و پەل‌و پێویستیان هەبوو کەوتە بەر دەستی هێزەکانی ی.ن.ك . هەر لەوێ بەڕێز کاك کەریم ئەحمەد جێگری سکرتێری حزبی شیوعی عێراق بە دیل گیرا لەگەڵ دوو ئەندامی پایە بەرزیان ( کاك ئەحمەد بانی خێلانی‌و کاك ئەبو شوان ) ئەوانە کەوتنە قۆڵی شەهید ئەحمەد مەولود زۆر بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ کردن‌و لەلایەن کاك نەوشیروان قسەیان لەگەڵ کرا، پاشان ڕەوانەی سەرکردایەتی کران کە بەڕێز مام جەلال وتووێژی لەگەڵ کردن، هەڤاڵ کەریم ئەحمەدو بەڕێز مام جەلال بەیانێکی دوو قۆڵیان بلاوکردەوە بۆ ڕاگرتنی شەڕ بەڵام هاوڕێیانی حزبی شیوعی قسەی کاك کەریم ئەحمەدیان بە هەند هەڵنەگرت . وە (٤٢ ) پ.م ی حزبی شیوعیش بەدیل گیران پاش ماوەیەك ئازاد کران. سەرکردەکانی حزبی سۆسیالیست شارەزای ناوچەکە بوون زوو لە قەندیل ئاودیوی ئێران بوون هەرچەندە قەندیل لە مانگی مایس هێشتا بەفری زۆری لێ دەمێنێ .

لایەنەکانی بەرەی جود پاش کۆتایی شەڕ پاش ئەوەی لە دیوی ئێران پشوویاندا دەستیان کرد بە پڕوپاگەندە گوایە هێزەکانی ی.ن.ك بێ ڕێزیان بە ئافرەتی ئەو حزبانە کردووە .. هەرچەند من بەشداریم لەو شەڕە نەبووە، دۆست‌و برادەری زۆرم هەبوو کە بەشداری تێدا کردووە زۆر پرسیارم کرد؟ تا ئەو مەسەلەیەم بۆ ساغ بێتەوە کەچی لە هیچ کەسێکم گوێ لێ نەبووە ڕەفتاری خراپ کرا بێ ... ناهەقی ئەو حزبانەش ناگرم چونکە پاش شکاندنیان دەبێ هەر ئەو جۆرە قسەو پڕوپاگەندانە بکەن ..!؟

شەڕی قەندیل دەرگای وتووێژی لە نێوان لایەنە سیاسی یە ناکۆکەکانی کوردستان داخستو هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی گەورە دژی ی.ن.ك کەوتە کار ، چەندین حزب و رێکخراو نارەزایییان دژی یەکێتی دەربڕی لەوانە : الجبهة الديموقراطية لتحرير فلسطين - نايف حواتمة، الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين - جورج حبش، حزبی شیوعی سوری، حزبی شیوعی سعودی، حزبی شیوعی ئەردەنی حزبی شیوعی ئیتالی، حزبی شیوعی فەرەنسی ، حزبی شیوعی بەریتانی، بەرەی رزگاری بەحرەین، چەندینی تر لە حزبەکانی دنیا .

لە ١٠/٥/١٩٨٣ هێزەکەی ی.ن.ك لە وەرتێ بەرێکەوت بۆ دۆڵی خۆشناوەتی چونکە تا ئەو کاتە زیاتر لە هەزار پێشمەرگەی شیوعی‌و سۆسیالیست‌و پارتی لە دۆڵی بالیسان‌و مەلەکان سەنگەریان گرتبوو. نیوەڕۆ بوو لەرێگا کاك نەوشیروانم بینی لەسەر کانی ساوسێوەکە نانی نیوەڕۆمان خوارد ، کاك رۆستەم فەرماندەی ت ٢١ ی کەرکوك، کاك سامان ف ت ٥١ ی گەرمیان، مامە ریشە فەرماندەی کەرتی چواری جەباری لەگەڵ بوو پاش شاد بوونەوە بەیەك کاك نەوشیروان بە درێژی باسی ئەو شەڕەی قەندیلی بۆ گێرامەوە ، لە ناخی خۆم زۆر دڵگیر بووم برادەرانیش پێدەکەنین، دەمزانی چەند زەرەرە بۆ گەلەکەمان ئەوە شەڕی یەکتری کوشتنە بەڵام هیچ چارەم نەبوو. بە هاتنی ئەو هێزەی بەرەی جود هەڵوێستێکی ژیرانەیان وەرگرت بەبێ شەڕ ناوچەکەیان چۆڵ کرد بە بۆچونی خۆم هەنگاوێکی باشیان نا چونکە شەڕ بووایە بە دەیان پێشمەرگەی تریش شەهید دەکران بەم جۆرە هەموو ناوچەی سۆران کەوتە ژێر دەسەڵاتی ی.ن.ك پارتی هێزەکانی بردەوە سێ سنوور، شیوعیەکان خۆیان ونکرد، سۆسیالیستەکان هێزەکانیان گەڕانەوە دەشتی هەولێرو دۆڵی سماقوڵی بەو خەیاڵەی شەڕی پارتیزانی لەگەڵ ی.ن.ك بکەن لە پاشان بێ سەروبەر کران‌و بوونە ئاردی ناو درك . کاك قادر عەزیز هەر زوو گەڕایەوە سەرکردایەتی کە تازە لە زێوکەو مشکان نیشتەجێ ببو . دەرکردنی دوو هەزار پێشمەرگەی شیوعی‌و پارتی‌و سۆسیالیست‌و پاسۆك لە کوردستان زەرەرێکی گەورە بوو لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد کەوت، شەڕکردنی ئەو دوو هەزار پێشمەرگەیە لەگەڵ دوژمن‌و یارمەتی دانی ی.ن.ك دەبووە هۆی بەرەو پێشچوونی شۆڕش، جگە لەوەش حکومەتی عێراق لەو ماوە دوورو درێژە هەر سەیری شەڕی کورد بە کوردی دەکرد بێ ئەوەی هیچ زیانێکی لێبکەوێت لەوانەش خراپترو لەسەر هەمووش شۆڕشی کوردستان دەیان بگرە سەدان رۆڵەی بە وەفای لە دەستدا ، دیارە لەو شەڕەش هێشتا دەرس‌و پەندمان وەرنەگرتبوو بۆیە چەندین جار تووشی شەڕی براکوژی بووینەوە گەورەترین‌و سامناك ترین شەڕ شەڕی قەندیلی دووەم بوو کەلە مانگی

١٩٨٣/٨ ڕووی دا زیاتر لە بیست شەو و ڕۆژی خایاند، زیاتر لە سەد ڕۆڵەی تێکۆشەری گەلەکەمان لە هیچ‌و خۆڕایی گیانیان لە دەستدا، ئەو برینە زیاتر تەشەنەی سەند تا ماوەیەکی دوور و درێژ هێزەکانی کوردستان نەیانتوانی ئەو برینەو برینەکانی تر سارێژ بکەن .

ئەگەر بە ووردی ڕووداوەکان بخەینە یاد دەبینین نزیکەی نۆ مانگی تەواو هێزەکانی کوردستان خەریکی یەکتری بوون یەکەم ڕووداو لە گوندی (ئاوماڵ) لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٨٣ دەستی پێکردو شەڕی قەندیلی دووەم لە ١٩٨٣/٩/١ کۆتایی بە شەڕەکان هێنا لە نێوان ئەو دوو مێژووە بە دەیان وورده شەڕ کراوە، هەرچی توانای مرۆیی‌و دارایی حزبەکان هەبوو لە خزمەت ئەو شەڕە نەخوازراوەدا دانرا کە دەبووایە ئەو هێزو توانا زۆرە لە خزمەتی ڕزگارکردنی شوێنێکی ستراتیژی کوردستان دابنرایە .

شۆڕشگێڕان دەبێ هەمیشە ڕێزی دیل بگرن داخەکەم لەو شەڕە ناوخۆییانەدا کاری ناجوامێرانە کران چەندین دیلیش کوژران بێئەوەی هیچ کەس هەست بەو لێپرسراوێتیە گەورەیە بکات ڕۆژێك دەبێ ناوی هەموو دیلەکان بنووسرێنەوە چونکە بە هەق زوڵمیان لێکرا ..!؟ شەڕی قەندیل گەلی کوردیشی کردە دوو بەش جا نازانم کام بەشی لەسەر هەق بوو ..!؟

## هاتنی مام جەلال بۆ دۆڵی خۆشناوەتی

پاش ئەوەی هێزەکانی جود لەناوچەی سۆران شکستیان خواردو بەرەو بادینان رۆیشتن، بەشێوەی پارتیزانی هەندێ مەفرەزەیان لە ناوچەکانی خۆشناوەتی، گەرەوان، دەشتی هەولێر بلاوکردەوە هێزەکانی ی.ن.ك بواری نەدان خۆیان رێك بخەنەوە ، لە زۆر شوێن تووشی شەڕ هاتن بووە هۆی شەهید بوونی چەندانیان ، هەندێکیان خۆیان دایەوە دەست رژێم لەبەر دوو هۆ :

**یەکەمیان :** هەندێك لە پێشمەرگەکان تەنیا پێیان وابوو شۆڕش کردن کارێکی ئاسانە، ماندوو ببوون، هەندێك توانای ئەو ململانێیەیان نەبوو، بەو بیانووە خۆیان تەسلیم کردەوە .

**دووەمیان :** هەندێکیان نا ئومێد بوونو بڕوایان بەو شەڕە نەبوو هەر بۆ گەلی کورد هاتبوون ، تووشی رەشبینی هاتن رێگای خۆ تەسلیم کردنەوەیان هەڵبژارد

کەرتی ئێمەوکەرتی یەکی ت ٨٣ ی هەورێ بە فەرماندەی کاك تەحسین کاوانیو تیپی سەرگرمە رەوانەی گەرەوان کران بۆئەوەی شوێنەکانی مەفرەزە پارتیزانەکانی حزبی سۆسیالیست تەسك بکەنەوە کە ئەو کات کاك عەبدوڵا بۆرو کاك سەباحە رەش لە ناوچەکە بوون ( کاك عەبدوڵا بۆر لەپاشان بووە کادیرێکی لێهاتووی هێزی پێشمەرگەی کوردستانو فەرماندەی ت ١٢ ی سۆرانو بەداخەوە کاك سەباحیش لەو روداوانەدا شەهید کرا ) .

پاش ماوەیەك لە کۆتایی مانگی ١٩٨٣/٥ شەهید سەید کەریم هاتە لامان بەرەو وەرتێ دەچوو پرسیاری خۆیمان لێکرد بە نهێنی بە ئێمەی وت: دەچمە پێشوازی مام جەلال دێتەوەرتێ: مام جەلال هەمیشە بۆ سەفەری دووری ناو کوردستان سەید کەریمی لەگەڵ خۆی دەبرد چونکە پیاوێکی گورجو گۆڵ و ئازاو چاو نەترسو بە هیمەت بوو، ماندوو بونی بە خەیاڵدا نەدەهات .
پاش چەند رۆژێك بەڕێز مام جەلال گەیشتە وەرتێ یەکسەر بیەم لە مفاوەزات کردەوە پێم وابوو دەبێ ئێمە لەگەڵ رژێم بیر لە رێکەوتنێك بکەینەوە چونکە ئێران هەڕەشەی گرتنی سەرکردایەتی( ی.ن.ك) ی دەکرد، هێرشەکانی ئێران بۆسەر کوردستان خەریك بوو دەست پێبکات عێراقو ئێران شەڕەکەیان دەخستە کوردستان بێگومان شەڕەکە دەکەوتە شوێنی هێزەکانی ئێمە ، هەردووکیان دوژمن بوو ، سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ جود شەڕمان بەردەوام بوو شەڕ کردنیش لەگەڵ عێراق و ئێران کارێکی یەکجار ئاستەنگ بوو بۆ ی . ن . ك .

هاتنی هێزەکانی ئێران بۆ کوردستانی عێراق بە واتای هێنانی هەندێ حزب و رێکخراوی کوردیو عێراقی بوو بۆ ناوچەکە کە هەموویان دژی ئێمە بوون بۆیە بیرکردنەوە لە مفاوەزات

ڕێگای ڕاست بوو جێگای خۆی بوو ... لە ناوچەی گەرەوان لە گەرمەی بەهار خەلك ئیش‌وكاری زۆر بە دەستەوەیە دەست دەكات بە ڕێكخستنی زەوی‌وزار بۆ دابینكردنی ژیانی، پێشمەرگەكانی ئێمە لەوێ بوون خەلكی گوند داوایان لێكردین كە پێشمەرگە یارمەتیان بدات ئێمەش ئەو داوایەمان پەسەند كرد هەر تاقمێك پێشمەرگە لەگەڵ ماڵێك دەستی بەكار كرد بە ڕاستی بە جوانی ئەو ڕاستیەم بۆ ئاشكرا بوو كە دەبێ پێشمەرگە هەمیشە لەگەڵ جووتیارەكان كار بكات.

نیوەڕۆیەك ناردمان تەماتەمان بۆ بهێنن لە ( ڕەواندز كە بە ئۆتومبیل ١٥ دەقیقە دوورە لە گەرەوان ) لە مزگەوتەكە تەماتەمان سور كردەوە، ئێمە چەند پێشمەرگەیەك بووین ئەوانی تر لەگەڵ خەڵكەكە كاریان دەكرد. دوو كادیری ئێمە دەیانزانی من حەز دەكەم مفاوەزات بێت بۆئەوەی بەزمێك ساز بكەین ، شەهید شەوقی و مامۆستا ئەحمەد تەسجیلێكی بچوكیان هەبوو، لە دەرەوە دوو سێ سروودی عێراقیان بە زمانی عەرەبی تەسجیل كردبوو ( لەشەڕی عێراق - ئێران ، عێراقیەكان سرودی خۆشیان لێدەدا ) پاش دوو سرودەكە بە دەنگی شەوقی كە دەنگی زۆر لە دەنگی ( رشدی عبد الصاحب - موزیعی ئێزگەی بەغدا ) دەچوو ئەم ڕستەیەیان تۆمار كردبوو ( نسترعی انتباه المواطنین الكرام اننا سنذیع فی تمام الساعة الثامنة من مساء هذا الیوم بیانا هاما صادرا عن مجلس قیادة الثورة حول تطویر الحكم الذاتی لمنطقة كردستان بالتشاور مع المكتب السیاسی للاتحاد الوطنی الكردستانی ) بە ئەسپایی هاتنە تەنیشتم من ڕاكشا بووم دەنگی سرودەكانم گوێ لێبوو وتم: توخوا تۆزێك دەنگی زیاد بكەن كە سروودەكە تەواو بوو ئەو بەیانەی كەلە سەرەوە نووسراوە خوێندیەوە، لەناكاو ڕاپەڕیم بۆ دڵنیا كردن دووجار لەسەر یەك تۆمار كرابوو، وتم: هەستن مفاوەزاتە ... نەمووت: لە خۆڕای نییە مام جەلال لەو وەرتێ یە ... بووبە هەڵڵا پێشمەرگەكان دەستیان برد بۆ چەكەكانیان‌و ویستیان لە خۆشیان تەقە بكەن ئەوان نەیانهێشت ، دوو پێشمەرگەم تێگەیاند كە بچن لە ڕەواندز ئۆتۆمبیل بهێنن كاك تەحسین كاوانی لە نزیك من بوو، دەستم گرت‌و بەقایم بە ئەرزەكەم دادا وتم: هەستە تەواو مفاوەزاتە ئەویش وەكو من بڕوای كرد وتم: من دەڵێم مام جەلال شتێكی لە بن سەرە هەر بڕوات نەدەكرد ..! شەهید شەوقی‌و مامۆستا ئەحمەد كە زانیان پێشمەرگە دەڕوا بۆ ڕەواندز واتای ئەوەیە دەگیرێن وا خەریكە پێشمەرگە دەست بكات بەتەقەی خۆشی خەریكە ببێتە شایی‌و هەڵڵا دەستیان كرد بە سوێند خواردن كە ئەوە ڕاست نییە تەسجیل كراوە سەیر ئەوە بوو بڕوامان نەدەكرد ئەوە تەسجیل كراوە .

که مەسەلەکەمان بۆ ساغ بۆوە بە جارێ دڵمان شکاو هەر دەتووت ئاوی ساردمان پیاکراوە..
بەڕاستی چەند دەقیقەیەکی زۆر خۆشبوو لە ژیانمدا زۆرجار ئەو مەسەلەیە بۆ برادەران دەگێڕمەوە. ناهەق نەبووین هەندێکمان حەوت هەشت ساڵ بوو لە خەباتی چەکداری دابووین، رۆژانە ژیانمان لە مەترسی دا بوو ، دوور بووین لە شار ، لەشەڕو شۆڕی قورس ولابەلا وەرس ببووین نایشارمەوە دەمانویست وێرا بگەین دەستمان لە شەهادەیەك گیر ببێ چونکە دەمانزانی چەرچی و پەرچی بە زمانی لووسیان دەسکەوتی میللەت زەوت دەکەن ؟
زروفی ئەو کاتی شۆڕش سەخت بوو ، ی . ن . ك چوار دەوری بە دوژمن تەنرابوو ، ئێرانیەکان هەرەشەیان لێ دەکردین عێراقیش لیوا روکن ( ماهر عبدالرشید ) کە یەکێکە لە سەرکردە دڕندەکانی عەسکەری بەعس بە قائیدی فەیلەقی یەك هاتبووە کەرکوك هەڕەشەی لە جووتیاران دەکرد لەگەڵ بەرەی جود ناکۆکیەکان بەرەو توندی دەڕۆیشت لەو هەل و مەرجە دەکرا لەگەڵ حکومەتی عێراق رێك بکەوین ئەگەر مافەکانی گەلی کورد بسەلمێندایە . پاش چەند رۆژێك گەراینەوە دۆڵی بالیسان لە ١٩٨٣/٦/٢١ مام جەلال گەیشتە دۆڵی بالیسان بارەگای لە گوندی (خەتێ ) دامەزراند لە سەرەتای مانگی تەموز هێزی پێشمەرگەی کوردستان زنجیرەیەك چالاکی گەورەی لە سەرانسەری کوردستان ئەنجام دا چەندین سەرباز و نۆکەری رژێمی بەعسیان کوشت و چەك و دەسکەوتی چاکیان دەسکەوت بوو . ئەو زەبرە کوشندانە لە کاتێك بوو حکومەتی عێراق وای دەزانی کە ی . ن . ك پاش شەڕەکانی لەگەڵ بەرەی جود زۆر لاواز بووە .بەهاتنی مام جەلال بۆ ناوچەی خۆشناوەتی خەڵکەکە زیاتر بەلای ی . ن . ك هاتن ، سەرکردایەتی توانی لە هەموو گیروگرفتەکانی خەڵك و پێشمەرگە بگات ، خەڵك بە ئاسانی دەیتوانی شکایەت لەلای مام جەلال و کاك نەوشیروان لە لێپرسراوانی عەسکەری و تەنزیمی ناوچەکان بکات . هەر لەوێ بڕیاردرا کۆبوونەوەی ی . ن . ك ببەسترێ لەو کۆبوونەوەیە ئاڵوگۆڕی گرنگ کرا هەر لەوێش بڕیاردرا ئەگەر رژێم دان بە مافەکانی گەلی کورددا بنێ مفاوەزاتی لەگەڵ ئەنجام دەدرێ ئیتر قۆناغێکی تری خەبات و تێکۆشان لە کوردستان دەستی پێ کردەوە ، ئەوەی جێگای داخە بەهۆی رووداوی ئوتومبیل سەرکردەیەکی دڵسۆزو دلێر وزانای کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان گیانی لە دەست دا ، شەهید مامۆستا جەمال پاڵەوانی زیندانەکانی بەعس لە هەل و مەرجێکی ناسك و دۆست و پێشمەرگەکانی بەجێ هێشت ئەویش گەیشتە کاروانی نەمرانی کوردستان مامۆستا جەمال لێ پرسراوی بەشی رێکخستن بوو لە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان .

# شەڕی قەندیلی دووەم

شەڕی قەندیل گرنگی خۆی هەیە لە مێژووی گەلی کوردمان لەبەرئەوەی چارەنووسی حزبە سیاسیەکانی سەر گۆڕەپانی کوردایەتی لێ دیاری کرا، ناکرێ لێرە کتو مت باسی شەڕەکە بگێڕمەوە چونکە هەلو مەرجی ئێستا ئەو ڕێگایەم پێ ناداو هەم ئەو هەویرەش ئاوی زۆر دەوێ هەر بۆئەوەی شەڕەکە بارو دۆخی لە یاد نەچێ دەمەوێ بە کورتی بیخەمە سەر کاغەز .

ڕژێمی ئێران لە ۱۹۸۳/۷/۲۲ هێرشێکی گەورەی کردە سەر ناوچەی حاجی ئۆمەران (کۆدۆ - گرد مەندیلی) گرت بە هەزاران کەس لە سەربازەکانی عێراقی کوشتو بریندار کرد (گرد مەندیل) لووتکەیەکی بەرزە قەزای چۆمان کۆنترۆڵ دەکات بە تەواوەتی کەوتە دەستی ئێران (شیوەڕەش ، ماوەتان ، حاجی ئۆمەران ، خەلان ، زینۆی ئالانە ، ئازادی ، بابەکراوە ، رایات ، رەشمەێ گوندە ژێر و گەلە ژێر) لەلایەن ئێرانیەکان داگیرکرا . ڕژێمی عێراق لە مێژ ساڵە دەیویست کوردستان بە چۆڵی بهێنێتەوە هەلی بەدەست کەوت بە بیانووی پاراستنی گیانی خەڵك ، چۆمانو ناو پردانو دەربەندی رایاتو قەسرۆکیان گواستەوە خەڵك زەرەرو زیانی زۆری لێکەوت .

هاوکات لەگەڵ هێرشەکانی ئێران هێزەکانی جود بناری قەندیلیان کۆنترۆڵ کرد بەشێك لە جادەی گشتی سەنگەسەر - حافیز لە ژێر دەسەڵاتی ئەوان دابوو، پەرینەوەی هێزەکانی جود بۆ وەرتێ دەبووە هۆی ئەوەی ی.ن.ك نەتوانێ جوڵانی بە ئارەزووی خۆی بێت تا ئەو کاتەش هیچ ڕێکەوتن نامەیەك لە نێوان ی.ن.ك و جود مۆر نەکرابوو بە چاوی دوژمنانە سەیری یەکتر دەکرا بۆیە سروشتییە ی.ن.ك پێش لەو هێزە بگرێو ڕێگا نەدا هێزەکانی بکەونە مەترسی .

لە هەمان ڕۆژ ئێمە بەرێکەوتین لەگەڵ شەهید سەید کەریم تاکو ۱۹۸۳/۸/۱۳ هیچ شەڕو پێك دادانێك رووی نەدا زۆر هەوڵ درا بۆ ئەوەی شەڕ روونەدات دیارە هیچ لایەك بەرژەوەندی خۆی نەدەگۆڕیەوە بە بەرژەوەندی گەورەی میللەت بۆیە لە ۱۹۸۳/۸/۱۳ شەڕ دەستی پێکرد تاکو ڕۆژی ۱۹۸۳/۹/۱ چەندین هێرشو هێرشی پێچەوانە لە هەردوولا کرا لە ۱۹۸۳/۹/۱ شەڕەکە بە شکانی بەرەی جود کۆتایی هات پاش ئەوەی نزیکەی سەد پێشمەرگەی کوردستان لە هەموو لایەنەکان شەهید بوون وە زیاتر لە سەد پێشمەرگەش بریندار کران ، زۆربەی هێزەکانی مەڵبەندی چوارو مەڵبەندی سێ و هێزێکی ت۲۱ ی کەرکوکی ی.ن.ك بەشداری ئەو شەڕەیان کرد لە بەرەی جودیش هێزەکانی پارتیو سۆسیالیستو شیوعی بەشداریان هەبوو .

جێگەی داخە لەو شەڕە بێ واتایەو پڕ واتایە ..! چەندین پێشمەرگەی خاوەن ئەزموونی شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن چەندین فەرماندەی پێشمەرگە شەهید کران لەوانە شەهید ئەحمەد مەولود، شەهید نازم حمە سلێمان شەهید حەسۆ میرخان، شەهید عەبدولرەحیم جسیم، شەهید صەلاح، شەهید حاجی مام ئەحمەد ... هتد شەڕی قەندیل دەرس و پەندی زۆر لێ وەرگیرا کۆتایی هێنا بە شەڕی گەورە لە نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردستانی ئێران و عێراقیش پاش ئەوەی لە یەکتر کوشتن وەڕست بوون پاش ئەوەی بە هەزاران رۆڵەی عێراق و ئێرانیان لەسەر چەند گردو شاخێکی کوردستان بە کوشتندا هەریەکە لە جێگای خۆی وەستا بەم جۆرە بەرەیەکی تازە لەشەڕی عێراق و ئێران دروست بوو ، کە راستەوخۆ کاری کردە سەر باری میللەتەکەمان و شۆڕشەکەی، هەندێ کەس بێ ئەوەی زانستیانە بیر بکاتەوە هەموو شەڕەکانی نێوان عێراق و ئێرانی بە قازانج دەزانی بە پێچەوانەوە شەڕەکانی کوردستان هەرچەند ئەو دوو دوژمنە بەر ببونە گیانی یەکتر بەڵام کاول کردنی کوردستانی لە دوا هات، ئێرانیەکان ناوچەی پێنجوێنیان گرت خەڵکەکەی ئەو ناوچانە ئاوارەو دەربەدەر بوون و هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش ناوچەی چالاکی پشودانی تسک تر دەبوو بە هەمان شێوە لە حاجی ئۆمەران و سیدەکان و هەڵەبجە . شەڕی دوژمنانی کوردستان ئەو کات بە قازانجی میللەتەکەمان دەگەڕێتەوە لە دەرەوەی کوردستان بێت .

شەڕی قەندیل دەسەڵاتی (ی.ن.ك) ی لە ناوچەی سۆران زیاد کرد ئاسۆی برایەتی و تەبایی دوور خستنەوە کرمی پیسی خستە دڵ و دەروونی جەماوەری گەلەکەمان، ئەو هەموو شەڕانە هیچ قازانجێکی نەبەخشی نە بۆ میللەتەکەمان نەبە لایەنە سیاسیەکان چونکە لەساڵی ١٩٨٨ هەموو تووشی یەك چارەنووس بووین ئەویش شکستی گەورەی شۆڕشەکەمان و گەلەکەمان کە بووە هۆی شەهید بوونی دەیان هەزار کەس و کاول کردنی هەموو کوردستان دیارە شەقی زەمانە هەموانی بەیەکەوە کردە دۆستی حکومەتی ئێران .

# شەڕی بێتواتە

شەڕی بێتواتە گرنگی تایبەتی هەیە لە شۆڕشی نوێی گەلی کورد چونکە یەکەم جار بوو پاش شۆڕشی ئەیلول ناحیەیەك رزگار بکرێو هێزی پێشمەرگەی کوردستان تێپەڕیو زیاتر بەرگری لێبکات .

وە یەکەمین جاریش بوو لە شۆڕشی نوێی کوردستان شەڕێکی وا رووبەروو لەگەڵ دوژمن لە قوڵایی کوردستان بکرێت . شەڕی بێتواتە خەونو خەیاڵەکانی دوژمنی پوچەڵ کردەوە کە گوایە ی.ن.ك پاش ئەو زنجیرە شەڕە دوورو درێژانە لەگەڵ بەرەی جود توانای شەڕ کردنی نەماوە، وە دەتوانرێ بە ئاسانی قوت بدرێ . بە پێچەوانەوە خۆراکی پێشمەرگە شەڕکردنە هەرچەند شەڕی براکوژی شەڕێکی نابەرانبەر بوو ..!؟

گرنگییەکی ئەم شەڕە دەمکوت کردنەوەی جاشەکان بوو کە هەر کاتێك هێزی پێشمەرگەی کوردستان بیەوێ وایان لێدەکاتو کەر چۆمیان دەکاتو دەرسیان دەداتێ ، خاڵێکی تری دیاری ئەو شەڕە برواو متمانەی خەڵکی بەهێز کرد بە شۆڕشو پێشمەرگەو ی.ن.ك ، پڕ چەك کردنی پێشمەرگەو فراوان کردنی ناوچە رزگار کراوەکان ئەنجامی شەڕی بێتواتە بوو. چەند جارێك پیلانی ئازادکردنی بێتواتە خرابووە بەر باسولێکۆڵینەوە بەڵام هیچیان سەری نەگرت چونکە سیخوڕی ناوخۆمان رژێمی ئاگادار ئەکردەوە .. !؟

دوژمن بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەو ناوچە گرنگو ستراتیژیە دەرپەڕێنێ دەیویست خەڵکەکە چەکدار بکاو بەگژ پێشمەرگەی بداتەوە بۆئەو مەبستە گلاوە لە رۆژەکانی ١٢ و ١٣ و ١٤ / ١٠/ ١٩٨٣ جاشەکانی ناوچەکە بە پاڵ پشتی تۆپو زرێپۆشو تانكو فرۆکەی دوژمن هێرشی بۆ دۆڵی بالیسانو لووتکە بەرزەکانی پشتی هەرتەلو زێوە دەستی پێکرد . هێزەکانی ی.ن.ك هیچ ئامادەییان نەبوو هێزەکان پەرتو بڵاو بوون، سەنگەریان نەگرتبوو هەندێك هێز زۆر دوور بوون لە ناوچەکە . یەکێك لە هونەرەکانی سەرکردایەتی ی.ن.ك لە سەرەتای شۆڕش تا ئێستا زۆر کۆکردنەوەی هێزەکانە هەر بۆیە مەڵبەندی چوار بەهۆی ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان کە ئەوکات بە دەنگی شۆڕشی عێراق ناسرا بوو ئەو ئیزگەیەی کە لە هەموو رووداوەکانی کوردستان رۆڵی گرنگی هەبووە داوای هێزەکانی کرد بە پەرۆشەوە تیپو کەرتو مەفرەزەکان بە دوای ئەو بانگەوازەوە هاتنو بە گوێرەی دوورو نزیکیان لە مەڵبەند گەیشتینە ناوچەکە .

کەرتی ئێمەو هەندێك پێشمەرگەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی شەهید مەلا ئاراس لە گوندی مێرگە سور سەنگەرمان گرت لە کاتژمێری (١٠) ی بەیانی رۆژی ١٤/١٠/١٩٨٣ هێزێکی گەورەی دوژمن بە جادەی گشتی چوارقوڕنە - خەلیفان بەرەو گوندی مێرگە سور هێرشی کرد نزیکەی چوار کاتژمێر شەڕمان کرد لە پاشان کشاینەوە بە کوردیەکەی خۆمان بلێین شکاین بەڕاستی نەمانتوانی چیتر بەرگری بکەین لەبەر زۆر هۆ، کەمی پێشمەرگە، شوێنی شەڕەکە تەختاییە ، نەگرتنی بەرزاییەکان، نەهاتنی پێشمەرگەی نوێ (هێزێکی زۆر لە چیوەو بالیسان بوون ) هیچیان بەهاوارمان نەهاتن تەنیا کەرتی یەکی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی شەهید هاوڕێ کاوە ئەویش لەڕێگا شەهیدێکیاندا . بە هەرحاڵ زۆر خۆمان یا باشتر بلێم خۆم بەشەرمەزار زانی بەڵام لەوە زیاتر لە دەستمان نەهات، گرتنی مێرگەسور بەرەی شەڕی کردەوە دوژمن دەیتوانی بە دۆشکە بارەگای مەڵبەند داگرتەوە .

شەوی ١٦-١٧/١٠/١٩٨٣ جاشەکان هێرشیان کردە سەر لووتکەی نوسك لە نێوان چیێوەو سەردۆڵ گرتیان کەلەلایەن پێشمەرگەکانی ت ٩٣ ی کۆیەو بە فەرماندەی کاك داناو ت٩٩ ی بیتوێن بە فەرماندەی عەبدولای عەلی پارێزگاری لێدەکرا. بە گرتنی لووتکەی نوسەك جاشەکان توانیان گوندەکانی ( سوێرە ، چیوەی سەروو ، چیوەی خواروو ، سەردۆڵ و نێوە ) بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانو خەڵکەکە بە زۆری زۆرداری چەکدار بکەن . ئەگەر هەتا دوێنێ خەڵکی ئەو گوندانە پشتیوانی پێشمەرگەیان دەکرد ئەوا ئەمڕۆ ببونە چەکداری رژێمو بەقازانجی ئەوان هێرشیان کردە سەر لووتکەی (مۆتە) پاش شەڕێکی دە کاتژمێری داگیریان کرد لەلایەن دوو کەرتی ت٨٥ ی بەڕانەتی پارێزگاری لێدەکرا بە فەرماندەی هەڤاڵان شەهید مەجیدە سورو شەهید جوامێر ، مۆتە لووتکەیەکی ستراتیژی بوو بە گرتنی زۆریەی ناوچەکە دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی دوژمن .

بەرەی ( هەورێ ) لەلایەن هەڤاڵ شەوکەت حاجی موشیر سەرپەرشتی دەکرا بە مەبەستی تۆقاندنی جاشەکان هێزێك هێرشی کردە سەر گوندی نێوە داخەکەم پێشمەرگەکان زۆر بێ رەحمانە، لەبیریان چوو بوو کەتا چەند رۆژێك پێش شەڕەکە یارمەتیان دەدان لەوێ پشویاندەدا کەوتنە گیانی خەڵك کاری نا شۆڕشگێرانەیان لە بەرامبەر ئەو خەڵکە کرد هەرچەند ئەو کات بڵاوکرایەوە کە گوایە شەست جاش کوژراوە کەچی لە راستیدا لە سەدا دەی ئەو قسەیە راست بوو .

بەرەی هەرتەل - زێوە - بەرزۆژە لەلایەن شەهید سەید کەریم سەرپەرشتی دەکرا لەوێ دوژمن شکستی خوارد زۆر کوشتاری لێکرا. بەرەی ماکۆک دەرە زێوە - دەرە هەرتەل لەلایەن حەسەن کوێستانی سەرپەرشتی دەکرا ، دوژمن نەیتوانی پێشڕەوی بەرچاو بکات و زەرەرو زیانی مەزنی گیانی لێکەوت .

پێویستە بگوترێ شەڕی بێتواتە راستەوخۆ لەلایەن بەڕێز مام جەلال لە دۆڵە رەقە سەرپەرشتی دەکرا، بۆ ئەوەی دوژمن هەست بە کۆبونەوەی پێشمەرگە نەکات زۆر بە شێوەی نهێنی چەند کەرتێکی شارەزا لە شەڕ گەیشتنە دۆڵە رەقە لە ٢٠و٢١/١٠/١٩٨٣ هێزێکی گەورەی مەڵبەندی سێ بە هاوکاری لەگەڵ کەرتی چواری جەباری بە فەرماندەی مامە ریشەو کەرتی سەرگرمە بە فەرماندەی شەهید حەمە رەش وە سەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلال هێرش کرایە سەر لووتکەی کەلاوەی دێوانە کە دەڕوانێتە سەر بێتواتە پاش شەڕێکی قورس‌و خوێناوی پێشمەرگەکان ئازایەتی‌و دلێری خۆیان نیشاندا ئەو لووتکە گرنگە ئازاد کرا بۆ بەیانی لە هەموو لایەك هێرش دەستی پێکرد، بێ تەقە ئەو گوندانەی بە زۆر چەکدار کرابوون چەکەکانیان فرێداو هەندێك لە ترسی ئەوەی پێشمەرگە تۆڵەیان لێنەکاتەوە سەرەتا رایان کرد پاش ئارام بوونەوەی دۆخەکە گەڕانەوە ، شەڕ کەوتە سەر بێتواتە پاش چەند کاتژمێرێك لە هەموو لایەك ئابڵۆقە دراو دوژمن کۆڵی داو فڕۆکەو تۆپ و تانك سوودی نەدان ، ئەوەی دوژمن بە دە رۆژ داگیری کرد هێزی پێشمەرگە بە شەو و رۆژێك رزگاری کردەوە بەڵکو زیاتریش ، پێش دەست پێکردنی شەڕەکە گوندەکانی ( بێ کێل ، بێتواتە ، دواوە ، ئەندیك ئەنگۆز ، شکارتە ) تۆپەکانی سەر بێتواتەو کەلاوی دێوانە هەموو لەژێر دەسەلاتی دوژمندابوو لە شەڕەکە ئەوانیشیان لەدەستدا ، سەربازو جاشەکانی رژێم کشانەوە گوندی سەروچاوە لە نزیك چوار قوڕنە، تەنیا سێ رەبایەی عەسکەری لە مێژ ساڵ بوو لەسەر ماکۆك خۆیان قایم کردبوو مانەوە. بە لێشاو گوندە چەکدارەکان چەکەکانیان تەسلیم بە پێشمەرگە دەکرد، بەرەو سەروچاوەو رانیەو چوار قوڕنە دەڕۆیشتن گوندەکانی ( هەرتەل ، زێوە ، بەرزۆژە ، هەرمك ، نواوە ، مێرگە سەر ، مەلۆك سوێرە ، چیوەی سەروو ، چیوەی خواروو ، بێتواتە ، دواوە ، بێ کێر ، ئەندیك ، ئەنگۆز ، شکارتە ) چۆڵ بوون خەلکەکەیان ئاوارە بوون بۆ پارێزگاری کردن لە بێتواتە دەبوایە قۆپی دێوانە بە قایمی بگیرێ بۆ ئەم مەبەستە هێزێکی ت ٩٩ ی بیتوێن بە فەرماندەی هەڤاڵ عەبدولای مام عەلی چوونە ئەو شوێنانە چەند رۆژێك ت ٨٥ ی بەرانەتی هەڵبژاردرا بۆئەوەی پێشمەرگەکان بگۆڕێ ئەو کات هەڤاڵ ملازم سمکۆ سەرتیپ بوو منیش تازە کرابووم بە جێگری

فەرماندەی تیپ کاك سمکۆ نەهاتە سەر شاخ فەرماندەی هێزەکانی شاخ بە من سپێردرا لەگەڵ هێزەکەی ئێمە کەرتێکی ت٩١ ی سەفین و لقی شۆڕشگێران بەرەو شاخ سەرکەوتن . لە کاتی گۆڕینی پێشمەرگەکان هەڤاڵ عبدولا مام عەلی هیچ ئاماژەی بە قۆپی کڵاوی دێوانە نەکرد وە ئێمە هەموو ئەو پێشمەرگانەمان گۆڕی کە لەوێ ئەرکی پاراستنیان هەبوو ، تاریك بوو تۆپ باران زۆر بە گەرمی بەردەوام بوو لەکاتی گۆڕین چەند پێشمەرگەیەکمان برینداربوو بەهەر حاڵ شەوێ زۆر بە وریایی سەنگەرمان گرت بەسەر مەفرەزەکان سوڕاینەوە بۆ پشکنینی سەنگەرەکان تەنیا شەهید سەردار سەعید سۆفیم لەگەڵ خۆم برد .

شەو لەلای کەرتی سێ بە فەرماندەی کاك مەلا سلێمان بووم ، کە بەیانی دنیا رووناك داهات سەری قۆپی دێوانە گیرابوو ، دەست رێژیان لێکردین ئەوان زۆر زاڵبوون چونکە شوێنی کڵاوی دێوانە بڵندە ، خۆمان راگرت بوارمان نەدان شوێنی ترمان لێبگرن تۆپ بارانی چڕیشمان لەسەر بەردەوام بوو .

گرتنەوەی کڵاوی دێوانە لە دەستدانی ئەو هەموو شەڕەی پێشوو بوو . واتای گرتنەوەی بێتواتە بوو ، واتای سەرکەوتنی دوژمن‌و شکانی ئێمە بوو ، راست دەرچوو بەیانی زوو بێتواتەشیان گرتەوە . کاك عەلی نەبی هاتە لامان وتی بڕیاری مام جەلالە دەبێ کڵاوی دێوانە بگرینەوە . من پێم وت ئێمە خۆمان ئەو شوێنە دەگرینەوە ئەگەر هەموومان بکوژرێین . لە کاتژمێر ٣ ی پاش نیوەڕۆ هێرشێکی بەهێزمان کردە سەر کڵاوی دێوانە هەرچەند شوێنەکانی ئێمە تەختایی بوو هی ئەوان بەرز بوو ، قایم و سەخت بوون ژمارەیان زۆر زۆرتر بوو پاش شەڕێکی دژوار و گران ئێمە بەسێ پێشمەرگە قۆپیەکەمان لێگرتن ، تۆپ باران لە هەموو لایەك دەستی پێکرد ، بریندار بووم کاك سەردار سەعید سۆفی وایزانی شەهید بووم گەڕایەوە سەرم کە زانی سەلامەتم بە تەنیا سەنگەرێکی تری لێوەرگرتن ، لە شوێنەکانی دەورو بەری بێتواتە کەرتی یەکی ت٩١ی سەفین بە فەرماندەی کاك یاسین کاوانی پێشڕەویان کرد لەو هەڵمەتە دلێرانەیە هەڤاڵان مەلا سلێمان و بورهان و ئەحمەد کوردە و کاك عەلی رۆڵی کاریگەریان گێڕا .

هاوکات لەگەڵ هێرش بۆسەر کڵاوی دێوانە تیپەکانی ت٩٣ ی کۆیە بەفەرماندەی کاك داناو ت٨٦ ی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی کاك شێخ جەعفەر هێرشیان بۆ سەر بێتواتە دەستی پێکرد پاش شەڕێکی کورت جاشەکان وەکو پیشەی باوك و باپیریان هەڵاتن و دەعبا لە پاشیان نەدەژیا .

ئیتر دوژمن نەیتوانی خۆی بگرێ بۆماوەی ساڵ و نیوێك ئەو هاوینە هەوارە دڵگیرە ، ئەو شوێنە گرنگە کەوتە ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەسکەوتی شەڕی بێتواتە بریتی بوو لە :

١. زیاتر لە ١٥٠٠ هەزارو پێنج سەد کلاشینکۆف .
٢. زیاتر لە سەد ڕەشاشی تکتاریۆف .
٣. دوو هاوەنی ١٢٠ ملم .
٤. بە سەدان هەزار فیشەك و تەقەمەنی .
٥. بە دەیان ئاریبجی و گوللە ئاریبجی .

لەشەڕی بێتواتە گەلێ کردەوەی ناشۆڕشگێرانە کرا کە هەرگیز نەدەبوایە هێزی پێشمەرگە بیکات ، ئەو جۆرە هەڵس و کەوتانە دوور بوو لە هەڵسووکەوتی پێشمەرگانە .

ڕاستە گوندەکان چەکیان هەڵگرتبوو ، ڕاستە چەك هەڵگرتن جاشایەتیە، ڕاستە چەکداربوونی دانیشتوانی لادێکان لەلایەن ڕژێم ناوچە ڕزگار کراوەکان تەسك دەکاتەوە ، ڕاستە هاتووچۆی پێشمەرگە ئاستەنگ دەبێ ، ڕاستە دەبوایە مەڵبەند بگوازێتەوە ، ڕاستە لە ڕووی سیاسی ی.ن.ك تووشی شکستی دەهات، بەڵام ئەو هەموو ڕاستیانەو گەلێکی تریش هەرگیز ڕێگا بە پێشمەرگە نادات دەست بە تالان و بڕۆ ، دەرگا لە ڕێسمە بردن . ئەو گوندانە تا دوێنێ جێگای پشودانی پێشمەرگە بوو ، دەنگ و باسی دوژمنیان بۆ پێشمەرگە دەهێنا ، نان و پێخۆریان بە پێشمەرگە دەدا ، دۆستایەتی تەواویان لەگەڵ شۆڕش هەبوو ، هەندێك لەوانە دۆست و ئەندامی ی . ن . ك بوون کەچی هەندێك لە پێشمەرگەکان هەڵسووکەوتی جاشانەیان دەکرد زۆر بێ ئابڕوانە چاویان لە مافوور ، مەڕ بزن مریشك ، هێلکەی ئەو جووتیارانە بوو بە بۆچوونی من ڕاو و ڕووت و بێ گوێدان لەناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەستی پێکرد هەندێك لە پێشمەرگەو مەسولەکان ئەو چەك و تەقەمەنیەشیان شاردەوە کە بە خوێنی چەندین پێشمەرگە دەسکەوت بوو.

هەرچەند سەرکردایەتی شۆڕش ماوەیەك خۆی تووڕەو توند کردو پەیمانیدا ئەو پاتە خۆرو بێ ئابڕوانە سزا بدات کەچی پاش ماوەیەك وەکو هەمیشە دیزە بە دەرخۆنە کرا بە ئومێدی ئەوەی کە جارێکی تر دووبارە نەبێتەوە .

ئەو کارە نا شۆڕشگێرانەیە ئەوەندە کاری لە مێشك و هەستم کرد وەخت بوو بە یەکجاری واز لە پێشمەرگایەتی بهێنم چونکە بە چاوی خۆم دەمبینی هەندێك لە لێپرسراوان تەلەفزێن ، سەماوەر ، مافوور ، شتی ناو ماڵیان پەنا دەدا پاشان دەتووت چۆن بەو لێپرسراوانە

میللەتێکی وا ستەم لێکراو رزگار دەکرێت . گریانم بۆ ماڵ و سەروەت و سامانی کوردان دەهات ، مانگاو مەڕو ماڵاتیان بە تالان ڕۆیشت لە بارەگاکان گۆشتیان دابەش دەکرد ، رژێمی بەعس وا زۆریان لێدەکات و ئێمەش بەو شێوەیە هەڵسووکەوتیان لەگەڵ دەکەین دەباشە ئەو خەڵکە بۆ کوێ بڕوات ئاسمان هەڵیان ناکێشێ و زەویش قوتیان نادا کەوتبوونە نێوان دوو بەرداش جا دەبێ چۆن ( هێردرابن ) حەیف پێشبڕکێ بوو لەسەر هەژاران ، جووتیارانی کورد ، جووتیارەکان ئەوەی بە پەنجا ساڵ کۆیان کردبۆوە کەوتە بەر دەستی پیاوی هەرچی و پەرچی .

بەڕێز مام جەلال لە کۆبوونەوەی ٢٥/١١/١٩٨٣ ئەو دیاردەیەی ریسوا کرد، لە کۆبوونەوەکەدا گریا ئەوەندە کاری تێکردبوو ، هەندێ کەس تووشی لێپێچینەوە بوون .

شەڕی بێتواتە پێویستی بە دراسەو لێکۆڵینەوەی درێژ هەیە هەم شەڕێکی نوێی بوو بەو سەنگەی کە کرا وەهەم کاری ناڕەوا کە دژی جووتیارەکان ئەنجام دراو کە لە پێشەوە باسم کرد شکانی دوژمن لە شەڕی بێتواتە قەوانە شڕەکەی بیر هێنایەوە کەوتە لێدانی ئەو دەهۆڵ و زوڕنایە بۆ ئەوەی وتووێژ لەگەڵ ی.ن.ک دەست پێبکات . دوژمنانی کورد بۆ تێك شکاندنی شۆڕشەکانی کوردستان هەمیشە سێ ڕێگا دەگرنە بەر :

١. بەکار هێنانی هێزی سەربازی و جاشە خۆماڵیەکان .

٢. مفاوەزات بۆئەوەی لێپرسراوان چەشە خۆر بکەن و خۆیان بەهێز بکەن .

٣. هاوکاری لەگەڵ یەکتر، دوژمنانی کورد پاش ئەوەی دوو ڕێگای سەرەوە بەکاردەهێنن سەرکەوتوو نابن. دیسان برایەتی خۆیان تازە دەکەنەوە پیلان دەگێڕن بۆ لەباربردنی کێشەی رەوای گەلەکەمان، مەسەلەی مفاوەزاتی ی . ن . ك لەگەڵ حکومەت زۆر باس و خواسی لەسەر بوو ، مەسەلەیەکی گرنگ و هەستیارە ناتوانم لە هەموو شتەکان بدوێم راستر بڵێم لە هەموو کون و قوژبنەکانی ئاشنا نیم تەنیا ئەوەندە دەخەمە بەر باس کە لێی دەزانم تاکو لە خەڵك و عەوام روون بێت . دۆست و ناحەزان و دوژمنانیش هەر کەسە بە ئارەزوو تەماشای خۆی ئەو کات ئەو مفاوەزاتەی لێك داوەتەوە هەریەکە لە روانگەی بیرو قازانجی تەسکی خۆی .

## مەسەلەی مفاوەزات

لەوەتەی کوردستان داگیر کراوە ، سەدان مفاوەزات لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان کراوە بۆئەوەی میللەتی کورد وەکو گەلانی دونیا بە سەربەستی ، سەرفرازی ، ئازاد بژی کەچی ئەو داگیر کەرانە هەرگیز بە مفاوەزات مافەکانی گەلی کوردیان نەسەلماندووە کوردستان وولاتێکی بە خێرو بەرەکەت و دەوڵەمەندە ، پڕە لە نەوت داگیرکەران بەزەبری هێز داگیریان کردوە بە قسەی خۆش و بە پارانەوە ، بە دوعا و نزا دەست لە داگیرکردنی هەڵناگرن . بە هەزاران رەبایەو مولگاو ئوردوویان لە کوردستان دامەزراندوە ، هەر بەهێزی گەلی کورد ئەو زوڵم و زۆریە لەسەر کورد هەڵدەگیرێ ، عەرەب ، فارس ، تورك ، سێ گەلی دراوسێ ی کورد خاکی کوردستان بە خاکی نەتەوەی خۆیان دەزانن ، تاك و تەرا لەو نەتەوەو دراوسێیانە بوونی کورد دەسەلێنن ، ئەگینا سەرۆك و پیاوە گەورەکانیان کوردستان بە خاکی نەتەوەی خۆیان دەزانن . میللەتی ئێمە لەو شوێنانە دەردەپەڕێنن کە خێرو بەرەکەتی زۆرە ، داگیرکەرانی کوردستان نەك هەر مافەکانی کورد نادەن بەڵکو نەیان ویستوە ونایانەوێ گوێیان لە ووشەی میللەتێك بێ بەناوی کورد .داگیرکەران نەك مافەکانمان نا سەلێنن بەڵکو بە ملیۆن خەڵکی کوردستانیان شەهید کردووە ، سەروەت و سامانیان بە تالان بردوە ، بێ حورمەتیان بە گەلەکەمان کردوە . داگیرکەران نەك چاوەڕێ ی ئەوەیان لێ ناکرێ کەدان بە میللەتی کورد بنێن بەڵکو دەیانەوێ لەرەگ و ریشەوە ئەو گەلە زوڵم لێ کراوە هەڵکێشن . دەیان سەرۆکی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بەلێنیان بە کورد داوە کە مافەکانیان بسەلێنن کەچی دوای ئەوەی خۆیان بەهێز زانیوە هەموو بەڵێن و قسەکانی خۆیان لەبیر کردوە دەستیان بە رەشەکوژی کورد کردیە . داواکانی کورد پێویستی بە مفاوەزات نی یە چونکە ئاشکرایە کوردیش گەلێکە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست پێش ئەو نەتەوە بالاّ دەستانە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بووە ، زەمان وای لە گەلی ئێمە کرد کە ژێر دەست بێت ، ناکۆکی نێوان خێڵ و پیاوە گەورەکانی کورد ، هەل و مەرجی دنیا ئەو هەقەی بە کورد نەدا کە بەسەربەستی بژی . کوردیش بۆ وەدەست هێنانی مافە رەواکانی خۆی هەموو رێگایەکی گرتووە ، شەڕ ، مفاوەزات لە هیچیان سەرکەوتوو نەبووە ، لە شەڕکردن تەرازووی هێزەکان و زروفی دنیا لە قازانجی نەبووە ، لە مفاوەزات گوێیان پێ نەداوە هەر بۆ ئەوە بوو رێگای تازە بدۆزنەوە بۆ لەبار چوونی شۆڕشەکەی .

• سەرەڕای ئەوەی گەلی کورد هەموو مافەکانی لێ زەوت کراوە هەر لە ووتووێژ دابووە بۆئەوەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە بەشێکی کەم لە داوایەکانیان بسەلێنن کەچی بێ هودە بووە زیاتر گەلی کوردستانیان خستۆتە ژێرباری گران، لە مێژووی نوێی ی گەلی کورد دەیان جار ووتووێژ لەگەڵ داگیرکەران کراوە هیچیان بە ئاکام نەگەیشتوون، دنیا هەمیشە بەرژەوەندی سەرووی بیو باوەڕ (المصلحة قبل المبادیء ) ڕەچاو دەکات خۆی لە ئاستی دڕندەیی ڕژێمە داگیرکەرەکان کەڕولاڵ کردووە هەندێ جار هاوکاری کردوون بۆئەوەی زیاتر کورد لە قوڕ نقوم بکەن .

کورد یەك ڕێگای لەبەردەم ماوەتەوە ئەویش شەڕ کردن بوو هەر تا بتوانێ مافی خۆی بسەلێنێ ، ئەگەر شۆڕشی کورد هیچ قازانجی نەبێ ئەوەی ساغ کردۆتەوە بێ شۆڕش کورد وجودی دەکەوێتە مەترسی ، ڕاستە شۆڕش کردن کارێکی ئاسان نی یە ماڵ وێرانی و کوشتن و بڕین و دەربەدەری بەلام کورد هەموو ڕێگاکانی تری لێ گیرا بوو ، هەڕەشەی گواستنەوەی هەموو کورد لە ئارا دابوو ، مەترسی دەکرا کوردستانی خواروو ببێتە عەرەبستان کوردستانی ڕۆژهەلات عەجەمستان ، سەروو تورکستان .... ئەگەر سەیرێکی تری مێژوو بکەین ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ئەو کات داگیرکەران مفاوەزاتیان لەگەڵ کورد کردوە کە خۆیان بێ هێز بوونە نەیان توانیە شۆڕشی کورد خامۆش بکەن .

هەندێ سەرانی گەلی کورد ئەوەندە حەزیان بە ئازادی کوردستان کردوە لە ئەنجام تووشی هەڵەی گەورە بوونە بۆ وەرگرتنی مافەکانی گەلی کورد لە پارچەیەکی داگیرکراو پشتیان بە داگیرکەری پارچەکەی تر بەستاوە ، باشتر بلێم ویستویانە سوود لە ناکۆکی داگیرکەران وەربگرن کەچی داگیرکەران ئەوەندە زۆڵ و تەلەکە بازن کە مەترسی ڕزگاری پارچەیەك لە کوردستان وەبەر گوێیان دەکەوێ ناکۆکیەکانیان وەلا دەنێن دەکەونە پیلان دانانەوە بۆ کوژانەوەی ئەو کلپەیە . ( عێراق — ئێران )

لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٣/٦ ، کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی ئێران — سوریا — تورکیا — لەم ڕۆژگارە ) وە گەلێ نموونەی زیندوی تر .

مادام داگیرکەران یەك دەگرن دژ بە ئاواتەکانی گەلی کورد پێویستە گەلی کوردیش لە سەرانسەری کوردستانی گەورە یەك بگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئاواتەکانی بهێنێتە دی ، نە سەرمایەدارەکان و نەشیوعیەکان هیچیان بۆ کورد نەکردوە تاکو سەلاوات لە دیداریان بدرێ .

شیوعیەکانی سۆڤیەت خوا سزای خۆی لێ وەرگرتنەوە ، لە جیاتی ئەوەی پێشوازی گەرم لـە بارزانی بکەن پشتگیری بکـەن لـە داواکـانی کەچـی گەیشـتە ئـەو بـەری ئـاراس بەهـەزار حـەلاو وەلانەیان گرت .

ئینگلیزەکان هەزار فرت و فێڵیان لە کورد کرد ئێران ، تورکیا ، عێـراق ، سـوریا زۆر جـار دۆستایەتیانلەگەڵ ئەو دوو زل هێزە گەورەی دنیا هەبووە نەدەوێران لە قسەی ئەوان دەربچن بەڵام قسەی خۆشیان ئەوە بوو چ چەکێك باشە لە چیاکانی کوردسـتان بـەکاربێت بۆئـەوەی (عـملاو و مخربین ) نەمێنن هەقە زل هێزەکانی دنیا و ئەو دەوڵەتە کورتە بالاّیانە ئەو راستیە بـزانن کـە تـا کورد وەکو گەلانی دنیا مافی خۆی وەرنەگرێ پشێوی لە ناوچەکە کۆتایی نایـەت و بەرژەوەنـدی هەموو لایەك هەر لە مەترسی دا دەبێ

شۆڕشی نوێی ی کوردستان لە سـاڵی ١٩٧٦ لـە هـەل و مـەرجێکی دژوارو نـاخۆش دەسـتی پێکردەوە زروفی بابەتی ( موچوعـی ) لەبار نەبوو حکومەتی عێراق پەیوەنـدی لەگـەڵ دنیـای دەرەوە زۆر خۆش بوو .

شۆڕشـی کـورد تووشـی هەرەسـی گـەورە هـاتبوو بەناچـاری رۆڵـەکانی گـەلی کـورد خـەباتی چـەکداریان دەسـت پێکـرد بۆئـەوەی میللەتەکـەمان لـە مەترسـی نـەمان رزگاربکـەن چـونکە سیاسەتی ( تەعریب ، تەبعیس ، تەهجیر ) لە کوردستان زۆر بەپەلە جێ بەجێ دەکرا .

رژێمی عێراق لە پێش هەمووان بـڕوای وابـوو کـە جـارێکی تـر کـس نـاتوانێ (١٠) کـەس لەچیاکان کۆبکاتـەوە ، لـە قسـەیەکی سـەرۆك سـەدام حسـێن کـە ئـەو کـات جێگـری سـەرۆك ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو دەڵێ ( دەتوانرێ دار خورمـا لەسەر سەریان شین ببـێ بـەڵام ئەوانە ناتوانن دە کەسی چەکدار لە چیاکان کۆبکەنەوە ) . هەقیشە ئـەو راسـتیە بڵـێین لـە چـاو پێکەوتنێك لەگەڵ میشـیل عـەفلەق ئەمینداری گشتی حزبی بەعس دەڵێ : ئەگەر سەرکردەکانی بەعسی وەکو عومەری کوڕی خگاب عەدالەت بەرامبـەر ناوچەی سەرووی عێـراق نـەنوێنن ئـەوە جارێکی تر یاخی بوون دەست پێ دەکاتەوە (( فان التمرد سیعود پانیە )) تا ئەو کاتە رژێمـی عێراق هەر خەریکی ئەوە بوو چۆن کورد بفەوتێنێ ئەو بەڵایەی لە کۆڵ ببێتەوە.

لەساڵی ١٩٧٧قسە کردنێك لەگەڵ حکومەت دەستی پێکرد بەهۆی بەڕێز ( حاجی محمد شێخ رەشیدی لولان )برا گەورەی عەشیرەتی برادۆست بۆ ئەو مەبەستە نامە ئـاڵو گـۆر کـرا ، سـەدام حسێن نامەیەکی نووسـیبوو ئەوەنـدە بـە چـاوی سـووك سـەیری شۆڕشـی کـوردی دەکـرد گوایـە تەوقیعی نەکردبوو لە کۆتایی نامەکە ، بۆ ئەم مەبەستە شەهید عەلی عەسـکەری چـووە بەغـدا

بەڵام هیچ ئەنجامی نەبوو ، راستە شۆڕشی کورد هەقی نەبوو داوای ئەوە بکات کە دەبێ عێراق بە گەرمی لە ( جبهة الصمود والتصدی ) کار بکات کە ئەو کات سوریا و جەزائیرو یەمەنی دیموکراتی و فەلەستینیەکان لەگەڵ عێراق لە دژی ئیسرائیل لەبەر یەکدا بوون .

نیازی عێراق لەو قسە کردنە هەر ئەوە بوو بە سەرکردایەتی رابگەیەنێ کە خۆیان تەحویل بدەنەوە ؟

لە ساڵی ١٩٧٩ حزبی سۆسیالیستی کوردستان بە هۆی د . عبدالرحمن قاسملو لەگەڵ حکومەت کەوتنە ووتووێژ بۆئەو مەبستە کاك د . محمود چووە بەغدا قسەی خۆشی د . فاضل براك مدیری موخابەراتی ئەو کاتی عێراق ئەوەبوو ( دکتور هوایة ساعدناکم بالفلوس، بالکوادر) لە گەرمی مفاوەزات رژێم هێرشی کردە سەر هێزەکانی حزبی سۆسیالیست ، دوو سەرکردەی ناوداری ئەو حزبە لە دۆڵی سماقوڵی شەهید کران ( شەهید سەلیم و شەهید شینە بۆڵێ ) ، پاش ئەوەی زیاتر لە سەد سەربازی رژێم کوژران ، ئەو مفاوەزاتە ئاگری شەڕی خۆشتر کرد .

رژێم بە گوێرەی شۆڕش مامەلەی دەکرد کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لاواز بوو ، هێشتا پێ رۆ بوو بە هۆی موختارو پیاو ماقول و مەلا جوابی ئەگینارد بۆ سەرکردایەتی بۆ قسەکردن ، هەرچەند پێشمەرگە بەهێز دەبوو نوێنەرانی حکومەتیش پلەیان بەرز دەبۆوە ، شەڕی عێراق — ئێران تەرازوی هێزەکانی تۆزێك گۆڕی رژێم بیری لەوە دەکردەوە کە ئێران سوود لە کورد وەرنەگرێ بۆیە بۆ لای هەموو حزبە سیاسیەکان خەلکی رەوانە کرد لە وێرا بەنهێنی ووتووێژ دەستی پێکرد ( ی . ن . ك ) پەیوەندی لەگەڵ ئێران بەرەو خراپی دەڕۆیشت . بەو مەرجە پەیوەندی دۆستایەتی دەکرد تا خزمەتی سیاسەتەکانی بکرێ لە کوردستانی رۆژهەلات ( ئێران ) بە کوردی و کورتی لە کوردەکانی ئەوێ بدرێ ، چاوساغی بۆ بکرێ لەکاتی هێرش بۆ کوردستان .

شەڕ کردنی هێزەکانی ( ی . ن . ك ) لە پال پێشمەرگەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەلەی ئاستەنگکێشان دژی هێزەکانی حکومەتی ئێران بەیەکجاری دەرگای لەنێوان یەکێتی و ئێران داخست حکومەتی ئێران بە چاوێکی دوژمنانە سەیری ( ی . ن . ك ) ی دەکرد بۆیە هێرشەکانی ئێران بۆ سەر عێراقبە تایبەتیکوردستان یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەخستە مەترسی و جێگای پێ لەق دەکرد ، ناوچەکانی لێ تەسك دەکردەوە بەرەی جود پێك

هاتبوو لە ( پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و پاسۆك ) لە ناکۆکی توندو تیژ دابوون شەڕی یەکتریان دەکرد لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان .

هاتنەوەی هێزەکانی عێراقی بۆ کوردستان داگیرکردنەوەی زۆربەی ناوچە رزگارکراوەکان بۆ ئەوەپێش لە هێزەکانی ئێران بگرێ بە تایبەتی لە ناوچەی ( حاجی ئۆمەران کەلە تەموزی ١٩٨٣ لە لایەن ئێران داگیرکرا ، پێنجوێن و گرمك لە لایەن ئێران داگیر کرا )

کاول کردن و ئاوارە بوونی خەڵکی کوردستان لە ئەنجامی راکێشانی شەڕ بۆ خاکی کوردستان . سەرەڕای ئەوەش حکومەت نەیدەویست دوژمنی زۆر بێت نەوەکو هێزەکانی ( ی . ن . ك ) لە پشتەوە لە هێزەکانی حکومەت بدەن سەرکردایەتی ( ی . ن . ك ) بڕاوای وابوو هەلێکی باشە مفاوەزات بکرێ ، حکومەت لە دۆخێکی خراپە دەتوانرێ هەندێ لە داواکانی گەلی کوردی لێ وەربگیرێ ، هەر کەسێك تۆزێ بیری بکردایەوە دەیزانی ئەو شەڕەی عێراق ئێران هەتا هەتایە نی یە هەر کۆتایی پێ دێت ، بە راوەستانی شەڕ یەکەمین زەرەرمەند کورد دەبێت لە پاشان ئەو راستیە سەلێنرا .

شەهید عبدالرحمن قاسملو رۆلی هەبوو لە مفاوەزات ، دیارە ئەو مفاوەزاتە بە نهێنی کاری بۆ کراوە ، بۆیە دەتوانم بڵێم سەرەتای مانگی شوباتی ١٩٨٣ زانیم مفاوەزات هەیە ، لە نامەیەکی کاك (( نەوشیروان )) کە بۆ کاك ( ٠ سەید کەریم )) نووسرابو ئەو مەسەلەی بەراشکایی تێدا بەدی دەکرا ، کاك (( فەرەیدون )) بە نهێنی چووە بەغدا ، دیارە هەمیشە حکومەتی عێراق لە کاتی مفاوەزات داوای بۆچونی (( مام جەلال )) دەکات وە دەیەوێ لە نزیکەوە لە رەئیەکان بگات .

لە رۆژی ١٥/١١/١٩٨٣ لە گوندی بالیسان لە بارەگای کاك ( کەمال خۆشناو )) بەڕێز (( مام جەلال)) نزیکەی سی کادیری سیاسی و عەسکەری کۆکردەوە بۆ دوو مەسەلە یەکەمیان ، هەڵسەنگاندنی شەڕی بێتواتە دووەمیان مەسەلەی مفاوەزات .

بە دوورو درێژی باسی باری کوردستانی کرد ئەو مەترسیانەی لەسەر کوردو ( ی . ن . ك ) پەیدا بوونە ، مفاوەزات بکرێ یان نا ؟ بەڕێز مام جەلال داوای کرد هەموو برادەران سەربەستانە بۆچونی خۆیان بدەن وە دەبوایە یەك قسە بکەین وە لەسەر رەئیەکەی خۆمان ئیمزا بکەین ئەو هەڤالانەی لەو کۆبونەوەیە بەشدار بوون بریتی بوون لە :

١. د . کەمال خۆشناو .
٢. کاك شەوکەت حاجی موشیر .

٣. كاك فوئاد

٤. حاكم پێشڕەو .

٥. كاك عەلی نەبی .

٦. كاك عەبدوڵا مام نەبی .

٧. مامۆستا سیف الدین .

٨. كاك ڕێكەوت .

٩. شەهید مەلا غەفوور .

١٠. كاك شاخەوان .

١١. ڕێباز .

١٢. كاك تەحسین كاوانی .

١٣. كاك سعد الله پەرۆش .

١٤. كاك جەوهەر كرمانج .

١٥. كاك مولازم سمكۆ .

١٦. مامۆستا محسن .

١٧. كاك پۆڵا

١٨. مامە ریشە .

١٩. كاك حەمە ڕەش .... هتد .

لە هەموو ئەو برادەرانە مامۆستا سیف الدین و كاك پۆڵا دژی ئەو مفاوەزاتە وەستان . لەوێ تێ گەیشتم كە دەست پێكردنی مفاوەزات بەئاشكرا نزیك بووەتەوە. قەناعەتم وابوو مفاوەزات لەوهەل و مەرجەزۆر بە قازانجی گەلی كورد دەگەڕێتەوە هەرنا لە ئابلوقەی دوژمنان ڕزگارمان دەبێ و میللەتەكەشمان بڕوای بەتێن دەبێتەوە قسەو درۆكانی ڕژێم ئاشكرا دەبێت كەگوایە چەند چەتەیەك لەوشاخەن ، هێزی پێشمەرگەش خۆی ڕێك دەخاتەوەو سوود لەو هەلە وەردەگرێ . زۆر بە جوانی ئیمزام كرد.

دوو ڕۆژی پێچوو شەوێك((مام جەلال)) داوای كرد كە بچینە خوارەوە گوایە شیوعییەكان بەهێزێك لە ناوچەكە دەسوڕێنەوە. بۆ مێژوو دەیڵێم ((مام جەلال))وتی وا بكەن شیوعیەكان ناوچەكە بە جێ بهێڵن شەڕیان لەگەڵ مەكەن ئەگەر شەڕیان پێ نەفرۆشتن.

لەگوندی عەلیاوە نزیك دێگەڵە بووین لە ماڵی کاك فەخری بەگ نانمان دەخوارد ، قاسید هات نامەیەکی دا دەست کاك شاخەوان نووسرابوو لە ئەمڕۆ را ١٩٨٣/١٢/٣ شەڕ لەگەڵ حکومەت را دەگرن، وە بەڕێز ((مام جەلال)) دەچێتە بەغدا وە نووسرابوو (ڕەنگە بەندەش لەگەڵ مام جەلال بچێت بۆ بەغدا) کاك شەوکەت حاجی موشیر لێپرساوی عەسکەری‌مەڵبەندی چوار ئەو نامەیەی نوسیبوو ڕاست بوو خۆشی لەگەڵی چووەبەغدا ، کە نامەکەمان خوێندەوە زۆر خۆشحاڵ بووین،کاك مەلا غەفور دەستی کرد بە شەرحی مفاوەزات بە ڕاستی ئەوە(جاشێتیە) منیش گاڵتەم لەگەڵ دەکرد پێم دەگوت ئەگەر ئازای ئێستا تەقە لەو برادەرانەی‌ناو رەبیە دەکەی(چونکە لەسەر لوتکەی کورەدێر) رەبایەی حکومەتی لێ بوو ...!!؟ ( مام جەلال ) بە کۆپتەر لە زێخان ( گوندێکی دۆڵی بالیسانە ) چووە بەغدا هەڤاڵێ کاك ( مەلا بەختیارو کاك فەرەیدون عبدالقادر و د . خدر و ملازم سەید کەریم و شەوکەت حاجی مشیر ) لە گەڵیدا بوون چەند ڕۆژێك لە بەغدا مانەوە . بەڕێز مام جەلال لەوێ سەرۆك سەدام حسێنی دیت وە بە ئوتومبیل گەڕانەوە دۆڵی بالیسان ئەو مفاوەزاتە تێپەڕی و چل و دوو ڕۆژی خایاند . چەندین جار ( مام جەلال و کاك نەوشیروان ) و هەڤاڵانی تر چوونە بەغدا وە نوێنەرانی حکومەتیش چەندین جار هاتنە سەرکردایەتی ( ی . ن . ك ) لەوانە ( عزت ابراهیم الدوری ) جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش زۆر جار وا جاڕ دەدرا کە پاش چەند ڕۆژی تر ڕێکەوتن نامە لەلایەن ( ی . ن . ك ) و حکومەتی عێراقی مۆر دەکرێ . پاشان حکومەت مەسەلەیەکی تری دەهێنایە گۆڕێ .

حکومەت بە گوێرەی شەڕی عێراق – ئێران هێرشەکانی ئێران مفاوەزاتەکەی پاشە و پێش دەکرد کە ئێران لە ( هور الحويزه ) شکا ( تاج المعارك ) لە مانگی ١٩٨٤/٣ حکومەت پاشە کشەی کرد هەرجارێك دەنگ و باسی کۆبونەوەی هێزەکانی ئێران دەگەیشتە عێراق بە نیازی هێرش کردن حکومەت دیسان شلی دەکردەوە و مفاوەزاتەکەی گەرم دەکرد .

سەرەتا حکومەتی عێراق بە برادەرانی ڕاگەیاندبوو کە ئامادە نی یە باسی کەرکوك بکات ( حکومەتی عێراق پاش ڕاپەرین و شەڕی کوێت لەو لاوازیە کە هەموو کەسێك هەستی پێ دەکرد و پاش ئەوەی تۆزێك خۆی گرتەوە بە نوێنەرانی شۆڕشی وتبوو ( کەرکوك وەکو کەربەلاو بەسرە سەیر دەکات )، ( ی . ن . ك ) وازی لە کەرکوك نەهێنا لەگەڵ وەفدەکەی عێراق باسی کەرکوك هاتە گۆڕێ جگە لە چەمچەماڵ و کەلار دانی نا کە کفری سەرقەلا دەبێتە حوکمی زاتی لەسەر ناوچەی کوردستان ، جەماوەری کوردستان پشت گیری خۆیان نیشان دا بەرامبەر بە

یەکێتی بە تایبەت لە ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٨٤/٣/٢١ لە قەشقۆڵ و سورداش بەسەدان هەزار کەس کۆبونەوە لەوێ ( مام جەلال ) وتارێکی بەنرخی دا خەڵکی لادێیەکانی کوردستان لەگەڵ مفاوەزات بوون چونکە ئەوان دەیانزانی شەڕکردن چەند ئاستەنگە ، گوندیان دەسوتا ، کوڕیان شەهید دەبوو ، تالان دەکران لە روانگەی خۆیان سەیری مەسەلەکان دەکەن وا دەزانن شۆڕش کردن کارێکی ئاسانەو ماندوو بوون و ئەزیەتی تێدا نی یە ، ناحەزانی ی . ن . ك تا مەسئولانە دەجولانەوە بە پەلە پەل کەوتنە پروپاگەندە بە ناهەق ناوی (جاشەتیان ) دەدا پاڵ ی . ن . ك ، دەبوایە زۆر لەسەر خۆ چاوەڕوانی ئەنجامی مفاوەزاتیان بکردایە ئەوجا بۆچونیان لەسەر بدایە ، هەندێ کەس تەنیا بەرژەوەندی خۆی لە مفاوەزاتەکە رەچاو دەکرد ، هەمو داوای ئەوە بوو نەبێتە عەسکەرو جەیشی شەعبی و یاغر یاغر بسوڕێتەوە (( ئەگەر کورد ئاڵای خۆشی هەبێت دەبێ خەڵك خزمەتی سەربازی بکات )) ، حکومەتی عێراق قازانجی خۆی رەچاو کرد لە مفاوەزاتەکە.

١. هێزەکان دەستێ بەتاڵ دەبن بەرامبەر بە هێزەکانی ئێران .
٢. مەترسی نامێنێ لە پشتەوە ی . ن . ك لێ ی بدات .
٣. بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆ ( الجبهه الوگنیه ) .
٤. دامەزراندنی دەیان فەوجی سووك ( الافواج الخفیفه ).
٥. ئارامی رێگای هاتوچۆی هێزەکانی بۆناوچە سنوریەکان .
٦. راکێشانی کورد بەلای خۆیدا

سوریا دۆستی دێرینی ی . ن . ك نارەزایی خۆی بە شێوەیەك لە شێوەکان نیشان دا ، وە نوێنەرانی ( ی . ن . ك ) ی لە سوریا تەنگاو کرد ، ئێران کە خۆی هەقی حەوت ملیۆن کورد دەخوا خۆی بەردێن سپی کوردان دەزانی ، هێشتا تاوانباری دەکردین ، دەیویست وەکو زەمانی زوو هەر خۆی سەرپشك بێت کەی ویستی ئەو کات شەڕ بکەین ئەو کات چەك فڕێ بدەین . ئێرانییەکان هەمیشە لە پەنا قسەی خۆش شۆڕشی کورد\ لەبار دەبەن .

تورکیا داگیرکەرێکی دێرینی گەلی کوردە زیاتر لە (١٥) ملیون کورد دەچەوسێنێتەوە لەگەڵ عێراق رێکەوتنێکیان مۆر کرد هەر یەکەیان بە گوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە دەتوانێ (١٥) کم بچنە ناو خاکی ئەوەی تر ، بۆ تەعقیب کردنی شۆڕشگێران واتە پێشمەرگە کوردەکان ( چەند جارێك سوپای تورکیا هاتنە ناو خاکی کوردستانی عێراق بۆ راونانی پێشمەرگەکانی P.K.K ) هەمو داگیرکەرانی کوردستان ئەو مفاوەزاتەیان پێ ناخۆش بوو لە هەموان زیاتر

توركيا ، وەلەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی عێراق کۆبونەوە وە بەفەرمی نارەزایی خۆیان دەربڕی ( یەکێك لە هۆیەکانی سەرنەگرتنی مفاوەزات پیلان گێرانی رژێمی تورکیا بوو) .

بەرەی (جود) بە کردەوە هەوڵیان دا مفاوەزاتەکە تێك بدەن بۆئەوەی حکومەت دوو دڵی بکات چەند مەفرەزەیەکی چەکداریان نارده خوارەوە تاکو ئاشکرا بێت کە ی . ن . ك ناتوانێ ئارامی لە کوردستان دابین بکات . سەرەڕای ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرەیە ، سەرەڕای ئەو هەموو دوژمن و ناحەزانە ، سەرەڕای ئەوەی حکومەتی عێراق هەر لە سەرەتا نیازی خراپ بوو ، سەرەڕای چەندین پێکدادان لە ماوەی مفاوەزات توانرا تێپەڕی زیاتر باشتر بلێم ( تێپەڕی و چل و دوو رۆژ ئەو مفاوەزاتە بەردەوام بێت ) پاش ئەوەی حکومەتی عێراق لە هەموو بەڵێن و قسەکانی خۆی پەشیمان بۆوە و پاش ئەوەی لە پەنا مفاوەزات چەندین کادیرو تێکۆشەری شەهید کرد پاش ئەوەی چەندین ئەفواجی خەفیفەی دامەزراند ، ی . ن . ك لە ١٩٨٥/١/١٥ بە بەیانێك وتووێژی لەگەڵ رژێم وەستاند بەڵام جاڕی شەڕ کردنی نەدا ، ئەو هەلەی بۆ رژێم هێشتەوە تاکو بەخۆیدا بچێتەوە و ئەو فرسەتە لەدەست نەدات ، کەچی داگیرکەرانی کوردستان ئەو کاتە مافی کورد دەسەلێنن کەلە گۆڕدا بن و خەریك بێت تەلقین بدرێت ئەگینا کارێکی مەحاڵە وابەئاسانی دان بەمافەکانی ئەو گەلە دابنێن .

دیاری کردنی سنوری کوردستان ، چوونە ناو بەرە داتاشراوەکەی رژێم ، دەسەڵاتە دەزگا جاسوسیەکانی رژێم ، پەرەپێدانی یاسای ئۆتۆنۆمی لە کوردستان ، چەك کردنی جاشەکان هەڵبژاردنی دیموکراتیانە ، نەهێشتنی تەعریب ، تەبعیس ، تەرحیل گرنگترین هۆیەکانی سەرنەگرتنی مفاوەزات بوون ، جگە لەو هۆیانەی باسمان کرد کە لە رێکەوتنی دوژمنانی کورد خۆی دەنواند ، هەندێك مفاوەزاتیان بەکاری خراپ دەزانی .

ناکرێ ( عملیە) ی مفاوەزات هەمووی بە خراپ دابنرێ ، راستە حکومەتی عێراق توانی لە کوردستان خۆی رێك بخاتەوە ، چالاکترین هێزی سیاسی کوردستان لە چالاکی پێشمەرگانە بوەستێنێ ، دەبێ ئەوەش بلێین مفاوەزات قازانجیشی هەبوو بۆ گەلی کورد و ی . ن . ك توانی خۆی لە ئابلوقەی دوژمنان رزگار بکات ، لەرووی دارایی و ئیمکانیەت توانی خۆی پۆشتەو پەرداخ بکاتەوە ، ژمارەی پێشمەرگەکان تێ ی پەراند ئەگەر پێش مفاوەزات لە (٣٠٠٠ — ٤٠٠٠) پ . م هەبوو ئەوا لە کۆتایی مفاوەزات گەیشتە نزیکەی (١٠٠٠٠) پ . م بڕواو متمانەی خەڵك زیاتر بوو بە شۆڕش حکومەت وای بلاو دەکردەوە کە لەگەڵ ئەو چەند\ ) چەتەیە) مفاوەزات ناکات بەڵکو خۆیان دەتاوێنەوە کەچی بە پێچەوانەوە بۆ ماوەی تێپەڕی رژێم

کەوتە ووتووێژ لەگەڵ ی . ن . ك بۆیە مفاوەزات لایەنی چاك و خراپی هەبوو ، قازانج و زەرەری هەبوو ، دۆست و دوژمنی هەبوو ، هەریەکە لەروانگەی خۆی دەیڕوانیە ئەو مەسەلەیە گرنگە .

لەناو خودی ( ی . ن . ك ) مفاوەزات نەیاری هەبوو ، پیم وابوو هەریەکێ لەو نەیارانە هەر بۆئەوەی بوو شوێنی خۆی قایم بکات و ئەندام و پێشمەرگەکانی یەکێتی زۆر بە دژی سەدامی بزانن ، هەندێ لەو جۆرە کەسانە لەلایەك دەستی سەدامیان دەگوشی و دیاریان لێ وەردەگرت ، دەڕۆیشتنە دەرەوەی وولات بۆئەوەی بەهەڤالاّنی بسەلمێنن کە مفاوەزات باشە لەلایەکی تر لەناو ئەندامان و پێشمەرگەکان دژی مفاوەزات دەوەستان .

سەرکردەکانی کورد زۆربەیان تەنیا بەرژەوەندی خۆیان لێك دەدەنەوە گوێ بەبەرژەوەندی بەرزی میللەت نادەن ....!!؟

نەیاران و دوژمنانی ( ی . ن . ك ) دەیان جار بەناهەق ناووناتۆرەیان هەڵبەستا ، شیعرو گۆرانی نا راستیان هۆندەوە ، بوختانیان هەڵبەست بەڵام هیچی سەری نەگرت ، کە مفاوەزات هەڵوەشاوە چالاکانە ( ی . ن . ك ) کەوتەوە کار دژی رژێمی عێراق گەلێك زەبری کوشندەی وەشاند هێزەکانی حکومەتی عێراقی هەراسان کرد ، دەبێ ئەو هەقەش بدەینەوە ( ی . ن . ك ) کەلە مفاوەزات لەو کاتەی رژێم دەیویست خەڵك بکاتە بەعسی ، بیکا بەجەیشی شەعبی لەو شوێنانەی هێزی پێشمەرگە دەسەڵاتی هەبوو بە توندی بەگژ ئەو رەفتارانەدا دەچوو ، ، چەندین جار لەگەڵ هێزەکانی رژێم کەوتنە شەڕ کردن بۆئەوەی میللەتەکەمان نەکەوێتە ئاگری شەڕی عێراق — ئێران .

پاش ئەوەی حکومەتی عێراق داوای ( ی . ن . ك ) ی رەت کردەوە ، تەنیا رێگای شەڕ لەبەردەم ( ی . ن . ك ) مایەوە ئەوەبوو لە ١٩٨٥/٢/١ بەگەرمی شەڕ لە کوردستان دەستی پێکردەوە ن هەرچەندە حکومەتی عێراق دەیویست بەدرۆو دەلەسە جارێکی تر شەڕ بوەستێنێ . بریاری سەرکردایەتی ی . ن . ك بەراشکاوی پەنجەی بۆ داواکان درێژ کرد حکومەتیش پاشەکشەی کرد بەم جۆرە ئەم مفاوەزاتەش وەکو هەموو مفاوەزاتەکانی تر بێ ئەنجام بوو .

# شەڕە گەورەکانی ساڵی مفاوەزات

لە ماوەی تێپەڕی مفاوەزات چەندین شەڕو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی ( ی . ن . ك ) و میری و جود کرا ، دەستدرێژیەکانی هێزەکان و دەزگاکانی رژێم بۆ سەر خەڵکی بێ دیفاع و هەڕەشەی جاشەکان لەلایەکی تر بوونە هەڵگیرسانی گەلێك شەڕو شۆڕ لەسەرانسەری کوردستان.

## ١- شەڕی ناو شاری هەولێر :

لەکاتێکدا چوار پێشمەرگەی ( ی . ن . ك ) هەڤالان ( سەفین مەلا قەرە و کاك مەلا عەزیز و کاك محمد عارەب کەند و سەلاح شینە ) بە سەردان لە ماڵی خزمی یەکێکیان دەبن لەلایەن هێزێکی جاشەکان ئابلوقە دەدرێن و دەبێتە شەڕ پێشمەرگەی کوردستان لە هیچ زروف و زەمانێك لەکاتی تەنگانەش هەرگیز مل بۆ دوژمنان کەچ ناکەن ، ئەو چوار پێشمەرگەیە دەکەونە شەڕێکی مان و نەمان لەگەڵ جاشەکان ، ئەو هەواڵە بە ت٨٥ ی بەڕانەتی و ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر گەیشت هەر زوو ئەو دوو هێزە گەیشتنە شوێنی شەڕەکە لە ( کورانی ئاستەنگکێشان ) پاش شەڕێکی کەم وێنە ئەو چوار پێشمەرگەیەش لە ئابلوقەی دوژمن رزگاریان بوو تەنیا یەك پێشمەرگەی ( ی . ن . ك ) شەهید بوو ئەوەش کاك حسین محمد حسین بوو کە پ . م ی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر بوو .

## ٢- شەڕی چیای سەفین :

لە تەمموزی ١٩٨٤ هێزێکی حزبی شیوعی عێراقی و حزبی سۆسیالیست کە ژمارەیان نزیکەی (٢٠٠) پ . م دەبوون لە بادینان بەرێ کەوتبون و گەیشتنە دەورو بەری شەقلاوە ، هێزێکی ( ی . ن . ك ) لە ت٩١ ی سەفین پێشیان لێ گرتن لە دەوروبەری گوندی زێبارۆك شەڕ دەستی پێکرد لە ئەنجام سێ پێشمەرگەی یەکێتی شەهید کران و چەندین پێشمەرگەش برینداربوون لەوانە هەڤاڵ مامۆستا بەکر فەرماندەی ت٩١ ی سەفین )و دوو پێشمەرگەی حزبی شیوعی شەهید کران .

بارەگای ت ٨٥ ی بەڕانەتی لە بەحرکە بوو ، بە جیهاز ئاگاداریان کردینەوە کە بە شوێن هێزەکەی جود بکەوین لەگەڵ هێزێکی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر شەو لە گوندی کاوانیان ( ناوچەی زرارەتی ) یەکترمان گرتەوە ، بەیانی کەوتینە پشکنینی ناوچەکە لە گوندی ئاژگە

سۆراغمان کردن ، بە ئوتومبیل سوڕاینەوە سارتکە و حاجی ئەحمەد لەوێ بۆمان روون بۆوە کە هێزەکەی جود لە گوندی ( قەلاسنجی سەروو ) سەنگەریان گرتووە بۆ رۆژی دواتر شەڕ لە هەموو لایەك دەستی پێکرد ئەوان ناو گوندو رەزەکانی پێش گوندو لووتکەکانی دەورو پشتی گوندەکەیان گرتبوو ، ئێمەش لە هەموو لایەك هێرشمان بۆ دەکردن .

مفاوەزات بوو ئێمە دەمانتوانی بە ئاسانی هێزەکانی خۆمان کۆبکەینەوە بەبێ ماندووبوون چونکە میری حەزی دەکرد ئەو شەڕە گەرم بێت برین قوڵتر بێت ، کارلەکاربەترازێ هیچ کۆسپی نەدەخستە پێش هێزەکانی ئێمە ، هێزەکەی جود لە هێزەکانی خۆی گەلێك دوور بوو ، بە تەواوی دابڕابوون ، حکومەتیش هەر لێ ی دەدان ئەگەر هەستی بە بوونیان بکردایە ، بەو واتایە تەرازووی هێز زۆر زۆر لە قازانجی ئێمە بوو بەڵێ ئەو شەڕە ناعادیلانەیە تاکو تاریکایی بەسەر دەستان داهات درێژەی کێشا ، کە شەو داهات تەقە مەکس بوو ، تاکو ئەو کاتە خۆش بەختانە لە هیچ لایەك کوشتار نەبوو .

هێزەکانی جود دەیانویست لەو ئابلوقەیە رزگاریان بێت ، دەبووایە بەشەو کەمینەکانی ئێمە ببڕن ، لە کاتژمێر (١٢) ی شەو هێزەکەی جود کەوتە کەمینی پێشمەرگەکانی کەمینی پێشمەرگەکانی ( ی . ن . ك ) لە نزیك گوندی حوجران بیست کلاشنکۆفیان لێ گیرا بەڵام هیچیان شەهید نەبون ، هێزەکەیان سەری لێ شێوا هەندێکیان زۆربەیان نەشارەزا بوون گروپ گروپ دابڕان .

بەیانی شەڕ لەگەڵ ئەو گروپە بچوکانە دەستی پێکردەوە ، پاش ئەوەی هەندێکیان لەترسی خنکان لە تینوتیان خۆیان تەسلیم بە پێشمەرگەکان کرد ، وە هەندێکیان شەهید بوون بەشێکیان بۆئەوەی نەکەونە دەستی پێشمەرگە خۆیان تەسلیم بە رژێم کرد ، لەسەر لووتکەی سەفین بەشێکی زۆریان هەر شەوی پێشوو خۆیان قایم کردبوو لە شوێنی شەڕەکە دووركەوتبوونەوە .

شەو لە پشتی گۆڕە شێر ماینەوە ، بەیانی داوایان کرد لە نزیك حوجران کۆبوونەوە بکەین من و کاك شاخەوان درەنگ بە کۆبونەوەکە راگەیشتین وەکو گەیشتینە شوێنی کۆبونەوەکە ئەو کارەساتە دڵتەزێنەمان دیت :-

لە بناری سەفین پێنج پێشمەرگەی حزبی شیوعی بەدیل گیرابوون کە چاوم بە دیلەکان کەوت زۆر بەزەییم بەواندا هات .. چۆن ئەوانە هاتوون بۆ شۆڕش تووشی چ وەزعێك بوون .. رەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو لێویان ووشك بوو ، چەند رۆژ بوو نانیان نەخواردبوو ، چاویان لەبێ خەوی

پووت ببو، چلکن و ریش هاتوو بەڵام لە دەروون گەش .. سیمای پێشمەرگایەتیان پێوە دیار بوو ..کۆبوونەوەی لێپرسراوانی ئێمە دەستی پێکردبوو کە وترا گەیشتین هاتە سەرباسی دیلەکان ، من هەروام دەزانی رەنگە بڕیاری ئازادکردنیان بدرێ چونکە هەر ئەوە باشترین هەڵسوکەوتە لەگەڵ برا پێشمەرگەی هاوسەنگەری خۆت با بیروباوەڕی جیاوازیش بێت ن کاك شەوکەتی حاجی مشیر سەرپەرشتی کۆبونەوەکەی کرد لە پڕ قسەیەکم گوێ لێ بوو کە هەرگیز نەمدەویست گوێم لێ بێ برادەرێك باشتر بڵێم نەزانێك ووتی ( با سەرف و سونیان بکەین ) لەناو پێشمەرگە ئەو قسەیە ( با بیان کوژین ) لێك دەدراوە بەڕاستی تاسام چۆن ئەو کوڕە جوانانە دەکوژرێن بێ ئەوەی رەچاوی هەق و عەدالەت بکرێ ...!!؟ دیل دەکوژرێ بێ ئەوەی ویژدان بجوڵێ . هەوڵم دا ئەو قسەیە بە جدی وەرنەگیرێ بێ سوود بوو.هەندێ مەسئول ئەوەندە گەمژەو گێل بوون ، ئەوەندە دژی بەرژەوەندی گەل بوون ئەوەندە بەرژەوەندی خۆیان رەچاو دەکرد بۆئەوەی تەنیا خەڵك بزانێ پیاو کوژن دیلیان دەکوشت تا پلەو پایەی پێ وەربگرن .

ئەو پێنج مەزلومە شەهید کران و لاشەکانیان فڕێ دران بۆ مێژوو دەڵێم کاك مەلا خدر لێپرسراوی کەرتی رێکخستنی هەولێر بە منی گووت با پەسەند نەکەین زۆر دڵگیر بوو هیچمان لە دەست نەهات بەناچاری ملمان شۆڕ کرد چووینە گوندی حوجران.

یەکێك لەوانە بەناوی ( ابو احرار ) پێشئەنجامدانی ئەو تاوانە کاك سابیر رەسوڵ لێ ی پرسی ناوی راستت چی یە ؟ ووتی ابواحرار ؟ ووتی راستم پێ بڵێ ناوی راستی خۆت چی‌یە ؟ ووتی (( هەر ابواحرار ، بەعسیەکانیش هەروا تەسەروف لەگەڵ دیل دەکەن ....)).

چوینە حوجران لەناکاو بوە تەقە کە خەبەر هات ووتیان برادەرێك دیلێکی گرتبوو ئەمری کوشتنی دەرچوو بوو ئەویش ویستبوی لە ناوچەکە رمی بکات ئەو دیلە رومانەی هەڵکێشاو چەکەکەی لە پێشمەرگەکە ساندو هەڵات ، من ئەو رووداوەم زۆر پێ خۆش بوو دەمگوت بەڵکو ئەو کەسانە هۆشیان دێتەوە بەرخۆیان و چیتر دیل ناکوژن ...!!؟.

بۆ نیوەڕۆ چووینە شەقلاوە لەوێ دووبارە هەندێ هەڵسوکەوتی برادەرانی خۆمان دیت بەرامبەر امر لیوا ( عمید تحسین ) کوردێکی بادینی بوو هەموو رەوشتی پێشمەرگایەتیم لە پیش چاو رەش بوو ، لە پاشان چووینە هیران لەوێ بۆ ئێوارە هێزەکەی ئێمەیان ناردەوە حوجران هەستی خۆتان رابگرن بزانن لە حوجران چ منالێکی کورد پەیدا بوو ..!؟

ئێوارە لە ماڵە جووتیارێکی هەژاری حوجران کۆنە دۆستی کاك شاخەوان توزیع بووین بۆ نان خواردن .

پاش ئەوەی مـەلای دێ بـانگی داو ( فتـار ) کـراوە چـونکە ڕەمـەزان بـوو کـە دنیـا تاریـك هەڵگەرا منـالێکی ( ٩-١٠ ) ساڵ تەمەنی دەبوو کە کوڕی ماڵەکە بوو وە ژوور کەوت من لێم پرسی : لەکوێ بووی ؟ دایکی چاوی لێ زەق کردەوە منداڵەکەی ترساند هەر دایکی لـە جیـاتی وەڵامی داوە ووتی لە مـاڵی مـامی بـوو ..!! زۆرم پـێ سـەیر بـوو ووتم خوشـکە بـۆ منداڵەکـە دەترسێنی ؟ ووتی نا بەخوا ..!! لـە مـاڵی مـامی بـوو منالەکـە بـە ڕقـەوە سـەیری مـن و کـاك شاخەوانی دەکرد زانیم شتێك هەیە لـێم پرسـیەوە ووتم کـاکی خـۆم بـەکاکی خـۆت نـەگوت لـە کوێندەر بووی ؟ زۆر بە توڕەیەوە ووتی لەو چیایە بووم ووتم باشە بۆ بەو ئێوارە درەنگـە چیـت دەکرد لەو چیایە ؟ ووتی من بەتەنیا نەبووم زۆر خەڵك لەوێ بوون ..!! لێم پرسی چیـتان دەکـرد ؟ دیسان زۆر زۆر بەتوڕەیەوە وەڵامی دامەوە گووتی شـەهیدەکانمان شـاردەوە ... گـۆتم شـەهیدی چـی ؟ گـووتی شـیوعیەکان ئێـوە بـەدیلی ڕەمیتـان کـردن ... بـەجارێ شـەرمەزار بوومـەوە لـە ویژدانی خۆم .. کاك شاخەوان گووتی ڕاست نی یە ئێمە دیلمان نەکوشتووە .. منالەکـە گریـاو ووتی عەیبە بۆ ئێوە ئێستاش قۆڵیان بەستراوە لەبەر گریان هیچی تری پێ نەووترا ، لـە مالـەوە چووە دەرەوە و گووتی جاش لە ئێوە باشترە ...!! بە دوای دا ڕۆیشتم ماچم کردوو هێنامـەوە ووتم قسەکانی تۆ ڕاستە ئێمە دیلمان کوشت ، ئێمە ترسنۆك و بێ ویژدانین بەڵام کاکە ئێمەش وەکـو تۆ بێ دەسەڵات بووین .

تۆ منالی بۆ دوا ڕۆژ ئەو کارەسـاتە لەبـەر ئـاگردان بـۆ منـالاتی کـورد بگێـڕەوە ، دایـك و باوکی منالەکە زۆر ترسان نـەوەك ئێمـە تۆڵـەی ئـەو قسـە هـەق و ڕەقانـەیان لێ وەربگرینـەوە ، چونکە لە پیاوی بێ ویژدان هەموو شتێك دەوەشێتەوە ..!!کـە هـەموو ئـەو ڕووداوانـەم دیـت کـە ویژدانم جوولا کە مێشکم هەموو ئەو کارەساتانەی هەڵنەگرت بڕیارم دا و هەر لەوێ وەعـدم دا ئەگەر هەلم بۆ هەڵکەوت دەبێ ئەو ڕووداوانە وەکو خۆی بگێڕمەوە ، ئەوا ئیستا تەنیا وەعدەکەی خۆم دەگەیەنمە جێ هیچی تر نا ؟ لەپاشان ئەو هەواڵە بە بەڕێز مام جـەلال گەیشـت و ویـژدانی جوولا زۆر بە ئاشکرا کردەوەی ئەو لێپرسراوانەی ڕ یسوا کرد ، ئەو جۆرە برادەرانە هـەم لەلایـەن پێشمەرگەو لێپرسراوانی خۆیان ڕیسوا بوون وە هەم مێژووی گەلەکـەمان ڕوو زەردی کـردن هـەر ئەوەندەیان بۆ مایەوە تا مردن ویژدانیان ئازاد نابێ خوایە لە قـەزاو بـەڵای ئـەو جـۆرە کەسـانە خۆمان و میللەتەکەمان بپارێزی .



شەهید سەید کەریم

لێپرسراوی عەسکەری م - ٣

## ٣- شەڕێکی سەرانسەری لەگەڵ جاشەکان :

لە ١٩٨٤/٩/١٥ تاقمێك جاش بە فەرماندەی تاوانبار(حەمەی حسۆلی) کە لە پاشان تۆڵەی لێ کراوەو کوژرا، کەمینیان لە نزیك سلێمانی داناوە بۆشەهید سەید کەریم لە کاتی گەڕانەوەی لە نزیك سەیتەرە کەوتە کەمین بە ئارپیجی لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر شەهیدیان کرد.

شەهید سەید کەریم (ئەندامی مەکتەبی عەسکەری) یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەو پیاوە لێ هاتووە بە شەهید بوونی کەلێنی خستە ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

- هەڤاڵ نەوشیروان بە ئاشکرا لەسەر جیهاز جاڕی شەڕکردنی دا داوای لە هێزەکانی کرد لە جاشەکان بدەن ، لە سەرانسەری کوردستان پێشمەرگە هاتنە سەر شەقامە گشتی یەکان لە زۆر شوێن شەڕو پێکدادان دەستی پێکردپێشمەرگەی کوردستان باشترین وئازاترین و فیداکارترین وخۆشەویسترین رۆڵەی لە دەست دابوو بیێ رەحمانە کەوتە گیانی جاش ونۆکەرو ئەڵقە لەگوێ ی ڕژێم لە ١٩٨٤/٩/١٥ بە دەیان لاشەی جاش و سیخور لەسەر شەقامەکان ریزکرا سەید کەریم لە دۆستە هەرە نزیکەکانی من بوو ، هەمیشە گرێ ی دڵی خۆی لەلای ئێمە دەکردەوە بە بیستنی هەواڵی شەهید بوونی ئەو قارەمانە بەجەرگە حەپسام ، بۆ ماوەیەك فکری خۆم بۆ کۆنە دەکراوە ، کاك سەید کەریم هیچ خامەیەك ناتوانێ هەقی خۆی بەتێرو تەسەلی بداتێ ، جەسوور ، لەپێشەوەی شەڕ ، گورج و گۆل ، چاو نەترس ، قسە لەروو ، بەبیرو باوەڕ ، فەرماندە ، سەرکردە ، ، ی . ن . ك بەلەدەستدانی باشترین و دڵسۆزترین رۆڵەی خۆی لێ بزربوو ، دەتوانم بڵێم هەرچەندە بە فەرمی مفاوەزات تاکو ١٩٨٥/١/١٥ بەردەوام بوو بەڵام لەو رۆژەی سەید کەریم شەهید کرا بەتەواوی هێزی پێشمەرگە لە مفاوەزات نا ئومێد بوو ، ووردە شەڕ لەگەڵ جاشەکان لە هەموو ناوچەکان دەستی پێکردەوە ، وە نائارامی سەرانسەری کوردستانی گرتەوە ، تێپەڕی بەسەر شەهید بوونی تێ پەڕاندبوو رۆڵەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان تاوانباریان بە سزای گەل و شۆڕش گەیاند .

## ٤- شەڕی گەزنە :

شەهید سەید کەریم سەرکردەیەکی بە وەفاو دڵسۆزو ئازای هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، بە شەهید بوونی هەموو پێشمەرگەی کوردستان رق و تووڕەیی بەرامبەر دوژمنان زیاد بوو، هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد کاك نەوشیروان جاری شەڕکردنی دا لەگەڵ جاشەکان تا لە سەرانسەری کوردستان شەڕ دەستی پێکرد . ت٨٥ ی بەرانبەتیش کە بارەگای لە گوندی ( بەحرکە ) بوو بڕیارماندا ئەو کسانە چەك بکەین کە بەناوی جەیشی شەعبی چەکیان هەڵگرتووە ، بە سێ قۆل هێرش کرا بەسەر ئەو گوندانەی ناوچەی بەرانبەتی .
قۆڵی یەکەم :بۆ گوندی گردەچاڵ کە هەڤاڵان کاك شاخەوان و رێباز سەرپەرشتی هێزەکەیان دەکرد، پاش کەمێك هەموو چەکدارەکان گیران و چەکەکانیان لێ وەرگیرا
قۆڵی دووەم : بەفەرماندەی عەلی مەسیفی بۆ گوندی جێژنیکان لەوێش چەکەکانیان لێ وەرگیرا

قۆڵی سێ یەم : بە فەرماندەی هەڤاڵ مام غەفوور و کاك بەکرە قیت چەکیان لێ وەرگیرا .
قۆڵی چوارەم : کەرتی دووی شەهید ئەحمەد قەنبەری لەگەڵ کادیرانی رێکخستنی کۆمەڵەو ناوچەی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی خالد حاجی لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد بۆ چەککردنی گوندی ( صفیە )و دەورو پشتی هەموو چەکەکانیان گیرا وهەندێك چەکداریش بە دیل گیران .
دام و دەزگاکانی رژێم بۆئەوەی تۆڵەی خۆیان بکەنەوە ویستیان هێرش بکەنە سەر گوندی ( بەحرکە ) . بۆئەوەی گوندەکە لە کاول کردن و زەرەرو زیان بپارێزرێ هێزەکانمان کێشاوە ، چەند رۆژێك بەسەر ئەو رووداوە تێ پەڕی ، هێزەکانمان کردە دوو بەش بەشێك بەفەرماندەی کاك شاخەوان کە ئەو کات فەرماندەی تیپەکەمان بوو، گەڕانەوە گوندی بەحرکە وەبەشەکەی تریش کە بریتی بوون لە هەشتا پێشمەرگە لێپرساوەتیەکەی بە من سپێردرا .
ئێمە بەرێ کەوتین بۆ گوندی گەزنە لەوێ مەفرەزەیەکمان بەجێ هێشت باقی هێزەکە لە گوندەکانی قەلا چۆغان و خرابە دراو و جەدیدەی زاب دابەش بووین ، من لەگەڵ بیست پێشمەرگە شەو لە خرابەدراو بووین .
هورەی پاییزان گەردە لوولەی لەگەڵ خۆی دەهێنا ، هاوین ماڵ ئاوایی کردبوو ، رۆژ تازە لەو سەری ئاوایی دەدا لەگەڵ گرمەی تۆپ و دەنگی دۆشکە لێفە شڕەکەم لەسەرخۆم لادا، وامزانی لە مەعسکەری هەولێر تەقەیە حکومەت راهێنان (تدریب ) بە سەربازەکان دەکات ، هەرزوو

بیرم کردەوە باشە ئەمڕۆ ( محرەمە ) رۆژێکی جەژنی موسڵمانانە خۆ دەوام نی یە رۆژی ١٩٨٤/٩/٢٦ بوو هەرزوو مەفرەزەیەك پێشمەرگەم نارد بزانن دەنگ و باس چی یە ؟

زوو گەڕانەوە بەهەشتاوی هاتنە لام ووتیان شەڕە لە گەزنە هەر بەپەلە بەڕێ کەوتین لەگەڵ مەفرەزەکانی تر یەکمان گرتەوە بەرەو گەزنە کەوتینە رێ کەلە گوندەکە نزیك بووینەوە چەند کۆپتەرێك هاتە سەرمان دەیان ویست رێگامـان بگرن بەهەرحاڵێك بوو گەیشتینە گوندەکە لەگەڵ مەفرەزەکەی ئەوێ یەکمان گرتەوە ، هەموو شوێنە گرنگەکانی گوندەکەمان گرت و دامەزراین شەڕ بەرەو گەرمتر دەڕۆیشت . هێرشی جاش و سەرباز ، تەقەی کۆپتەر تۆپ باران نۆرەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد ، پێشمەرگە شەڕی مان و نەمانی لەگەڵ دەکردن . کاتژمێر (٢) پاش نیوەڕۆ قائیدی عەسکەرەکان بەپیاوێك خەبەری دا ئێمە و هاتە لای من و ووتی : قائد دەڵێ یەك سەعات مۆڵەتیان دەدەمێ ئەگەر تسلیم نەبن ئەوە لەگەڵ گوندەکە تەختیان دەکەین.

هیچ قسەم پێ نەکراو رووم کردە شەهید مەجیدە سوور بە پێکەنینەوە ووتم : کاکە هەق نی‌یە سەری ئەو قائیدە ببڕین تازە قسەی کابرایەکمان بۆ دەهێنێ کە خۆی لەشەڕی عێراق — ئێران رای کردووە ، نامەیەکم بۆ قائیدەکە نووسی ناوەڕۆکەکەی ئەمە بوو :

پێشمەرگەی کوردستان فێر نین چەکەکانیان فڕێ بدەن مل کەچ بکەن ئەوە پیشەی سەربازەکانی تۆیە ئەگەر هەتا ئەمڕۆ نەتدەزانی پێشمەرگە واتای چی یە ئەوە هەقە ئێستا پاش ئەو هەموو شەڕە لە واتای پێشمەرگە گەیشتبی ، گەزنە حاجی ئۆمەران نی یە ئەگەر تۆ شەرەفی عەسکەریت هەبێ ئەوە دەچی خاکی عێراق رزگاردەکەی کەلەلایەن ئێرانیەکان داگیرکراوە ، وە دڵنیات دەکەم کە ئێمە داوای پاڕانەوە لە پیاوێکی وەکو تۆ ناکەین ئەو هەڕەشەیەش ئێمە ناترسێنێ هیچ منەتت نەبێ .

کە نامەکە گەیشتە دەستیان بەجارێ هاربوون هەشت کۆپتەر لەگوندەکەی دەدا ، بەدەیان هاوەن بۆردومانی ئەو گوندەی دەکرد سێ هێرشی گەورەشیا بۆکردین هەمووومان تێك شکاند هەرلەگەڵ یەکەم تەقە خەڵکی گوندەکە چۆلیان کرد تەنیا برای تێکۆشەر کاك ( رەمزی گەزنە ) لەگەڵمان مایەوە وەیارمەتی داین لەرووی تەقەمەنی بەراستی جێگای خۆیەتی ئەو پیاوەتی و ئازایەتیەی لەبیر نەکرێ وەگوللە تۆپێك بە خانوەکەشی کەوت من چوومە لای داوام لێ کرد ئەویش بروات زۆر مەردانە هاتە وەلام ووتی من لە ئێوە زیاتر نیم چارەنووسم لەگەڵ ئێوە دەبەستمەوە وە دڵنیاشم لەسەر دەستی ئەو پێشمەرگانە ئەو هێرشەی دوژمنیش تێك دەشکێ .

له کۆشکێك بووین بە دووربین سەیری لای هەولێرم دەکرد خەڵکێکی زۆر ڕەوەستابوون سەیری شەڕەکەیان دەکرد ، دەمزانی دایك و باوك و کەس و کاری پێشمەرگەکان لە هەموان بە پەرۆشترن . بەگوێرەی کۆپتەرو تۆپ باران و هێرشەکانی دوژمن دەبووایە ئێمە زەرەرو زیانی زۆرمان هەبێ کەچی تەنیا هەشت بریندارمان هەبوو کە خۆش بەختانە برینی هەموویان سووك بوو ، ڕۆژکاتژمێر( ٥,٥٨ ) پێنج و پەنجاو هەشت دەقیقە ئاودیو دەبوو ، پێش ڕۆژ ئاوا بەرە بەرە خۆمان کۆدەکردەوە ، کەتاریك داهات پاش ئەوەی بریندارەکانمان دەرباز کرد بە ڕێك و پێکی کشاینەوە هەرچەند ئابلوقەی گوندەکەی دابوو وە تەقەیەکی زۆری لەو شوێنانە دەکرد کە ئەگەری هاتووچۆی تێدا هەبوو، لە گوندەکانی پشتی گەزنە (قەلاچۆغان ) مەفرەزەیەکمان دانابوو هەرزوو شەهید سەردار گەیشتە لامان پرسیاری لێکردین ئێمەش هەر بەدەم ڕێگاوە بۆمان دەگێراوە ، هێزەکانی ( ی . ن . ك ) نەیان توانی بەهانای ئێمە بێن چونکە بەبەردەوامی کۆپتەرەکانی دوژمن دەسووڕانەوە کاتژمێر (٢) ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی پەرپیتان لەوێ لەلایەن خەڵکی گوندەکە پێشوازیمان لێ کرا وە بەیانی زوو گەیشتینەوە بەحرکە لەلایەن پێشمەرگەو کەس و کاری پێشمەرگەکان و دۆست و دڵسۆزان پێشوازی گەرمان لێ کرا ، لەو شەڕە چەندین پیاوی ڕژێم کوژران ، داخی گرانم جووتیارانی گەزنە تووشی زەرەرو زیانی مەزن بوون .

بەم جۆرە ئەم داستانەش لە مێژووی گەلەکەمان تۆمارکرا هەڤاڵان مەجیدە سوور، نەهرۆ سەعید سۆفی ، مەلا سلێمان ، برهان سەعید سۆفی ، مام عەلی ئەحمەد خدر و کاك بەدەل بادینی دەوری گرنگیان گێرا بۆ سەرکەوتنی ئەم شەڕە مەزنە .

# کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە

لە مێژ بوو دەبوایە کۆنفراس ببەسترێ ، هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆنفراس لە زستانی ١٩٨٣-١٩٨٤ تەواو بوو ناکۆکیەکانی ناو ریزی کۆمەڵە رۆژ بە رۆژ زیاتر هەستی پێدەکرا هەندێك لە کادیرەکان بە پێچەوانەی سیاسەتی سەرکردایەتی کۆمەڵەو ی . ن . ك کاریان دەکرد ، سیمینارو کۆبونەوەی جیا جیا دەکرا ، پشێوی لەناو ئەندامانی کۆمەڵە گەیشتە رادەیەك لێدان و کوشتنی لێ پەیدا بوو بۆ یەك لا کردنەوەی ئەو مەسەلە گرنگە و هەڵسەنگاندنی کاروباری نێوان دوو کۆنفراس و هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتیتازەی کۆمەڵە و لێ تۆژینەو لەسەر مەسەلەی مفاوەزات وپەیوەندی یە کوردستانیەکان و دەرەوەو گەشەپێدانی رێکخستن گرنگترین ئەرکی کۆنفراسی سێ یەمی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوو .

لەو دۆخە ئاڵۆزە لە ساڵی ١٩٨٤ لە مێرگە پان لەپەنا چیای پیرە مەگرون کۆنفراس دەستی پێکرد . گەلێك گیروگرفتی هاتە پێش هەڤاڵان مام جەلال و شەهید د . عبدالرحمن قاسملو بەشداری کاریگەریان تێداهەبوو ، لە مێژبوو کاك مەلا بەختیار دەیویست ئەو باڵە سەرکەوێ کە خۆی دەیەوێ ، پاش ئەوەی دەنگی لەسەر هەموو مەسەلە گرنگەکان درا ئنجا هەڵبژاردن دەستی پێکرد . ئەو هەڤاڵانەی خوارەوە بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژاردران :

١- هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا
٢- هەڤاڵ ملازم عومەر عبدولا
٣- هەڤاڵ فەرەیدون عبدالقادر
٤- هەڤاڵ قادر حاجی عەلی
٥- هەڤاڵ مەلا بەختیار
٦- هەڤاڵ جەبار فەرمان
٧- هەڤاڵ کۆسرەت
٨- هەڤاڵ ئازاد هەورامی

ئەو هەڤاڵانەش بە ئەندامی جێگری سەرکردایەتی هەڵبژاردران :

١- هەڤاڵ حەسەن کوێستانی
٢- هەڤاڵ عومەر فەتاح
٣- هەڤاڵ حەمەتوفیق رەحیم
٤- هەڤاڵ د . خەسرۆ

هەرچەندە کۆمەڵە بەرواڵەت بە سەرکەوتوویی لە کۆنفراسەکە دەرچوو کەچی بووە هۆی دروست بوونی برینێك لەناو دڵی هەندێ لە هەڤاڵان تاکو وای لێ هات بە نهێنی لەناو ریزەکانی کۆمەڵە گروپی بچوك بچوك خۆیان ریك دەخست و بەپێچەوانەی سەرکردایەتی کۆمەڵە کاریان دەکرد و بەیانیان بلاو کردەوە بە ناوی ( ئالای شۆڕش ) ، چەند رۆژێك دوای کۆنفراسی کۆمەڵە یەکێتی شۆڕشگیانی کوردستان کە باڵێکی ناو ( ی . ن . ك ) بوو لە هەمان شوێن کۆنفراسی خۆیان بەست ئەو هەڤاڵانەیان بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژارد :

١- هەڤاڵ د . فۆاد معصوم
٢- هەڤاڵ مامۆستا نازم عومەر
٣- هەڤاڵ پێشەوا تالەبانی
٤- هەڤاڵ شەوکەتی حاجی مشیر
٥- هەڤاڵ سەربەست بامەرنی
٦- هەڤاڵ حاکم عومەر
٧- هەڤاڵ د . کەمال فۆاد
٨- هەڤاڵ د . خدر معصوم
٩- هەڤاڵ شێخ دارا
١٠- هەڤاڵ شێخ عەلی حمە صالح
١١- هەڤاڵ شێخ محەمەد
١٢- هەڤاڵ حەمەی فەرەج

پاش کۆنفراسی ئاڵوگۆڕی گەورە بەسەر مەڵبەندەکان دا هات وەبەم شێوەی خوارەوە :

١.هەڤاڵ جەبار فەرمان لێپرسراوی مەڵبەندی یەك
٢. هەڤاڵ قادر حاجی عەلی لێپرسراوی مەڵبەندی دوو
٣. هەڤاڵ حەمەی فەرەج لێپرسراوی مەڵبەندی سێ
٤. هەڤاڵ کۆسرەت لێپرسراوی مەڵبەندی چوار

(ی . ن . ك ) پاش بەستنی ئەو کۆنفراسە کەوتەوە رێکخستنی هێزەکانی و گەشەپێدانی رێکخستن لە شار و شاخ و خۆ سازدان بەرامبەر هەر رووداوێکی ناکاو ، بەرێز مام جەلال لە ناوەراستی مانگی ئەیلول چووە بەغدا بۆ ئەوەی ئەو مفاوەزاتە لەگەڵ حکومەت ساغ بکاتەوە وە

یەك لای بكاتەوە ، حكومەتی عێراق هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی دواخست وا لێك دەدرایەوە گوایە دەیەوێ یەكێتی نیشتمانی كوردستانیش سوود لەو هەلە وەربگرێ پاڵێوراوەكانی دیاری بكات ... ئەو قسانە هیچ بناغەیەكی راستی نەبوو ، چونكە بەبێ سەلماندنی مافەكانی گەلی كورد ی . ن . ك ناتوانێ بەشداری ئەو هەڵبژاردنە بكات .. هەندێ كەس هەتا لەناو ریزەكانی شۆڕش زۆر پڕوپاگەندەیان دەكرد كە گوایە لەو رۆژانە رێككەوتن مۆر دەكرێت وە لەهەندێ شوێن شیعاراتیش نووسرابوو بۆئەوەی رۆژی مۆركردنەكە دوانەكەون ...!! راستی یەك هەیە پێویستە ئاشكرای بكەین ی . ن . ك لە هەموو قۆناغەكانی مفاوەزات ئاگاداری كادیرە پێشكەوتوەكانی دەكردەوە وە چەندین كۆبونەوە بۆ ئەو مەبەستە كرا لەگەڵ مەكتەبی سیاسی ( مەرگە و سورداش ) هەموو كادیرەكان لەگەڵ درێژە پێدانی مفاوەزات دابوون ، لە كۆبونەوەی سورداش تەنیا دوو هەڤاڵ دژی مفاوەزات وەستان یەكێكیان پاش ئەوەی مفاوەزات كۆتایی هات و دەنگی فرۆكە و تۆپ هاتەوە خۆی پێ رانەگیراو قوچاندی بەرەو ئەوروپا حەزم نەكرد ناوی بهێنم.

كە مام جەلال لە تشرینی دووەم گەڕایەوە ساغ بۆوە كە نیازی حكومەت خراپەو دەیەوێ دەستی بە شۆڕش بكات و لەدوایشدا بڕوای خەڵكی لێوەربگیرێتەوە. بە بۆچونی خۆم ی. ن . ك زۆر بە رێك و پێكی ئیدارەی ئەو صراعە بكات لە كاتی مفاوەزات خۆپیشاندانی سلێمانی و پشتگیری كردنی خەڵك زیاتر متمانەی بە ی . ن . ك زیاد كرد ئەگەر ی . ن . ك خۆی ئامادە دەكرد بۆ قۆناغی دوای مفاوەزات ئەوا حكومەتی عێراقیش بەرە بەرە خۆی كۆكردەوە جاش و سیخوڕەكانی بەرەڵا كردبوو بۆئەوەی لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی كوردستان بكەونە شەڕ ، كۆیتەرەكانی رژێم لە ناوچە گشتیەكان دەسوڕانەوە هەر كەسێكیان لە هێزی پێشمەرگەی كوردستان بە چەكەوە بدیبایە دەیان خستە بەر پەلامارو هێرش ، بۆیە بارەگای هێزی پێشمەرگەی كوردستان بەرەبەرە لە شوێنە پێ دەشتەكان كشایەوە بۆئەو شوێنانەی كە رژێم نەیدەتوانی بە ئاسانی دەستی وێرا بگات . مەڵبەندەكان كەوتنە خۆسازدان و خۆ ئامادەكرن ، لەهەندێ شوێن تیپی تازە دروست كرا ، حكومەتی عێراق ئەو هەنگاوەی یەكێتی نیشتمانی كوردستانی زۆر پێ ناخۆش بوو .... سەیر لەوەدا بوو لە كاتێكدا حكومەت هیچ مافێكی گەلی كوردی نەسەلماند هەموو داواكانی یەكێتی نیشتمانی كوردستانی دەخستە پشت گوێ ، كە بەدەیان فەوجی جاشی دروست دەكرد ئەو هەموو كردەوانەی خۆی بە تێك دانی مفاوەزات نەدەزانی .. بەڵام دروست بوونی چەند تیپێكی تازەی هێزی پێشمەرگەی كوردستانی

به نیـازی شـەڕ کردنـەوەی ( ی . ن . ك ) ی دائـەگینا ...!!؟ ئەوەیـە دوژمـن یـەکێتی نیشمانی کوردستانی دەویست بە هێز بێت لەکاتی پچڕاندنی مفاوەزات ، حکومەتی عێراق بەهۆی ئەلقە لەگوێیەکانی خۆی لە ناکۆکیەکانی ناو ی . ن . ك بەگشتی و کۆمەڵە بەتایبـەتی گەیشـتبوو ، بە خەیاڵی خۆی وای بۆ دەچوو ئەگەر ی . ن . ك بکەوێتە شەڕ کردن ئەوا ناکۆکیـەکانی نـاوخۆی دەتەقێتەوەو ناتوانێ بەرەنگاری ڕژێـم بێتـەوە، ئـەو خالآنـەی حکومـەت بینـای سیاسـەتی خـۆی لەسەردەکرد بەرامبەر ی . ن . ك بە بۆچونی حکومەتی بەعسی عێراق ئەوانەی لای خوارەوە بوون:

١- ئەگەر کۆمەڵە بەو دۆخەدا بڕوات لەئەنجام (انشقاق) دەکات پاش کـۆنفرانس کـاك مـەلا بـەختیار ڕازی نـەبوو کـار بکـات، هەنـدێ مـەرجی دانـا بۆکـارکردنی خـۆی یـان دەبـێ ببێتـە لێپرسـراوی مەڵبەنـد یـان ئەنـدامی ناوەنـدی و لێپرسـراوی بەشـی ڕێکخسـتن لـە کۆمەڵـە ، سەرکردایەتی کۆمەڵە ئەو مەرجانەی هەڤاڵ مەلا بەختیاری پەسـەند نـەکرد هـەر بۆیـە چـوو بـۆ ناوچەی قەرەداغ دەستی کرد بە ڕێکخستنی دۆست ولایەنگرانی خۆی و بـە نهێنـی دژی ی . ن . ك بەیان و بلآوکراوەی دەردەکـرد بـەناوی (( ئـالآی شـۆڕش)) ئیشـارەتە بـە بلآوکـراوەی ئـالآی شۆڕش لە سەردەمی خەباتی نهێنی کۆمەڵە ، ڕژێم پێی وابوو هەندێ لە عەناسـرە چـالاکەکانی کۆمەڵە لەگەڵ هەڤاڵ مەلا بەختیار دەبن و ی . ن . ك تووشی دووبەرەکی پارچـە پارچـە بـوون و گێژاوی بیورڕا دەبێت .

٢- لە کاتی مفاوەزاتی عێراق ڕەنگە حکومەتی عێراق پەیوەندی لەگەڵ هەندێ لێپرسراوانی هێزی پێشمەرگە کردبێ یا دەتوتنم بڵێم هەندێك لەوانە لە بنچینەدا بە قسەی ڕژێم لەناو شۆڕش دابوون ، حکومەت دەیویست لەکاتی شەڕ دەسـت پێکردنـەوە ئەوانـە بگێڕێتـەوە نـاو ڕیزەکـانی خۆی و زەبر لەشۆڕش بدات .

ڕاستە هەندێك لەوانە لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شۆڕش خۆیان ئاشکرا کرد ئەو پەردە ڕەشـەی چەندین ساڵ بوو لە پەنای خۆیاندا پۆشیبوو هەڵدایەوە ، لەناو خەڵك و عـەوام ئاشـکرا بـوون وە گەڕانەوە شوێنی ئەسڵی خۆیان (( وعادت الحليمه الى عادتها القديمه )).

٣- ڕژێم دەیان فەوجی جاشی دروست کردبوو دەیویست یا وای بۆ دەچـوو هـەر شـەڕی کـورد بە کورد بکات وە خۆشی بە ئیسراحەت سەیری شەڕەکان بکات .

شۆڕشی کوردستان لە مەدای نزیك ناتوانێ یەکتری بگرێتەوە واتە هێزە سیاسیەکان لەبەرئـەوەی برینی قوڵ و سامناکیان لە جەستەی یەکتر دروست کردوە وا بەئاسانی تیمار ناکرێت هـەر شـەڕ

دەست پێبکاتەوە هێزە سیاسی یەکانی گۆڕەپانی کوردستان دەکەونە گیانی یەکترو ڕژێمیش سوود لەو دۆخە وەردەگرێ و لە ئەنجام شۆڕش لاواز دەبێت .

٤- ئابلوقەی ئابوری لەسەر ناوچە رزگار کراوەکان وتێکدانی گوندەکانی کوردستان بۆئەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە یارمەتی و پشتیوانی گەلەکەمان بێ بەش بکات ، ئەوانەو هەندێ تریش لەو خالآنە بوون کە حکومەتی بەعس سیاسەتی خۆی بەرامبەر بە ی . ن . ك لەسەر دادەرشت . وەنگە هەموو ئەو خالآنە جێگای سەرنج بێت بەلآم هیچیان ئامانجەکانی رژێمیان پێ نەهاتە دی ، ی . ن . ك زیرەکانە ، ئازایانە ئەو گیوگرفتانەی بڕی کۆسپ و تەگەرەکانی پێش شۆڕشی تەخت کرد ، نابێ نکولّی لەوەش بکرێ تا ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لەبەردەم شۆڕش راماڵی تووشی گیوگرفت هات ، تووشی ئاستەنگی بوو بەلآم دەبێ ئەو راستیە هەمیشە لە پێش چاو بگرین شۆڕش کردن کارێکی دژوارو سەختە ی . ن . ك هەموو ئەو خالآنەی لەسەروە باسمان کرد دەیزانی و هەستی پێکردبوو ، بێ خەبەر نەبوو ، لەگوێ ی گا نەنوستبوو ، بەرە بەرە هێزی پێشمەرگەی رێکخستەوە ، بارەگای مەڵبەندەکانی نزیك خستەوە لەو شوێنانەی دامەزراند کە کاردەکەنە سەر وورەی خەڵك و پێشمەرگە ، بارەگای مەڵبەندی یەك لە قەرەداغ و ، بارەگای مەڵبەندی دوو لە سەرگەڵوو ، بارەگای مەڵبەندی سێ لە وەرتێ ، بارەگای مەڵبەندی چوار لە سماقوڵی سەرچاوە بوو، لەهەمان کات زیرەکانە چارەسەری ناکۆکیەکانی ناو ریزەکانی کۆمەڵەی کرد بواری دایە هەموو کادیرو ئەندامەکان تا بتوانن لەراستی مەسەلەکان بگەن ،یەك راستی هەیە هەقە لێرە روونی بکەینەوە ئەویش کۆمەڵە رێکخراوێکی مارکسی عەیار بیست و چوار نەبووە تاکو بڵێین لە فکری مارکسی - لینینی لای داوە بەڵکو لە پێناوی قازانجی میللەتەکەمان کاری کردووە وچی بەچاك زانیبێ کردوویەتی راستیەکەی کۆمەڵە لە قازانجی چینی هەژار و ئاستەنگکێشان و رەش و رووتی میللەتەکەی لە هەموو حزب و رێکخراوەکانی تر لە پێش تربووە و پشتگیری بەهێزی کردوون ، بەرامبەر ئەو کسانەش کە گومانیان لێ دەکرا رۆژێك لە رۆژان بچنە پاڵ رژێم هیچ بەڵگەیەکی نەدانە دەست کەلە پاشە رۆژ بڵێین ناچارکراین تەگینا کوردی پاك و بێ غەل و غەش بووین ...!! هەر لە نەورۆزی ١٩٨٤ ی . ن . ك جاڕی ئاشتبوونەوەی گشتی دابوو وە چەند جارێك بە نهێنی نوێنەرانی ی . ن . ك لەگەڵ لایەنە سیاسی یەکانی کوردستان بۆ ئەو مەبەستە بە نهێنی کۆبونەوە بەتایبەتی لەگەڵ هەڤالآنی حزبی شیوعی عێراقی . دەربارەی ( فەوجە سووکەکان شۆڕش هەر لە سەرەتا سیاسەتێکی نەرمی بەرامبەریان بەکار هێنا دەیویست پەکی شەڕی کورد

به کورد بێخیٚ هەرنا سەرۆك جاش و جاشەکان بە پەرۆشەوە شەڕی هێزی پێشمەرگەی کوردستان نەکەن لەئەنجامیش زۆربەی سەرۆك جاشەکان بە نهێنی پەیوەندیان لەگەڵ شۆڕش گرێ دا وە لەکاتی پێویست یارمەتیان ئەگێنارد ، لە جموجۆڵەکانی دوژمن ئاگاداری شۆڕشیان دەکردەوە ، وەلەکاتی هێرش و پەلامارەکانی دوژمن زۆربەی جاشەکان بە پەرۆشەوە نەبوون .

شۆڕشی کوردستان نەیدەویست لەو هەل و مەرجە دژایەتی هەموو دوژمنانی کورد لەیەك کاتدا بکات هەربۆیە لەگەڵ ئێرانیەکان قسە دەکرا هەرچەندە ئەوان نەیاندەویست بەبێ مەرج پەیوەندی لەگەڵ ی . ن . ك دروست بکەن ، لەپاشان دەگەڕێینەوە سەر ئەو خاڵە گرنگە کە رۆڵی گرنگی گێرا لە باری گەلی کوردستان. بەهەر حاڵ حکومەتی عێراق ئەوەی لەبیر خۆی بردبۆوە کەلەگەڵ ئێران شەڕێکی گران بەهای تووش هاتووە وهیچ دەنگ و بۆی راوەستانی ئەو شەڕە نەدەهات .

بێ گومان شۆڕشی کوردیش دەیویست سوود لەشەڕی نێوان ئەو دوو دوژمنە دێرینە وەربگرێ ، نابێ تۆزقاڵێك گومان هەبێ لەوەی کە ئۆباڵ لەئەستۆی سەرکردایەتی شۆڕش بووە کە مفاوەزات پچڕا چونکە لە هیچ زروف و زەمانێك ئەو داگیرکەرانە نایانەوێ دان بە مافەکانی کورد بنێن لە کاتێکدا رژێم لە بەغدا لە ناخۆشترین باری ئابوری ، سیاسی ، عەسکەری دایە ئینجا ئاواتە خوازە جارێکی تر وولاتەکەمان داگیربکاتەوە وە نیوەی کوردستانی خوارووی داگیرکردەوە . شەڕی رزگاری گەل دەتوانێ بەو رژێمانە بسەلێنێ ، مفاوەزات هات و چو ، نامە گۆڕینەوە ئەگەر چی لەو چەرخە قازانجی خۆی هەیە بەڵام هەرگیز نابێتە هۆی ئەوەی خاکمان رزگار بێت مافەکانمان جێ بەجێ بکرێت هەرچەندە مافە سەرەتایەکانیش بێت .

# هەڵوەشانەوەی مفاوەزات

لە ١٩٨٤/١٢/١ کۆبونەوەی ئەنجومەنی مەڵبەندی چوار لە گوندی زیارەت بە سترا بە ئامادەبوونی ئەو هەڤاڵانەی خوارەوە :

١- هەڤاڵ کۆسرەت ( لێپرسراوی مەڵبەند )

٢- هەڤاڵ شیخ جەعفەر ( لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەند )

٣- کاك مەحمود بەنزین

٤- کاك رۆوف سلیمان

٥- کاك شاخەوان ( ئەندامی مەڵبەند پێشتر ف ت ٨٥ ی بەرانەتی )

٦- هەڤاڵ سابیر رەسوڵ ( ف . ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر )

٧- هەڤاڵ رەهبەر سەید برایم ( ف . ت ٩٣ ی کۆیە)

٨- هەڤاڵ سەفین ( ف . ت ٨٧ ی قەرەچوغ )

٩- هەڤاڵ هێمن ( ف . ت ٨٥ ی بەرانەتی )

١٠- هەڤاڵ مام غەفور ( جێگری ت ٨٧ ی قەرەچوغ )

١١- هەڤاڵ نەهرۆ سەعید سۆفی ( سەرپەرشتیاری رێکخستنی بەرانەتی )

١٢- هەڤاڵ رێباز ( جێگری ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر )

١٣- هەڤاڵ مەجیدە سورر ( جێگری ت ٨٥ ی بەرانەتی )

١٤- هەڤاڵ فاروق عەلی مەولود

١٥- هەڤاڵ مامۆستا باپیر

١٦- هەڤاڵ شوان ( بەهرۆز )

١٧- مامۆستامحسن( لێپرسراوی لقی شۆرشگێران )دوای خیانەت کردنی لەموسل بە سزای گەل گەیی

١٨- هەڤاڵ مەلا خدر ( لێپرسراوی کەرتی رێکخستنی دەشتی هەولێر )

١٩- هەڤاڵ تەحسین کاوانی ( ف . ت ٩١ ی سەفین )

لەو کۆبونەوەیە ئ ئاڵوگۆری گرنگ بەسەر لێپرسراوانی عەسکەری و رێکخستن داهات ، کەم و زۆر لە مەسەلەی مفاوەزات کۆڵدرایەوە .

برادەران هەریەکە بە ئازادی بۆچونی خۆی دەربڕی ، بە گشتی لەناو کادیرانی ی . ن . ك سێ بیرو بۆچوون هەبوو ، وە کۆبونەوەکەی مەڵبەندی چوار لەو سێ ڕەئیە بەدەر نەبوو :

١- بەشێك لە کادیران مفاوەزاتیان بە کارێکی ڕاست دەزانی بەردەوام بوونی لە قازانجی میللەتی کوردیان دائەگینا ، ئایشارمەوە یەکێك بووم لەو کادیرانەی کە شەڕ کردنەوەم پێ خراپ بوو چونکە دەبێ ئەو ڕاستیە بزانین شەڕکردن ماڵ وێرانی و کوشتن و برینی لە دوایە وە کارێکی ئاستەنگبە تایبەتی بۆ میللەتێکی وەکو کورد کە بە دوژمنان دەوری گیرابێ ، بۆ ی . ن . ك شەڕکردن کارێکی زۆر زۆر ئاستەنگ بوو .

٢- هەندێك لە کادیران بۆچونیان وابوو دەبێ شۆڕش و ی . ن . ك لەسەر دوو قاچ بڕوات ( شەڕو ئاشتی ) ، ئەگەر ( ی . ن . ك ) و میللەتی کورد ئەوەندە مەترسی لەسەر ڕژێم پەیدا بکردایە دەیتوانی ئەو سیاسەتەبچەسپێنێ ، پێم وایە شەڕو ئاشتی لەدەست ئێمە نەبوو چونکە دوژمنانی کورد هەمیشە شەڕیان بە کورد فرۆشتوە ویستویانە ناوی لە مێژوو ڕەش بکەنەوە بە ئارەزووی خۆیان هەڵسوکەوت لەگەڵ کورد بکەن ، ئەو ڕەئیە لە جێ ی خۆی نەبوو و لە توانای ی . ن . ك دا نەبوو ئەو سیاسەتە بچەسپێنێ .

٣- بەشێکیش لە کادیرەکان پاش ئەوەی نا ئومێدی باڵی بەسەر داکێشابوو وە بڕوایان بە مفاوەزات نەمابوو دەیانویست هەرچی زووە شەڕ دەست پێبکاتەوە ، بەبڕوای من هەندێك لەو کادیرانە هەر بۆئەوە ئەو ڕەئیەیان دەردەبڕی تا بەشۆڕشگێڕو تێکۆشەر خۆیان پیشان بدەن و بەرژەوەندی خۆیان زیاتر بپارێزن ، هەرچەندە ی . ن . ك هیچ ڕێگایەکی جگە لە شەڕکردنلە پێش نەمابوو بە هەقیش شەڕکردن کارێکی دژوارو ناخۆش بوو لەو سەردەمە.

لەو هەل و مەرجە جاشەکان لە هەموو ناوچەکان کلکیان خستەوە سەر پشت و شەڕیان بە پێشمەرگە دەفرۆشت بە تەواوی هێزەکانی پێشمەرگە کەوتنە ئامادەباشی و دوورکەوتنەوە لە شارەکان ، دیارە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان ئەو جۆرە کۆبونەوانە کرابوون وە قسەی کادیرەکانیان وەردەگرت دیارە حکومەتی عێراقیش پاش تێك شکاندنی هێرشەکانی ئێران لە ناوچەکانی ( خواروو - سەروو - ناوەڕاست ) لە بەڵێنەکانی خۆی پەشیمان بۆوە ، بۆیە ی . ن . ك لە ١٩٨٥/١/١٥ بە بەیانێکی کۆمیتەی سەرکردایەتی مفاوەزاتی لەگەڵ ڕژێمی عێراق ڕاگرت بە ڕاشکاوی بۆ جەماوەری گەلەکەمانی روون کردەوە کە حکومەتی عێراق هەموو هەوڵ و تەقەلاکانی شۆڕشی خستۆتە پشت گوێ و دەیەوێ پاشەکشە لە مفاوەزات بکات ، هەمان ڕۆژ مەکتەبی سیاسی ( ی . ن . ك ) بە بروسکە ئاگاداری مەڵبەندو تیپ و ڕێکخراوەکانی کردەوە و

وشیاری کردنەوە کە ئەو مفاوەزات راگرتنە واتای شەڕکردنەوە نی یە بەڵکو دەبیٚ بەدەستێکی پۆلایین لێیان بدەن ، حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق وە بەتایبەتی رژێمی بەعس هەمیشە هەوڵ و تەقەلای بیٚ ووچان دەدەن بۆئەوەی میللەت لە شۆڕش و سەرکردەکانی دابڕن و خۆیان بەسەرکردەی کورد دەزانن بەدرۆ فرمێسك بۆ گەلی کورد دەرێژن ، سەرکردەکانی کورد تاوەنباردەکەن گوایە دەیانەویٚ بازرگانیان پیٚ بکەن لە بیرە خۆیان دەبەنەوە کە ئەوان بەناهەق خاکی کوردستان داگیردەکەن ، گەلەکەی دەچەوسێننەوە کوردیش وەکوگەلانی دنیا خاوەنی حزبی سیاسی خۆیەتی بەهۆی ئەو حزبە سیاسیانە پیٚ لەسەر داواکانی دادەگریٚ .

لەپاش رۆژی ١٩٨٥/١/١٥ بۆ هەموو خەڵك ئاشکرا بوو کە مفاوەزات گەیشتە بن بەست و شەڕ کردنەوە نزیك بوویتەوە . لە ١٩٨٥/١/٢٥ بە پیلانێکی نامەردانە قارەمانی گەلی کورد رۆڵەی بەوەفاو بەجەرگ ودڵسۆزی گەلەکەمان مامەریشە شەهید کرا کە( منظومەی استخباراتی عسکەری ) لەو پیلانە کاریگەرانە بەشداری هەبوو .

بە شەهید بوونی مامە ریشە کوردستان شڵەژا ، خەڵك داوای لەهێزی پێشمەرگەی کوردستان کرد کە تۆڵە بکەنەوەوە دۆست و دوژمن گومانی لەوەدا نەما کە رژێم نیازی خراپە و لەهەل دەگەڕیٚ تا دڵسۆزانی گەلەکەمان لە پەنا مفاوەزات شەهید بکات ، بەم جۆرە لاپەڕەیەکی تر لە مێژووی شۆڕشی کوردستان دەستی پێکردەوە ، شەڕ لەسەرانسەری کوردستان بە گەرمی بەردەوام بوو ، هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە پێچەوانەی خەون و خەیاڵەکانی رژێم و ناحەزان دەستی کوشندەو کاریگەری لە دوژمن وەشاند ، مێژووی کوردی بە دەیان و سەدان داستانی قارەمانانە رازاندەوە ، پێم وایە دوژمن تاماوە لە بیری ناچێتەوە .

ی . ن . ك دەیویست بیٚ خوێن رشتن ، بیٚئەوەی گوندە جوانەکانمان بسووتێن ، بیٚ ئەوەی جەرگی پیرە دایك بسووتیٚ ، بیٚ ئەوەی منالی کورد بیٚ باوك بێت ، مافی کورد بدریٚ کەچی بەعسیەکان ، هەموو دوژمنانی کورد بیٚ گویٚ دانە ویژدان ، بیٚ گویٚ دانە مرۆڤایەتی بەشەڕ دەیانەویٚ میللەتەکەمان سەرکوت بکەن ئەوا لە بەشەکانی تر دەبینن چۆن هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرگری لە کوردستان کردوە .

## شەڕكردنەوە لەگەڵ میری

مفـاوەزاتی ی . ن . ك لەگـەڵ حكومـەت بینـەو بـەردەی زۆری لەسـەر كـرا . هەنـدێك لـە ناحەزانی ی . ن . ك ناوی جاشەتیان دەدا پاڵ ئەو رێكخراوە خاوەن هەزاران شەهیدە كە پێم وایـە ناهەقیەكی یەكجار گەورەیان دەكردلە هەمووان سـەیرترو سەرسـوورِ هێنـەر تـر ئێـران یـەكێتی نیشتمانی كوردسـتانی تاوەنبـار دەكـرد دەق وای لێ هـاتبوو (( تـا خـاوەن مـاڵ دزی گـرت دز خاوەن مالّی گرت )) . ئێران حەوت ملیـۆن كـورد دەچەوسـێنێتەوە هێشـتا پێـی خـراپ بـوو ، دەیویست دەست بخەینە ناو دەستی ئێران و زەبر لە عێراق بدەین وە نـابێ وورتـەمان لێـوە بێـت بەرامبەر ئـەو غـەدرەی لـە میللـەتی كـوردی دەكـات لـە كوردسـتانی سـەروو، كـوردە (( ئەوروپیەكان )) كە عەیامێكی دوور بوولە دوور ووڵات دەژیان هەر بۆ خۆش كردنی مەجلیسـی خۆیان ناوی كوردستانیان وەبیر دەهاتەوە ، لە باری كوردسـتان بـێ خەبـەر بـوون دەیـان گـووت هەرگیز نابێ مفاوەزات بكرێ ئەوە سەدام بەهێز دەبێتەوە.

دەبێ گوندەكان هەموو تێك بچن قەیدی چی یە ، فلان رۆژنامە نوسیویەتی سەدام دكتاتۆرە چۆن دەبێ دەستی بخرێتە ناو دەست ، هەزار قسەی حەلەق و مەلەقی وایان دەكـرد پیـاو لـەخۆی تەریق دەبۆوە ، هەندێكیان ئامادە نەبوون تەنیا یەك رۆژ بێنەوە كوردستان لەگـەڵ ژان و ئـازاری پێشمەرگەو خەڵك بژین . وەیەك دۆلاریشیان بە یارمەتی نەئەگینارد ، پێم وابوو هەندێك لەو برا ئەوروپیانە خۆشیان لە پەنا كێشەی كورد قەڵەو كرد ؟ داخەكەم هەنـدێك لەوانـە بـێ خێـر بـوون ساڵەها بوو لە ئـەوروپا بـەناوی خوێنـدن كـەس و كاریـان بـەجێ هێشـتبوو لەبـەر كـاری لابـەلا تائیستا نەیانتوانی شەهادەیەكی چاك وەربگرن تا بتوانن لـە رۆژێكـی خـۆش و بـێ گێوگرفـت خزمـەتی میـللەتەكەیان بكەن .

ئەوانەش لە ی . ن . ك تۆران و جنێوی سەرەو هەورازیان دەدا بەڵام چونكە بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئەو هەڵلآیەیان دەكرد قسەكانیان بڕیاری نەبوو چەند هەنگاوێك بڕی نەدەكرد .

رووخان و نەرووخانی رژێمی سەدام حسێن لە دەست یەكێتی نیشتمانی كوردستان و شۆڕشـی كوردو میللەتی كورد نی یە ، ئەمەریكا و فەرەنسا و روسیا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و سـعودیە و كوێتی بە پەند چوو یارمەتی عێراقیان دەدا ، بە هەزاران ملیـۆن دولاریـان پێشـكەش كـرد بـە سەدان هەزار تەن چەك و تەقەمـەنیان پـێ فرۆشـت ، گـازی ژەهراویـان فێـر كـرد هـەق نـی یـە بوختانی وا گەورە بە شۆڕشی كورد بكرێ

شەڕ لە پێناوی شەڕ نی یە ، شەڕ لەپێناوی هێنانە دی ئامانج و ئاواتەکانی گەلی کوردە جا هەرکاتێك بەهەر ڕێگایەك ئاواتی کورد بێتە دی ئەوا دەبێ پێشوازی لێ بکەین ، خۆ هێنانە دی ئامانجەکانی میللەت بەبێ شەڕ کارێکی زۆر باشە ، ئەگەر بەئاشتی ڕژێم دانی بە مافەکانی گەلی کورد بنایە ئەوا چوارهەزار گوندمان تەخت نەدەکرا ، ئەمڕۆ میللەتەکەمان باری ئابوری گەلێك باشتر دەبوو ، ئەگەر شەڕ لە کوردستان نەبووایە ئەوا خێزانی دەیان هەزار شەهید موچەی نەدەکەوتە سەر حکومەتی کوردستان ، ئەگەر شەڕ نەبووایە ئاوارەی گەلەکەمان ئێران و تورانی نەدەگرتەوە . کەواتە شەڕ دیاردەیەکی سلبیە لە ژیانی هەموو گەلێك نابێ شانازی پێوە بکەین کەچی میللەتی ئێمە بە شانازیەوە باسی شەڕەکانی خۆی دەکات چونکە هیچ ڕێگەیەکی تری لەبەردەم نەمابوو تەنیا شەڕ نەبێ بۆ بەرگری لە بوونی خۆی بەهەر حاڵ ئەو هەموو درۆ و دەلەسە و بوختانانە ئاشکرا بوون و ی . ن . ك پێی داگرت لەسەر داواکانی میللەت ڕێگای ئاشتی هەڵبژارد دوژمن ملی نەدا ئینجا ڕێگای سەخت و دژواری هەڵبژاردەوە ئەویش شەڕ کردن بوو لەگەڵ ڕژێمێکی وا مەلعون و لەخۆبایی و دڕندە .

لە مێژ ساڵە حکومەتی عێراق دەیەوێ ئەو ناوچانە لە کورد چۆڵ بکات و عەرەبی لێ نیشتەجێ بکات بەتایبەتی ئەو ناوچانەی خێرو بێری زۆرە ( نەوت ، گەنم ، جۆ.......هتد ) .

بەعەرەب کردنی ناوچە کورد نشینەکان مەترسی ڕۆژ بەڕۆژ زیاد دەکرد وای لێ هاتبوو بەچەندین ڕێگا دەیانویست شارە گەورەکانیش مۆرکی عەرەبی پێوە دیار بێت خانەقین ، مەندەلی ، توزخورماتو ، کفری ، کەرکوك ، دبس ، کەندیناوە ، سنجار ، تەلەعفەر ، زمار ، شێخان ....هتد بە مێژوو خاکی کوردستان زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی کورد بوون ، بەماوەیەکی کورت هەموو ئەو ناوچانەی لە کورد چۆڵ کرد وە عەرەبی لە جێگای ئەوان نیشتەجێ کرد ، بەهەزاران خێزانی کورد دەربەدەرو سەرگەردان کران ، بۆ پارووە نانێك ئەو شارو ئەو شار دەکەن لەپێش چاوی ئەوان خێروبێری ئەوان عەرەب دەیخۆن . بۆیە دەرپەراندنی ئەو عەرەبانە ئەرکێکی نیشتمانی یەو لەسەر هەموو کوردێك پێویستە هەوڵی جدی بدات بۆوەرگرتنەوەی خاکی باو و باپیرانی و گەڕانەوەی ئەو پارچە داگیرکراوە بۆ باوەشی نیشتمان .

هێزی پێشمەرگەی کوردستان بۆئەوەی عەرەبەکان ووشیار بکاتەوە تا دەست هەڵبگرن لە زەوت کردنی موڵك و ماڵی کوردی بێ تاوان ، نەخشەیەکی ڕێك و پێکی دانا بۆ لێدانی ئەو عەرەبانەی هاتوونەتە گوندە کوردیەکان ، ساڵەهایە برا عەرەبەکان هاوارو ڕۆڕۆیتیان بۆ فەڵەستین کەچی هەمان سیاسەتی ئیسرائیلیەکان بەرامبەر کورد جێبەجێ دەکەن ئاوڕێك لە

ویژدانی خۆیان نادەنەوە ، باشتر بلێم شەرمێك لە خۆیان ناكەن وا بەگژ ئەو میللەتە هەژارەدا دەچن لەكاتێك ئیسرائیل خەنجەری لە دڵی سەدو پەنجا ملیۆن عەرەب دەدا وهەیبەتیان دەشكێنێ و بێ حورمەتیان پێ دەكات ، سەرانی وولاتە عەرەبیەكان لەجیاتی ئەوەی شەرم بكەن و ئارەقەی شەرمەزاری ناوچەوانیان بگرێ كەچی لە تونس و میسر ومەغریب ... هتد بە هەزاران ماڵە عەرەبیان ئەگێناردە عێراق و هانیان دەدان تا خاكی كورد داگیربكەن وخێروبەرەكەتی لێ زەوت بكەن مێژوو نابێ بەزەیی بە هیچ سەرۆكێكی عەرەب دابێ چونكە لە ئاستی ئەو مەسەلەیە هەڵوێستی نامرۆڤانەیان هەبووە ، كەسێك كە مافی خەڵكی تر پێشێل بكات هەقی ئەوەی نی یە داوای مافی خەڵكانێكی تر بكات .

سیاسەتی بەعەرەب كردنی كوردستان چەند دەوڵەت و لایەنێك تێیدا بەشداربوون خۆش بەختانە ناكۆكی ناو دەوڵەتە عەرەبەكان هەموو پیلانەكانی هەڵوەشاندەوە و سەركەوتوو نەبوون ، كۆمیتەی سەركردایەتی بڕیاری دا كەلە ١/٢/١٩٨٥ لە چەند لایەك هێرش بكرێتە سەر گوندە ( تەعریب ) كراوەكان . لە رۆژی ٣٠/١/١٩٨٥ لە نزیك گوندی ئازیانە لە ناحیەی قوشتەپە كۆبونەوەیەكی زۆر بە نهێنی كرا كە ئەو هەڤاڵانە تێیدا بەشدار بوون :

١- هەڤاڵ كۆسرەت
٢- هەڤاڵ شێخ جەعفەر
٣- هەڤاڵ سەفین
٤- هەڤاڵ مام غەفوور
٥- هەڤاڵ رێباز
٦- هەڤاڵ مەلا سایمان
٧- هەڤاڵ فاروق عەلی مەولود
٨- هەڤاڵ نەهرۆ سەعید سۆفی

پاش تاووتوكردنی دۆخەكەو دانانی نەخشە بڕیاردرا لە گوندەكانی ( دەربەند -پەلكانە ) لە ناحیەی كەندیناوە بدرێ وەلە رۆژی ١/٢/١٩٨٥ ئەو كارە ئەنجام بدەین ، بۆئەو مەبەستە ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر و ت ٨٧ ی قەرەچوغ و كەرتی سێ ی تیپی ٨٥ ی بەرانەتی ئامادەكرا ، لەشەوی /٢/١٩٨٥ باران دەستی پێكرد رێگاو بان گیران ، كارەكەمان جێبەجێ نەكرا شەوێ درەنگ چومە لای كاك كۆسرەت و برادەران لە گوندی ( تیكالۆ) زۆر دلگیر بوون چونكە دەیانزانی وەكو پێویست كارەكە ئەنجام نادرێ رەتلێك بەسەر گوندی ( دەربەندی گۆم ) ی دادا

پاش شەڕێکی کورت پێشمەرگەکان کشانەوە هەر ئەوەندە بەس بوو ڕۆژی دواتر گوندی دەربەند لە عەرەب چۆڵ کراو هەلاتن هێزەکەی تر نەگەیشتنە گوندی پەلکانە و گەڕانەوە ، هەمان شەو هێزێکی تری ی . ن . ك کە پێك هاتبوو لە ت ۲۱ ی کەرکوك هێرشیان کردە سەر گوندی ( گورزەیی ) لە ناحیەی ( ڕێدار ) پاش شەڕێکی کورت توانیان دەرس بە عەرەبان بدەن ، کوشتنی ( عەرەبەکان ) بێنەو بەردەی لەسەر دروست بوو سەرەڕای ئەوەی حکومەت ڕێنەی کوژراوەکانی گوندەکەی گرتبوو لەناو هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش ئەو ڕەفتارەی پێشمەرگەکانی ت ۲۱ جێگای دڵخۆش نەبوو ، ڕاستە ئەوانە عەرەب بوون و خاکی کوردستانیان داگیرکردبوو ، ڕاستە کوردیان لە شوێنی باوك و باپیران دەرپەراندبوو، ڕاستە هەق نی یە ملك و ئەرزی کورد داگیر بکەن ، ڕاستە چەکداری حکومەتیش بوون ، کەچی ئەو هەموو ڕاستیانە نابێ ڕێگا بدا پێشمەرگەی کوردستان کاری نابەجێ بکات و منالی ساوا ، ئافرەت بکوژێ چونکە دەبێ پێشمەرگە ویژدانی خۆی ڕەچاو بکات ، بەعس بەعسە و پێشمەرگەش پێشمەرگەیە . پێشمەرگەی خاوەن ڕەوشتی بەرز هەمیشە دەبێ ڕێز لە ئافرەت و منال بگرێ . پاش ئەو شەڕە گوندەکە پاك کرایەوە لە عەرەب . ڕژێم شەڕی گورزەی کردە بیانوێکی گەورە تا ڕق و تووڕەیی خۆی بەسەر کوردان دا ببارێنێ ، هەر بۆیە لە ۱۹۸٥/۲/۷ هێزێکی گەورەی دوژمن هێرشی کردە سەر گوندی ( گۆپتەپە ) لە ناحیەی ئاغجەلەر ، پاش شەڕێکی (١٤) کاتژمێری چەندین پێشکەرگەی قارەمان شەهید بوون وە چەندی تریش بریندار بوون لەوانە ( مام ڕۆستەم ) ، وە خەلکی گوندەکەش زەرەرو زیانی گەورەیان لێکەوت و حکومەت گوندەکەی کاول کرد . حکومەتی عێراق سەروەت و سامانی خەلکی گوندی گۆپتەپەی بەتالان برد ، خەلکەکە ئاوارە بوو ، مال و منالی ساوا بەو زستانە لە پەنا ئەشکەوتەکان خۆیان پاراست ، کۆپتەرەکانی ڕژێم ڕۆژانە لە ناوچەکە دەسووڕانەوە ، حکومەتی عێراق سەربازی لەشەڕی کوردستان بەکاربێنێ ، دەیویست ئامادەیان بکات بوچ بەرپەرچ دانەوەی هێرشەکانی ئێران هەر بۆیە لەو جۆرە هێرشانە زۆربەی جاشەکانی بەکاردەهێنا ، جاشەکانیش گوێیان بەهیچ نەدەدا ، لە عەرەبەکان خراپتر بەردەبوونە تالانکردنی مالی هەژارانی کورد . شەڕی گۆپتەپە هەلسووکەوتی جاشەکانی بۆ خەلك روون کردەوە .

تا ئەو کاتەش هاتووچۆ لەنێوان حکومەت و شۆڕش هەبوو بەو هیوایە ئەو شەڕانە ببێتە پەند و عیبرەت بۆ حکومەت و بەبیرو بۆچونەکانی دا بچێتەوە .

هەرچەند هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە گۆیتەپە شەڕی دلێرانەی کرد ، بەدەیان جاش و سەربازی کوشت ، زەرەرو زیانی زۆری لە دوژمن دا کەچی دوژمن خۆی بەسەرکەوتوو زانی لەبەرئەوەی توانی گوندی گۆیتەپە تەخت بکات . لە ساڵی ١٩٨٥ تا کۆتایی ئەنفالەکان کەلەپاشان دێینە سەر باس کردنی جاشەکان دەوری گرنگیان هەبوو لە شەڕکردن بەرامبەر پێشمەرگە ، لەسووتان و تالان کردن ، هەر هێرشێك لەلایەن دوژمن دەکرا بە دەیان فەوجی جاش بەشداری تێدا دەکرد لەهەندێك لەو هێرشانە تەنیا چەند ئەفسەرو سەربازێك بۆ چاودێری کردن لەو شەڕە بەشداریان تێدا هەبوو ، لەهەندێ شوێن جاشەکان پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر گرتنی گوندێك یا لووتکە شاخێك . جاشەکان سەرەڕای ئەوەی بەپێش دوژمن دەکەوتن لەشەڕ شارەزاییان هەبوو ، شوێنەکانیان دەزانی ، دەنگ و باسی باشتریان لەسەر پێشمەرگەو خەڵك کۆکردەوە بەهۆی دۆست و ناسیاویان لەناو لادێیەکان . هەندێك لەو جاشانە بەپەرۆشتر بوون لە دوژمنی گەورە بۆ کوشتنی پێشمەرگە و گوند سووتان . داخەکەم ئەو هەموو خراپەکاریە لەبیر کراو چاك و خراپ بەیەك چاو سەیر دەکرێ . دەبێ ئەو راستیەش بڵێم هەندێك لە فەوجەکان نەیاندەویست کاری خراپ بکەن هەوڵیان دەدا لەکاتی پێویست یارمەتی خەڵك بدەن بەڵام دیاردەی جاشەتی بەکارێکی دزێوو خراپ گەڕایەوە بۆ کوردو شۆڕشەکەی .

شەڕی گۆیتەپە رێگای خۆشتر کرد بۆشەڕی گەورەترو خوێناوی تر بووە دەسپێکی هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە سەرانسەری کوردستان .

## شەڕی

## دابان - هەلاج - قەرەتیکە

سووتان و تەخت کردن و تالان کردنی مەڕومالات سەروەتی خەڵکی گوندی گۆڕتەپە نیازەکانی رژێمی بەغدای بۆ خەڵکی کوردستان و شۆڕش و ی . ن . ك بەدیار خست ، بۆیە بۆ تۆڵە کردنەوەی ئەو هەموو زوڵم و زۆرداریە ، بۆ سەندنەوەی خوێنی شەهیدانی گەل و شۆڕش بەتایبەتی شەهیدان ( سەید کەریم و مامەریشە ) سەرکردایەتی ی . ن . ك بڕیاری دا زنجیرە شاخی ( دابان- هەلاج -- قەرەتیکە ) ئازاد بکات و لەدوژمنی بەعس پاکی بکاتەوە وە زەبری کوشندەش لە هێزەکانی بدات . ئەو زنجیرە شاخە لەساڵی ١٩٧٥ پاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول رژێم مۆڵگای لێ دامەزراندبوو ، کۆنترۆڵی دۆڵی جافەتی و سورداش و مێرگە پانی دەکرد . لە هەندێ شوێن دوژمن بۆ پاراستنی رێگاو بان و لووتکە بەرزەکان جاشی لێ دائەگینا ، کەچی لەبەر گرنگی ئەو زنجیرە شاخە ( جەیشی شەعبی ) لێ دانا بوو .

هۆیەکی تری گرنگی گرتنی ئەو زنجیرە شاخە دامەزراندنی بنکەی سەرکردایەتی و ئیزگەی گەلی کوردستان بوو لە دۆڵی جافەتی.

گرتنی زنجیرە شاخی دابان ، هەلاج ، قەرەتیکە بەگوێرەی پیلانی رێك و پێك ئەنجام درا مەکتەبی عەسکەری ی . ن . ك ئەرکی ئەو شەڕەی گرتە ئەستۆی خۆی . پێشمەرگەکانی مەڵبەندی یەك کە بریتی بوون لە تیپەکانی ( ٥١ ی گەرمیان ، ٥٣ ی شێروانە ، ٥٥ ی قەرەداغ ، ٥٧ ی سەرگرمە ، ١٥ ی هەورامان و ١١ ی شارەزوور ) بە فەرماندەی هەڤاڵ جەبار فەرمان لێ پرسراوی مەڵبەند بەشێك لە پاککردنەوەی ئەو زنجیرە شاخەیان پێ سپێردرا .

مەڵبەندی دوو بریتی بوو لە ( ت ٢١ کەرکوك ، ت ٢٥ خاڵخالان ، ت ٣٧ شارباژێر ، ت ٣٣ سلێمانی ، ت ٤٧ پیرەمەگرون ) بەشێکی تری ئەو شاخەیان پێسپێردرا ، هەموو هێزەکان لەلایەن هەڤاڵ ملازم عومەر عەبدولا لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری سەرپەرشتی دەکرا ، ت ٩٣ ی کۆیە سەر بە مەڵبەندی چوار بە فەرماندەی هەڤاڵ رەهبەر سەید برایم گرتنی جادەی گشتی چوارقوڕنە- سلێمانی پێ سپێردرا بۆئەوەی لەکاتی دەست پێکردنی شەڕ هێزەکانی فرقەی ( ٢٤) کە بارەگاکەیان لە چوارقوڕنە بوو نەتوانێ بەئاسانی بەهانای شەڕ بێت ، ئەو نەخشەو پیلانەی سەرکردایەتی بە ووردی جێبەجێ کرا لە ١٩٨٥/٢/١٤ هێزەکان لە هەموو

لایەك پەلاماریان دەست پێکرد هەرزوو چەکدارەکانی رژێم شکان و ئەو شوێنانە ئازاد کران پاش ئەوەی دوژمن بە دەیان کەسی لێ کوژرا و زیاتر لە (٩٠) جەیشی شەعبی بەدیل گیان . بەیانی دوژمن لە سلێمانی و چوارقورنە بە هێزێکی گەورە بەهانای سەربازە شکاوەکانی هات لە رێگای سلێمانی دوکان لە گوندەکانی حاجی تان و وێراوە لەلایەن هێزی پێشمەرگەی کوردستان پێشی لێ گیراو وشەڕ بەگەرمی دەستی پێکرد ، هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئازایەتی و چاونەترسی خۆی لەوێ نیشان دا بەدەیان ( قوات خاصە) ی دوژمنی کوشت بەرامبەر فڕۆکەو دەبابە شەڕی مان و نەمانی کرد ، چەندین رۆڵەی قارەمان و نەبەز ، چەندین لاوی کوردی تێکۆشەر ، چەندین پێشمەرگەی بەوەفا بە خوێنی گەشیان داستانی نەبەزیان تۆمار کرد . پاش ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگە کشاوە دوژمن بۆ رۆژی دواتر هەموو ئەو گوندانەی تەخت کرد وخەڵکەکەی خستە سەر ساجی عەلی . لە جادەی چوارقورنە — دوکان فرقەی (٢٤) ئەو فرقەیەی کە ساڵانێکە دەستی بە خوێنی رەشو رووتی کورد سووربووە ، بەهێزێکی گەورە بە پشتیوانی دەبابەو زرێپۆش و تۆپ و فڕۆکە هێرشی کردە سەر پێشمەرگەکان لە گوندەکانی باداوان و باقلان لەوێ کوڕەکانی کۆیە ئەو کوڕانەی لەدروست کردنی شۆڕش دەوریان هەمیشە لە پێشەوەیە شەڕی کوردانەیان لەگەڵ کردن ، سوێندیان بە گۆڕی حاجی نەمر خوارد کەنابێ دوژمن تێ بپەڕێ تاکو هەموو ئامانجی شەڕی دابان ، هەلاج ، نەیەتە دی لەوێش سەربازانی دوژمن لاشەیان بەجێما. لەوێش خوێنی چەندین کوڕی کۆیە دڵی خەڵەکانی ئاودایەوە .

( شەڕی دابان هەلاج لە ئیزگەی گەلی کوردستان بە درێژی باسکراوە بۆیە پێویستی نەکرد بینووسمەوە بەدرێژی ) .

ئەگەر سەربەرزانەو سەربەستانە قسە بکەین ئا لە دابان و هەلاج و قەرەتیکە و باداوان و حاجی تا دەبێ بلێین ( تۆڵە بەسەبرە ئەمما بەزەبرە ) پاش ئەو شکستە دیسان حکومەت ( قەوانە شڕەی ) خستەوە گەڕ باسی مفاوەزاتی هێناوە گۆڕێ ( سەعدی مەهدی ساڵح ) ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی و لێپرسراوی رێکخستنەکانی سەروو ( عضو القیادە القطریە مسؤل تنظیم الشمال) هاتە سەرکردایەتی و داوای کرد سەرلەنوێی دەست بە مفاوەزات بکەنەوە وە داوای کرد دیلەکان ئازاد بکەن هەندێك لە دیلەکان ئازاد کران . سەرکردایەتی شۆڕش هەموو داواکانی میللەتی کوردی وەبیر سەعدی مەهدی ساڵح هێناوە کەچی دیسان رژێم خۆی لەگێلی دا هێزێکی گەورەی جاش و سەربازی لە دوکان و بن

گرد و کارێزەو قەلاچۆلان کۆکردەوە بەنیازی ئەوەی هێرش بکاتە سەر سەرکردایەتی ی . ن . ك که بەرێز مام جەلال لە (سیوان) وبارەگەکەی کاك نەوشیروان لە ( ئاوژێ) .

ئەو وتووێژەی رژێم لەگەڵ سەرکردایەتی تاکو ۱۹۸۵/۲/۲۳ خایاند دیسان لە وەعـدەکانی خۆیان پەشیمان بوونەوە . بەم جۆرە ناوچەیەکی گرنگ پاش ئەو شەڕە لە دوژمـن پـاك کرایـەوە . بۆئەوەی پاڵەپەستۆ لەسـەر سـەرکردایەتی کـەم بێتـەوە ، هێزەکـانی مەڵبەنـدی چوار لـە دۆڵـی سماقوڵی کۆبونەوە بە نیازی هێرش بردنـە سـەر ناحیـەی هـیوان کـە شـوێنێکی گرنگـی ناحیـەی خۆشناوەتیە . چەند رۆژێك هێرشەکە دواخرا لەسەر داوای سەرکردایەتی چونکە سەعدی مـەهـدی ساڵح مۆڵەتی سێ رۆژی وەرگرتبوو لە سەرکردایەتی بۆئەوەی وەلامی داواکان بداتەوە ، دیار بوو سەرانی رژێم لە بەغدا ئەو نەرمیەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان نەقۆزتـەوە بـەردەوام بـوون لە تۆپ باران کردنی شوێنەکانی هێزی پێشمەرگە لەناوچەی جافەتی و هێز کۆکردنەوە لە نزیك سەرکردایەتی. بۆیە لەرۆژی ۱۹۸۵/۲/۲۳ بەپێی پیلانێك هێزەکانی مەڵبەندی چوار کە بریتی بوون لە ت ۸۵ ی بەرانەتی و ت ۸٦ ی دەشتی هەولێر و ت ۸۷ ی قەرەچوغ وبەشـێك لـە ت۹۳ ی کۆیە وتیپی مەڵبەند هێرشیان کردە سەر مۆلگەکانی دوژمن لە هیوان ، دوژمن لە مێژ ساڵ بوو رەبایەکانی خۆی لەوێ قایم دەکرد . شەوێکی سارد و تـووش بـوو ، بـاران و بـەفر بەنۆبـەت دەهاتە خوارێ رووبار هەستا بوون ، تاریك و شەڕە بابوو لـەو دۆڵ و چیایە ، قـوڕو چڵپاوڕێگاو بانەکانی بزرکردبوو ، گورگیش برسی بوایە رێ ی برنەدەکرد ، بەو شەوە دیسان پێشمەرگە تولە رێیان گرت ، یەك بەدوای یەك ، باران لە جل و بەرگ نەدەگەڕاوە ئاو گەیشتبووە سـەر گۆشـت ، دابەش بوون هەر یەکەبۆ شوێنێ دیـاری کـراو ، هەریەکـە رێ پیشـاندەری خۆیـان لەگـەڵ بـوو ، شارەزا و نەشارەزا چاوەنواڕی ( ساعە السفر ) ی دەکرد بەڵام داخی گرانم تـەگبیرو تەقدیریـەکی نەگرتەوە ئەوەی چەندین رۆژ بوو هەوڵمان بۆ دەدا بەنەزانی ئەو کسانەی کە چووبوون بـۆ هـیوان پەیوەندیان لەگەڵ ئامر سریەکە کردبوو کارەکەی هەڵوەشاندەوە لەو هەمـوو مۆلگاو رەبایە تەنیا ت۸۵ ی بەرانەتی ( کەرتی سێ ) بەفەرماندەی هەڤاڵ مەلا سلیمان رەبیەکـەی خۆیـان گـرت و یەك بی کەی سی و یەك ئار بی جی و یـەك هـاوەن و (۵) کلاشـنکۆفیان دەسـت کـەوت ، کـە شەهید سەردار سەعید سۆفی یەکەم پێشمەرگە بوو گەیشتە ناو رەبیەکە ، لەبـەر ئـەوەی دوژمـن لە پیلانەکە ئاگاداربوو کارەکـەمان سـەرکەوتوو نـەبوو ،یـەك رەوشـتی زۆر خـراپ لـەناو هێـزی پێشمەرگەی کوردستاندا هەیە ئەویش: ئەگەر جارێك سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا وادەزانـێ چـی نەکردووە و بیر لەوەی ناکاتەوە کە هێشتا زۆر کاتی لەبەر دەستدایە یان زۆر شەڕی گەورەتری لـە

پێشدایە ، زۆر فەرماندەی ئازاو لێوەشاوەو دلێر و قارەمـان لـە مەیدانی شـەڕ خۆی سـەلماندوە ئەگەر جارێك سەرکەوتنی وەدەست نـەهێنا خۆی بـە شـەرمەزار دەزانـێ و هـەم هەڤاڵەکانیشـی سەرزەنشتی دەکەن ئەو یاسایەی شەڕکردن لەبیر دەچێتەوە کە سـەرکەوتن و ژێرکـەوتنی تێدایـە . بەبۆچونی خۆم هۆی سەرەکی سەرکەوتوو نـەبوونی ئـەو پـەلامارە دەگەڕێتـەوە بـۆ چـەند هۆیـەك لەوانە ئەو برادەرەی پەیوەندی بە جاش و سەربازەکان کردبوو هەڵەی کرد ولەجیاتی ئەوە فێڵیشی لێ کرا خالێکی تری سەرکەوتوو نەبوون دەگەڕێتەوە بۆ بەفر و بـاران و نەشـارەزایی ، کـەم شـەو هـەبوو ئەوەنـدە سـارد و دژوار و تـەڕ بێـت راسـتە لـە گرتنـی سـەری رەش بـەفرو بـاران حـەوت پێشمەرگەی لێ شەهید کردین بەڵام هەل و مەرجەکە لەبارتر بوو لەبەر زۆر هۆ کەلە کاتی خۆی باسمان کرد .

پاش گەڕانەوەمان لە هیران هاتینـەوە گوندی دڵگیری نازەنین هـەڤاڵان کـاك کۆسـرەت و کـاك شـێخ جەعفـەر زۆر عـاجز بـوون بـۆ رۆژی دواتـر گەراینـەوە گونـدی سماقوڵی سەروچاوە لـەوێ دەستمان کردەوە بە تەگبیر کردن بۆ ئەوەی مەڵبەندەکەی ئێمە دوانەکەوێ لە چالاکی ئەنجامدان . کۆبونەوەیەکمان سازدا بڕیاردرا کە زنجیرە رەبیـەکانی جـادەی هـەولێر کۆیـە بگـرین وەلەهـەمان کات هێزێك رێکخرا بۆئەوەی بچێتە ناوچەی کەندیناوە دەستێك لە رژێم بوەشێنێ ، فەرمانـدەی ئەو هێزە بەمن سپێردرا کەلە بیرمە کاك کۆسرەت لەمنی پرسی ( بە بۆچونی تۆ ئەو کارانەمان پێ ئەنجام دەدرێ ؟) لە وەڵامدا وتم ( خوایە هیچ کەس تـەگبیری لێ نـەکرێ ) چـوومە خـوارەوە لەگەڵ برادەران دوو کەرت بووین ( کەرتێکی ت ٨٧ ی قەرەچوغ بەفەرمانـدەی شـەهید محمـد شینە وە کەرتێکی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی بـەکرە قیـت ) لەگـەڵ مەفرەزەیـەکی تیپ لە شەوی ٢\٣/٣/١٩٨٥هێرشمان کردە سەر دوو رەبایـەی جەیشـی شـەعبی لـە گونـدی ( بـەرزەوار—ناحیـەی کەنـدیناوە ) بـە ماوەیـەکی کـورت هـەردوو رەبیەکـەمان گـرت و (١١) کلاشنکۆفمان دەستکەوت.

• لە شەوی ٣\٤/٤/١٩٨٥ هێزەکانی مەڵبەندی چـوار هێرشـیان کـردە سـەر زنجیرە رەبایـەك لەسەر جادەی گشتی هەولێر – کۆیە پاش شەڕێکی گەورە چوار رەبیەیان گرت وزیاتر لە (٣٠) پارچە چەکی هەمەجۆر وەدەسـت پێشـمەرگەکان کـەوت و چـەندین جەیشـی شـەعبی کـوژران و بریندار کران و هەندێك بەدیل گیران وە لەو شەڕە سێ پێشمەرگەی قارەمان ، سـێ هـەڵۆی تـری کوردستان ، سێ کوڕی بەجەرگی ی . ن . ك گیانیـان بـە خـاك و گـەل پێشـکەش کـرد ( کـاك سلیمان مەلا محمد نێرەگین ، کاك سەباح و کاك نجاە ) دوژمنـی سەرسـەخت و درِنـدە بۆقـەرەبوو

کردنەوەی شکستەکەی ، لەرۆژی ١٩٨٥/٣/٧ هێرشێکی دڕندانەی گەورەی کردە سەر سنووری ت٨٦ ی دەشتی هەولێر و ت٨٧ ی قەرەچوغ کە پێك هاتبوو لە هەزاران جاش و سەرباز دەیان تانك و زرێپۆش ، چەندین تۆپ و هاوەن ، دەیان کۆپتەر بەشداری تێداکرد . لەو شەڕە وەحشیەتی هێزەکانی رژێم بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا بوو ، لەوێ نیازی حکومەت بە دیارکەوت ، لەوێ بیرو باوەڕی بەعس پەردەی هەڵدایەوە لەسەر رووی خۆی شێتانە ، کوێرانە ، وەحشیانە بەربووە گیانی خەڵکی بێ چەك و بێ تاوان بە کۆپتەرەکان ژن و منداڵ و شوان و جووتیاری لەسەر ئیش و کاری خۆیان لە خوێن گەوزاند ن دەیان منال و ژن شەهید بوون دەیان خانووبەرەیان وێران کرد ، مزگەوت و تەکیەکانیان سووتاند ، مەلا و شێخیان کوشت ، چەندین ماکینەی ئوتومبیلی هەژارانیان لە کارخست .

هێزی پێشمەرگەی کوردستان پێشی لە جەردەکانی رژێم گرت شەڕی مەردانەی لەگەڵ کردن لە قەشقەو ئازیانە ئەو دوو شەڕە گرنگی خۆی هەیە لە مێژووی کورد و ی . ن . ك بۆیە بە پێویستم زانی هەندێك باسیان بکەم .

## شەڕی

## ئازیانەو قەشقە

هێشتا ڕۆژ گەزەنگی نەدابوو ، هێشتا مەڕومالات نەگەیشتبووە بانە بۆران ، تازە جووتیاری هەژار چێشتی خواردبوو نیازی وابوو کاری ڕۆژانە دەست پێبکات هێزەکانی ڕژێمی بەعسی کافر کە پێك هاتبوو لە چەندین فەوج و جاش و سەرباز زیاتر لە بیست دەبابە و (١٨) هەژدە کۆپتەر هێرشیان دەست پێکرد بەشێك لە هێزەکەی دوژمن رووی کردە گوندی ( ئازیانە ) لەسەر بەستی ( شاقازی ) لە ناحیەی قوشتەپە لەسەر جادەی گشتی بێستانە – ئالتون کۆپری، نزیکەی بیست خێزانی کوردەواری خۆمانی لێ دەژیا ، بە ئارەقەی نێو چاوانیان رزقی ماڵ و مناڵیان پەیدا دەکرد ئەو ڕۆژە واتە ڕۆژی ١٩٨٥/٣/٧ کەرتێك پێشمەرگەیان میوان دەبێ بێ خەبەر لەوەی دوژمن دێتە سەریان لەگەڵ زیڕەو هاواری ئافرەت و منداڵ لەگەڵ دەنگی کۆپتەرەکانی دوژمن پێشمەرگە وەئاگا هاتن ، ئابلوقە دران ، تۆپ باران دەستی پێکرد کۆپتەرەکان کوێرانەو بێ بەزەییانە بۆردومانی گوندەکەیان کرد یەك ڕێگا بۆ پێشمەرگەکان مایەوە ئەویش شەڕ کردن بوو ، لەوێ دوژمن و پێشمەرگە لێك ڕاست هاتن پێشمەرگەکانی کەرتی دووی ت ٨٦ ی هەولێر بە فەرماندەی هەڤاڵان عبدالباقی بارزانی و کاك جەلال ئیلینجاغی دامەزران دەبابەکانی دوژمن سێ ڕێیان لە خانووەکان گرت چەند هێرشیان کرد ، پێشمەرگەکان پاشەکشەیان بە هێزەکەی دوژمن کرد شەڕی ئازیانە گرنگی تایبەتی هەیە لە مێژووی شەڕەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان چونکە ژمارەی پێشمەرگەکان لەگەڵ ژمارەی هێزەکانی دوژمن بەراوورد نەدەکرا ژمارەی پێشمەرگە (٢٢) پ . م بوو ، کەچی ژمارەی هێزەکانی دوژمنلە (٣٠٠٠) سێ هەزار جاش و سەرباز زیاتر بوو جگە لە دەیان زرێپۆش و دەبابە و تۆپ و فڕۆکە ، ئازیانە لە بیست ماڵ پێك هاتبوو ، خانووەکان بە کەرپوچ و قوڕ دوست کرابوون ، تۆپ و دەبابەو کۆپتەرەکان دەیانتوانی خانووەکان بڕوخێنن . شوێنی گوندەکە دەشتاییە و نزیك دوژمنە ، لە گوندی ئازیانە بە دیار کەوت پێشمەرگە چەند گیان بازە ، چەند پاڵەوانە ، چەند ئازایە ، چەند بە وەفایە ، چەند چاو نەترسە ، چەند وورە بەرزە ، چەند بێ باکە لە مردن ، چەند پێشوازی لە شەهید بوون دەکات ، بەڵێ لە ڕۆژی ١٩٨٥/٣/٧ دەشتی هەولێر ئەو دەشتە پان و بەرینە ، ئەو دەشتە خۆش و دڵگیرە ، ئەو دەشتە بەخێرو بەرەکەتە ، ئەو

دەشتە دوژمن شکێنە ئاگری گرت لەوێ دوژمن و جاش لەلایەك وهێزی پێشمەرگەی کوردستان لە لایەکی تر بەرەنگاری یەکتر بوونەوە دەرکەوت پێشمەرگەی کوردستان چۆن بەرگری لە شەرەف و خاك ، لە مرۆڤایەتی و عەدالەت ، لە رەوشت و نەریتی خۆی ، لەناوی پیرۆزی دەکات تەنیا بیست و دوو پێشمەرگە لەو گوندە بچوکە لەو دەشتە لەو سەر جادە گشتی یە بەرامبەر ئەو هێزە گەورەی دوژمن راوەستا تا تاریکی بەسەر دەستان داهات شەڕ بەگەرمی بەردەوام بوو ، هەموو خانوەکان بەهۆی تۆپ باران و دەبابە کۆپتەرەکان وهێرشەکانی پیادە بەسەر یەکدا کەوتن ، لە کەلاوەکان ، لەپەنا دیواری گوندەکە بواری دوژمنیان نەدا بێتە پێشەوە ، بریندارەکانیش شەڕیان دەکرد لەو شەڕە نابەرامبەرە ، لەو شەڕە دلێرانەیە ، لەو شەڕە کەم وێنەیە ، لەو شەڕە دوژمن بەزێنە دوو رۆڵەی گەلەکەمان ، دوو کەلەمێردی کورد شەهید بوون ( کاك عبدالباقی بارزانی فەرماندەی کەرتی دوو کەلە هاوینی ١٩٨٣ بە ئاستەنگ لەدەستی کۆنەپەرستان رزگاری بەو هاتە ریزی پێشمەرگەی کوردستان تا تۆڵەی برا بارزانیە بێ سەروشوێنەکان بکاتەوە گیانی بەخاك و گەل و مرۆڤایەتی پێشکەش کرد . لەو شەڕ و پێکدادانە (٥) هاوولاتی لە پیاو و ژن و منالی گوندەکە شەهید بوون دوژمنیش بە دەیات لاشەی لە دەوروبەری گوندەکە کەوت . کە شەو داهات پێشمەرگەکان گوندەکەیان چۆل کرد تەرمی شەهیدەکانیان گواستەوە دەرەوەی گوندەکە بۆ بەیانی دوژمن گوندەکەی خاپوور کرد وتاوانێکی گەورەی دەرهەق بە خەڵکی هەژاری ئەو گوندە ئەنجام دا هەرچی بیست و سێ تێپەڕی بوو کۆیان کردبۆوە بەتالآنیان برد وخەڵکیان ئاوارەو دەربەدەر کرد . هەمان رۆژ بەشێك لە هێزەکانی دوژمن رووی کردە قەشقە لەوێش لەلایەن پێشمەرگەکانی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر و مەفرەزەیەکی مەلبەند پێشیان لێ گیرا . لەوێش شەڕ تاکو ئێوارە بە گەرمی بەردەوام بوو شوێنی گوندی قەشقە بۆ شەڕکردن گەلێك باشتر بوو بۆ ئێوارە هێزێکی پێشمەرگە بەهانای شەڕەکە چوو بەداخەوە لەو شەڕە (٥) پێنج پێشمەرگەی قارەمان شەهید بوون هاوزەمان لەگەڵ ئەو هێرشانە دوژمن بە کۆپتەرەکانی هەرچی شوان ، گاوان ، بەرخەوان ، جووتیار ، دارکەر ، منالْ ، ژن .....هتد بەرچاوی بکەوتایە تەقەی لێ دەکرد ، بۆ ئێوارە سەرژمێری شەهیدەکان گەیشتە (٤٣) شەهید(٧) پێشمەرگە و (٣٤) کوردی بێ تاوان سەرەڕای سووتانی گوندەکانی ( ئازیانە ، قەشقە ، جل بەسەر) لەکاتی تێکدانی گوندی جل بەسەر ئەفسەرێك بەبن خانوو کەوتبوو هێزەکەی دوژمن لە دووری گوندەکە کە هەستیان کردبوو کە یەکێك لە ئەفسەرەکانی بەجێ ماوە لە هەمان کات خەڵکی جل بەسەرچووبوونە سەری بە برینداری رزگاریان کردبوو لەکاتێدا چەندین هاوولاتی گوندی جل

بەسەر لە هەمان رۆژ شەهید کرابوون لێرەدا پیاوەتی و شەرەفی خەڵکی کوردستان بەدیار دەکەوێ بەرامبەر بەو کەسانەش کە زوڵمی لێ دەکەن وە دوژمن هەڕەشەی لە خەڵك کرد ، بۆیە خەڵکی بێ دیفاع و هەژار بە ناچاری گوندەکانی چۆل کرد و بەرەو شارەکان رۆیشت .

من لە ژیانم بەهاری وا سەرمام نەدیبوو ، لە رۆژانی ١٤ و ١٩٨٥/٣/١٦ دەتگووت تازە چلەی زستانە ، شەختە ئەرزی دەلەرزاند ، دەبوایە جل و بەرگی زستان بپۆشی ، خەڵکی گوندەکان لە ترسی کۆپتەرو هێزەکانی پیادەی دوژمن دەبوایە بەشەو ماڵ و حاڵیان رزگار بکەن لەوەش دەترسان نەوەکو دوژمن لە نزیك شارەکان تالانیان بکات ، خۆم منالی بچوکم زۆر خۆش دەوێ بە فریشتەیان دەزانم ، روح سوکن ، بێ تاوانن ، هەرچەند سەیری منالەکانم دەکرد کەلە باوەشی دایکیان بەو نیوە شەوە بەو سەرما و شەختەیە ئاگرم تێ بەر دەبوو ....چۆن لەسەدەی بیستەم کۆرپەکانی کوردستان ، پەپولەکانی کوێستان ، خوێن شیرینە جوانەکانی نیشتمانەکەم بەو دەردە سەریە فرچك دەدرێن . ئەوەی زۆر لە ژیانم کارم تێدەکات گریانی ئافرەتەچونکە واتای بێ دەسەلاتی دەگەیەنێ لەو هەلالا و بگرەی دەشتی هەولێر منالی خۆشەویستم دیت لەسەرمان دەلەرزی لە برسان دەگریا ...!!ئافرەتی شۆخ و شەنگم دیت بە گوڕ فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتە خوارێ و منالە کۆرپەکەی بە توندی لە ئامێزی گرتبوو رێگای دەرنەدەکرد نەیدەزانی سەر بۆ کوێ هەلگرێ ..!! یان خۆشەویستێکی گەورەی لەدەست دابوو ......!!کە سەیری گوند و دەشتەکانم دەکرد چۆل و چۆل تر دەبوو ، تفم لە ویژدانی هەموو کاربەدەستێك دەکرد دەمگووت ( خودایە خۆ کورد بۆ ئەوە دروست نەکراوە کەرامەت و شەرەفی پێشێل بکرێت ) هەر لە پێشە خۆم دەمگووت نابێ ئەو زوڵمە بکرێ هەرگیز نابێ تا سەر وابێ کوردیش هەر رۆژێکی دێتەوە.

مێژوو سەلماندوویەتی زاڵم وزۆرداران هەتا سەر ناتوانن وا بکەن هەر بە چارەنووسی رەشیان دەگەن ..!!؟ بەلێ پەنجا گوند ، هەزاران خانەدان وولات و باپیریان ، سەروەت و سامانیان بەجێ هێشت و چوونە شارەکان بۆ پارووە نانێك دەستیان لەبەر نامەردان پان کردەوە ... بەلام بە هیوا .

لە ١٩٨٥/٣/١٢ هێزەکانی ئێران هێرشیان کردە سەر ( هور الحویزە ) سەرەتا هەندێ سەرکەوتنیان وەدەست هێنا هەرا و هۆریاو گووتیان ( سەدام رفت ) گەیشتە ( قورنە ) هێزەکانی عێراق لێیان وەخۆ کەوتن قرچ و بریان کردن لە ١٩٨٥/٣/١٨ پاش شەش رۆژ ( بلیلها ) ئێران دیسان شکا عێراق ( یاحوم اتبع لو جرینا ) ی جاڕدا و ئەو شەڕەی بە ( تاج المعارك ) ناو برد بەو شەڕە ( هشام صباح فخری ) کە ئەفسەرێکی پایە بەرزی عێراقە دەوری

کاریگەری گێڕا لە شکاندنی ئەو هێرشەی عێراق ئەو ڕۆژە نیوەڕۆ لە گوندی ( تل الحیم ) ی گەورە بووین لە کەندیناوە لە ماڵی شەهید جەلیل ناسراو بە ( ڕەنجدەر ) . دیسان برادەران قسەی عێراقیان بڕوا نەکرد ووتم کاکی خۆم ئێران بێ دەنگە دەڵێ ی دزە گیاوە وورتەی لێوە نایەت ئەوە بەڵگەی شکانیەتی . داخی گرانم زۆر لە برادەرانی خۆمان نایانەوێ لە ڕاستیەکان هەموو شتێك بەئارەزووی دڵی خۆیان لێك دەدەنەوە چیان پێ خۆش بێت و وا دۆخەکە لێك دەدەنەوە کە سامناکترین دیاردەیە لەناو کورد .

ئەگەر هەتا ئەو ڕۆژەش واتە ١٨/٣/١٩٨٥ گومانی مفاوەزات مابێ ئەوا بە تێك شکانی هێرشەکانی ئێران ، عێراق خۆی قیت کردەوە دەیگووت ( شا بە سەپانی خۆم نازانم ) کەسانی وورده بورجوازی و بورجوازی و هەم حزبە بورجوازیەکان لە کاتی تەنگانە کلکیان لەناو گەرانی خۆیان دەنێن لە کاتی سەرکەوتنیش کلکیان دەخەنە سەر پشت و مەغرور دەبن دارو دەستەکانی ڕژێمی بەعس لەو یاسایە بەدەر نین بەڵکو زیاتریشن . دەیانگووت ڕۆژی نەورۆز کۆپتەرەکان لەکەس نادەن با کورد بەکەیف و ماشای خۆی جەژنی نەورۆز بکات ... بەعسیەکان هەموو مافی کوردیان دەخستە ژێر لچ ، ژن و منداڵیان دەکوشت ، گوندەکانیان دەسووتاند ، سەدان بگرە هەزاران ڕۆڵەی کوردیان لە زیندان پەستبوو ، بە سەدانی تر چاوەڕوانی ڕۆژی لە سێدارەدانیان دەکرد خەمی ئەوەیان بوو دەبێ کورد جەژنی نەورۆز بەخۆشی بکات بەڕاستی سەیرە لە بەغدا . لە ٢١/٣/١٩٨٥ ڕۆژی نەورۆز لە گوندەکانی ( هەوار غەرو گرون ) لە قەراج بووین خەڵکێکی زۆر بۆ بناری قەرەچوغ هات بۆ ( دۆمبەلان) کردن ئێمەش چەند پێشمەرگەیەك چووینە بناری قەرەچووغ لە پڕ هەندەمان زانی سێ کۆپتەر هاتنە ناوچەکە بە توندی دەهاتن و دەچوون هاتنە سەرمان ئێمە لەپێ دەشتەکە بووین هەندێك لە برادەران چەکەکانیان شاردەوە نەوەکو کۆپتەرەکان نیشانیان بکات هەندێکمان چەکەکانمان دائەگینا چونکە چەك دانان بە واتای کوشتنی گیانی شۆڕشگێڕیە . بەهەرحاڵ کۆپتەرەکان ناوچەکەیان بە سەلامەتی بەجێ هێشت و گەڕاینەوە گوندەکە . بەهاری ١٩٨٥ شەڕی پێشمەرگانە لە سەرانسەری کوردستان دژی هێزەکانی بەعسی دەستی پێکرد و زەبری کوشندە لە دوژمن وەشێندرا . ڕۆژ بە ڕۆژ دیاردەی جاشەتی لە کوردستان زیاتر دەبوو ژمارەی فەوجەکان لە (٣٠) سی فەوج تێ ی پەڕاندبوو . لەسەرەتا دەبوایە هەر سەرۆك جاشێك هەزار چەکدار کۆبکاتەوە ئەوجا فەوجی بۆ دەردەچوو . لە هەمووان سەیرتر ئەو سەرۆك جاشە بەدەیان هەزار دیناریان بەرتیل دەدا تاکو دەکرا بە مستەشاری فەوج لە هەمان کاتیش ڕژێم دەیان بگرە سەدان (

مفرەزە خاصە ) ی جاشی دروست کردبوو هەندێکیان سەر بە ( مدیریە امن ) بوون ، هەندێك سەر بە ( استخبارات ) ی عەسکەری وە بەشێکیش لەوانە سەر بە ( منظومە استخبارات الشمالیە ) بوون کە دەورێکی پیس و بۆگەنیان هەبوو لە کوردستان هەمیشە ئەو فەوج و مەفرەزە خاسانە لە پێشەوە بوون کە زیاتر راوی پێشمەرگەیان دەکرد ، ئازاری خەڵکیان دەدا لەلایەن کاربەدەستانی رژێم خەلات دەکران زیاتر هار دەبوون ، دەیان کەس لەسەر خوێنی کوڕی هەژارانی کورد بووە خاوەن پارە و قسر و قسور لە هەموو زەمانێك هەژارەکان دەبنە سووتەمەنی بەڵام هەقە تەنیا ئەوەندە بڵێین ( تاکەی زەمان هەر وابێ ) .

چالاکیەکانی پێشمەرگە و هێرشەکانی دوژمن

لە نیسانی ١٩٨٥ هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سەرانسەری وولاتی داگیرکراو کەوتە جموجوڵی سیاسی و پێشمەرگانە ، چونکە هەموو شەڕێکی پێشمەرگە دەبێتە هۆی کارێکی سیاسی گەورە ، هەندێ چالاکی هەیە مۆرکی سیاسی زیاتر پێوە دیارە.

پێشمەرگە سێ جۆرە شەڕ لەگەڵ دوژمن دەکات :

١- شەڕی بەرگری کردن لە بارەگاو شوێنە گرنگەکان و بەرگری لەخۆ کردن .

٢- هێرش بردنە سەر موڵگای گەورەی دوژمن بەهێزی تیپێك یا زیاتر .

٣- چالاکی پێشمەرگانەی ناو شار و شەقامە سەرەکیەکان بۆئەوەی دوژمن سەری لێ بشێوێ و ورە و زاتی خەڵکی ناو شار و شارۆچکەکان بەرز بکاتەوە جگە لە چالاکی سیاسیانە وەکو کۆڕ و کۆبونەوە و سوڕانەوە لە شوێنە گرنگەکان. هەندێ چالاکی پێشمەرگە هەرچەندە بچوکە بەڵام سەدای لەناو جەماوەری گەلەکەمان زۆر گەورەیە، وە هەم لەناو سوپاو دام و دەزگای دوژمن هەر بۆیە پێشمەرگەی کوردستان لە سەرەتاوە گرنگی تایبەتی داوە بەو جۆرە چالاکیانە وە دەوری کاریگەری خۆشی گێراوە لەو بوارەدا . گرتنی دوو ئەفسەری پایە بەرزی عێراقی لەلایەن پێشمەرگەکانی ت ٢١ ی کەرکوك وە بەدیل گرتنی چوار پۆلیس لەناو جەرگەی شاری هەولێر وە دانانەوەی سەیتەرە لەسەر شەقامە گشتیەکان بەدیل گرتن و کوشتنی چەندین جاش و سیخوڕ لە قوڵایی خاکی کوردستانی داگیرکراو دوژمنی هێنایە لەرزین بەدەیان پیلانی دانا بۆ رێگا گرتن لەو جۆرە چالاکیانە بەڵام هیچی سەری نەگرت بۆیە دیسان کەوتە هێرش کردن بۆ سەر ئەو ناوچانەی کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لێ ی دەسەلات دار بوو .

لە ساڵی ١٩٨٥ دوژمــن سیاســەتی ( رد الفعـل ) ی بـەکارهێنا بەرامبـەر هـەر چالاکیەکی پێشمەرگە بێ بەزەییانە لە دانیشتوانی ناوچـەکەی دەدا ، گونـدەکانی دەسـووتاند ، بـۆ قـەرەبوو کردنەوەی ئەو چالاکیانە دوژمن دوو هێرشی کردە سەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان :-

١- لە ناوەراستی نیسانی ١٩٨٥ حەوت کۆپتەر هاتنە سەر ناوچەی دیدەوان لـە گونـدی میرکـە ئینزالیان کرد توانیان هەموو بە دیل گیاوەکان ببەنەوە . ئەوە لە کاتێکدا کە گوندەکە زیاتر لە (٣٠) پ . م ی لێ بوو پێشمەرگەکان تەقەیان نەکرد دیلەکان لە قوتابخانەی گوندەکـە بـوون کـە نزیکـەی ٣٠ – ٥٠ م لـە گوندەکـە دوور بـوون . بـۆ رۆژی دواتـر (٢٣) بیسـت و سـێ کۆپتـەر لەناوچـەکە سـووڕانەوە وە زەرەرو زیـانی گـەورەیان لـە خـەڵکی ناوچـەکەدا بـەهۆی بۆردومـانی کۆپتەرەکان چەندین پێشـمەرگە برینـدار بـوون هەرچـەند هێـزی پێشـمەرگە لـە چـەند گونـدێك دامەزرابوو بەڵام کۆپتەرەکان لەو گوندانە سەربازیان دانەبەزاند . سوڕانەوەی کۆپتـەر بـەو ژمـارە زۆرە ترس و لەرزی خستە ناو جەماوەرو هەندێ لە لادێ نشینەکان کە تازە گەڕابوونـەوە شـوێنی خۆیان جارێکی تر ماڵیان بارکرد و دووبارە کۆچیان کرد . بەم جۆرە جووتیـارانی کـورد رۆژانـە لەگەڵ شۆڕشی کوردستان بەشداریان هـەبووە جگـە لـەوەش سـێ ژەمـە پێشـمەرگەکان لـەماڵی ئەوان نانیان دەخوارد و خزمەت دەکران .

٢- لـە رۆژی ٢١/٤/١٩٨٥ هێزێکـی گـەورەی دوژمــن بـەنیازی بەسـەر کردنـەوەی ناوچـەی کەندیناوە و قەراج چوونە گوندی ( کەپەنەك رەش) لـە بنـاری قەرەچوغ لەلایـەن دەسـتەیەك لـە پێشمەرگەکانی ت ٨٥ ی بەرانەتی بە فەرماندەی هەڤاڵی تێکۆشەر کاك مەجیدە سوور جێگـری فەرماندەی تیـپ و کـەرتی ٨٧ ی قەرەچـوغ بەرپـەرچ درانـەوە شـەڕێکی نابەرامبـەر لـەو گونـدە دەستی پێکرد پاش شەڕێکی قورس و گران بووە هۆی شەهید بـوونی (٨) هەشـت پێشـمەرگەی ئازا و چاونەترس لەوانە شەهیدانی هەمیشە زیندوو کاك مەجیدە سوور و کاك ئەحـمەدە سـوور و کاك د. هەمزە و باقی شەهیدان. بەم جۆرە دوژمن توانی زەبرێکـی کاریگـەر لـە پێشـمەرگەکان بوەشێنێ چەندین کادیری هەڵکـەوتووی ی . ن . ك شـەهید بکـات ، راسـتە دوژمــن جـار و بـار دەتوانێ زەبر لە پێشمەرگە بدات ، کادیرو پێشمەرگەکان شەهید بکات بـەڵام هەمیشـە خـوێنی گەشی شەهیدان زیاتر شۆڕش و خەبات دەخاتە جۆش و خـرۆش ئەگـەر شـەهید بـوونی هـەڤاڵان هەندێ جار وا لەهەندێ کەس دەکات کە واز لە پێشمەرگایەتی بهێنێ و چەکی پێشمەرگایەی لە شان بکاتەوە بەڵام لەلای تێکۆشەرە راستەقینەکان کارێکی ئاساییە لەوە بەدەر نی یە کـە چەند

هـﻪڤاڵ و دۆسـت و تێکۆشـەرێك شـەهید دەبـن و جێگـای ئەوەیـە پێشـمەرگەکان فرمێسـکی دڵسۆزیان بۆ برێژن و ڕق و تورەییان بەرامبەر دوژمنی گەوج و نەزان زیاتر دەبێ .

شۆڕش کردن بەبێ خـوێن ڕژان کـارێکی مـەحاڵـە و نـاکرێ . خـوێنی گەشـی مـەجیـدە سـوور هەڤاڵانی بووە مەشخەڵێك ڕێگای خەبات و تێکۆشـانی زیـاتر رونـاك کردەوەهـەزاران سـڵاو لـە گیانی پیرۆزیان .

هەر لەنیسانی هەمان ساڵ هێزێکی تری ٨٧ ی قەرەچوغ بـە گـوێرەی پیلانێکـی زۆر رێـك و پێك هێرشیان کردە سەر سەیتەرەی هەولێر – کەرکوك و توانیان چەندین ئـەمنی ناکـەس بەچـە بکوژن کە ڕۆژانە گێچەڵیان بەخەڵکی بەشەرەفی کوردستان دەکرد لەو چالاکیە پڕ واتایـە چـوار کلاشینکۆف دەسکەوتی پێشمەرگەکان بوو . لەوێ کـاك مـەلا عـەزیز بـەردە سـپی بـە سـووکی بریندار بووکە ئەو هەواڵەم پێ گەیشت لە سیوان بووم لەلای بەرێز مـام جـەلال ڕاوەسـتابووین . تائـەو کاتـەش ئومێـدی مفـاوەزات لەگـەڵ حکومـەت هـەر مـابوو ، دیـار بـوو هەنـدێك وایـان بڵاوکردەوە گوایە ئەگەر مفاوەزاتیش نەبێ ( هدنـە) بکرێـت لەگـەڵ حکومـەت کـارێکی باشـە، ( هدنە) بەو واتایە دێت تەنیا شەڕ ڕابگریت هەرکەسـە لـە شـوێنی خـۆی بێـت تـاکو زەمینـەی مفاوەزات لە بارتر دەبێت . واش بڵاودەکرایەوە کە گوایە هەڤاڵ ( د . فؤاد معصـوم ) ئەنـدامی مەکتەبی سیاسی ی . ن . ك بە سەرۆکایەتی وەفدێك سەردانی ئێرانی کـردوە . وا مـەعلوم بـوو کە ئەو مەسەلەیە بنچینەی نەبووە تەنیا ئەو قسە بۆ ئەوەی دەکرا بە عێراق نیشان بـدرێ ئەگـەر ئەوان ئامادەی ئەوە نەبن مافەکانی گەلی کورد بسەلێنن ئەوە ڕێگای ئێـران ئاواڵەیـە . پێموایـە حکومەتی عێراق ئەو (تاکتیکەی) (ی. ن . ك) ی بە گرنگ وەرنەگرت و بـەردەوام بـوو لەسـەر سیاسەتی چەوتی خۆی و دەستی کرد بە پیلان دانان بۆ بێ هێز کردنی شۆڕشی کوردستان .

## هەوڵ و تەقەلای سەرکردایەتی

## بۆ بنبڕکردنی ناکۆکیەکان

لە ١/٤/١٩٨٥ لەسەر داوای بەڕێز مام جەلال سکرتێری گشتی ی . ن . ك چووینە سەرکردایەتی‌لە ( سیوان ) بۆ لێکۆڵینەوە لە کوشتنی ئەو چوار ئەفسەرەی لە بناری قەرەچوغ کوژرابوون . بە پیادە لە بەستی شەرغە بەڕێ کەوتین ، دەشتی کۆیە و چەمی ڕێزان و چیای پیرە مەگرون و دابان و هەلاج و دۆڵی جافەتی و مەرگەمان بڕی وگەیشتینە سەرکردایەتی لەو سەفەرە دوورو درێژە هەڤاڵی شەهید محمد شینە و چەند پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو .

کۆبونەوەی سەرکردایەتی ی . ن. ك بەردەوام بوو بۆ دانانی پیلانی تازە بۆ شۆڕشەکەمان لەلای کاك نەوشیروان دانیشتبووین ، ڕۆژێکی خۆش بوو لە پڕ کاك مەلا بەختیار بەدیار کەوت کە چاوم پێ کەوت گەشامەوە ، هاوڕێ یەکی کۆنی پێشمەرگایەتیم بوو ، لە ڕۆژانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕش گەلێك ئەزیەت و ئازارمان پێکەوە کێشاوە ، لێ پرسراوم بوو ، زۆر کۆبونەوەی پێکردوین ، لەکاتی تەنگانە یارمەتی داوین ، ڕۆڵی گرنگی گێرا بۆ ئەوەی کۆمەڵە و ی . ن . ك گەشە بکات ، لەمێژ بوو نەم دیبوو ئەو دلگیرو نارازی لە کۆرە گوندێکی قەرەداغ دانیشتبوو، منیش لە دەشتی هەولێر ، چەندین ڕۆژە ڕێ لێك دوور بوین ناهەقم نەبوو بە دیدەنی خۆشحاڵبم ، شادیەکەم زیاتر بوو کە دیتم لەگەڵ کاك نەوشیروان دەستیان لە ئەستۆی یەکتری کرد . لە دڵی خۆم ووتم خوایە هەڤاڵانمان هەروا تەبا و برا بن چونکە دوژمن و ناحەزان دەیانەوێ ناکۆك بین و کارەکەمان لێ خراپ بکەن و زەرەر لە میللەت و شۆڕش و کۆمەڵە بدەن ، کاك ڕۆستەم و کاك حەمید حاجی غالی و کاك وەهاب لەگەڵ مەلا بەختیار هاتن کاك کۆسرەتیش لەگەڵ ئێمە بوو، پرسیارم کرد ووتیان کاك نەوشیروان ئەو برادەرانەی ناردووە بۆ قەرەداغ بۆ ئەوەی کاك بەختیار بێتە ئێرە لەسەر مەسەلەکان قسە بکەن ، چەند ڕۆژێك کۆبونەوە بوو وە مام جەلالیش زۆر هەوڵی دا کەچی هەوڵ و تەقەلای برادەرانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و جەنابی مام جەلال هەمووی بە فیڕۆ ڕۆیشت کاك مەلا بەختیار دەوری لە شۆڕشی نوێی ی گەلەکەمان دیار و بەرچاوە بەو واتایە نی یە پیاو بە هیچ جۆرێك باسی کەم و کوڕیەکانی دۆستەکانی خۆی نەکات هەر بۆیە دەبێ ئەو ڕاستیە مێژوویە روون بکەینەوە کە :

هەڤاڵ مەلا بەختیار سوودی لەو هەموو کەسانە وەردەگرت کە لەلایەن شۆڕش سزا دەدران یان لۆمەو گازاندەیان دەهاتە سەر زۆر کەس بە نهێنی نامەی بۆ مەلا بەختیار نووسیبوو کە لەگەڵ سیاسەتی ئەو دان ، زۆر جار لە حیسابی وردی خۆی مەغرور دەبوو وای بۆ دەچوو زەمانی لینینی مەزنە هاوڕێیان راستگۆ دەبن و بەرژەوەندی خۆیان دەخەنە ژێر پێ ، کاك مەلا بەختیار دەبوایە بزانێ ئەورۆ دنیای بەرژەوەندی یە بیرو باوەڕ نەماوە ئەو برادەرانە بەرژەوەندی خۆیان بە هەزار مەلا بەختیار نادەن . یەك راستی تر هەیە دەبێ هەمیشە لە یادی نەکەین مێژووی خەباتی بەڕێز مام جەلال و کاك نەوشیروان و تاقی کردنەوەیان لە رۆژانی سەخت ئەوەندە ئەزمونیان لا کەڵەکە بووە بە ئاسانی جێگایان پێ لێژ ناکرێت .

رێکخستن لەناو رێکخستن کۆمەڵە و ( ی . ن . ك ) ی خستە مەترسی هەر وەکو لە پێشەوە باسم کردحکومەت دەزستەکانی خۆی هان دابو بۆ قەبە کردنی ئەو ناکۆکیانە هەر بۆیە دەبوایە کاك مەلا بەختیار ئەو راستیەی بزانیایە کە هەرگیز سەرکردایەتی ی . ن . ك رازی نابێ لەسەر لاشەی ئەو یان باشتر بڵێم لەسەر خەبات و تێکۆشان و خوێن ناوی ئەو خەڵکانی تر سەر هەڵبدەن . تاقی کردنەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان هێشتا لە گۆڕێ دابوو کە چییان بەسەر هارت . زۆرجار کاك مەلا بەختیاربۆ چەسپاندن و جێگیر بوونی قسەکانی خۆی هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵەی بە راڕاو تەپیو و هەلپەرست دەزانی ...!! دەباشە لە کوێندەر بوون ئەو ئەندامانەی کە سوێندیان بۆ کاك مەلا بەختیار خوارد بوو .. هەلپەرست و راڕایی لەناو ریزەکانی ئەو تاقمە بە ئاشکرا دەرکەوت کە هەموویان لە پێناوی بەرژەوەندی تەسکی خۆیان یەکیان گرتبوۆوە بەهەرحاڵ نامەوێ زۆ بچمە بنج و بناوانی ئەو مەسەلەیە ئەوەندە دەڵێم لە دەست دانی ئەو هەموو کادیرە ئەگەر دە کادیریش بن لە زروفێکی ئەو کاتی شۆڕش و کۆمەڵە و ی . ن . ك زۆر زەرەر بوو . زۆر چاوەڕێ ی رێکەوتنێکم دەکرد کەچی هیوایەکەم نەهاتەدی هەوڵ و تەقەلای سەرکردایەتی ی . ن . ك سەری نەگرت هەڤاڵ مەلا بەختیار چۆن هاتبوو ئەوها گەڕایەوە ناوچەی قەرەداغ داوای سەرکردایەتی ئەوە بوو کە بێتە سەرکردایەتی لەوێ بێت گوایە هەڤاڵ مەلا بەختیار وەعدی دابوو کەچی جێ بەجێ ی نەکرد

بەهەرحاڵ ئێمە چاوەڕێ ی تەواو بوونی کارەکانی کاك کۆسرەتمان دەرکرد لەگەڵی بگەڕێینەوە سنوری مەڵبەندەکەی خۆمان . لە ٢٠/٤/١٩٨٥ لە سەرکردایەتی بەڕێ کەوتین ئەو جارە لە ( دەرباچەی دوکان ) پەڕینەوە بە بناری چیای کۆسرەت پاش ئەوەی زیاتر لە (١٤) چواردە سەعات بە پیادە رۆیشتین گەیشتینە ناوچەی سماقوڵی پاش ئەوەی ماندوومان حەساوە وردە وردە

شۆڕمان کردەوە بۆ دەشتی هەولێر لە ٢٦/٤/١٩٨٥ هەڤاڵ کۆسرەت گەیشتە سنوری ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بۆ ئەوەی بچێتە پێشوازی کاک نەوشیروان بەڵام لەوێ مایەوە پیلانی دانا بۆ ئەنجامدانی چەند چالاکیەك لەمەو دوا یەکە یەکە لەبەر گرنگی باسیان دەکەم .

کۆبونەوەی کاک مەلا بەختیار لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمەڵەو ی . ن . ك لە نیسانی ١٩٨٥ بووە هۆی لێك ترازان و لەپاشان لێك جیابوونەوە کە شوێنەواری خراپی لەسەر باری کۆمەڵە بەجێهێشت و دەیان کادیرو پێشمەرگەش سەرگەردان و سەر لێشێواو مانەوە ، دەست کرا بە بڵاوکردنەوەی (ئاڵای شۆڕش) و هێرش کردنە سەر سەرکردایەتی کۆمەڵە و ی . ن . ك .

## شەڕی

## جادەی گوێر - هەولێر ( شەمامەر )

بە ئامادە بوونی کاک کۆسرەت کۆبونەوەیەکمان لە گوندی (بانی ماران) کرد بۆئەوەی پیلانی لێدانی حمایەی رێگای هەولێر – گوێر بە چاکی ئەنجام بدرێ هەڤالان ( مام غەفور ، رێباز ، شەهید رەنجە ، نوری قادر)ئامادە بوون پاش هەڵسەنگاندنی کارەکەمان بڕیاردرا هێزێکی هاوبەش لە ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر و ت ٨٧ ی قەرەچوغ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بچێتە ناوچەی شەمامك وا رێککەوتین لە کاتی ئەنجامدانی ئەو کارە بە جیهاز قسە لەگەڵ کاك کۆسرەت بکرێ تا هەمان شەو لە رەبیەکانی سەر جادەی هەولێر – کەرکوك بدرێ بە باقی هێزەکەی دەمینێتەوە . لە ئێوارەی ١٩٨٥/٥/٦ بەرێ کەوتین بۆ کاتژمێر (٢) ی پاش نیوەشەو گەیشتینە گوندی (تل الخیم ) پاش پشوودان بەیانی دەورو بەری کاتژمێر (١١) یازدە مام غەفورو من و رەنجەدربەقەمەرەیەکی تاکسی هاتینە سەر جادەی هەولێر – گوێر بۆئەوی دراسەی دۆخەکە بکەین و گەڕاینەوە (تل الخیم) هەر زوو بە لۆری گەورە هێزەکەمان هێنایە سەر جادەی هەولێر- گوێر بۆئەوەی دوژمن شك نەکات لە هەمان کات هێزەکەی دوژمنیش گەیشتە گوندی ( شەمامەر ) شەڕ یەکسەر دەستی پێکرد لە ئەنجامدا دوژمن شکا بێ ئەوەی هیچ زەرەر بدەین هێزەکەی دوژمن تەفرو تونا کرا هەندێکیان لێ کوژراو هەندێکیان بەدیل گیران کە هەموویان عەسکەری بوون . ( بیست کلاشینکۆف و سێ ئار بی جی ) مان دەست کەوت بوو لەگەڵ هەندێ ئوتومبیل بەپەلە گەڕاینەوە گوندی عەوێنە لەوێش بەرێ کەوتین گوندەکانی شێخ شەروان و سیاومان بڕی لە ( هێلەوە ) ماینەوە ، کاتژمێر (٥) پێنجی ئێوارە هێزێکی دوژمن هاتە ناوچەکە تا گوندی عەوێنە و شێخ شەروان لەوێ درەنگی بەسەر داهات چوار کۆپتەریش دەسووڕانەوە لەسەر گوندەکان دە دەقیقە پێش رۆژ ئاوا هاتنە سەر گوندی هێلەوە ، ئێمەیان کەشف کرد شەڕ لەگەڵ کۆپتەرەکان دەستی پێکرد لە خانوویەك بووین جیهازەکەشمان لابوو هەڵوێستی شەڕەکەمان بە کاك کۆسرەت گەیاند خانووەکەی ئێمەی بوردومان کرد لەناو کۆشکەکە بووین لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك کۆشکەکەی بەسەر روخاندین چەند ساچمەیەك بە من کەوت مام غەفور لە خانوویەکی تر بوو کە چاوی بە باری ئێمە کەوت هات بۆلامان لە گۆڕەپانی گوندەکە کۆپتەرەکان تەقەیان لە مام غەفور کرد و بە سووکی برینداربوو کە تاریك

داهات کۆپتەرەکان شوێنی شەڕەکەیان بە جێ هێشت پاش نوێژی شێوان لە گردە سوور لەگەڵ کاك کۆسرەت یەکترمان گرتەوە ، دیار بوو برادەرانیش هەریەکە دەچووە شوێنی خۆی لەسەر جادەی هەولێر - کەرکوك کە نیوە شەو داهات جادەی گشتی هەولێر- کەرکوك بووە مەیدانی شەڕێکی قورس لە نێوان هێزەکانی ت ٨٦ و ت٨٧ ی قەرەچوغ ( ئەوکات هەڤاڵ سەفین فەرماندەی ئەو تیپە بوو ) ئەو هێزە نەیتوانی هەموو ئامانجەکانی خۆی بپێکێ تەنیا دوو رەبیە دەستی بەسەردا گیرا دەسکەوتی پێشمەرگەکان چەندین پارچە چەك بوو جگە لە کوژرانی هەندێ جەیشی شەعبی . ئەو دوو چالاکیە سەدای زۆری هەبوو هەم لەناو جەماوەری میللەتەکەمان وە هەم لەناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان ، بۆ بەیانی گەڕاینەوە گوندی بانی ماران لە بیرمە لەماڵی کاك ( فاروق عەلی مەولود ) ماینەوە ، هەر لەوێ هەندێ هێز بەرێ کرا بۆ دۆڵی بالیسان تاکو لەگەڵ کاك نەوشیروان بچن ، پاش چەند رۆژێك ئێمەش لەگەڵ کاك کۆسرەت بەرێ کەوتین رۆژی ١٢/٥/١٩٨٥ گەیشتینە دۆڵی بالیسان وە سەردانی هەڤاڵ د . کەمال خۆشناومان کرد . سەردانی هەڤاڵ کۆسرەت بۆ لای د . کەمال کێشەو قسەی زۆری لەسەر کرا داخەکەم هەندێ کەس بە ئارەزووی خۆی قسەکانی هەڵسوڕاند کەچی من لەوێ بووم هیچ قسەیەکی وا نەکرا لەلایەن هەڤاڵان تاکو کاك د . کەمال دڵی گەرد بگرێ . دوژمن بۆئەوی تۆڵەی خۆی بکاتەوە لە رۆژی ١٣/٥/١٩٨٥ هێرشێکی گەورەی کردە سەر سنووری ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە کاتژمێر (٣) ی پاش نیوەڕۆ لە گوندی سماقە لەگەڵ پێشمەرگەکانی هەمان تیپ بەرەنگاری یەکتر بوونەوە ئەوهێزەی خۆمان بە فەرماندەی هەڤاڵ مام غەفور توانی تا ئێوارە شەڕێکە قارەمانانە بکات ئەوەی جێگای داخە لەو شەڕە پێشمەرگەی دڵسۆز و کادیری دلێری ی . ن . ك کاك ( قاسم مەلا محەمەد نێرەگینی ) شەهید بوو کاك قاسم برای شەهید سلیمان کە دوو مانگ پێشتر لەشەڕی رەبیەکانی سەر جادەی کۆیە - هەولێر شەهید بوو ئەو بنەماڵەیە تاکو ئێستا شەش شەهیدیان داوە (٥) براو باوکیان . رۆژی دواتر ئەو هێزەی دوژمن گوندی سماقەی کاول کرد . زیانی دوژمن لەو شەڕە کوژرانی جاشێك و برینداربوونی سێ جاش بوو . ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەین دەبینین کەوا مانگ لە دوای مانگ هێزی پێشمەرگە چالاکی مەزنتر و کاریگەر تر ئەنجام دەدا تا وای لێ دێ بۆ چەندین رۆژ بەرامبەر هێزی پۆشتەو پەرداخی حکومەت شەڕی روو بەروو دەکات و سەرکەوتنی گەورە تر وەدەست دەهێنێ .

دوژمن دەستی کرد بە جی بەجی کردنی ئەو پیلانەی کە پێشتر دای نابوو هەر بۆیە ی . ن . ك هێزێکی گەورەی ئامادەکرد بە فەرماندەی هەڤاڵ نەوشیروان بۆ هەڵوەشاندنەوەی پیلانەکانی دوژمن بەتایبەتی لە سنووری مەڵبەندی سێ .

# شەڕی دۆڵە ڕەقە
## ( مەڵبەندی سێ )

ململانەی حزبایەتی لەناو شۆڕش زۆر کەس سوودی لێ وەردەگرێ ، بەلام ئەنجام شۆڕش و گەلەکەمان زیانی مەزنی لێ دەکەوێ ، هەندێ حزب و ڕێکخراو بۆقایم کردنی جێ پێی خۆیان و بەهێز بوونیان دڵسۆزی و پاکی لە وەرگرتنی پێشمەرگەکانیان رەچاو ناکەن هەر بۆیەش هەندێ خەڵك کەلە بنچینەدا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان شۆڕش دەکەنە پیشەی خۆیان و مەرامەکانی خۆیان جێ بەجێ دەکەن ، ئەو ناکۆکیانەی ناو حزبەکان دەقۆزنەوە و هەندێ جار پەیوەندیش بە دزی لەگەڵ دوژمن دەبەستن ، ئەو دیاردەیە گەلێك زەرەر و زیانی لە گەلەکەمان داوە تا ئیستا گەلەکەمان بەو دیاردەیە ناشرینە تەگیناڵێنێ هەندێ جار حزبێك یەکێك لە پێشمەرگە یان مەسولەکانی خۆی سزا دەدا هەرزوو حزبەکەی تر وەری دەگرت و داڵدەی دەدا و پلەی لە پێشووی بەرزتری پێ دەدا ، زۆر حزب هەبووە لە ئەنجامی ئەو ململانێیە رکابەریە چاوی لە هەندێ پێشمەرگەو لێپرسراوی هێزەکەی خۆی پۆشیوە . کە پەیوەندیان لەگەڵ دوژمن کردوە .

ی . ن : لەو دیاردەیە بێ بەری نەبووە ئەویش خەڵکانێك لە پەنا ئەو مەرامی خۆی جێبەجێ کرد و کاری نا شۆڕشگێری ئەنجام داوە و دەتوانم بڵێم پەیوەندیشی لەگەڵ میری کردوە و چاویشی لێ پۆشراوە لەبەر ئەو هۆیانەی کەلەسەرەوە باسمان کرد

ڕژێمی عێراق بەنیازی شکاندنی ی . ن . ك دەیویست بە کۆمەڵ پیاوەکانی خۆی لەناو شۆڕش بکێشێتەوە دەیزانی کاریان تەواو بووە ، لە مێژ بوو ی . ن . ك خەبەری هەبوو کە هەندێك لە لێپرسراوانی شۆڕش لە دۆڵە رەقە پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ دوژمن بەستووە وە دەیانەوێ لە هەل و مەرجی ناسك بۆشایی بخەنە ناوچەکە، جاسوس و نۆکەرانی ڕژێم لەو ناوچەیە ئەوەندە دیار بوون ی . ن . ك ناچار بوو ئەگەر زەرەری گەورەشی لێ بکات دەبێ لە بنەڕەتەوە ئەو مەسەلەیە چارەسەر بکات . لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی ی . ن . ك هێزێکی گەورەی پێشمەرگە بەرەو مەڵبەندی سێ کەوتە ڕێ بە فەرماندەی هەڤاڵی تێکۆشەر کاك نەوشیروان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نەخشەو پیلانەی کەلە سەرکردایەتی دیار کرابوو ، بە گەیشتنی ئەو هێزەی پێشمەرگە ئەو کسانەی پەیوەندیان لەگەڵ ڕژێم کردبوو بە کۆمەڵ خۆیان تەسلیم بە ڕژێم کردەوە و ڕژێمیش لەسەر ئێزگە و تەلەفزیۆن قسەی دژی شۆڕش پێ کردن تا دڵیان داکەوت جنێوی

خۆیان دا له بیریان چووبۆوه که ئەو قسانەی ئەوان دەیان کرد زۆربەی کارە خراپەکانی خودی خۆیان ئەنجامیان دابوو . بوون بە جاش پاش چەند رۆژێك سەنگەریان گۆری ئەو جارە لەگەڵ بەعس هاتنەوە سەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان و شەڕ دەستی پێکرد عمید رکن ( عبدالعزیز حدیپی ) قائدی فرقەی (٢٤) بیست و چوار لە چوار قوڕنە بە دەنگی ئەو تۆپانە دڵی خۆش بوو کە خاکی کوردستانی دەکوتا دەیانگووت ئەگەر دەنگی تۆپ نەهاتبا خەوی لێ نەدەکەوت ئەوەندە تینوو بوو بەخوێنی کوردان ، ئەوەندە دڵ رەش بوو بەرامبەر بە هەژاران و ئاستەنگکێشانی میللەتی کوردله پاشان بوو بە قائد فەیلەقی (٥) پێنج لەکاتی گەڕانەوەی لە ناوچەی رانیە بۆ کەرکوك کۆپتەرەکەی ئاگری گرت و خوا تۆڵەی کوردانی لێ کردەوە لەگەڵ هەیئەتی ئەرکانی فەیلەق هەموویان بە قوربانی مناڵێکی چاو گەشی کورد بوون . جاشە تازەکان بەڵێنیان دا کە ناوچەکە لە هێزی پێشمەرگە پاك بکەنەوە ..!! هێزی پێشمەرگەی کوردستان تیپەکانی ٢١ ی کەرکوك و ٢٥ ی خاڵ خالان و ٩٣ ی کۆیە و ٨٥ ی بەڕانەتی و ٧٨ ی کاروخ و باقی هێزەکانی تری پێشمەرگە نزیکەی دوو مانگ شەڕی ( بەرەبیان – جبهە ) یان لەگەڵ جاش و ئاغاکانی جاشەکان کرد لەو شەڕە دوژمن هەموو جۆرە چەکێکی بەکارهێنا بە تایبەتی بە دەیان تۆپ رۆژانە ئاگربارانی سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان دەکرد هەرچەند دوژمن توانی هەندێ پێشڕەوی بکات بەڵام نەیتوانی هەموو مەرامەکانی خۆی بهێنێتە دی هاوزەمان لەگەڵ هێرش بۆ سەر دۆڵە رەقە دوژمن هێرشی دەست پێکرد بۆ سەر ناحیەی بێتواتە و دەرە هەرتەل و شوێنەکانی بەرامبەر قۆپکی ماکۆك بەشێك لە هێزەکانی مەڵبەندی سێ وهێزەکانی مەڵبەندی چوار سەنگەریان لێ گرتن پاش چەندین رۆژ توانیان بێتواتە بگرنەوە ، بەو جۆرە شەڕ لەوناوچەیە تا ساڵی ١٩٨٨ راوەستا .

هەندێ کەسی بێ ئاگا لە دنیا تەسلیم بوونەوەی بە کۆمەڵی ئەو جەماعەتەیان بە زەرەر دەزانی وایان دیعایە دەکرد ئەگەر وانەبووایە حکومەت ( هدنە ) ی لەگەڵ دەکردین بە بۆچوونی خۆم ئەو بۆچوونە دوور بوو لە راستی چونکە رژێم دەورو تەئسیری ئەو جەماعەتەی دەزانی وە لە بناغەدا پیاوی خۆی بوون بە پێچەوانەوە تەسلیم بوونەوەی ئەو جەماعەتەبە خێرو قازانج بۆ کوردو شۆڕش و ی . ن . ك گەڕایەوە چونکە :

١- نەمانی زەبرو زەنگ لەسەر جووتیارەکانی ناوچەکەوەکو زەمانی سورانە، بەرخانە ، توتنانە، بێ گەریان پێ دەکرا .

٢- کرینەوەی هەیبەتی و سەربەرزی ی . ن . ك چونکە ماوەیەك بوو دوژمن و نەیاران وایان بلاوەکردەوە کە ی . ن . ك دالدەی ئاغاکان دەدا .

٣- پاك بوونەوەی شۆڕش لە پیس و پۆخلّ و جەردە و رێگر و پیاوانی رژێم .

٤- سەلماندنی ئەو راستیە گرنگە ئاغاکان هەمیشە بەرژەوەندی خۆیان خۆشتر دەوێ .

٥- راستە شۆڕش لە مایس و حوزەیران و تەمموزی سالی ١٩٨٥ بە قۆناغێکی ناسك و دژوار تێ پەڕی ناحەزان دلخۆش بوون بەوەی کە ی . ن : تووشی تەنگ و چەلەمە بووە شۆڕشگێرانیش تەنیا ئەو ماوەیان بە تاقی کردنەوە دائەگینا لە بێ ورەو زاتەکان خۆیان تەحویل کردەوە ، هەندێك کۆلیان داو لە کوردستان رۆیشتن و ئاقاری چەند دەولەتیان بڕی ، هەندێك کەوتنە پرتەو بۆلە هەموو ئەوانەی سەرەوە بە خەبات و فیداکاری پێشمەرگە دلسۆزەکان گوڕ کران و شۆڕش چالاکی مەزنی ئەنجام دا هەنگاوی مەزنی بۆ پێشەوە هاویشت . شەرمەزاری و سەرشۆڕی بۆ خائینان و خۆفرۆشانی کورد مایەوە بێ گومان تێکۆشەران مێژووی پاك و بێ گەردیان بۆ خۆیان دروست کرد ، خائین و خۆفرۆشانیش لە مێژووی گەلەکەمان کارو کردەوەکانیان لە لاپەڕە رەشەکان دەنووسرێتەوە .

# شەڕی جەرگبڕ

شەڕی ناوەخۆ ، شەڕی براکوژی شەڕی کورد بە کورد ، شەڕی ناعادیلانە لەناو شۆڕشی کوردستان دیاردەیەکی کۆن و بەردەوامە ، دەیان و سەدان و هەزاران رۆڵەی کورد بە ناهەق خوێنی رژاوە . راستە ئەو دیاردەیە لەناو گەلێ شۆڕش و میللەتاندا هەبووە بەڵام لەناو کورد بە درێژیی مێژووی کۆن و نوێی هەرنەبڕاوەتەوە وە بن بڕ نەکراوە . دوژمنانی کورد بۆ پەك خستنی شۆڕشی کوردستان ، بۆ لاواز کردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ، بۆ شکانی شۆڕشی کوردستان هەمیشە کوردی بەکارهێناوە ، دووبەرەکی خستۆتە ناو ریزی گەل.

شەڕی کورد بە کورد ئەوەندە لەلایەن ترسنۆکەکان پێشوازی لێ دەکرا نیو ئەوەندە شەڕی دوژمنی سەرەکیان پێ خۆش نەبووە . دوژمنی سەرەکی گەلەکەمان داگیرکەرانی کوردستانن ئەو کەسانە نین کە لەگەڵیەکتر بیرو باوەڕیان لەسەر هەندێ مەسەلە جیاوازە کەچی هەموویان دژی داگیرکەرانن ئەو جۆرە ناکۆکیانە بە دانیشتن و ووتووێژی برایانە چارەسەر دەکرێ نەك بەچەك و کوشتن. بەهەر حاڵ بڕیارماندا ت ٨٧ ی قەرەچوغ بەشێکی بچێتە خوارەوە وە بەشەکەی تری لە گوندی چیوەی سەروو بمێنێتەوە ئەو کات کاك سەفین فەرماندەی تیپ بوو منیش جێگری فەرماندەی تیپ بووم . دوو کەرت لەگەڵ من هاتنە دۆڵی سماقولی لەوێ چاومان بە کاك کۆسرەت کەوت بڕیار درا کە بچینەوە دەشتی هەولێر بۆ سۆراغ کردنی ئەو هێزەی حزبی شیوعی عێراقی کەلەناوچەکە جەولەیان دەکرد ( تازە هاتبوونە ناوچەکە بەبێ ئەوەی هیچ رێکەوتنێك لە نێوانماندا هەبێ ) . هێزەکەی حزبی شیوعی نزیکەی هەشتا پێشمەرگە دەبوو هێزەکەی ئێمەش پەنجا پێشمەرگە بوو کەرتی سێ ی ت ٨٧ ی قەرەچوغ بە فەرماندەی هەڤاڵان مامند مەنتك و جێگری کەرت هەڤاڵ (فاقە) و کەرتی چوار بە فەرماندەی سەلاح شینە . هەرزوو شوێنی هێزەکەی شیوعیمان هەڵگرت و زانیمان بەرەو ناوچەی داربەسەر رۆیشتوون ئێمە پێمان وابوو شیوعیەکان هەستی ئێمە بکەن دوور دەکەونەوە و لە شەڕ کردن خۆدەپارێزن ، ئێمەش بە پەرۆش نەبووین بۆ شەڕکردن ئەو راستیەشمان دەزانی لەکاتی بەیەك گەیشتن شەڕکردن دەبێتە کارێکی ئاسایی . لە گوندی دار بەسەری گەورە ( عەلی مەولود ) بووین پاش نیوەڕۆ کابرایەك خەبەری بۆ هێناین و گوتی شیوعیەکان لە ( رووباری کۆیە) نانیان دروست کردووە

ئێمەش بەرێ کەوتین بۆ گوندی ئیلینجاغ بەو نیازەی شیوعیەکان ئێمە دەبینن و لە ناوچەکە دوور دەکەونەوە وە ئامادەیی شەڕیشمان وەرگرت .

بە ریز دوو دوو پێشمەرگە بەرەو گوندی ئیلیجاغ بەرێ کەوت کەرتی چوار لە پێشەوە مەفرەزەکەی لەگەڵ من بوو لەناوەراست و کەرتی ٣ لە پشتەوە مەسافەمان وەرگرتبوو ، لەناکاو لەناو گوندی ئیلنجاغ بووبە دەست رێژو هەڵڵا، شەڕ دەستی پێکرد ، تومەز شیوعیەکان پێش ئێمە سەنگەریان گرتبوو لە گوندەکە بەرایی پێشمەرگەکانی ئێمە گەیشتبووە ناو گوندەکە ، لە قسەکردن نەگەیشتبوونە یەکتر ، شەڕ دەستی پێکرد ، سەرەتا پێشمەرگەکانی ئێمە شکان و خۆمان رێك خستەوە تا ئێوارە نیوەی گوندەکەمان گرت و شیوعیەکانمان شکاند ، تاریك داهات شەهید ئازاد داریەسەری لە ئێمە دوور کەوتووە لەناو خانووەکان دەگەڕا بەپەلە گەڕاوە لام ، زۆر بەپەرۆشەوە ووتی کاکە (مام کاوێس) لەو پەنایە کەوتووە و بریندارە ، یەکسەر لەگەڵ شەهید ئازاد و پێشمەرگەیەك چووم بۆ شوێنەکە لەهەمان کات مامەند مەنتك گەیشتە لامان کە سەیرم کرد مام کاوێس لەبەر برینەکەی زۆر بەئازارە زۆر دڵگیر بووم ، لەسەرەتا خۆی بێ دەنگ کرد وای زانی دەیکوژین چونکە ئەو دیاردەیە لەناو پێشمەرگە زۆر باو بوو .... بانگم کرد مام کاوێس من رێبازم برادەری تۆم قسە بکە کەس ناتوانێ بتکوژێ کە سەری هەڵبڕی چاوم پێ‌کەوت هەموو رۆژانی سەختی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ و ١٩٨٠ م بەبیرهاتەوە کە بەیەکەوە جەولەمان دەکرد و دەستی بەقسان کرد ووتی حەیف ئەوە بیست ساڵ زیاترە خەبات دەکەم کەچی ئێستا لەشەڕێکی ناڕەوا دەکوژرێم ، دڵم داوە ووتم دڵنیابە بە شەهیدێکی گەورەی ئەو میللەتەت دەزانم بەڵام زروف و زەمان وای کرد تۆ وات لێ بێ .... داوای کرد دکتۆری شیوعیەکانی بۆ بانگ بکەین هەرچەند شەڕە دێت بۆ دەرمان کردنی ... داواکەم جێ بەجێ کرد زوو بانگی دکتۆرەکەم کرد ، هەرچەند دوور نەبوون لە ئێمە کەچی بەپیل ئەو داوایە نەهات ، کە بێ ئومێد بوو لە دکتۆر داوای لەمن کرد کە گوندەکە بەجێ بهێڵین تا شیوعیەکان بگەڕێنەوە سەری ، ئەو داوایەشم جێبەجێ کرد ووتم تۆ چی بڵێ ی وادەکەین ، داخی گرانم پاش ئێمە بەهۆی برینەکەی گیانی لە دەست دابوو ، چووە ریزی شەهیدانی کوردستان و رەنجدەران . مام کاوێس کادیرێکی پێش کەوتووی حزبی شیوعی عێراقی بوو ، دۆستێکی خۆشەویستی من بوو ، بە شەهید بوونی کەسەرێکی گەورە لە دڵ و دەروونم دروست بوو . نابێ ئەو راستیە بشارمەوە لە کاتێکدا ئێمە قسەمان لەگەڵ مام کاوێس دەکرد سەلاح شینە کەلە شەڕەکە شکا بوو هاتە لامان کە مام کاوێسی دیت ووتی : کەرتی چوار مام کاوێس بکوژن ، بەو قسەی سەلاح شینە

زۆر عاجز بووم سەیرێکم کرد و بەدەنگێکی بەرز بە پێشمەرگەکانی خۆمانم ووت هەرکسێك مام کاوێس بکوژێ یەکسەر بیکوژنەوە جا هەر کەسێك بێت ، وە ووتم تەنیا پیاوی ( حیز و خوێڕی و ترسنۆك ) دیل دەکوژێ کە سەلاح ئەو قسەی بیست بێ دەنگ بوو قسەی تری نەکرد . لەو شەڕە مام هیدایەت بەدیل گیرا ئەویشمان لە دەستی دیل کوژەکان رزگار کرد ئێستاش ماوە.

رۆژی دواتر واتە ١٩٨٥/٦/٣ هێزەکەی حزبی شیوعی عێراقی لە چیای باواجی لە نزیك گوندی ( کانی گوند ) دوو پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان گرت زۆر بە ناشیرینی شەهیدیان کردن و گاڵتەشیان بەتەرمەکانیان کردبوون . ئەو هەڵسووکەوتە نەدەبوایە هەڤاڵانی حزبی شیوعی بەرامبەر کوڕی هەژارانی کورد بیکەن . بۆ ئەو مەبستە جارێکی تر هێزەکانمان ناوچەکانیان پشکنی بە بریندارى مام هیدایەت خەڵکی ئیلنجاغ بە دیل گیرا هەندێك لە پێشمەرگەکان داوایان کرد کە بیکوژین . ویستم هێوریان بکەمەوە ووتم باشە بەلام داوای بۆچونی مەڵبەند دەکەین ، لەگەڵ مام هیدایەت گەڕاینەوە گوندی ئیلنجاغ ووتم حەز دەکەی بچیەوە ماڵی خۆتان زۆری پێ خۆش بوو دڵم نەشکاند ماڵو منالەکەی نەیاندەزانی ئێمە مام هیدایەتمان بەدیل گرتووە هەر وایان دەزانی پێشمەرگەین و بۆ نان خواردن تەوزیع دەبین کە گەیشتینە پێش دەرگا کچەکەی کەلە تەمەنی ( ٢٠ – ٢٢ ) ساڵ دەبوو چاوی بە باوکی کەوت کەوتە سەر ئەرز کردیە هاوار و گریان وای دەزانی تازە دەیکوژین لە تۆڵەی ئەو پێشمەرگانەی کە شیوعیەکان لە بناری باواجی شەهیدیان کردبوون. منالە بچوکوکانیش هاتن بووە رۆژی حەشر....... بە دزی لە پارچە وەرەقەیەکم نووسی بۆ مەڵبەند دامە دەست عدد جیهازەکە ووتم ئەوە بدە مەڵبەند :

لە - رێباز

بۆ - مەڵبەندی چوار

مام هیدایەتمان بەدیل گرتووە تکایە فەرمان بدەن .

پاش ماوەیەك ئێمە هەر دانیشتبووین عدد جیهازەکە بە نهێنی پارچە وەرەقەیەکی دایە دەستم کە خوێندمەوە نووسرابوو:

لە - م ٤

بۆ - کاك رێباز

مام هیدایەت لە گوندەکەی خۆیان بکوژن .

زۆر نەشێوام چونکە دەمتوانی گیانی رزگار بکەم ، سەلاح شینەو نوری قادر لەلام دانیشتبوون هەردووکیان فەرماندەی کەرت بوون ، بروسکەکەم پێ نیشاندان و سەیرێکی منیان کرد ووتم با برۆین کە چوونە دەرەوە بەوانم ووت ئەگەر رەئیتان هەبێ ئەو کابرایە ناکوژین چونکە دیل کوشتن کارێکی ناشۆڕشگێڕانەیە وە نابێ پێشمەرگە کاری وابکات ئەوانیش ، بۆ مێژوو ووتیان لە قسەی تۆ دەرناچین

جیهازەکەمان لەماڵی محمد ئیلنجاغی دامەزراندبوو ، بەلاکە لاك چوومە لای جیهازەکە ووتم داوای کاك کۆسرەت بکە قسەی لەگەڵ دەکەم کە جیهازەکە دەستی بەکار کرد کاك عەبدوڵا یەکسەر بە عدد جیهازەکەی ئێمەی گووت با فلان کس بێ داوای دەکەن کە دەستم بە قسەکردن کرد کاك کۆسرەت بوو ووتم پێم باشە مام هیدایەت نەکوژن زۆر سوپاستان دەکەم هەر بۆئەوەندە دەمویست قسەتان لەگەڵ بکەم . هەرچەندە دەمویست خزم و دۆست و کەسوکاری مام هیدایەت دڵنیا بکەم کە نایکوژین دەمزانی باوەڕیان بە قسەکەم نی یە چونکە یەکەم جار بوو شتی وا ببێ ، ناهەق نەبوون لە دڵی خۆم ووتم دەبێ هەر بڕوا بکەن ئەمڕۆ یا سبەی کە ئێمە مام هیدایەت ناکوژین رۆژان بەسەر چوو مام هیدایەت نەك هەر نەکوژرا بەڵکو پاش ماوەیەك ئازاد کرا و گەڕایەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی .

هێزەکەی حزبی شیوعی جارێکی تریش لەسەر باواجی و پشتی گۆمە تاڵ و پیرەر لەگەڵ هێزەکانی ی . ن . ك تووشی شەڕ هاتن پاش شەڕێکی یەك رۆژە پێشمەرگەیەکی ی . ن . ك بەناوی بەشدار شەهید بوو وە پێشمەرگەیەکی حزبی شیوعی بەناوی ( ابو دنیا ) شەهید کرا . ناکۆکیەکان ئەوەندە توند و تیژ ببوو ، خوێنی شەهیدانی هەردوولا ئەوەندە خۆشەویست بوو هەریەکە دەیویست تۆڵە لەوی تر بکاتەوە بێ ئاگا لەوەی بەو جۆرە کارانە خوێنی زیاتر دەرژێ و برین قوڵتر دەبێ و زەرەر و زیانی مەزنتر دەکرێ . لەو حەد و سەدە مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی لە نزیك گوندی سیاو بۆسەی لە سێ پێشمەرگەی ی . ن . ك داناوە لەکاتی تێپەڕ بوونی پێشمەرگەکان دەست رێژیان لێ دەکەن و هەرسێ پێشمەرگە شەهید دەبن ( کاك برایم و کاك لوقمان و کاك ستار ) سێ پێشمەرگەی ئازا و سێ پێشمەرگەی شەڕکەر و سێ کوڕی هەژارو رەنجدەر بەناهەق شەهید کران ، بە شەهید بوونی ئەو پێشمەرگانە جارێکی تر تووڕەیی و بێزاری خەڵك بەرامبەر شەڕی براکوژی و شەڕی ناوخۆ بەرز بۆوە خەڵك و پێشمەرگە گەیشتنە قەناعەتی تەواو کە شەڕکردن هیچ ئەنجامێکی باشی نیە تەنیا گەلەکەمان دەکاتە دوو بەرە ، کە دوژمنی سەرەکی گەلەکەمان سوودی لێ وەردەگرێ .

هـەموو ئـەو شـەڕانەی کەلەسـەرەوە باسـم کـرد لـە مـانگی حـوزەیرانی ١٩٨٥ روویـداوە، قوربانیەکان شەهید بوونی هەشت پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و شـەهید بـوونی (٥) پێنج پێشمەرگەی حزبی شیوعی و بریندار بوونی چەندین پێشـمەرگەی تـری قارەمـان لـە هەردوولا ، بە خوێنی ئـەو شـەهیدانە چـەندینجارەبری کوشـندە لـە دوژمـن دەدرا زۆر شـوێن پـاك دەکراوە بەڵام تاریکی بەرچاوی سەرانی کوردی گرتبوو ، پاش ئەو شەڕە گەڕاینـەوە مەڵبەنـد لـە ١٩٨٥/٧/١٩ لە ماڵی کـاك کۆسـرەت چـاومان بـەکاك نەوشـیروان کـەوت بـە ئامـادە بـوونی هەڤاڵان کاك کۆسرەت ، کاك حەمە تۆفیق ، مام رۆستەم شەو درەنگ باسی بـاری نـاو کۆمەڵـە کرا لـەوێ لـە بـیر و بۆچـونەکانی کـاك نەوشـیروان گەیشـتم لـە چۆنێتی چارەسـەر کردنـی ئـەو گیروگرفتە و کردنەوەی ئەو گرێ کوێرەیە .

لـە ١٩٨٥/٧/٢١ کۆبونەوەیـەکمان لەگـەڵ هـەڤاڵانی مەڵبەنـد کـرد لـەوێ نـارەزایی خـۆم دەربڕی بەرامبەر هەڵسوکەوتی پێشمەرگەکان بەرامبەر بە خەڵك بە تایبەتی ئازاردانی خـەڵك ، بەکارهێنانی ئوتومبیلی خەڵك لێدانی خەڵك و زۆر شتی تر ... لەکۆبونەوەکە نەگەیشتینە هـیچ ئەنجامێك هەرچەند موناقەشەیەکی توندو تیژمان لەگەڵ یەکتر کرد .

دیاردەیەکی زۆر بێ جێ و ناشیرین لەناو هەڤاڵان هەبوو ئەویش قسە راستەکان دەخرانە پشت گوێ لە پێناوی وەدەست هێنانی هەندێ ئامانجی تایبەتی . برادەرایەتی و ناوچـە گـەری هـەموو راستیەکانی وەلا ئەگینا کەلە بنچینەدا دژی کاری شۆڕشگێرانەیە . گەڕاینـەوە دەشـتی هـەولێر لە ئابی ١٩٨٥ بەبروسکە ئاگاداری هەڤاڵانی مـەڵبەندم کردەوە کە چیتر نـاتوانم لـە ت ٨٧ کـار بکەم بۆیە حەز دەکەم بچمە ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر هەڤاڵان ئەو داوایەی منیـان پەسـەند کـرد گوازرامەوە ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر .

## داستانی هەولێر

رژێم بۆئەوەی پێش لە چالاکیەکانی هێزی پێشمەرگە بگرێ و کۆنترۆلی شارەکان بکات هێزێکی تایبەتی دامەزراند بوو بەناوی ( قوات الطواریء ) واتە ( هێزەکانی ناکاو ) پێک هاتبوو لە ( ئەمن ، استخبارات ، سوپا ، پۆلیس ، جەیشی شەعبی ) زۆر جار ئەو هێزە بەکار دەهات بۆ پشت گیری ئەو هێزانەی کە لەدەرەوەی شار تووشی شەڕ دەبن لەگەڵ پێشمەرگە . وە لەناو شارەکان ، لە شەقامە سەرەکیەکان شەو و ڕۆژ سەیتەرەیان دائەگینا بۆ پرسین لە خەڵك و ڕێگا گرتن لەو پێشمەرگانەی کە چالاکی ناو شاریان ئەنجام دەدا

( شەهیدی نەمر حەیدەر جوکل ) لێ پرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەناو شاری هەولێر بەچاکی دیراسەی باری ئەو هێزانەی کردبوو ، چاودێری جوجوڵەکانی دەکرن ، پەیوەندی بە هەڤاڵانی ت ٨٧ ی قەرەچوغ ( کاک سەفین ) کرد بۆ ئەو مەبەستە . وە نەخشەیەك دانرا بۆ ئەوەی زەبرێك لەو هێزەی دوژمن بدرێ لەناو شار یا لەنزیك شار ، پاش دیراسەیەکی باش وەختی ئەوە هات کە ئەو چالاکیە بە شێوەیەکی ڕێك و پێکی ئەنجام بدرێ .. ڕۆژی ١٩٨٥/٩/٢ زۆر گەرم بوو لە پەنا دیوارێك لە گوندی بێستانەی گەورە دانیشتبووم سەیری دەشتی پان و بەرینی هەولێرم دەکرد ، دنیا رەملی دەکرد هەر دەتگووت دەریایە بەرز و نەوی دەبێت ، تۆزی ئوتومبیلەکان ناوچەی مرکیەی رەنگینی بزر کردبوو ، قەرەچوغ بە عاستەم ملی لە زۆر گەزراو هەڵکێشا بوو ڕەش دەچۆوە ، وردە وردە پێشمەرگە دەهاتنە گوندی بیستانە کاتژمێر (٤) زۆربەی هێزی قەرەچوغ گەیشتە بیستانە نەمدەزانی بۆکوێ دەچن پاش ماوەیەك کاك سەفین و شەهید ڕەنجە هاتن چرپە چرپ پەیدا بوو ، هاتنە لای ئێمە لەوێ کۆبونەوەیەکی کورت کرا ، لەوێ بڕیار درا ، ئەو چالاکیە ئەنجام بدرێ بەم شێوەیەی خوارەوە :

١- هێزێك بچێتە سەر سەیتەرەی هەولێر – مخمور شەڕ دەست پێبکات بۆئەوەی قواتی طواریء بەهانای سەیتەرە بێت .

٢- هێزێك هێرش بکاتە سەر کارگەی قیری هەولێر پۆلیسەکان بگرێ .

٣- هێزێکی باش کەمین بێت لەناو کارگەکە لەسەر جادەی گشتی هەولێر - مخمور ئەو نەخشەیە بە ڕێك و پێکی جێ بەجێ کرا هێزی گواریء و هەولێر بەهانای هێزەکەی سەیتەرەی مخمور هات کەوتە بەر هێرشی دلێرانەی پێشمەرگە قارەمانەکانی ت ٨٧ ی قەرەچوغ و ت٨٦ ی

دەشتی هەولێر پاش شەڕێکی کورت هێزەکەی دوژمن تەفرو تونا کرا بەدەیان لاشەیان لە مەیدانی شەڕەکە کەوت ، خەڵکی بەشەرەفی هەولێر و لەتیفاوە لەسەر خانووەکانیان سەیری ئەو شەڕەیان دەکرد . پێشمەرگەکان بانگیان دەکردن بۆچ دەست ناکەنەوە ؟ ئەدی بۆچ لەناو ژن و منالی کورد خۆ بادەدەن و بێ ڕێزی بەخەڵك دەکەن لە ئەنجامدا زیاتر لە (١١٧) سەد و حەفدە ئەمن و استخبارات و جەیشی شەعبی کوژرا ( بە گوێرەی ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان ) .

ئەو چالاکیە دوژمنی هەژاند ، لە سەرانسەری کوردستان دەنگی دایەوە ، دام و دەزگاکانی ڕژێم بۆئەوەی پارێزگاری لە خۆیان بکەن دوو ڕۆژ پاشتر (٤٠٠) ئەمنیان لە بەغدا هێنا و مدیر ئەمنی شیمالیان گۆڕی کابرایەکیان هێنا بەناوی ( عبدالرحمن الدوری ) .

بە کوشتنی ئەو هەموو ئەمن و استخباراتە دڵ و دەروونی هەموو کوردێك شاد بوو ، هەستی هەموو کوردێکی دڵسۆزی بزواند ، ورەو زاتی جەماوەری بەرز کردەوە ، ئەمن و استخبارات هەمیشە لەناو شارەکان خەڵك ئازار دەدەن ، لاف بەجاسوسی خۆیان لێ دەدەن ، چاو لە خەڵکی زەق دەکەنەوە لەکاتی بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ پێشمەرگە دەست ناکەنەوە ، مات و زەبوون دەبن وەکو دێڵە ڕێوی لە مەیدانەکە رادەکەن . پیاوی جەردەو ڕێگرو بەدرەوشت هەمیشە لە مەیدان بڕ ناکات و زوو دەبەزێ لەکاتی تەنگانە دنیای لێ وێك دێتەوە ، کە دنیا خۆش بوو ، شەقام چۆل و کڕ بوو ، بواری کەیف و سەفا بوو سینگ دەردەپەڕێنێ ، زمان درێژ دەکا ، لەو شەڕە دوژمن بەزێنە ، لەو مەیدانە ، لەو قڕانە ئەمنە تەنیا سێ پێشمەرگەی دلێر و قارەمان بریندار بوون بەداخەوە تائیستا دوو پێشمەرگە برینەکانیان پێوە دیارە .

ئەمن و سیخورەکانی عێراق لە سکی داکیان بەر دەبنەوە فرچك بەبێ ئەخلاقی و جەردەیی و تاوانباری دەگرن ، دەیان کاری نامەردانەیان کردووە ، هەزاران رۆڵەی گەلی عێراقیان ئازارو ئەشکەنجە داوە ، هەزاران بەدرەوشتیان دەرهەق گەلی عێراق کردووە ، زەبرو زەنگی ئەو دەزگا ناوزڕاوە ، ئەو دەزگایە بێ ئابڕوە لە کوردستان گەیشتبووە رادەیەك گەلی کورد تا هەتایە ئەو سیخوڕانە بەچاوی گومان سەیر بکات ... نازم گزاری گۆڕ بەگۆڕ وێنەیەکی زیندووی ئەو زەبرو زەنگەیە کە بەدەیان لاشەی تێکۆشەرانی گەلەکەمانی لەسەر شەقامەکان بە کوژراوی فڕێ داوە .

کوشتن و لەناو بردنی ئەمن و سیخوڕەکان ، دار ودەست و بەکرێ گیراوانی ڕژێم ، پیاو کوژ و جەردەکان ، بێ ئەخلاق و بێ ویژدانەکانی بەعسی لە ئەستۆی هەموو گەلی عێراقە نەك تەنیا لە ئەستۆی گەلی کوردە لە کوردستان . تەمبێ کردنی ئەو پیس و پۆخڵانەی کە ساڵەهایە لەسەر خوێنی گەلی عێراق دەژین لە ئەستۆی هەموو گەلی کوردە نەك لە ئەستۆی هێزی

پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی بەتەنیا . دیفاع کردن لەکەرامەت و شەرەفی گەلی کورد لە ئەستۆی هەموو پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانیە نەتەنیا لە ئەستۆی لایەنێك .

ئەو داستانەی هەولێر ، ئەو شەڕە قارەمانیە و فیداکاریە ، ئەو شەڕە دوژمن تەزێنە جارێکی تریش ئەوەی سەلماندەوە گەلی کورد لە هیچ مافێکی خۆی خۆش نابێت ، گەلی کورد واز لە بستێك لە خاکی کوردستان ناهێنێ دوژمنانی گەلی کوردیش ، ئەو دوژمنە سەر سەختانە ، ئەو دوژمنە بێ ئابڕوانە ، ئەو دوژمنە کورد کوژانە ، ئەو وەحش و دڕندانە دەبێ بزانن چارەنووسیان لە شای ئێران و سۆمۆزای نیکاراگوا و مارکۆسی فلیپین و سالازاری پورتەغال و فرانکۆی ئیسپانیا باشتر نابێت .

دەبێ ئەوانەی کە دەیان ساڵە گاڵتە بە گەلێکی ڕەوشت بەرزو هێمن و ئەمین دەکەن بزانن هەروا بەئاسانی ئەو هەقەیان لەسەر ناڕوا ت .

نابێ ئەوە لە یاد بکەین هەمیشە چەند ڕۆلەیەك چەند پێشمەرگەیەك ڕۆڵی گرنگ لەهەر شەڕێك دەبینن دیارە لەو شەڕەش چەندین ڕۆڵەی بەوەفای گەلەکەمان ڕۆڵی پڕ سەروەری خۆی گێڕاوە لە پێشەوەی هەموان شەهیدی نەمر ، ڕۆڵەی بەوەفای گەلەکەمان کاکە حەیدەر جوکل کە دەنگ و باسی جموجۆڵەکانی ئەو هێزەی دوژمنی ڕاگەیاند و داوای ئەو چالاکیەی کرد . هەڤاڵان سەفین مەلا قەرە ، هەڤاڵ ڕەنجدەر ( شەهید جلیل ) فەرماندەی کەرتی دووی ت ٨٧ ی قەرەچوغ ، هەڤاڵ مەلا عەزیز فەرماندەی کەرتی یەکی ت ٨٧ ی قەرەچوغ هەڤاڵ مامەند مەنتك و عەریف ئەکرەم کەرتی سێ ی ت ٨٧ ی قەرەچوغ ، سەلاح شینە فەرماندەی کەرتی چواری ت ٨٧ ی قەرەچوغ ، هەڤاڵ شەهید یوسف قەشقە فەرماندەی ك ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر و هەڤاڵ نوری قادر باریکە فەرماندەی کەرتی یەکی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر وە هەموو پێشمەرگەکانی بەشدار لەو داستانە دەوری خۆیان گێڕا . هەقە لێرە ڕێزو سوپاسی بێ پایان بۆ ئەو ڕۆڵە بەجەرگانە بنێرین کەلەشارەکان سەری گەلی کوردیان بەرز کردەوە ، ناوچاوانی ئافرەتی کوردیان گەشاندەوە ، بزەیان خستەوە سەر لێوی هەموو منالانی کوردستان . هەر زیندوو بێت یادی شەڕی داستانی هەولێر .

# دوو پیلان و یەك هێرش

رۆژ نەبووە دوژمن و ناحەزان پیلان نەگێڕن لە گەلی کورد و شۆڕشەکەی ، هەموو ڕێگایەکیان تاقی کردەوە بۆئەوەی شۆڕشەکەمان قەلاچۆ بکەن و نائومێدی لە کوردستان بالی بکێشی .

شۆڕشی کورد لە مردن گەلێك بەهێز تر بوو ئەگینا ئەوەندەی پیلان لەو شۆڕشە کراوە ئەقل پەسەندی ناکات ، دەیانویست هەموو میللەتی خۆمانمان لێ راست بکەنەوە بۆیان نەکرا ، دەیانویست لەناوە خۆ بەگژ یەکترماندا بدەن بۆیان نەچوە سەر .....!!!؟ هێزی گەورەی خۆیان بەکارهێنا سەرنەکەوتن ، وەك چاوێشە دەگەڕان فێلێك بدۆزنەوە بە ئومێدی ئەوەی ئاواتیان بێتە دی دیسان نائومێد دەبوون ، رژێمی بەغدا شێت و هار بوو ، وەخت بوو لە حەیفا شەق بەرێ نەیدەزانی بە چ ڕێگایەك چالاکیەکانی هێزی پێشمەرگە کەم بکاتەوە ، گەڕایەوە بۆ فرت و فێلە کۆنەکان جاشەکان ( سوارەی حەمیدی ) دادی نەدا بیری کردەوە بەرە بەرە گوندەکان چەکدار بکات هەرچەند ئەو تاقی کردنەوە هەرەسی هێنا لە سالەکانی ٧٨ و ٧٩ و ٨٠ و ٨١ و ١٩٨٢ زۆربەی گوندەکانی قەراج ، کەندیناوە ، شەمامك ، مرکیە هەتا هەندێ گوندی پاش جادەی هەولێر – کەرکوکی چەکدار کرد بەناوی جەیشی شەعبی کەچی بە پەلە پەل چەکەکانی لێ وەرگرتنەوە نەوەکو بەرە بەرە چەکەکان بکەونە دەست هێزی پێشمەرگە و بەهێزی بکات ئەو جارە بەتەرحێکی تازە گوندەکانی ( چەمەدبس، مەلا عومەر ، شەمشولە ، زاگە ، مشاری ) چەکدار کرد ، هەندێ گوندی تریشی ئاگادار کردبۆوە کە ئامادە بن چەك هەلبگرن . جووتیارەکان هەمیشە پشت و پەنای شۆڕشن ئەوان یارمەتی پێشمەرگە مسۆگەر دەدەن ، لەژێر پالەپەستۆ نەیان دەتوانی ئەو داوایەی رژێم رەت بکەنەوە دیاردەی جاشەتی گەلێك هۆی هەیە لە ئابوری بگرە تا کۆمەلایەتی و سیاسی ....هتد هەر بۆیە شۆڕش دەبێ بەوردی دیراسەی ئەو دیاردەیە بکات نابێ سەر پێی بڕیاری لەسەر بدات . رژێمی عێراق زیاتر لە (٤٠٠) چوارسەد فەوجی سوکی ( الافواج الخفیفە ) دروست کرد زیاتر لە دووسەد هەزار کەس لە کوردستان چەکیان هەلگرت بەلام دەبێ ئەو راستیە بلێین لەو دووسەد هەزارە دەهەزار جاشیش ئامادە نەبوو بەجدی شەڕ بۆ رژێم بکات دژی هێزی پێشمەرگە .

پیلانێکی تریش لە رۆژهەڵات هات ئەویش بەناوی (ئاڵای شۆڕش ) کە ئەو کات بەنهێنی لەناو کۆمەڵە کاریان دەکرد چەند بڵاوکراوەیەکیان پەخش کرد دژی ی . ن . ك ( بەرزە) چەند کەسێکی بێ ئەزموون دروستیان کردبوو ئەویش بەیانێکی لەناوچەی دەشتی هەولێر بڵاوکردەوە دژی من و کاك سەفین و مام غەفور و فاروق عەلی مەولود بۆئەوەی پێشمەرگەکان سارد بینەوە ، ئەوانە پیلان بوون دژی ی . ن . ك دەگیردرا یەکە یەکە چارەسەر کرا .

لە رۆژی ۲۷/۱۰/۱۹۸۵ لە گوندی سێ کانیان کۆبونەوەیەك بەسترا بە ئامادەبوونی کاك شێخ جەعفەر لێپرسراوی عسکەری مەڵبەند بە ئامادەبوونی هەڤاڵان مام غەفور فەرماندەی ت ۸٦ ی دەشتی هەولێر و رێباز جێگری فەرماندەی ت ۸۷ ی قەرەچوغ و کاك فاروق عەلی مەولود جێگری فەرماندەی ت ۸۷ ی قەرەچوغ بڕیارماندا لە گوندەکانی زاگە و شەمشولە و مشار بدرێ بۆئەو مەبستە هێزەکان کرانە دووبەش قۆڵێك بۆ شەمشولە و زاگە ، قۆڵەکەی تر بۆسەر گوندی مشار ، لە ئێوارەی هەمان رۆژ بەرێ کەوتین ، جادەی هەولێر - کەرکوك ، هەولێر- مەخمورمان بڕی پاییز بوو شەو درێژ بوو گوندەکانی مرکیە و سینەمان بڕی درەنگی شەو گەیشتینە گوندی سیاوو شێخ شەروان بەرۆژ لەوێ ماینەوە ، ئێوارە بەرێ کەوتین ت ۸٦ ی دەشتی هەولێر لەگەڵ کەرتی دووی ت ۸۷ ی قەرەچوغ بۆ گوندی شەمشولەو زاگە لەوێش بووینە دووبەش قۆڵێك لێپرسراوەتی بەمن سپێردرا وە دەبوایە لە کاتژمێر ۸,٤٥ دەقیقەی شەو دەست بەتەقە بکەین قۆڵەکەی تریش بەفەرماندەی مام غەفور ، وردە وردە لە گوندەکە نزیك بووینەوە وەختی ماڵ نوستان بوو، لە لادێ خەڵك زۆر دەبۆرژێ ئەگەر زوو نەخەوێ خەوە کوتکە دەیباتەوە هەرچەندە جاشەکان وریا بوون ، لەکاتی دیاری کراو شەڕمان دەست پێکرد هەرزوو گەیشتینە ناو گوندەکە هەندێك لە جاشەکان شەڕیان کرد .... هەرچەند بڕیار وابوو بۆئەوەی چاوی جاشەکان بشکێنین ژن و منداڵ بکوژین بەڵام کە گەیشتینە ناو گوندەکە لە قۆڵی خۆمان ئاگاداری هەموو پێشمەرگەکانمان کردەوە هیچ کەسێك بۆی نی یە ژن و منداڵ بکوژێ وە هەر کەسێك ئەو تاوانە بکات لێ پرسینەوەی لەگەڵ دەکەین بەجدی پێشمان لەو کارە گرت ئەگینا دەبووە هۆی کوشتنی دەیان منداڵ و ئافرەت ، پاش دوو سەعات شەڕ و لێك دان گوندەکەمان گرت دوانزە چەکداری رژێم کوژران و هێزەکانی ئێمەش بێ زیان بوون دەسکەوتی هێزەکەمان ۱۵ - ۲۰ پارچە چەك و چەندین ئوتومبیل بوو ، هێزێکی تیپی ت ۸۷ ی قەرەچوغ هەمان شەو هێرشیان کردە سەر گوندی مشار لەناوچەی قەراج پاش شەڕێکی چەند سەعاتی نەتوانرا گوندەکە بگرن بەڵام توانیان زەبرێکی کوشندەیان لێ بدەن و وشیاریان بکەنەوە کە هێزەکانی

پێشمەرگە دەستی دەگاتە هەموو شوێنێکی کوردستان ، هەمان شەو هەموومان گەڕاینەوە ناوچە رزگارکراوەکان لە دێدەوان و بەستی شەرغە گەیشتینە ئەو ناوچانە کاك شێخ جەعفەر گەڕابۆوە مەڵبەند لە دۆڵی سماقوڵی ئەو گەڕانەوەی کاك جەعفەرم لا شتێکی سەرسوور هێنەر بوو کە پرسیارم لە برادەرانی خۆمان کرد وتیان فڕۆکەکانی دوژمن لە سماقوڵی داوە و کاك کۆسرەت بریندارە .

کە ئەو هەواڵەم بیست زۆر عاجز بووم کاك کۆسرەت هەم وەکو برادەرێك و هەم وەکو ئەندامێکی زۆر بەکەڵکی شۆڕش بوو بریندار بوونی کاری راستەوخۆ دەکاتە سەر مەڵبەندەکەمان و لە دوایش دەکاتە سەر ی . ن . ك رۆژی دواتر لەگەڵ چەند برادەرێك چووینە سەردانی کاك کۆسرەت لە گوندی سوسێ لەلایەن د . زریان چارەسەر دەکرا ، د . زریان یەکێك بوو لەو دکتۆرانەی کەلە ریزەکانی هەرە پێشەوە خزمەتی گەلی خۆی دەکرد و گیانی چەندین پێشمەرگەی لە مردن رزگار کرد ، خۆزگە ئەو دکتۆرە پێشمەرگانە لە یاد نەدەکران و هەمیشە بەرێزەوە ناویان دەهات.

## جیابوونەوەی کاك مەلا بەختیار

## ( ئالای شۆڕش )

لە تشرینی یەکەم کاك مەلا بەختیار داوای کرد کە لە ی . ن . ك جیابێتەوە ، دیارە لە سەرەتا سەرکردایەتی یەکێتی ئەو داوایەی مەلا بەختیاری پەسەند کرد و رازی بوو ، دیارە جیابوونەوەی مەلا بەختیار ئەندامی کارامەی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و ئەندامی سەرکردایەتی ی . ن . ك کاری راستەوخۆی دەبێت و زەرەری گەورەی هەیە بۆ گەلەکەمان خەبات و تێکۆشانی پچڕ پچڕ دەکات ، کۆمەڵەش لاواز دەکات ، چونکە ئالای شۆڕش لەسەر خوێنی کۆمەڵە دەیویست نەش و نەما بکات ، بۆیە سەرکردایەتی ی . ن . ك پاش لێکۆڵینەوە بۆی ساغ بۆوە جیابوونەوەی مەلا بەختیار زەبرە لە کۆمەڵە و یەکێتی دەدا بۆیە بریاری دا : دەست گیر بکرێت و پێشکەش بەدادگای شۆڕش بکرێت .

هەڤاڵ مەلا بەختیار لە مێژ بوو کنەی لەناو ریزەکانی کۆمەڵە دەکرد دۆست و لایەنگیری بۆ خۆی پەیدا دەکرد پێی وابوو (٧-١٠) فەرماندەی تیپی لەگەڵدایە وە سەدان پێشمەرگەش پشتگیری لێ دەکەن و خەڵکی کوردستانیش یارمەتی دەدەن بۆ سەرکەوتنی ئەو رێکخراوەی کە دایدەمەزرێنێ رەنگە هەندێك لەو هەڤاڵانە بە جدی بەڵێنیان پێ دابێت بەڵام بێ گومان هەندێك لەو کەسانەی بە باری کۆمەڵە رازی نەبوون یان بۆ وەدەست هێنانی هەندێ بەرژەوەندی تەسکی خۆیان بە قسە لەگەڵ کاك مەلا بەختیار قسەیان کردبێ و لەناو خەڵك و پێشمەرگە وایان نیشان دابێ کە ئەوانیش لەگەڵ ئالای شۆڕش دان و سەنگیان هەیە .

رۆژ بە رۆژ چپوو چپوو لە ( ی . ن . ك ) زیاتر پەیدا دەبوو، ئەگەر زوو ئەو مەسەلەیە یەکلا نەکرابایەوە ئەوە دەبووە دەردێکی کوشندەو چارەسەرکردنی کارێکی ئاستەنگتر دەبوو ، هەر بۆیە سەرکردایەتی ی . ن . ك پاش ئەوەی هەندێك لە بەڵگە و نامەیان لەلایەن تەتەرەکانی ئالای شۆڕش گرت کە ئاڵوگۆڕ کرابوو لە نێوان خۆیان بە تایبەتی لە نێوان مەلا بەختیارو هەڤاڵ ( سالار– نجمالدین عزیز ) . بریاری دا مەلا بەختیار دەست گیر بکات وە بۆ ئەو مەبەستە هێزێکی لە سەرکردایەتی نارده تاوچەی قەرەداغ بە فەرماندەی کاك شەوکەت حاجی مشیر بە هاوکاری کاك حامید حاجی غالی و کاك شێخ جەعفەر و مام رۆستەم و کاك وەهاب بۆ سەلماندنی قسەکانی پێشوومان کاك مەلا بەختیار کاك حامید و شێخ جەعفەر و مام رۆستەمی

به دۆست و لایەنگری خۆی دائەگینا کەچی ئیستا ئەو هەڤالانە بە هێزێك دەچنە ناوچەی قەرەداغ بۆ دەست گیرکردنی کاك مەلا بەختیار .

راستە ی . ن . ك هێزێکی گەورەی لەناوچەی قەرەداغ و گەرمیان هەبوو لەبەر دوو هۆ ئەو ئەرکەی بەو دوو هێزە نەسپارد

١- هەڤاڵ جەبار فەرمان ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی مەڵبەندی یەك زۆر دژی ئالای شۆڕش بوو بۆ ئەوەی کاردانەوە و خوێن رشتن نەبێ تەنیا ئاگادار کراوە و ئەو ئەرکەی پێ نەسپێردرا .

٢- زۆربەی یا هەندێك لە لێپرسراو و پێشمەرگەی سنووری مەڵبەندی یەك ، سۆزیان لەسەرهەڤاڵ مەلا بەختیار هەبوو ، چونکە ماوەیەك لێپرسراوی مەڵبەندی یەك بوو وە هەم خۆی بە قائیدی روحی ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان دەزانی وە لە مێژبوو هێلانەی لەوێ دروست کردبوو بۆئەوەی پشێوی لەناو هێزەکان دروست نەبێ ئەو هێزانە بێ لایەن کران و هێزی تایبەتی لە سەرکردایەتیەوە رەوانەی ناوچەکە کرا و کارەکەیان بەبێ تەقە و شەڕ و شۆڕ ئەنجام دا ، کاك مەلا بەختیار بەدیلی رەوانەی سەرکردایەتی کرا ، هەندێ بەڵگەو بلاوکراوەش لە ماڵەکەی گیرا ، رەوانە کردنی بۆ سەرکردایەتی بەڕێزو حورمەتەوە بوو .

گرتنی کاك مەلا بەختیارو یاخی بوونی هەندێ لە فەرماندەی تیپەکانی ناوچەی سلێمانی ، لادانی هەندێ فەرماندەی تیپ و کادیر لە شوێنە جیا جیاکانی کوردستان بووە هۆی ساردبوونەوەی دەیان پێشمەرگەو دەمەتەقەی توند و تیژ لەناو ریزەکانی کۆمەڵە بەتایبەتی لەناو ریزەکانی رێکخستن دیاری کردنی چارەنووسی هەڤاڵ مەلا بەختیار ، بەند بکرێت ئازاد بکرێت ......کێشەی زۆری دروست کرد لەناو ریزەکانی ی . ن . ك بە تایبەتی ئەو بڕیارە لەلایەن هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی بەگران قووت دەدرا وای لێ هات هەڤاڵ مولازم عومەر عەبدوڵا ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری دەستی هەڵگرت لە هەموو کاروبارەکانی شۆڕش و کاك ئازاد هەورامی تووشی دوو دڵی هات و ئاخ و داخی بۆ دەکێشا ، مەلا بەختیار پێش هەڵگیرسانی شۆڕش ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان بوو لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕش رۆڵی دیار و پڕ سەروەری هەبوو ، لاوێکی خوێن گەرم و ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵە بوو ، بەهۆی لێ وەشاوەیی خۆی توانیبووی خۆشەویستی خۆی لەناو دڵی زۆربەی ئەندامان و پێشمەرگەکان بچەسپێنێ ، لەژیانی پێشمەرگایەتی زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی کردبوو ، لە قەرەداغ جێگای متمانەی خەڵك و پێشمەرگە بوو لە داستانەکانی هێزی پێشمەرگە بەشداری

هەبوو ، بۆ چەسپاندنی ی . ن . ك دەیان جار گەرمیان و کوێستانی کردبوو ..زەحمەت کەواتە گرتن و لادانی مەلا بەختیار کارێکی وا ئاسان نییە ، وابەسەر پێی ناکرێت ، لێك دانەوەو کۆبونەوە و پلینوم و کونفراسی پێویستە دەبێ بۆچونی کادیرە پێشکەوتووەکان وەربگیرێ هەر کەسە قسەی خۆی بکات چونکە ناکۆکی هەڤاڵ بەختیار لەگەڵ سەرکردایەتی وەختێکی زۆری خایاند هەر لەناکاو ئەو مەسەلەیە نەهاتە مەیدان ، ئالای شۆڕش چەندین ساڵ بوو ئیشی بۆ دەکرا جا کار کردنەکە بەرهەمی هەبوبێت یان نا .

سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ چارەسەر کردنی ئەو گیروگرفتە و بنبڕ کردنی بڕیاری دا پلینۆم ببەسترێ لە بەرگەڵوو شوێنێکە دەکەوێتە دامێنی گوندی سەرگەڵوو لەناوچەی جافەتی ، پلینۆم پێك دێت لە ئەندامانی سەرکردایەتی و کادیرە پێشکەوتوەکانی پێشمەرگەو ڕێکخستن و کادیرە تێکۆشەرەکان کە لەدەزگا جیا جیا کان کار دەکەن دەسەڵاتی پلینۆم کەمترە لە دەسەڵاتی کۆنفراس بۆ نموونە لە پلینۆم ناتوانرێ دەستکاری پەیڕە و پرۆگرام بکرێت ، ناتوانرێ هەموو سەرکردایەتی هەڵبژێرێ بەڵکو دەتوانێ جێگای ئەو کەسانە پڕ بکاتەوە کە بەهۆی جیا جیا وازیان لە سەرکردایەتی هێناوە .

لە ڕۆژی ١٩٨٥/١٢/١٠ پلینۆم لە شوێنی دیاری کراو دەستی بە کۆبونەوەکانی خۆی کرد بە ئامادەبوونی (٦٠) کادیری پێشکەوتوو و ئەندامانی سەرکردایەتی و جێگرەکانیان جێگای داخە ناوی هەموانم لە بیر نەماوە بۆیە هەر ئەوناوانە دەنووسم کە ئێستا وەبیرم دێتەوە :

١- کاك نەوشیروان مستەفا
٢- کاك فەرەیدون عبدالقادر
٣- کاك کۆسرەت
٤- کاك قادر حاجی عەلی
٥- کاك جەبار فەرمان
٦- کاك حەسەن کوێستانی
٧- کاك عومەر فەتاح
٨- کاك حەمە تۆفیق
٩- ٩-کاك د. خسرەو
١٠- کاك أرسلان بایيز
١١- کاك عەلی بچكۆل

١٢- کاك پۆلا

١٣- مام ڕۆستەم

١٤- کاك شێخ جەعفەر

١٥- کاك وەهاب

١٦- کاك حامید حاجی غالی

١٧- کاك شۆڕش حاجی

١٨- ڕێباز

١٩- کاك شاخەوان

٢٠- کاك عەبدوڵا توفیق

٢١- کاك مەلا خدر

٢٢- کاك بەهرۆز ( شوان )

٢٣- هەڤاڵ نەهرۆ سەعید سۆفی

٢٤- کاك عبدالرحیم

٢٥- کاك سەرهەنگ

٢٦- مامۆستا سیف الدین

٢٧- کاك جوامێر

٢٨- کاك دانا

٢٩- کاك سەفین

٣٠- شەهید عبد الرزاق

٣١- کاك غەریب سەعید

٣٢- کاك سامان

٣٣- کاك عادل

٣٤- کاك ئاوات قارەمان

٣٥- کاك دلێر سەید مەجید

٣٦- شەهید مەلا ئاراس

٣٧- سیروان کوێخا نجم

٣٨- کاك ڕێکەوت

لە پێشەوەی هەموو کارەکان باسی کێشەی ئالای شۆڕش و چارەنووسی هەڤاڵ مەلا بەختیار هاتە گۆڕێ پاش چەندین کۆبونەوەو پاش مشت و مڕێکی زۆر بڕیاری کوشتنی درا .

هەندێ هەڤالآن بێ گوێ دانە ماندوو بوونی هەڤاڵ مەلابەختیار تەنیا ئەو ئیشەی کە کردوویەتی باسیان دەکرد کەچی هەندێکی تر لە برادەران چاکە و خراپەکانی مەلا بەختیاریان باس دەکردو دەیان خستە تای تەرازوو بزانن بەکام لا دەشکێ ئەوسا بڕیار لەسەر چارەنووسی بدرێ ، بەهەر حاڵ هەموو ئەندامانی پلینۆم مۆریان کرد کە پێویستە مەلا بەختیار بکوژرێ تەنیا کاك عەبدولآ توفیق ئیمزای نەکرد ، هەندێك داوای بەندکردنی مەلا بەختیاریان دەکرد کەچی هەندێك لە برادەران دەیانویست حساباتی کۆنیش بهێننە گۆڕێ دەیانگوت ئەگەر مەلا بەختیار لە زیندان بێت کێ زامنی ئەوە دەکات ڕۆژێك لە ڕۆژان ئازاد ناکرێ یا لە بەندیخانە ڕزگار نابێت.جێگای سەرسووڕمانە ئێمەی پێشمەرگە کە داوای ئازادیمان دەکرد ، داوای مافی زەوت کراومان دەکرد ، ڕژێمی عێراقمان بە پیاوکوژ دەزانی کەچی هەقی ئەوەمان نەدەدا برادەرەکانمان بیرو باوەڕی ئازادیان هەبێت هەر هیچ نا بە بەند کردنیش پەسەندمان نەبوو بەڕاستی ئیستا خۆم بەناهەق دەزانم .....!!؟ ئەوەی جێگای خۆیەتی باسی بکەم ئەوەیە ئەو برادەرانەی کە چەند ڕۆژێك پێش پلینۆم یا گرتنی مەلا بەختیار دیفاعیان لێ دەکرد و لەگەڵی دابوون ئەوان گەلێ هەڵوێستیان خراپتر بوو نەك هەر داوای کوشتنی مەلا بەختیاریان دەکرد بەڵکو داوای کوشتنی ئەو کەسانەشیان دەکرد کە بۆنی ئالای شۆڕشیان لێ دێ .....!!؟ لەگەڵ هەڤاڵ مەلا بەختیار کاك شێخ عەلی و کاك پشکۆ دوو ئەندامی کارامەی کۆمەڵە بوون گیرا بوون حکایەت ئەوانیشی دەگرتەوە یەك ڕاستی هەیە هەقە ئاشکرای بکەم لە گەرمەی حەفت و هەشت دا کاك کۆسرەت داوای کرد کە شێخ عەلی ئازاد بکرێ یان حوکمی کەمتر بدرێ چونکە خاوەنی چەندین شەهیدە کاك نەوشیروانیش ووتی : مەلا بەختیار زۆر خەباتی بۆ کۆمەڵە و ( ی . ن . ك ) کردوە هەقە ئەگەر دانی بە خراپەکانی خۆی دانا ئەوا دەست لە کوشتنی هەڵبگرین لەسەر ئەو بڕیارە وەستاین و دەسەلآت گەڕایەوە بۆ ناوەندی کۆمەڵە ، ڕۆژی دواتر بڕیارەکانی پلینۆم بە کاك مەلا بەختیار گەیشت بە هۆی دوو برادەر یەکسەر کاك مەلا بەختیار داوای دیتنی کاك نەوشیروانی کرد .ناتوانم لە قسەکانی نێوان ئەو دوو برادەرە چ بنووسم هەر ئەوەندە دەزانم کاك مەلا بەختیار ئیعترافی بە تاوانەکانی کرد کە خۆی دەیگوت ( تاوانم ) کردیە وناوی هەموو ئەو کەسانەشی ئاشکرا کرد کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ ئەو هاکاریان کردبوو بۆ دروست کردنی ڕێکخراوی ئالای شۆڕش ، ئەو خاڵە بووە هۆی ڕزگار بوونی گیانی مەلا بەختیار بەم

جۆرە ئە و كێشەیە كۆتایی هات پاش ئەوەی دەیان كادیر و پێشمەرگە تووشی گیو گرفت بوون ، پاش ئەوەی دەیان پێشمەرگەی دڵسۆز ساردبوونەوە لە خەبات و تێكۆشان .

كاك مەلا بەختیاریش تاكو ناوەراستی ١٩٨٩ لە زیندانی ی . ن . ك بوو دوای ئەوەی كۆبونەوەی كادیرانی كۆمەڵە بەسەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلال بەستڕا ئازاد كراو گەیشتەوە هەڤاڵانی تری لە ئاڵای شۆڕش كەلە چەند كەسێك پێك هاتبوون .

ئاڵای شۆڕش لە ١/٥/١٩٩٢ لەگەڵ حزبی ئاستەنگكێشانی كوردستان لە حزبێك یەكیان گرت ، وە دوای تێپەڕی و دوو مانگ بەناوی حزبی ئاستەنگكێشانی كوردستان پەیڕەوی یەكگرتن لە ٢٤/٧/١٩٩٣ لەگەڵ ی . ن . ك یەكیان گرتەوە .

پلینۆمی كۆمەڵە لە بەرگەڵو بەستڕا ، هێزەكانی رژێم لە سوسێ بە تۆپ و تەیارە بەبەردەوامی بەرگەڵوی دەكوتا ، كۆبونەوەكان سەرەڕای ئەو بۆردومانەش هەر بەردەوام بوو ، لەو پلینۆمە پێویستی دەكرد جێگرێك ببێتە ئەندامی سەركردایەتی بۆیە بڕیار درا كە لەنێوان هەڤاڵ حەمە تۆفیق و د . خسرەو ئەندامان ئازاد بن كامیان هەڵدەبژێرن لە ئەنجامی دەنگ دان كاك حەمە تۆفیق بە زۆربەی دەنگ بە ئەندامی سەركردایەتی هەڵبـژێردرا لە ١٥/١٢/١٩٨٥ لە سەركردایەتی بەرێ كەوتم بۆ سنووری هەولێر لەو سەفەرە هاوڕێ ی تێكۆشەر شەهیدی نەمر سەردار سەعید سۆفیم لەگەڵ بوو لە رێگا زۆر سەرمام بوو لە ٢٠/١٢/ ١٩٨٥ گەیشتمەوە ناوچەی دەشتی هەولێر هەموو پێشمەرگەو ئەندامانی كۆمەڵەمان كۆكردەوە تەواوی رووداوەكانی ناو پلینۆمان بۆ باس كردن بەراشكاوی هەر جموجۆڵێك قەدەغە كرا كە ببێتە هۆی ئاژاوە نانەوە لە ناو ریزەكانی كۆمەڵە و ی . ن . ك لەو ماوەیەدا هێزێكی ت ٨٧ ی قەرەچوغ زۆر بە شێوەیەكی ناشیرین و نارێك چەند پێشمەرگەیەكی پارتی دیموكراتی كوردستانیان بریندار كردوو هەندێكیان بەدیل گرتن ، لەگەڵ كاك سەفین لە گوندی ئاومالْ قسەمان لەگەڵ دیلەكان كرد و وەكو ئازاد كرابن وا مامەڵەیان لەگەڵ كرا ئەو زەبرەی ت ٨٧ ی قەرەچوغ لە پێشمەرگەكانی پارتی دا رەنگدانەوەیەكی خراپی هەبوو هەم لەناو جەماوەری گەلەكەمان وە هەم لەناو ریزەكانی هێزی پێشمەرگەی كوردستان لە هەمان رۆژ مەفرەزەیەكی پارتی لە بناری قەرەچوغ تووشی سێ پێشمەرگەی یەكێتی دەبن هەرسێكیان شەهید دەكەن ، بەم جۆرە دیسان برینەكان سەریان هەڵدایەوە ، پاش ئەوەی ماوەیەكی زۆر بوو تەق و تۆق لە نێوان هێزە سیاسیەكان رووی نەدابوو هێشتا زۆربەی ئەندامانی سەركردایەتی و كادیرەكان هەر لە سەركردایەتی بوون ، هەندێكیان لە رێگا بون نەگەیشتبوونەوە شوێنی كاركردنیان

هەمیشە دوژمن لە خاڵی لاواز دەگەڕێت تا زەبر لە شۆڕش و هێزی پێشمەرگەی کوردستان بدات لە کاتی بەستنی پلینۆم هێرشێکی بۆ گوندی زیارەت کردبە هیممەتی دلێرانەی پێشمەرگەکان هێرشەکەی دوژمن سەرکەوتوو نەبوو ، دوژمن دەیویست تۆڵەی ئەو هەموو شکستەی خۆی بکاتەوە دەیویست سوود لەو هەلە وەربگرێ ناکۆکیەکانی ناو خۆمانی دەقۆزتەوە ئێمەش خەریک بووین دەم بخەینە لاشەی یەکتر دوژمن لە دووروە پێمان پێبکەنێ خۆش بەختانە ئەو هیوایەی دوژمن نەهاتە دی پلینۆم بە سەرکەوتوویی کارەکانی خۆی ئەنجام دا و هەڤاڵان بە خوێنێکی تازە بە تەوژمێکی تازە هەر یەکەیان گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی دەستی کردەوە بەچالاکی نواندن چ پێشمەرگایەتی چ ڕێکخراوەیی .

# هێرشی دوژمن بۆسەر مەڵبەندی چوار

سماقولیەکان و دۆڵی هیان - نازەنین گرنگی تایبەتی هەیە چ لە شۆڕشی ئەیلول و چ لە شۆڕشی نوێی ی گەلەکەمان هەمیشە جێگای حەوانەوە و بارەگای هێزی پێشمەرگە بووە ، چیای سەفین و ئاوە گرد و بەنا باوی و باواجی و چیا گچکەل سەنگەری قایمی شۆڕشگێران بووە هەر بۆیە دوژمن بە رق و تورەییەوە سەیری ئەو ناوچەیەی کردوە وە هەوڵی داوە چیای سەفینی سەر بلند لە ڕەگ و ریشەوە دەربهێنێ بەڵام لە مێژ ساڵە کورد دەڵێ ( پشتم سەفین بێ تف لە ئاسن دەکەم ) ، لەکاتی خۆی عیسی شاوی ئەفسەری پایە بەرزی جەیشی عێراقی ویستی ئەو چیایە پێشکەش بە عبدالسلام عارف بکات بەڵام کوڕەکانی شۆڕشی ئەیلول ئاواتەکانی دوژمنیان خستە ژێر گل ئەو ئەفسەرە گەورەیەشیان بە جەهەنەم شاد کرد ، زۆر جاران دوژمنی سەر سەخت هێرشی بۆ ئەو ناوچانە کردوە بەڵام هەرگیز نەیتوانیوە ڕەگ و ریشەی شۆڕشگێران هەڵتەکێنێ .

لە ١٩٨٥/١٢/١٣ لە کاتێکدا زۆربەی کادیرەکانی پێشمەرگەو ڕێکخستن بەشداری پلینۆمیان دەکرد لە دۆڵی جافەتی ، دوژمن هێرشی بۆ ئەو ناوچەیە کرد توانی گوندی زیارەت بگرێ ( دەرگای سماقولیەکان )وە چەند پێشمەرگەیەک شەهید کران و زەرەرو زیانی زۆریش بە جووتیارەکان گەیشت.

هێزەکانی دوژمن کشایەوە بە نیازی هێرشی بەربلاوتر ، تازە لە سەرکردایەتی گەڕابوومەوە زۆر ماندوو بووم ، هەوراز و نشێوی قەمچوغە و سەر مۆرد و شێخ باغ و سێ کانیان و تەلان شەکەتی کردبووین ، بروسکەیەکمان بۆ هات لە مەڵبەندی چوار داوای دوو کەرتی پێشمەرگەی دەکرد وە ناوی منیشی تێدا بوو کە لەگەڵ ئەو دوو کەرتە بچمە سماقوڵی سەروچاوە بڕیارەکەی مەڵبەندم جێبەجێ کرد لەگەڵ دوو کەرتەکە بەرێ کەوتین پاش بڕینی ڕێگای دوورو درێژی دەشتی هەولێر بۆ سماقوڵی پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتینە مەڵبەند ڕۆژی دواتر کۆبونەوەمان لەگەڵ برادەرانی مەڵبەند کرد دیار بوو ئەوان دەنگ و باسیان لەسەر هێرشەکەی دوژمن هەبوو بەڵام هیچ هەنگاوێکی جدی نەدەهاوێشترا بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو هێرشەی چاوەڕوان دەکرا .

شەوی ١٩٨٥/١٢/٣١ بۆ ١٩٨٦/١/١ لەکاتێکدا هەموو دنیا جەژنی سەری ساڵی دەگێڕا ئێمەش لەگەڵ هەڤالان عەلی حەمە سالح و کاک محمد شینە و هەندێ لە برادەرانی تر لە قوژبنێکی گوندی سماقوڵی لەبەر فانۆسی نەوت لێ براوو سەرما و سۆڵی زستان ئەو جەژنەمان

کرد ئەگەر دنیا لە بەزم و رەزم دابوو ئەگەر لە هەوایەکی ئازاد یا ژێر دەست ئەو جەژنەیان کردبێ ئەوە ئێمەی پێشمەرگە لە هەوایەکی ئازاد و سەرفرازانە یادی جەژنی سەری ساڵمان کردەوە نیوەشەو رابردوو ، نامەیەکی تر هات دیسان وەبیری هێنایینەوە کە دوژمن هەر وەختێك هێرش بکات ئامادەیە ، بەهەر حاڵ ئەو دەنگ و باسانە تا رۆژی ١٩٨٦/١/٥ بە گەرمی بڵاودەکرایەوە خەبەریش لە جاشەکانەوە دەهات .

ئەو رۆژە لە مەڵبەند بووم خەبەر هات کە حکومەت هێزەکانی لە دەربەندی گۆمەسپان کۆکردۆتەوە بەپەلە بەرێ کەوتم بەرەو گوندی کێشکە لە رێگا تووشی کاك رائد جەلال بووم ئەویش داکۆکی لەو دەنگ و باسە کرد و ووتی بەچاوی خۆم هێزەکانی دوژمنم دیوەو لەیەك دابڕاین .

کە گەیشتمە گوندی (کێشکە ) چاوم بەکاك تەحسین عوسمان فەرماندەی کەرتی یەك ت ٩١ ی سەفین کەوت بەیەکەوە بەسەر چیای کێشکە کەوتین سەیری ناوچەکەمان کرددوژمن یەك کەتیبە مەدفەعی گەورە ( کەتیبە پێك هاتووە لە (١٨) مەدفەعی گەورە ) لەنزیك ئاریانەدامەزراندبوو بەسەدان ئوتومبیلی پڕ لە جاش و جەیش بەرەو دەربەندی گۆمەسپان دەهاتن ، وە هەندێك لە ئوتومبیلەکان بەرەو کۆیە دەڕۆیشتن ( دوژمن ماوەیەك بوو لە جادەی کۆیە هەولێر هاتووچۆی نەدەکرد لەترسی هێزی پێشمەرگە ) هاتنی ئەو هێزە گەورەیە شك و گومانی نەهێشتەوە کە هێرش دەکات .

لەگەڵ هەڤاڵن پێشمەرگەکانمان دابەزاند لە لووتکەی پشتی کێشکێ تا کورە دێر، فیشەك و پێویستیەکانمان بەسەردابەش کردن چەند بلێ ی سەرمابوو بەفران بار بوو ، چلەی زستان بوو شەختە دارو بەردی دەبەست رەشەبا هەموو بن بەردێکی دەگرتەوە ، بەڵێ ئەو شەوە لەو شاخە بووین بەبێ ئاگر بەبێ پێخەف هەمیشە چاوەڕوانی هێرشی دوژمنمان دەکرد، بەدزی لەپەنا بەردان دووجار چامان ساز کرد ، جار جار وردە نانیشمان لەگەڵ دەخوارد، چا بۆ ماوەیەك خەو لە چاوان دەباتەوە،

(تاڵ و شیرین پێکەوە چا بێ چا نەبێ،هەر کەسێ هەنیشی چا نەبێ پێت چا نەبێ ) لە شارەکان پیاوی ماقوڵ و زل و قۆڵ بڕ هەمیشە قاوە دەخوات ئێمەی هەژاریش ئاشناو برادەرێکی کۆنی چاین ، لە کاتژمێر (٥) ی بەیانی باقی هێزەکەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بە سەیارە گەیشتنە لامان ، ت ٨٧ ی قەرەچوغ بەرەو سوسێ بەڕێ کەوتن ، لە کاتژمێر (٥/٥)ی بەیانی لە نزیك گوندی زیارەت تەقە دەستی پێکرد ، هەرچەندە جارێ دوژمن لە هێرش کردن بۆ سەر سماقوڵی

لەپێشدا قۆپی کێشکێ ی دەگرت کەچی ئەو جارە دزەی کرد و بەجادەی گشتی دا ڕۆیشت هیچ پێشمەرگەیەکی لە پێش نەبوو کە ڕۆژهەلاَت هێزەکانی دوژمن بە کاوە خۆ بەسەر بەنەباوی کەوتن ، هێزەکەی ئێمە لەشەڕ دابڕاو لە هەمان کات شەش کۆپتەر هاتنە سەرمان بۆئەوەی نەتوانین بەسەر بەنەباوی بکەوین .

دوژمن بەبێ تەقە سەرانسەری بەنە باوی گرت کە دەڕوانێتە سەر سماقولیەکان لە هەمان کاتیش لە قۆڵی کۆیە و باواجی، هێرشی کردبوو بەسەر بەنە باوی کەوتبوو . دوژمن لەو شوێنانە هێرشی خۆی دەست پێکردبوو ، دەربەندی گۆمەسپان – زیارەت ، چیای باواجی ، بۆ گرۆژو بەنە باوی دۆڵی ئەسحابان بۆ سماقوڵی و گەلی و چیای گچکە ، گرتکی حمد امین سلام بۆجەلی ، هیزۆپ و کۆلکە ڕەش و کاموسەك، هیان بۆ کاموسەك هیان بۆ نازەنین ، هیان بۆ پشتی نازەنین گەرۆتە بۆ قۆپی سوسێ دوژمن لەو هەموو قۆڵە هێرشی کردبوو دەبا بزانین هێزەکانی ئێمە چەند بوو .

١- ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر (١٠٠) پێشمەرگە
٢- ت ٨٧ ی قەرەچوغ (١٠٠) پێشمەرگە
٣- ت ٩٣ (٥٠) پێشمەرگە
٤- ت٩١ ی سەفین (٥٠) پێشمەرگە
٥- ت ٨٥ ی بەرانەتی (٧٠) پێشمەرگە

بێ گومان لەناو ئەو هێزەش دەبوایە هەندێك خەریکی نان و فیشەك گواستنەوە و کاری تەنەری بێت بەبڕوای من دوژمن لە (٧٠٠٠) حەوت هەزار جاش و سەرباز زیاتر بوو جگە لە تۆپ و دەبابەو کۆپتەر سەرەڕای نارێك و پێکی هێزەکان و باش سەرکردایەتی نەکردنی .

تا ئێوارە دوژمن هەموو هێزەانی پێشمەرگەی ئابلوقە دا ئێمە دەمانتوانی بەسەلامەتی بگەڕێینەوە دەشتی هەولێر بەلاَم بۆئەوەی هەڤاڵەکانمان بەجێ نەهێڵین شەو بەرەو سماقوڵی کەوتینە ڕێگا زۆر بەئاستەنگ کەمینەکانی دوژمنمان بڕی نێوان وونکە و سماقوڵی لە هەموو حاڵەتێك لە سێ کاتژمێر زیاتر نابێ کەچی بە (٩) کاتژمێر توانیمان بگەینە سماقوڵی ، شەهید عەبدوڵا جیهاز زۆر دەوری هەبوو چونکە دەیزانی مەڵبەند زۆر بێ سەروبەر بووە ، کەس بە کەس نی یە هەر بۆیە ئێوارە بەجیهاز قسەی لەگەڵ من کردو ووتی : ئەگەر زوو نەگەنە مەڵبەند دۆخەکە زۆر خراپ دەبێت بەیانی کاتژمێر (٥) ڕۆژی ١٩٨٦/١/٧ گەیشتینە مەڵبەند لەگەڵ هەڤالاَن زۆر ماندوو بووین هەر یەکە لە کاولە خانوویەك لامان دا من چوومە

لای برادەرێك بریندار بوو بێ خەبەر لەوەی تـەگبیر کـراوە چۆلی بکـەین ، کـە هاتـە دەرەوە رۆژ باڵێك لە چیای ئاوە گرد بەرز ببۆوە لەناو گونـدی سماقولی سەروچاوە چـاوم بـە مـام غـەفور و شەهید عەریف ئەکرەم و بیست پێشمەرگەیەك کەوت لە پشتی گوندی جاشەکان بە ئار بـی جـی گوندەکەیان دەکوتا ناوی خوامان لێ هێناو بەرەو چیا رۆیشتین ، نـازانم جاشـەکان نیازیـان چـی بوو ئەگینا ئێمە زۆر نزیك بووین هەندێ تەقەیان لێکردین ، لەسەر چیای ئاوەگرد لەگەڵ هەموو هێزەکەی مـەڵبەند یەکمان گرتەوە ، تا ئێوارە تۆپ بـارانی کـردین کـە تاریـك داهـات شـۆڕمان کردەوە گوندی نازەنین تازە لەوێ جاشەکان کشـابوونەوە سـەر جـادەی کاموسـەك ، زۆر بـێ نـان بووین شەو چوومە ماڵێك کەسی لێ نەمابوو خەڵکەکە لە ترسی کوشتن و گرتن چۆڵی کردبوو ، فانۆس نەبوو دەبوایە ئاگر دیار نەبێ لەبەر ئەوەی دوژمن زۆر نزیك بوو هەرچۆنێك بوو هەنـدێك نان و تورشیمان دۆزیەوە زۆر باش بوو لە نزیك مزگەوتکۆبووینەوە هێزەکـەمان کـردە دوو بـەش فەرماندەی بەشەکان بە ت٨٦ ی دەشتی هەولێر و ت٨٧ ی قەرەچوغ سپێردرا .

بەرێ کەوتین بۆ گوندی (فریز) نزیکەی سەد کەس پیەو پەك کەوتـەو ژن و منـاڵمـان لەگـەڵ بوو زۆر بەئاستەنگ کەمینەکانی دوژمنمان بڕی (( هەقە ئەو راستیەش بلـێم جاشـەکان لەسـەر جادەکە بوون لەوێ ویژدانی کوردایەتیان جولا رێگەیان چۆڵ کرد ئـەگینا تووشـی زەرەرو زیـانی گەورە دەبـووین )) لەگـەڵ بـەیانی گەیشـتینە فریـز لـەوێ لـە ئابلوقـەی دوژمـن رزگـار بـووین هـەڤالانی مـەڵبەنـدی سـێ هاتنـە لامـان ، لـەو شـەڕە بـێ سـەروبەرە (٩) پێشـمەرگەی دلێـر و قارەمان شەهید بوون و چەندین پێشمەرگەش برینـدار بـوون ، چـەند پێشـمەرگەیەکیش لەلایـەن دوژمن بەدیل گیران لەپاشان بە فەرمانی سەرۆك سـەدام حسـێن ئـازاد کـران ، گـرنگترین هـۆی شکستی ئەو شەڕە دەگەرێتەوە :

١- کەم ئەزموونی سەرکردەکانی مەڵبەندی چوار لە شەڕو پێك دادان لەگەڵ دوژمن .

٢- لە دەست دانی قولایی ستراتیژی مەڵبەندی چوار هەمیشە پشتی بە مەڵبەندی سێ ئەسـتور بوو، هێزەکانی مـەڵبەندی سێ هەولێکی جدیان نەدا بـۆ شـکانی ئابلوقـەی دوژمـن کـە زۆر بـە ئاسانی دەکرا بە تایبەتی چیای هەورێ شوێنێکی گرنگ بوو دەتـوانرا لـەوێ را هێـرش بکرێتـە سەر دوژمن .

٣- ئامادە نەکردنی هێزەکان پێش دەست پێکردنی هێرش هەریەکە لە شوێنی خۆی چـاوەڕوانی هێرشی دوژمنی دەکرد ئەوجا بگاتە شەڕەکە کە هێزەکان کۆبونەوە دوژمن کاری خۆی کردبوو و شوێنەکانی داگیر کرد .

٤- دابین نەکردنی فیشەك و خواردن بۆ هێزەکانی پێشمەرگە .

٥- بەفرو سەرما و سۆل هەموو دەست پێشخەریەکی لە پێشمەرگە سەندەوە .

دوژمن لە رۆژی ١٩٨٦/١/٨ لە ناوچەکە کشایەوە پاش ئەوەی گوندەکانی ( سماقولی گرتەك ، کرۆژ، سێ نان، سماقولی، جەلی، سەروچاوە، سوسێ، زیارەت، حاجی ئەحمەدە، عەلیاوە .....) سووتاند و سەروەت و سامانی میللەتی وەکو پیشەی خۆی بەتالان برد ، رۆژی ١٩٨٦/١/٩ گەراینەوە شوێنی خۆمان لە مەلبەندی چوار .

رۆژی گەرانەوەمان بۆ مەلبەندی چوار رۆژێکی ناخۆش بوو دوژمن گوندی سماقولی سەروچاوەی سووتاند بوو ، هەرچی ئازوقەو خواردن هەبوو دەستی پێدا هێنابوو هەم بە چاوی خۆمان ئەنجامی شکستی هێزەکەی خۆمان دیت بە هەرحاڵ رۆژی دواتر هەڤاڵ کۆسرەت و برادەران گەرانەوە لامان بە دلێکی زۆر تەنگ هەڤالان پێیان وابوو هێزەکە شەری چاکی نەکردووە بەهەرحاڵ رۆژی ١٩٨٦/١/١٢ هەڤالان کاك فەرەیدون عبدالقادر و کاك د . فۆاد معصوم گەیشتنە مەلبەند ئەوان دەیانویست بچنە شوێنێك نزیك بێت لە برادەرانی جود تا ئەوەی بەدەستی خۆمان کردومانە باشی بکەینەوە شەو کاك فەرەیدون کاك د. فۆاد لەگەلمان مانەوە شەوێکی چەند بلێی ناخۆش ، بە هەموومان دوو بەتانیمان لابوو نەدەکرا ئێمەی کادیر شوێنمان گەرم بێت و برادەرانی سەرکردایەتی سەرمایان بێت هەمیشە پەیرەوی برا گەورەییمان دەکرد ئێمە هەتا بەیانی بەئاگر کردنەوەو دانیشتن تۆزێك سەرماو سۆلمان لەکۆل خۆمان کردەوە نەمانزانی ئەو شەوەش چەند درێژ بێت هەر دەروات چونکە دنیا هەر وایە چەند خۆش بێت یا ناخۆش بێت ئەوە بێ گومان تێ دەپەرێت و بەسەر دەچێ تەنیا شەرمەزاری بۆ ئەو کەسانە دەمێنێتەوە کە ویستویانە دنیا بە ئارەزووی ئەوان بێت هەر چۆنێك بوو ئەو تەنگانەش بەسەر چوو تاریکە شەو بە گەزنگی خۆرێکی گەش و جوان رەویەوە دیارە سەرکەوتن و ژێرکەوتن رۆلی گرنگ دەگێرێ لە شۆرش ، داخی گرانم هەندێ کەس وای دەزانی دوژمن هەرگیز ناتوانێ بگاتە سماقولی، ئەو بەرد و کونە تەیارە دەیپارێزێ لە پەناو پەسیوە شورشگێری راستەقینە دەردەچێ ، کەچی ئەو جۆرە کەسانە لەو شەرە نەترەیان بەردا رەنگیان گۆرا بە خۆرا نەگەیشتن پەنایان بردە بەر دوژمنی کوردو خۆیان تەسلیم بە داگیرکەرکردەوە .

ئەوانەی راست کردنەوەی ئەو بارەیان لە ئەستۆ بوو ، هەژارو رەش و رووتی وەك ئێمە بوو ، دەبوایە ئەو بارە راست بکەینەوە هەر زوو کەوتینە خۆ پاش یەك رۆژ چووین بۆ دەوروبەری سەربازگەی گۆمەسپان بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو شکستە بکەینەوە بەلام بۆمان نەلواو گەراینەوە

مەڵبەند و لەوێش کێڵمان کردەوە دەشتی هەولێر پاش ئەوەی هێزەکانمان ڕێك خستەوە دەست کرا بە چالاکی پێشمەرگانە گورزی کوشندە لە دوژمن وەشێنراو بە دوژمنیان سەلماند ئێمە کوڕی ڕۆژی ڕەشین وە هیچ هێزێك نی یە لەسەر ڕووی زەمین کوڕی کوردان بترسێنێ شکستەکانیشمان بە سەرکەوتن دەزانی دەرس و پەندی تازەمان لێ وەردەگرت ، بودەڵەو ترسنۆکەکانمان لەکۆڵ دەبۆوە ، بۆمان ساغ دەبوچوە کێ پێشمەرگەی ڕاستەقینەیەو کێ دەیەوێ لە ڕۆژی خۆشی لەگەڵمان بێ و لە پاش خۆشیان پاڵ بداتەوە ڕژێم ، بڕوامان وابوو شۆڕش هەر سەرکەوتن نی یە ، شۆڕش پارە دزین و قوڵ بڕین نییە ، شۆڕش گەشت و گوزار نی یە ، بەڵکو شۆڕش ویژدانە ، پیاوەتیە ، شەرەفە ، ناخۆشیە ، سەختیە ، خوێن ڕژانە ، مانەبوو بونە ژێر کەوتن و سەرکەوتنە شۆڕش کارو کردەوەی شۆڕشگێڕانەیە .

سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان بە پێچەوانەی هەموو شۆڕشەکانی دنیا هەرگیز ڕەچاوی ئەوەی نەدەکرد سزای توند و تیژی ئەو کەسانە بدات کەلە ڕیزی شۆڕش دابوون و خۆیان تەسلیم دەکردەوە ، بێ خەبەر لەوەی دوژمن زۆر سوودی لەو جۆرە کەسانە وەردەگرت ناوونیشانی هەموو تێکۆشەرانی بە دوژمن رادەگەیاند ، چەك و تەقەمەنی تەسلیم دەکردەوە لەکاتێکدا شۆڕشی گەلانی دنیا ئەو کەسانەیان بە خائین دەزانی کەلە ناوجەرگەی شۆڕش کردن خۆیان تەسلیم دەکردەوە ئەوە کارێکی ڕاست و دروستە وەهەر بەو جۆرە ڕێك و پێکی دیسپلین لەناو شۆڕش پەیدا دەبێ نابێ ئەو کەسانە ئەو قسەیە واتێبگەن کەلە هەل و مەرجی خراپی شۆڕش وەکو شکانی شۆڕشی ئەیلول و پاش ئەنفالەکان خۆیان تەسلیم کردەوە ئەو دوو حاڵەتە جیاوازە لەگەڵ ئەو کاتەی کە شۆڕش لە گرمەی سەرکەوتن دابوو.

هەر لەبەر ئەو هۆیەش زۆر کەس بەمەرامی خۆی شۆڕشی بۆ چەند وەختێك کردوە تا مەرامەکەی هاتۆتە دی و بەکەیف و ماشای خۆی تەسلیم بە دوژمن کردۆتەوە ، ئەو جۆرە کەسانە بەڕاستی قۆڵ بڕ بوون ، ڕاوە ڕووت کەر بوون خۆیان لەسەر خوێنی شەهیدانی کوردستان دەوڵەمەند کردو لەهەلی خۆش و فراوان دیسان قۆڵ و باسکی نامەردانەیان لێ هەڵدەکرد و خۆیان دەکردەوە لێپرسراوی خەڵك و زۆر جاریش خۆیان بە لێپرسراوی ئەو پێشمەرگانەش زانیوە کە ڕۆژێك سازشیان لەگەڵ دوژمنی کورد نەکردووە .

هەق وابوو ئەو کەسانە سزای توند بدرێن کە خۆیان تەسلیم دەکردەوە هەق وابوو ئەو کەسانە ڕیسوا بکرێن کە سازشیان لەگەڵ دوژمنی کورد کردوە هەق وانەبوو ئەو کەسانە پاداشتی ئەوەیان بدرێتێ کە خوێنی پێشمەرگەیان ڕشتووە ..!! هەق وابوو بەچاوێکی سووك سەیری ئەو

کسانە بکرێ کە بۆ مەرامی خۆیان چەند رۆژێک هەفتەیەک ، مانگێک ، تێپەڕی شۆڕشیان کردوە لەپاشان سەریان بۆ دوژمن شۆڕ کردوە ، ئەگەر هەق لە دنیا مابێ هەق وابوو خۆ ئەگەر هەقیش زولمی لێ بکرێ ئەوە نابێ باسی هیچ لەو کێشانە بکەین .

# چەند تێکۆشەرێکی قارەمان

مێـژووی گـەلی کـورد بـە هـەوڵ و تەقـەلای هـەزاران قارەمـان نووسـراوەتەوە ، لـەناو ئـەو قارەمانانەش قارەمانی مەزنیان لێ هەڵکەوتووە تا کورد مابێ دەبێ ڕێزیـان بگـرێ و لـەیادیان نەکات .

شۆڕشـی کوردسـتان لەسـەر شـانی چـەند هەڵۆیـەکی بـەهێزو سـەر بـەرز مایـەوە ، قارەمـان قارەمانی پێ دەگەیاند جێگای داخە لەبەر هەست بە لێ پرسراوەتی نەکردنی هەندێ کـەس هـەر وەختە میللەتی کورد بێ قارەمان بمێنێتەوە ...!!؟ پاش شـەڕی سماقوڵی چـەندین مەفرەزەیـەکی تێکۆشەر لە تیپە جیاجیاکانی مەڵبەندی چـوار دەسـتیان کـرد بـە چـالاکی پێشـمەرگانە لـەناو جەرگەی دوژمـن ، لەناو شارەکان کە دوژمن پێی وابوو هیچ کەسێك ناتوانێ کـارێکی وا بکـات تۆزێك تـرس بخاتـە دڵیـان ، بـەڵام ڕۆڵـەکانی گـەلی کـورد کـوڕە ئازاکـانی هێـزی پێشـمەرگەی کوردستان ئەو جارەیان لەناو دڵی دوژمن ترسیان پەیدا کرد نەك تـرس بـەڵکو دوژمـن تووشـی سەرشێتی بوو تۆقین ، هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەر زوو زیانەکانی خۆی قەرەبوو دەکـردەوە چالاکی مەزنی ئەنجام دەدا ، سزای دوژمنـانی کـوردی دەدا خـۆی ڕێـك خسـتەوە لـە سـەرەتایی مـانگی شوباتی ١٩٨٦ هـەڤاڵ کۆسـرەت لێپرسـراوی مەڵبـەند و هـەڤاڵ شـێخ جەعفـەر هاتنـە سنوری تیپەکانی ٨٦ ی دەشتی هـەولێر و ٨٧ ی قەرەچوغ بـە هاوکـاری هـەموو لایـەك چـەند مـەفرەزەیەك دروست کرا لـە پێشـمەرگە هـەرە ئازاکـانی ت ٨٦ و ت٨٧ و ت٨٥ بۆئـەوەی لـەناو شاری هەولێر دەست لە دوژمنی سەرسەخت بوەشێنن .

بە ماوەیەکی کەم چەندین چالاکی دلێرانە لەناو شارو لە نزیك شار ئەنجام درا ، گرنگترینیـان ئەو چەند چالاکییە کە لە خوارەوە باسیان دەکەم :

١- کوشتنی دوو ئەفسەر لە نقلیاتی شاری هەولێر بە فەرماندەی هەڤاڵ شەهید سەردار سەعید سۆفی و بەبەشداری هەڤالان ئەیوب یوسف و بەختیار کاوانی .

٢- لێـدانی مۆلگـای جاشـەکان لـەناو شـاری هـەولێر لەهـەمان ڕۆژ لـە لایـەن دەسـتەیەك لـە پێشمەرگە دلێرەکان

٣- كوشتنی هەردوو ئەفسەری پایە بەرز لە نزیك ناحیەی قوشتەپە كە لەبەر دەرگای فەیلەقی (٥) پێنج گرتبوویانن لەلایەن شەهید سەردارسەعید سۆفی و شەهید شێرزاد جەلال بە شێوەیەكی سەرسوورِ هێنەر رزگاریان بوو .

٤- لێدانی قوەتی‌ڤكواری‌ولە نزیك گەرەكی شۆڕش لەلایەن شەهید سەردار سەعید سۆفی و هەڤالاَن ئەیوب یوسف و بەختیار كاوانی .

٥- لێدانی پارێزگاری هەولێر ( ابراهیم زەنگەنەی گۆڕ بە گۆڕ ) لەلایەن شەهید سەردار سەعید سۆفی و هەڤالاَن ئەیوب و بەختیار كاوانی .

٦- لێدانی قوەتی‌ڤكواری‌و لە نزیك رووناكی لە شاری هەولێر لەلایەن پێشمەرگەكانی ت ٨٧ ی قەرەچوغ وەلە هەمان شەو پاككردنەوەی گەرەكی باداوان لە جاش و خۆفرۆشان لەلایەن پێشمەرگەكانی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر و كادیرانی رێكخراوی یەكی كۆمەڵە .

٧. لێدانی رەبیەكانی دوژمن لە گوندی بیرە بات كەلەناو جەرگەی دوژمن دابوو .

لەو هەموو چالاكیە گەورانە دەیان بۆرە پیاوی دوژمن كوژرا زەرەرو زیانی مادی زۆری پێكەوت ، دەسكەوتی پێشمەرگە چەك و تفاقی زۆر بوو .

بۆئەوەی ناوی پیرۆزی ئەو تێكۆشەرانە بۆئەوەی جەماوەری گەلەكەمان ئاشنای تێكۆشانی كورِە ئازاكانیان بن ئەوا ناوی هەندێ لەو تێكۆشەرانە دەنووسەوە كەلە مەفرەزەی ناو شارەكان رۆڵی گرنگیان گێرا بەداخەوە هەندێك لەو تێكۆشەرانە شەهید بوون خۆزگە ئیستا چاویان دیار دەبوو چۆن هەندێ كەسی مشەخۆر بەرهەم و ماندوو بوونی ئەوان دەخۆن و ئەو شەهیدانەش بوون بە سەربازی وون .

١- شەهید ( سەردار سەعید سۆفی ) فەرماندەی كەرت خەڵكی گوندی (دەربەندی گۆم ) ی كەندیناوە لە شەڕێكی دلێرانە لە قۆپی كێشكێ لە ١٩٨٧/٦/٣٠ شەهید كرا لە تیپی ٨٥ ی بەڕانەتی بوو .

٢- شەهید (شێرزادجەلال) پێشمەرگەی مەفرەزەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە لایەن رژێمەوە لە ئەنفال شەهید كرا .

٣- شەهید( كاوە )خەڵكی كەندیناوە لە چالاكیەكی مەزن لە نزیك فلكەی زەعیم لەناو شاری هەولێر شەهید كرا پێشمەرگەی مەفرەزەی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر بوو .

٤- شەهید (غودیل) پێشمەرگەی مەفرەزەی ت ٨٧ ی قەرەچوغ لە سەرەتای مانگی ١٠/١٩٨٥ لەگەڵ شەهید كاوە لەناو شاری هەولێر شەهید كرا لەلایەن جاشە خۆفرۆشەكان .

٥- شەهید (سولە قۆڕیتانی) پێشمەرگەی ت ٨٧ ی قەرەچوغ لە نیسانی ١٩٨٨ لەکاتی ئەنجام دانی چالاکیەکی مەزن لە نزیك شاری موسل لەگەڵ کاك ئەمجەد شەهید کرا .
٦- شەهید (بەختیار ) پێشمەرگەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە ئەنفالەکان شەهید کرا.
٧- شەهید ( شۆڕش ئاومالّی ) پێشمەرگەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە مرکیە شەهید کرا .
٨- شەهید( شێرۆ ) پێشمەرگەی ت ٨٥ ی بەرانەتی بەهۆی بۆردومانی کۆپتەر شەهید کرا .
٩- شەهید ( کەریمە سوور )پێشمەرگەی هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر لە هاوینی ١٩٧٨ شەهید کرا .
١٠- شەهید ( هێمن ) پێشمەرگەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە ئەنفالەکان شەهید کرا.
١١- شەهید ( ئازاد ) خەڵکی مەخمور پێشمەرگەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە راپەڕین شەهید کرا .

جگە لەو شەهیدانە دەیان پێشمەرگەی تریش ئازایانە و دلێرانە دەوری پڕ لەسەروەری خۆیان گێڕا لە شەڕی پێشمەرگانەی ناو شارەکان وەهەر یەکەیان جێگای دەستی پیرۆزیان دیار بوو لەوانەش تێکۆشەران :

١- بەختیار کاوانی پێشمەرگەی ت٩١ ی سەفین خەڵکی کاوانیان - شەقلاوە .
٢- ئەیوب یوسف پێشمەرگەی ت ٩١ ی سەفین خەڵکی دارەتووی نزیك هەولێر .
٣- (ئازۆ ) مەخموری و ( رەشۆ ) مەخموری دوو پێشمەرگەی ت ٨٧ ی قەرەچوغ بوون خەڵکی مەخمورن .
٤- ( فخرالدین ملا کریم ) پێشمەرگەی ت ٨٧ ی قەرەچوغ خەڵکی مەخمور .

ناکرێ لێرە ناوی یەکە یەکەی ئەو پێشمەرگانە بنووسمەوە کە دەوریان لە شەڕی ناو شارەکان هەبووە دەبێ لێم ببورن .

# بریندار کردنی پارێزگاری هەولێر

حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی درۆ گەورەکانی سەر بگرێ ، بۆئەوەی چاو بەستەکی بە خەلك بکات ، بۆئەوەی زەمینەی کورد لەناو بردن خۆش بکات هەمیشە ئەلقە لە گوێیەکانی خۆی ئەوانەی کە کورد بوون زۆر دژی میللەتی خۆیان بوون دەیکردنە کاربەدەست لە کوردستان ، ئەو کوردە نۆکەرانە لە عەرەبە بەعسیەکانیش خراپتریان دەکرد چونکە دەیانویست خۆیان خۆشەویست بکەن زۆر لە کوردە خۆفرۆشەکان ئەوانەی مێژوو ویژدانی لێ سەندنەوە ، ئەوانەی مێژوو ریسوای کردن بەناهەق خەلکیان بە گرتن دەدا کاری نامەردانەیان دەکرد تا زیاتر بە خزمەتکاری پلە یەك حساب بکرێن پێتان سەیر نەبێت کە دەلێم نەبووە و نەکراوە کابرایەکی کورد لێپرسراوەتیەکی لە حکومەت وەرگرتبێ بەرامبەر ئەوە کوردێکی بە شەهید کردن نەدابێ ، کچ و ئافرەتێکی کوردی دلشکاو نەکردبێ ، خەفیەو نهێنی گری لەسەر کوردێك نەکردبێ ، ئەو کاربەدەستانە کورد نەبوونە بەلکو زۆلە کورد بوون .
سەرەرای ئەو خراپەو خراپەکاریانە بە چاوی سوك سەیر کراون هەم لەلایەن رژێمی بەعسەوە هەم لەلایەن گەلەکەمان بە پیاوی بێ هەلوێست و مشەخۆر ، نەفس نزم ، مل پان ، چاو مۆن ، ترسنۆك ، توولە حیز ، سەرسەری ، دێلە رێوی ، دەخوێندرانەوە ، بەعسیەکان بۆ دهۆك و سلێمانی و هەولێر محافقی کوردیان دائەگینا بەلام دەسەلاتی پۆلیسێکی ئەمن و یەك نەسیری عەرەبیان نەبوو ، پارێزگاری مالی خۆشیان پێ نەدەکرا .
بۆئەوەی دوژمن بزانێ هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەتوانێ لە هەموو نۆکەرەکان بدات ، دەتوانێ دەستی بگاتە نۆکەرە هەرە پیسەکان ، ئەوانەی لەسەر خوێنی کوردی هەژار کورسی لەرزۆکیان وەرگرتوە ، ( ابراهیم زەنگەنە ) یەکێك بوو لە ئەلقە لەگوێیەکانی دوژمنی گەلی کورد ، یەکێك بوو لەوانەی سیاسەتی کورد لەناو بردنی پیادە دەکرد ، یەکێك بوو لەوانەی کە درۆیەکانی بەعسی دەشاردەوە بۆیە لێدانی ئەرکێکی نیشتمانی گەورە بوو لەناو بردنی ئەو خۆفرۆشە چاوی هەزاران نۆکەری بچووکی بەر دەرگای بەعسیەکانی دەترساند .

لە گوندی بۆرێجە بووین ، لە مالی جووتیارێکی هەژار دانیشتبووین تازە بەهار لە قەرەچوغ سەری هەلکێشابوو لەلایەن کاك کۆسرەت لێدانی پارێزگار هاتە گۆرێ لە بیرمە من و کاك کۆسرەت و شێخ جەعفەر بووین کە ئەو پرسیارە هاتە گۆرێ ماوەیەك بیرم کردەوە ، ترسی ئەوەم لێ نیشت نەوەکو پێشمەرگەکان بکوژرێن چونکە ماوەیەك بوو ئەو نۆکەرە زیاتر لە حەوت

ئوتومبیلی پڕ لە جاش و جەیشی شەعبی و پۆلیس حیمایەیان دەکرد شەهید سەردار لەلامان دانیشتبوو بێ سێ و دوو ووتی من تەقەی لێ دەکەم و سەریش دەکەوین هەر لەوێ ئەو بڕیارە درا کە ئەو کارە ئەنجام بدرێ ، شەهید سەردار سەعید سۆفی نەیدەزانی بە چاکی و ووردی چەکی ئار بی جی بەکار بهێنێ بۆیە بڕیار درا ماوەیەك مەشق بکا لەسەر ئەو چەکە ، بۆ ئەم مەبەستەش گوندی بەردە سپی تەرخان کرا ، ئێوارەی رۆژی ١٩٨٦/٣/١٩ لە نزیك گوندی بیستانە بوین کۆپتەرەکانی رژێم بە توندی لەسەر ناوچەی دەشتی هەولێر و نزیك هەولێر دەسوڕانەوە .

کاربەدەستانی رژێم هەموو ناوچەی دەشتی هەولێرو کۆیە و هەموو ئەو ناوچانەی کوردستانیان قەدەغە کردبوو کە هێزی پێشمەرگەی تیا دەسەلات دار بوو بۆیە نەمانتوانی هیچ دەنگ و باسێك لەو کاتە لە شار وەربگرین چونکە خەلکەکە کە تاریك دادەهات ئەوجا بەهۆی چەکدارەکانی رژێم رێگا دەدران و دەگەڕانەوە ناوچەکە کە جیهازەکەمان کردەوە کاك شێخ جەعفەر لەسەر جیهازەکە ووتی ئەو برادەرانەی کارەکەیان کرد گەڕانەوە لامان زۆرم پێ سەیر بوو چونکە بڕیار نەبوو لە ناکاو ئەو کارە بکرێ دەبوایە لەلای ئێمە بڕۆن ئێوارە ئوتومۆبیلانی ناوچەکە گەڕانەوە هەواڵی لێدانی پارێزگار کەوتە سەر زاران سەردار سەعید سۆفی و هەڤاڵ ئەیوب یوسف و بەختیار جمیل کاوانی لە کاتژمێری هەشتی بەیانی لە کاتێکدا ئەو تاوانبارە لەگەڵ هێزێکی زۆر لە ماڵی خۆی دەرچوو بۆ پارێزگە ( محافظە ) مەردانە تەقەیان لێ کردبوو بریندارایان کرد ، خۆفرۆشەکان لەناو ژن و منداڵی کورد خۆیان بادەدا نەك تەقەیان نەکردبوو بەلکو بۆ رزگار کردنی گیانی خۆیان هەریەکە بە کۆلانێك رایان کردبوو .

لێدانی پارێزگار مەسەلەیەکی مێژوویی گەورەی دروست کرد ترس و لەرزی خستە دڵ و دەروونی کاربەدەستانی رژێم سەر لەنوێی هەموویان بیریان لە چۆنیەتی پاراستنی ژیانی خۆیان دەکردەوە بێ گومان لە وولاتانی دنیای سێیەم ( الدول المتخلفە ) هەمیشە لێپرسراوان و کاربەدەستە گەورەکان لەسەر خوێنی خەلك خویان دەولەمەند دەکەن و خێرو بێری خەلك دەدزن و لەکاتی تەنگانە هەر بیر لە خۆیان دەکەنەوە.

رژێمی زاڵمی بەعس هەمیشە کاری نامەردانە دەکات ، هەمیشە دەیەوێ چاوی خەلك بشکێنێ بۆ ئەوەی وورەی تاقمە دزو جەردەکەی بەرز بکاتەوە بەناهەق چوار خوێندکاری تازە لاوی لەناو شاری هەولێر گوللە باران کرد تەرمە پیرۆزەکانیشیان لە کەس و کاریان شاردنەوە ئەگەر دوژمن بەو تاوانە دەیویست چاوی خەلك بشکێنێ گومان لەوەدا نیە خەلك هەردەم دژی

کاری وا دڕندانەیە ، لەناخەوە ڕق و تووڕەییان بەرامبەر ئەو کارە زۆر تر دەبێت ، کوشتن و بڕین ، زوڵم وزۆرداری ، تالآن و بڕۆ فاکتەرێکی گرنگە بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان زیاتر بەرەنگاری دوژمنانی بێتەوە ، بەعسیەکان و کاسەلێسەکانی بەسەدان تاوانی گەورەیان بەرامبەر گەلانی عێراق کردووە بۆئەوەی کورسی حوکمڕانییان بمێنێتەوە ، بەڵام مێژوو سەلماندویەتی هەموو زاڵم و زۆردارێك دەبیّ بگاتە هەقی خۆی ئەویش زبڵدانی مێژووە .

پارێزگار و نۆکەرە کوردەکان هەر خزمەتی رژێمیان نەدەکرد بەڵکو شەرعیەتیشیان دەدا دەست حکومەت بۆ ئەوەی گەلی کورد قڕچ و بڕ بکات ، رژێمی بەعس هەر بەهۆی کوردە خۆفرۆشەکان رۆڵەکانی گەلی کوردی دەخستە داو لە عەمەلیاتی ئەنفالە بەدناوەکان بەدەیان هەزار خەڵکی بەشەرەفی کوردستان شەهید کران ، رۆڵی سەرەکی جاش و خۆفرۆشان گێڕایان .

ئەو تاوانبارانە لەبارەگای عەدالەتی هەژارانی کورد و لە بارەگای خوای مەزن شەرمەزارن جا رۆژێك لە رۆژان ئەو هەژارانە دەبیّ تۆڵەی رەز و باغ و بێستان و خانوو، مەڕ و مالآت و کچ و کوڕەکانیان لیّ وەربگرنەوە چونکە ناکریّ تاوانباران هەروا وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەربچن و وا بزانن نە با ی هاتووە نە باران ..!!؟

## سەرداری شەهیدان

## سەرداری سەعید سۆفی



٢٢/تەموزی ١٩٨٣ بوو ، کەرتی سێی تیپی (٨٣) ی هەورێ لەگەڵ هەڤاڵ شەهید سەید کەریم بەرێ کەوتین بۆ بناری قەندیل ، ئێران و نەیارانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەیانویست لە کوردستان دەرمان بکەن بە قسەی خۆیان بمانخەنەوە باوەشی حکومەتی بەعس ، لە گوندە بێراوەی دۆڵی بالیسان بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە دەڕۆیشتین کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەربەرز بێت ، سەرژمێری پێشمەرگەمان کرد ، لەپڕ چاوم بەسەردار کەوت کە خۆی ئامادە کردبوو لەگەڵمان بێت ، لەگەڵ دایك و براکانی زۆر هەوڵمان دا کە ئەو سەفەرەمان لەگەڵ نەکات چونکە هێشتا منداڵ بوو تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو ، چەندی کردمان نەگەڕایەوە ، دەستی کرد بە گریان .... نازانم ئەو گریانەی زادەی چ ئەوینێکی ئەم گەل و نیشتمانەی بوو .... بەناچاری داواکەمان پەسەند کرد ، چەکێکی کردە شان ، سەرەڕای منداڵی و تازە لەشار

هاتوویی بە جەربەزەیی خۆی لە دەستی ئەمنەکان رزگاری ببوو ، لە پێشەوەی هەموومان ( دەرەشیی) بڕی ، ڕێگای ساوسێوکە چوار کاتژمێرە تا دەگەییە وەرتێ ، چەند بڵێ ی ڕێگایەکی رەقانە ، کام پێشمەرگە خۆی بەجەربەزە دەزانێ ئەو ڕێگایە شەکەتی دەکرد کەچی کاک سەردار تا شۆڕی کردەوە کوێستانی (مەکێ) کە کوێستانی گوندی وەرتێیە شەکەتی پێوە دیار نەبوو ....کە فرچکی بە مەمکی دایکی گرت من ئەو کوڕەم ئەگیناسی ، بەهۆی خزمایەتی نزیکمان دەیان جار لە ماڵی خۆیان حەفت و هەشتم لەگەڵ کردووە ، بەڵام هەرگیز نەمدەزانی ئەوها مەردوو رەندە ، ئەوها زەبر وەشێنە ، ئەوها دڵسۆزو فریشتەیە . شەوی ١٣\١٤/٨/١٩٨٣ هێرشیان کردە سەر کەلکی بالەییان و کۆنە کۆتر ، پێ بەپێ لەگەڵ شەهید سەید کەریم بەرەو پێش دەڕۆیشت ، گوێی بە گوللە نەدەدا .... ماندوو بوونی نەدەزانی . شەڕی قەندیل درێژەی کێشا زۆر کەس خۆی ڕانەگرت و کۆڵی دا ، کەرتەکەی ئێمە بە ئاستەنگ نانی بە دەست دەگەیشت ، کەچی هەرکسێك بەڵاماندا تێ دەپەڕی کاکە سەردار بانگی دەکرد و نان و پێخۆری خۆی پێ دەدا بەناچاری ئێمەش خواردنی ترمان دەدایەوە سەردار .

کەمین دەرکردن نۆبەت بوو ، کەپێشمەرگەکانم کۆدەکردەوە دەمانگووت ئەمشەو نورەی ئەم ناوانەیە ، ئەگەر ناوی ئەو لەگەڵ نەبوایە دەیگووت (ئەمن یەکەم کەسم بۆ کەمین ) . درەنگی شەو بوو لەگەڵ شەهید ئەحمەد مەولود دانیشتبووین خەمی دنیامان سەراو بن دەکرد .. گرێ ی دڵی خۆمان دەکردەوە، لەسەر لووتکەی سێ کانیان سەیری تروسکەی ئەو تاکە شوانەمان دەکرد کەلە گوندی ( بۆران ) مەرەکانی شەو بەکێو دەکرد ، بلێسەی تەقینەوەی تۆپەکانی دوژمنمان دەژمارد کەلە قەسر و ماکۆسان رایدەوەشاند ، بەوَ چلەی هاوینە سنگی خۆمان دابووە ئاگر و قۆریە رەشمان خستبووە سەر تا چایەکی نیوە شەوانە بخۆینەوەو خەو بەرۆکمان بەریدا ، لەو کەین و بەینە شەهید سەردار هاتەوە لامان دوو کلاشینکۆفی لابووگوتم سەردار ئەو چی یە؟ گوتی پێشمەرگەیەکی ترسنۆك ناوێرێ تەقە بکات ...

چەکم کرد ها فەرموو.. پێ کەنیم و گوتم ئەوە کێیە و گوتی (م) ە. کاك ئەحمەد مەولود زۆر سەری سوڕما کە مێردمنداڵێکی ئەوها ئازایەتیەکەی لەو رادە بەدەرە. لەشەڕی بێتواتە هەمیشە لەگەڵ من بوو ، کەشەوێ دوژمن کلاوی دێوانەی داگیرکرد دەبوایە بەیانی بیگرینەوە ، هێرشمان کرد شەهید سەردار یەکەم کەس بوو بەسەر لووتکەی ئەم کلاوە کەوت.. کە هاوەن لە نێوانی من و ئەوی دا برینداد بووم گەراوە سەرم هاواری کرد .. دەمزانی منی خۆش دەوێ .. کە زانی سەلامەتم بەرەو پێش ڕۆیشت و نەگەڕایەوەدواوەتا سەنگەری هەرە بەرزی لە دوژمن گرت ..بووە مفاوەزات. هەڵسایین تیپی (٨٥) ی بەرانەتیمان پێك هێنا و بوم بە جێگری تیپ ، ئەو

تێکۆشەرەمان هەر لەگەڵ بوو.. بلاوکراوەکانی کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی هەمیشە لەلابوو. دەیخوێندنەوە. دووبارە دەینووسینەوە. نەمدەزانی بۆچی وادەکات...! دەچووینە گوندەکان ئەو نەیدەویست لەناو خەڵك بە چەکەکەی خۆی هەڵبکێشێت . چەکەکەی دائەگینا هەمیشە بۆیاغ و فلچەی لەلابوو دروشمەکانی ئەو قۆناغی کۆمەڵەی ئەنجەدانی دەنووسی.بەگاڵتە پێمان دەگوت ( ناونوس ).رۆژێك بزر بوو سۆراغمان کرد ئەماندۆزیەوە، چوبو لە هەولێر تەقەی لە خۆفرۆشێك کردبوو ، ئەوەکو مەحاسەبەی بکەین گوایە مفاوەزاتە نابێ شەڕ لەگەڵ کەس بکرێ یەکسەر رۆیشتبووبۆ دۆڵی خانەقا . لەوێ پاش پرسیارو وەڵام گوتبوی دەچمە ئێران... کاك قادر خەبات شەقێکی لێدا بوو بەڵام کە زانیبووی خزمی ئێمەیە بروسکەی بۆ کردم ...چەند رۆژێك لەوێ ماوە و دوایی هاتەوە لامان ..شەڕ دەستی پێکردەوەچالاکی پێشمەرگانە گەرم بوو.. جێگا پەنجە و دەستی کاك سەردار زۆر بە ئاشکرا بوو .. لام وایە یەکەمین مەفرەزەی ناوشاری لەگەڵ شەهید شێرزاد جەلال کرد کە توانیان لە نزیك ئۆردووی هەولێرلێپرسراوێکی جەیشی شەعبی بکوژن وە سەیارەکەش بهێنن، پاش ئەو چالاکیە گەڕانەوە لای ئێمە ، ئەو کات جێگری تیپی (٨٦) ی دەشتی هەولێر بووم ، شەوێك بێ پرسی ئێمە ئەو و شەهید شێرزاد و کاکامەند مەنتك دەچن بۆ گوندی کونە گورگ و دارەتوولەوێ شایی دەبێ ئەوانیش دەیانەوێ سیاسەت و قەناعەتەکانی کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە گەنجەکان رابگەیەنن..ناوەخت هاتنەوە... زۆر عاجز بووم چونکە دەمزانی لە دەست دانی ئەو تێکۆشەرانە چەند زیان بە گەلەکەمان دەگەیەنێ .. لە گوندەی رەسوڵ بسکۆل عاجزم کرد هیچ وەڵامی نەدامەوە .. هەر ئەو شەوە لەناکاو لێمان بزر بوو جێ نەما لە دوای نەگەڕێین ، تا رۆژهەڵات بە چەند قۆڵ بەدوایدا دەگەڕاین تومەز تورە ببوو هەر بەو شەوە لێی دابوو بۆ ناوچەی مرکیە لە نزیك دەواجنەکانی قوشتەپەلە ماڵی کاك محمد کە زاوای شێرۆ بوو دەگیرسێتەوە ، دیارە نیوە شەوێکی درەنگ دەگاتە دەواجنەکە سەیر دەکات ماڵەکە نووستوون ...پێی ئەستەم دەبێ ئەو خێزانە لەخەو بکات بۆیە لە قوژبنێکی دەواجنەکە دەخەوێ ، کە بەیانی کاك محمد دێتە دەرەوە سەردار دەبینێ ، زۆر گلەیی لێدەکات کە چۆن بەخەبەری نەهێنایە ئەویش دێتە وەڵام و دەڵێ لام شەرم بوو چونکە ئافرەت لەوێ خەوتبوون .. بەڵێ کاکە سەردار نموونەی پێشمەرگەی بەوەفاو دەست و داوێن پاك بوو.، هەمیشە خۆی خزمەتی خۆی دەکرد ئەگەر لە ماڵێك نانی بخواردایە ... لێرەدا ناتوانم باسی گشت سیفاتە کەم وێنەکانی سەردارتان بۆ بکەم تەنیا باسی ئەو سیفاتانە دەکەم کەلەم یاداشتە جێیان دەبێتەوە ..سیفاتێکی گرنگی سەردار هەبوونی گیانی یاخی بوون بوو..لام وایە سیفاتێکی زۆر گرنگی ژیانی ئینسانە ..سەردار

قەناعەتی وابوو شۆڕش و گۆڕانکاری و ڕووداوەکان بەبێ گیانی یاخی بوون مەحاڵە ، بەڵام دیارە یاخی بوونیش نابێ لە چوار چێوەی قەناعەتەکانی مرۆڤی یاخی بوو بەدەربێ .. قەناعەتەکانی سەردار جڵەوی یاخی بوون و سەرکێشی ئەویان دەگرت و نەیاندەهێشت ئاقاری بەرەڵایی بپێوێ .. بۆیە بوو بەو سەردارەی قارەمانی شارو شاخ ... بە هەڵۆی داستان ... بەرابەری هەڵگرانی دروشمی ( فاشست بکوژە تا گەل بژی ، عەفلەق بکوژە تا کورد بژی ) بناسرێ .

لە شوباتی ١٩٨٦ لە گوندی سەرمزرا لەگەڵ کاک کۆسرەت و برادەران دانیشتبووین ... کۆپتەرەکانی ڕژێم لە ناوچەکە دەسوڕانەوە دەمانزانی شتێك ڕووی داوە لە پڕ کاکە سەردار و شێرزاد جەلال هاتنەوە جانتایەکی دبلوماسیان پێ بوو کە تەسلیمی ئێمەیان کرد نەشکابوو کە سەیرمان کرد پارە و مستەمسەکاتی دوو ئەفسەرە گەورەکەی ڕژێمی تێدا بوو ، بۆیان گێڕاینەوەو سەردار ووتی : ( ئەو دوو ئەفسەرەمان لەبەر دەرگای فەیلەقی پێنج لەسەر جادەی موسل بەدیل گرت سەرەتا ڕێزمان زۆر گرتن تا گەیشتینە جادەی کەرکوك – هەولێر لەسەر جادە گشتی یەکە پێش عەسر شێرۆ سەیارەکەی لێ دەخوڕی و من و دوو زابتەکەش دانیشتبووین لە پڕ هەر ئەفسەرێك بەرەنگاری یەکێکمان بوون و دەیانویست چەکەکانمان لێ بستێنن و بمان کوژن و خۆیان دەرباز بکەن بە هەزار ناری عەلی خۆمان دەرباز کرد لەو شەڕە شەق و گوللەیە هەردوو ئەفسەرەکەشمان کوشت و بەو جۆرە ڕزگارمان بوو )

شایانی باسە ئەو ڕووداوە چەند مەترێك لە نزیك ڕەبییەکانەوە ڕووی دابوو ... زستانی هەمان ساڵ بوو لە گوندی بۆریچە هەڤاڵ کۆسرەت پیلانی لێدانی مەحافزی هەولێری دائەگینا ، سەردار دانیشتبوو کە ئەوەی بیست هەڵساوە سەر پێ و گوتی ( ئەگەر ئێوە ڕێگەم بدەن هەر ئێستا دەچم بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە زۆریش ئاسان و ئاسایی یە ) ... بڕیار وابوو هەرسێکیان کاکە سەردارو ئەیوب و بەختیار لەسەر بەکارهێنانی B.K.C مەشق بکەن بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە . چونکە سەردار نیشانەی زۆر ڕاست نەبوو زۆر جار بە پێکەنینەوە پێم دوگوت بە خوای موحافیز لەسەر جادە بۆت ڕادەوەستێ ئارییجیەکەی تۆی پێناکەوێ ... ئەویش دەستی دەکرد بە پێکەنین و دەیگوت هەر لێی دەدەم .. ڕۆژێك ئارییجیەکەی ئێمەیان بردبوو بێ پرس ڕۆیشتبوون لەناو هەولێر لەسەر جادەی شەقلاوە نزیك نەخۆشخانەی (سیل) لە پیکابێکی جەیشی شەعبیان دابوو کەل و کرۆمیان کردبوو لەسەرجەمی (١٣) سەرنشین تاقە کەسێکیان گیانی دەرباز نەبوو . لە بیرمە پەنجەی گەورەی شەهید سەردار بەهۆی تەقینی ئارییجیەکەی خۆیان بریندار ببوو... لەکاتی گەڕانەوەیان بۆلای هاوڕێکانیان کاك قارەمان شینە و دکتۆر مەزن پەنجەکەیان تیمار کرد و دواتر گەڕانەوە لای کاك کۆسرەت ، ڕۆژێك کۆپتەرەکانی ڕژێم لە ئاسمانی

دەوروبەری هەولێر دەسوڕانەوە و هاتنە سەر ئێمە ، کە خەڵکی لادێیەکان لەشار گەڕانەوە ووتیان دەڵێن ئەمڕۆ لە مەحافیزی هەولێریان داوە لەهەمان کاتیش بروسکەمان بۆ کرا لە مەڵبەند لەو بارەیەوە ..

سەرم سوڕما چۆن بەم شێوەیە ئەنجام دراوە ، ئێستاش .. کاک شێخ جەعفەر جار جار دەگێڕێتەوە ... ئەو سێ تێکۆشەرە شەهید سەردار و کاک ئەیوب و کاک بەختیار لە کاتژمێر (٨/١٥ ) هەشت و پانزە دەقیقە ، سەرەڕای زۆری چەکاوخۆری دوژمن کە پێک هاتبوون لە یازدە ئوتومبیلی پڕ لە چەکدار بۆ پارێزگاری کردن لە ئیبراهیم زەنگەنە.

شێرانە.... هەڵۆیانە ......دلێرانە .....لەخۆبردوانە.... چاونەترسانە ڕوو بە ڕوو تەقەیان لەو خۆفرۆشە کرد ... بەناستەنگ لە پەلاماری ئەم شێرانە رزگاری ببوو ، لێدانی مەحافیزی هەولێر ترس و لەرزی زۆری خستە دڵی هەموو دوژمنان و ئەلقە لە گوێکانیان .... لەکاتی گەڕانەوەیان بە رێگای هەنارە لە نزیك بە ستۆرە وێنەی خۆیان گرتبوو زۆر جار کاکە سەردار دەیگوت تەماشا ئەو وێنەیەم لە رێگا گرت کە لە لێدانی مەحافیز دەگەڕاینەوە . شەهیدە سەردار بەحەق تێکۆشەرێکی سیاسی و پێشمەرگە بوو ، بڕوای تەواوی بە چینی ئاستەنگکێشانی میللەتەکەی هەبوو ، هەمیشە خۆی پەروەردە دەکرد .. دەیخوێندەوە ..دەینووسی .. دەیپرسی .. دەیزانی عەیب نی یە کە پرسیار لە شتێك بکرێ کە نازاندرێ .ز پارە ویست نەبوو ، ئەو پارەیەی کە وەری دەگرت زۆر جار بەسەر پێشمەرگە خاوەن خێزانەکانی دابەش دەکرد ... وەبیرم نایەت جارێك بێ رێزی بە خەڵك کردبێ دژی ئەو کەسانە بوو کە خەڵکیان ئەزیەت دەدا . بەهەق شۆڕشگێڕێکی مرۆڤ دۆست بوو خەڵکی ناوچەکە بە گشتی و منداڵان بە تایبەتی زۆر خۆشیان دەویست کە دەچووینە گوندەکان یەکەم جار منداڵان بەرەو پیرمان دەهاتن دەیانگوت سەردارتان لەگەڵدایە .

سەردار سەعید سۆفی سەرچاوەیەکی گرنگ بوو بۆ دابین کردنی یارمەتی بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە گشتی و مەڵبەندی سێ و چوار بەتایبەتی دەوڵەمەندەکانی کوردستان مەگەر بە دەگمەن ئەگینا کەسیان بەکەیف و ماشای خۆیان یا لەبەر دڵسۆزیان یارمەتی شۆڕشیان نەداوە بە پارە ناچار شۆڕش بڕیاری دا دەوڵەمەندەکان بگرێ... شەهید سەردار نەك هەر ئەوەندە ، کە باسم کردوە بەڵکو دەیان چالاکی دلێرانەی تری ناو شاری ئەنجامداوە کە پێویستی نەکرد بیانووسم ، زیاتر لە هەشتا چالاکی فەردی و دەستەیی هەبوو بێجگە لە بەشداری کردن لە چالاکییە تێکڕاییەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان .

شەهید سەردار بە هەق شایستەی ئەوەیە کە ببێتە ڕەمزی شەهیدانی شاری هەولێر چونکە کەم کوچەو شەقام و گۆڕەپان و فلکە و سەرسوچ و رێگا ماوە سەردار چالاکی سیاسی و

پێشمەرگانەی تێدا ئەنجام نەدابێ بە سەدان نۆکەرو ئەلقە لەگوێی رژێمی تەمبێ کردوە،چەندین پێشمەرگەی لە چالاکی ناو شارەکان شارەزا کردوە لە قەراج و کەندیناوە ، مرکیە ، شەمامك ، بەرانەتی ، دیدەوان ، خۆشتاوەتی ، ناو هەولێر ، جێگای دەستی ئەو تێکۆشەرە.. کردارو رەفتارەکانی ئەو تێکۆشەرە مایەی شانازی هەموو گەلەکەمانە . حەیف ئەو شۆرشگێرە . ئەو قارەمانە لە رۆژی ١٩٨٧/٦/٣٠ لە کاتێکدا دوژمن لەسەر چیای کێشکە سەنگەری گرتبووهەروەشەی دەکرد ناوچەکە بخاتە ژێر کۆنترۆلی خۆی .. کاکە سەردار لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك هێرشی کردە سەر سەنگەرەکانی دوژمن و لە ئاکامی شەرێکی قورس شەهید کراو گیانی پاکی گەیشتە کاروانی لە پسان نەهاتووی گەلەکەمان و دڵی گەورەی لە لێدان کەوت . . یەکجاری ماڵئاوایی لە خاك و گەل و کەس و کارو هاورێیانی کرد .. بەشەهید بوونی گەلی کورد و یەکێتی نیشتمانی کوردستان زیانێکی گەورەی لێکەوت .. کە ئەو هەواڵە بە من گەیشت لە گوندی قەمبەر بووم یەکسەر بروسکەم بۆ باوکی شەهید کرد کە ئەمەش دەقەکەیە :

( بەداخ و پەژارەیەکی یەکجار زۆرەوە هەواڵی شەهید بوونی برا و ئازیزی هەموومان .. قارەمانی گەلەکەمان کاکە سەرداری خۆشەویستم پێ گەیشت ..... بەراستی شەهید سەردار سەرداری شەهیدانە .. نازانم چۆن وەسفی خۆمت بۆ بکەم سەبارەت بە روودانی ئەم کارەساتە .. دەزانم چەند غەمبارو پەرێشانن بەڵام شەهید سەردار لە مێژووی گەلەکەمان لاپەرەیەکی زێرینی بۆ خۆی گرتووە کە میللەتەکەمان تا هەتایە شانازی پێوە دەکات .

رێگای تێکۆشەران و دڵسۆزان لەوە بەدەر نی یە ... کارەساتی شەهید بوونی سەردار رووداوێکی کت و پڕ و رێکەوتانە نەبوو بەڵکو پێشهاتێکی چاوەڕوانکراووەك خۆی گوتەنی پێویستیش بوو. بۆیە سەردار هەمیشە دەیگوتەوە (( ئەگەر ئێمە نەبینە تەزحییەی رووداوەکان ئەوا رووداوەکان دەبنە تەزحیەی ئێمە ( خوای گەورە سەبووری هەموومان بدات ... وا بەرێ کەوتم بۆ لاتان ......) .

پاش چەند ساڵ تێ پەرین بەسەر شەهید بوونی کاکە سەردار دەبێ ئەو راستیە ساغ بێتەوە کە خوێنی گەشی سەردار ئاساکان بوو تاریکی رووناك کردەوە ، خوێناوی ئەوان هاندەر دەبێت بۆ ئازادکردنی کەندیناوەی خۆشەویست جێ راوگەی کاکە سەردارو شەهیدانی تری کوردستان....

ئەمرو سەربەرزی بۆ شەهید سەردار و سەرجەم شەهیدانی تری گەل و نیشتمان، هەر شەکاوە بێت ئاڵای رزگاری هەموو کوردستان .

# دوو هێرش بۆ ناو شاری هەولێر

چالاکی هێزی پێشمەرگە لەناو شارەکانی کوردستان گرنگی تایبەتی خۆی هەیە چونکە دوژمن لەناو شارەکان خۆی بە بەهێز دەزانی ، زۆربەی خەلکی کوردشتان لەشارو شارۆچکە و ئۆردوگاکان دەژی ، دوژمن لەناو شارەکان پروپاگەندە دەکات گوایە پێشمەرگە ناتوانێ خۆی لە قەرەی هێزەکانی بدات ، هەندێك لە خەلکی شارەکان لەبەر ژیانی خۆیان و دەولەمەند بوونیان زۆر بیر لە کێشەی گەلەکەیان ناکەنەوە نۆکەرو کاربەدەستانی رژێم شارەکان بە شوێنێکی قایم دەزانن ، پێیان وایە دەستی شۆرش نایانگاتێ بۆیە چالاکی پێشمەرگانە لەناو شارەکان کارێکی زۆر پێویستە ، لەسەرەتایی دەست پێکردنەوەی شۆرشی نوێی گەلەکەمان لەناو شاری سلێمانی چەندین چالاکی پێشمەرگانە ئەنجام درا چەندین نۆکەرو کاسەلێس و بۆرە پیاوی رژێم کوژران تێن و تەوژمی زۆری بە خەلکی سلێمانی دا هەر بۆیەش تا ماوەیەك شۆرش لەناوچەی سلێمانی زۆر بەهێز بوو هەر بەراستی سلێمانی ببووە قەلای شۆرش و شۆرشگێران ، پاش شکانی هێزی پێشمەرگە لە ناوچەی سماقولی لە ١٩٨٦/١/٦ دوژمن زۆر پروپاگەندەی ژەهراوی لەناو شارەکان بلاو کردەوە گوایە هێزی پێشمەرگەی لە ناوچەکە دوور خستۆتەوە زەبری کاریگەری لێ وەشاندوە هەر بۆیە چالاکی لەناو جەرگەی شاری هەولێر چێژو تامی تایبەتی خۆی هەیە ، راستە مەفرەزەکانی پێشمەرگە چەند چالاکی یەکی گرنگیان لەناو شار ئەنجام دا ترس و لەرزی زۆریان خستە دلڕ و دەروونی دوژمنان بەلام هێشتا برێ خەلك و شۆرشگێران نەدەشکا هەر بۆیە هەردوو تیپە تێکۆشەرەکەی دەشتی دزەییایەتی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر ، ت٨٧ ی قەرەچوغ دوو هێرشی گەورەیان بردە ناو شاری هەولێر بەم شێوەیەی خوارەوە :

١- لە کۆتایی مانگی ئازاری ١٩٨٦ هێزێکی ت٨٧ ی قەرەچوغ بە فەرماندەی کاك سەفین بە هاری کاری شەهیدان دەشتی حەمەد عەلی و شەهید رەنجە کەمینێکی قایمیان بۆ دوو سەیارەی پڕ لە ئەمن لەنای شاری هەولێر ( گەرەکی روناکی ) داناوە ئەو دوو ئوتومبیلە کەوتنە کەمینی پێشمەرگەکان بە دەست رێژێك هەموو سیخورەکان قرچ و برِ کران بە سزای خۆیان گەیشتن بەبێ ئەوەی هیچ بەرگریەك بکەن شایانی وەبیر هێنانەوەیە ( ئەمن وخۆفرۆشان هەمیشە لەناو شارەکان چاو لە هەژاران زەق دەکەنەوە کە کەوتنە تەنگانە بەرگریان لە خۆشیان پێ ناکرێ)

لەو چالاکی یە پڕ واتایە چواردە ئەمن کوژران کە دوو زابت لەناو کوژراوەکان دابوو ، دەسکەوت (١١) یازدە کلاشینکۆف ، دوو رەشاشی بی کەی سی ، دوو دەمانچە ، دوو جیهازی

هوکی تـوکی ، سـووتانی هـەردوو ئوتومبیلەکـەش ئـەو چـالاکی‌یە سـەدایەکی گـەورەی دایـەوە خەڵکی شاری هەولێر بۆیان ئاشکرا بوو کە پێشمەرگە تاکە پشتیوانی راستەقینەی خەڵکە .

٢- هاوزەمان لەگەڵ دانانەوەی کەمین لەگەرەکی رووناکی لە هـەولێر لەلایـەن پێشـمەرگە ئـازاو جەسوورەکانی ت ٨٧ ی قەرەچوغ هێزێکی تری ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بە فەرماندەی رێباز و هاریکاری هەڤالان فاروق عـەلی مـەولود و کـاك شـوان و نـوری قـادر باریکـە و سـەلاح شـینە هێرشیان کردە سەر ماڵە جاشەکان لەگەڕەکی بـاداوە لـەناو شـاری هـەولێر پـاش شـەڕێکی دوو کاتژمێری ، پاش ئەوەی زەبری کوشندە لە جاشەکان درا بەدیل و دەسکەوتەوە ئەو هێزەش لەشار دەرچوو.

(١٥) کلاشینکۆف یەك تەکاریۆف دەسکەوتی پێشمەرگەکان بـوو لـەو شـەڕە ڕوو بـە ڕووە یـەك پێشمەرگەی قارەمان شەهید بوو ،یـەك مـەسـەلە هەیـە حـەزم کـرد لێـرە بـۆ ئێـوەی ئـازیز شـی بکەمەوە :

خەڵکی کوردستان بە هۆی جۆراو جۆر هەندێکیان چەکی جاشـەتیان هەڵگرتبووهەنـدێك بـۆ رزگار بوونیان لە خزمەتی سەربازی لەلایەن موستەشارەکان (عدم التعرچ ) یان وەرگرتبـوو زۆربەیان بەپارە لە مستەشارەکانیان دەکڕی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و شۆڕش بـە گـوێرەی هەلس و کەوت و کردەوەکانی خۆیان مامەڵەی لەگەڵ جاشەکان دەکرد نەدەکرا و نـاکرێ بەیـەك چاو سەیری جاشەکان بکرێ ، لەباداوان دوو کەس بەدیل گیران وەرەقەی جاشەتیان لابوو لەکاتی گەڕانەوەمان لە نێوان گەڕە سۆرو باداوان پێشمەرگەکانمان کۆ کردەوە و سـەرژمێرمان کـردن لـە ئەنجام پێشمەرگەیەکی کەرتی یەك کە سەلاح شینە فەرماندەیان بوو دیـار نـەبوو زۆر تـوڕە بـووم قسەم کرد بەناچاری سەلاح شینە دوو بارە گەڕایەوە ناو شار کە هاتەوە تەرمی شـەهیدی هێنـاوە سەلاح شینە راستە لە ساڵی ١٩٨١ لـە ریـزی پێشـمەرگە دابـوو بـەڵام بـەبێ ئـەوەی هەسـت بـە لێپرسراوەتی بکات فەرمانی بە پێشمەرگەکانی کەرتی خۆی دابوو کە ئەو دوو دیلە بکـوژن کـە ئاگاداریان کردمەوە یەکسەر چوومە لایـان زۆر قسـەم پـێ گـوت وەخـت بـوو شـەڕ لـە نێوانمـان دروست بێ هەرچەند بەڵێنی دا کـە نـەیان کـوژێ کەچـی پـاش ڕۆیشـتنی ئێمـە ئـەو دوو کـوڕە کوردەی کە تازە تەمەنیان لە وەرزی بەهار بوو بە گوللەی ناهەق کوشتنی ، کە ئەو خەبەرەم پـێ گەیشت زۆر دڵگیر بووم و ووتم ( دەبێ ئینسان ئەوەندە بێ قیمـەت بـێ لەسـەر شـتێکی وا کـەم بکوژرێ و ماڵ و منـاڵەکەی سەرگەردان بێ و خێزانەکەی بە ڕوو سوری بگەڕێتەوە ماڵی باوکی) خۆم بە شـەرمەزار دەزانـی چۆن لێپرسـراوی تـاقمی وا جـەردە و ڕێگـر دەبم ....!!؟ بـەڵی دەیـان تاوانی وا کراوە بەڵام داخی گرانم نەمدەتوانی ئەو جۆرە کەسـانەی لـە ریـزی خۆمـان وەدەر بنێم

زەمان رووی هەموو ئەو جۆرە کەسانەی رەش کردوو رەشیش دەکات کە بەو کارە نامرۆڤانە هەڵدەستن ، دەمەوێ زیاتر لەسەر ئەو مەسەلەیە بدوێم زەمان هات و رۆیشت دوژمن لە ساڵی ١٩٨٨پشتی شۆڕشی شکاند ، ئەو جۆرە کەسانە خۆیان لەبەر تەنگانە رانەگرت ئەو ئەوجا بۆ ئەوەی دوژمن بیانبورێ بە خۆشماندا هاتنەوە هەر بەو دەستورە دەیان پێشمەرگەی کە لەگەڵ خۆشیا بوو شەهیدیان کردچەند ساڵی بەسەردا رۆیشت لە بەهاری ساڵی ١٩٩٣ لە ئۆردوگای کەسنەزان لە ماڵێك میوان بووم زۆر رێزیان گرتم لە بەرامبەرم وێنەی کورێکی لاوی زۆر جوان هەڵواسرابوو پرسیارم لە خاوەن ماڵەکە کرد کە بزانم ئەو کوڕە کێیە ،ئافرەتێك بە دەنگێکی پڕ لە گریان ووتی ( ئەوە پیاوی من بوو باوکی مناڵەکانە ئێوە کوشتتان ) واقم وورما لە قسەی ئەو ئافرەتە سەرسام بووم کە بۆیان گێڕامەوە هەمان شەوم وەبیر هاتەوە کە نزیك باداوان ئەو کوڕەو کورێکی تری کورد لەسەر یەك پسوولەی ( عدم التعرج) کە بەپارە کڕیبوویان کوژران ..

پاش چەند رۆژێك لە نیسانی ١٩٨٦ دیسان بە دوو قۆڵ چووینەوە ناو شاری هەولێر بۆ گەرەکەکانی ماجیداوە و لەتیفاوە هەردوو ت ٨٦ و ت٨٧ ئەو جارە هەڤاڵ مام غەفور سەرپەرشتی قۆڵی ماجیداوەی کرد ئەو هێرشانە بۆ تەمبێ کردنی جاشەکان بوو ، بۆئەوەی چەکەکانیان تەسلیم بە حکومەت بکەنەوە (٩) نۆ کلاشینکۆفمان دەسکەوت .

شەڕ لەناو شارەکان گرنگی لەوەدا نیە چەند کەس دەکوژرێ ، چەند پارچە چەك دەسکەوت دەبێ ، بەڵکو گرنگی لەوەدایە چەند کەس هەست بە بوونی پێشمەرگە دەکات دوژمن چەند دەترسێ ، چەند دوژمن لە پێش چاوی هەژاران و دڵسۆزانی گەل مەلوول دەبێ بۆیە دەبێ فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و فەرماندەی ناوچەکان پیلانی ئەوە دابنێن کە چۆن لەناو جەرگەی دوژمن چالاکی ئەنجام بدرێ بۆئەوەی دوژمن لە سێبەری خۆشی بترسێ ، بۆئەوەی بزانێ تاوانەکانی هەروا بە ئاسانی تێ ناپەڕێ بۆئەوەی میللەتەکەمان هەست بە پاڵپشتێکی بە هێز بکات بۆئەوەی قەیسەری لە دوژمن بکرێتە کونە مشك .

فەرامۆش کردنی ئەو ئەرکە کارێکی خراپ دەکاتە سەر ورەو ژاتی جەماوەری گەل لەناو شارەکان شۆڕشی نوێی ی کوردستان زیرەکانە ئەو ئەرکەی جێ بەجێ کرد هەر لەسەرەتای دەست پێکردنی شۆڕش تا ئیستاش ئەو جۆرە چالاکیانە لەناو شارەکانی کوردستان دژی دوژمنانی کورد بەردەوامە و بەردەوامیش دەبێ .

# شەڕێکی ناهەق

شەڕی ناهەق ، شەڕی براکوژی ، شەڕی خوێن ڕژان بە فیڕۆ ، شەڕی ماڵ وێرانی ، شەڕی بێ ئامانج تا ئەو کاتەش لە کوردستان هەر بەردەوام بوو ، تائەو کاتەش هەندێ خەڵکی نەزان و نەفام لەسەر خوێنی هاوسەنگەری شینگی لەناو خەڵك دەردەپەڕاند خۆی بە ئازا دەهاتە پێش چاو شەڕی براکوژی لە کوردستان بە خوێنی دە ڕۆڵەی کورد پەروەر کۆتایی پێ هات لە حوزەیرانی ١٩٨٦ چەند مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان ئاگادار کرانەوە کە ناوچەکە بەجێ بهێڵن، بە بیانوی ئەوەی کە تاکو ئیستا ڕێکەوتن مۆر نەکراوە ، دیارە هێزەکانی پارتی و شیوعیش خۆیان بە خەڵکی کوردستان دەزانی بۆیە هیچ گرنگیان بەو ئاگاداریەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان نەدا

بۆئەو مەبەستە واتە دەرپەڕاندنی هێزەکانی پارتی و شیوعی هێزێکی یەکێتی بە فەرماندەی شەهید جەلیل ( ڕەنجبەر ) و سەلاح شینە چوونە بناری قەرەچوغ بە دیوی کەندیناوە لە گوندەکانی ( دێمەکار ، خدر جیجە ، چەغە میرە ) تووشی ئەو هێزە بوون پاش شەڕێکی گران حەوت پێشمەرگەی پارتی و شیوعی شەهید کران تەرمی ئەو کوڕە پێشمەرگانە بۆ دایك و باوکە هەژارەکانیان چوونەوە ئەوەی جێگای سەرنجە لە مێژ ساڵە حکومەتی عێراق بەشێك لە گوندەکانی کەندیناوەی بە عەرەب کردەوە ( جاستان ، دەربەندی گۆم ، سەربەشاخ ، قوچ ، پەلکانە ، سارەلو ، قپری عەلی ، شەناغا ، چەرت ، جیسمە ، تەلهەلالە ، گەزوەشان ).

جگە لە بەعەرەب کردنی ئەو گوندانە چەندین گوندی تریشی چۆل کردوە وە عەشیرەتی ( سیانی ) لەسەر خاکی باو و باپیری هەڵکەندوە لە جیاتی ئەوەی ئەو پێشمەرگانە بە هاوکاری یەکتر ، شان بە شانی یەك زەبر لە عەرەبان بدەن ئەوا لەپێش چاوی ئەو عەرەبە داگیرکەرانە کەوتبوونە گیانی یەکتر ، دەتوانم بڵێم ئەو شەڕە دوا شەڕی براکوژی بوو لە کوردستان .

بەو هیوایەم دەرس و پەند وەرگیرابێ ، برینەکانیش بەتەواوی سارێژ بێت جارێکی تریش کورد ئەو جۆرە شەڕانە نەبینێتەوە ، حزب و ڕێکخراوەکان ڕێگای سیاسی و دبلۆماسی و وتووێژ بگرنە بەر بۆ چارەسەر کردنی گیرو گرفتەکانی نێوان خۆیان ، ئێمە شەڕمان دەکرد (( کەویش بە چیاوە ))

# پەیوەندی لەگەڵ ئێران

ئێران زیاتر لە (١٥٠) سەدوپەنجا هەزارکم٢ لە خاکی کوردستانی رۆژهەڵاتی داگیرکردوە مافی حەوت ملیۆن کوردی زەوت کردوە .

حەرام کراوە منالّی کورد بە زمانی زگماکی خۆی لە قوتابخانە بخوێنێ خێرو بێری کوردستان بە تالان دەبەن ، بە ئاگر و ئاسن گەلی کورد و شۆڕشەکەی دەسووتێنن ، هەزاران لە رۆڵە بەشەرەفەکانی دەکوژن و کوشتوە ، بەسەدان هەزار پاسدارو ئەرتەشی لەسەر شاخەکانی کوردستانی ئەودیو قایم کردوە ، کاری بێ ئەخلاقی دەرهەق خەڵکی بەشەرەفی کوردستان دەکەن هەرچی خراپە وا بەکوردی دەکەن ، کەواتە ئێران یەکێکە لەو دوژمنە هەرە گەورەو سامناک و درندەکانی گەلی کورد لەپاڵ عێراق و تورکیا و سوریا لەزەمانی ( سەفەویەکانەوە ) تا ئیستا بەدەیان جار چاو بەستەکیان بەکورد کردوە ، بەڵێنیان داوە و درۆیان لەگەڵ کردوین هەر ئەو رەچەلەکەی سمکۆی شکاك و هەمزە ئاغای مەنگوڕ و قازی مەحەمەدیان لە پەنا دۆستی و دەعوەتەوە شەهید کرد ، هەر ئەوەی ئەوانن بەهەمان شێوە بەهەمان دەستور تێکۆشەری ناوداری کورد ( د. عبدالرحمن قاسملو ) یان لە ڤییەننا شەهید کرد پاش چەند ساڵ لە ئەڵمانیا تێکۆشەر و رابەری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ( صادق شەرەف کەند ) یان شەهید کرد کاربەدەستانی ئەمرۆی ئێران هەر وەکو شای ئێران بەرامبەر بە کورد هەمان جل و بەرگ و کراسیان پۆشیوە تەنها ( بۆینباغەکەی ملیان ) گۆڕاوە .

جاران لە پەنا ئیمبراتۆریەتی فارسی چاوی کوری ( خانی ئەحمەدی خانی ) یان دەرهێناو دەیانکردە ( کەللا شوشە ) ئیستا لەپەنا ئیسلامەتی میللەتی هەژاری بێ کەس و بێ پشتیوانی کورد دەچەوسێنەوە ، ئەگەر بیانەوێ یەکێك ژێر دەست بکەن یا بیکوژن هەمیشە رێگای دۆستایەتی دەگرنە بەر تا فرسەتی باشیان لێ هەڵکەوێ راستە ئیسلامن بەڵام پێش ئەوەی ئیسلام بن شیعەن پێش ئەوەی شیعە بن فارسن ، کورد نەفارسە و نەشیعەیە ، ئیسلامی (سوننی ) مەزهەبە بۆیە خۆیان دووجار بە دوژمنی کورد دەزانن هەم وەکو نەتەوە هەم وەکو مەزهەب ، ئەگەر لەزەمانی شا هەندێ کاربەدەستی دزیان دەکرد و لەسەر خوێنی میللەت دەژیان ئەوا ئیستا لە ئێران لەکاربەدەستی بچووك تا هەرە سەرەوە لەسەر حسابی خەڵك خۆیان

دەوڵەمەند کردوو وەکو خۆمان دەزانین ئەوانیش بە ڕێگای ناشەرعی خۆیان کردە خاوەنی قەسرو سەیارە میللەتیشیان فرێ داوە ...!؟

ئەوەندە لە حوکمڕانی نە شارەزا و دەست پیسن بۆیە ئەو ئێرانە دەوڵەمەندە ئابووری وا تەپیوە ژێرخانی بەرەو خوار تر دەڕوات .

مێژووی پەیوەندی شۆڕشەکانی کوردستانی خواروو ( عێراق) لەگەڵ ئێرانیەکان مێژوویەکی دوورو درێژە ، بەدرێژایی ژیانی کورد ئێرانیەکان هەر لە پشتەوە خەنجەریان لە میللەتی ئێمە داوە .

تاقی کردنەوەکانی دوورو نزیك ئەو راستیە دەسەلێنن کەچی ئەوەی جێگای پرسیارە بۆچی شۆڕش و سەرانی میللەتی کورد حەز دەکەن پەیوەندی لەگەڵ ئەو جۆرە دوژمنە زەبر وەشێنە ببەستن .

ئایا هیچ جار ئەو پەیوەندیە بە قازانجی گەلی کورد گەڕایەوەتەوە .

پێم وایە ئەو دوژمنانەی میللەتی کورد هەرگیز بەتەنیا ناتوانن شکست بە میللەتی ئێمە بگەیەنن ئەگەر لە نێو خۆیان ڕێك نەکەون ، ڕێکەوتنی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ و تێك شکانی کۆماری مەهاباد و لێدانی بزووتنەوەی بارزان شاهێدی قسەکانە.

ئەگەر نزیك تر سەیر بکەین مەترسی کورد حاڵی حازر لە پشتەوەیە نەك بەرامبەر رژێمی عێراق ، چونکە پیلان گێران خەنجەریان هەڵکێشاوە لە هەلێك دەگەڕێن بیوەشێنن ، بەهەر حاڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەپێچەوانەی ئارەزووی ئێران شۆڕشی هەڵگیرساند ، بەچەند پارچە چەکێکی کۆنی شاردراوەی شۆڕشی ئەیلول دژی رژێمی عێراق و ئێران و تورکیا وەستا ، چەند مەفرەزەیەك لە چیاو چۆڵەکانی کوردستان بلاّوبونەوە بە نانی ڕەقی جووتیارە خۆشەویستەکان ، بەیارمەتی دڵسۆزانی گەلەکەمان ڕۆژانی دژواری بڕی ، یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە ئازایی و چاونەترسی و دلێری پێشمەرگەکانی شەوی تاریکی شەق دەکرد هێزەکانی عێراق ، ئێران ، تورکیا دەنگ و باسیان لەسەر ئەو چەند پێشمەرگە قارەمانانە دەگۆڕیەوە کورد دەیویست سەربەست بژی ئێران و دوژمنان دەیانویست دیل و ژێر دەست بێت. بێ پارە و پول بێ فیشەك و جبەخانە شۆڕش دەستی پێکرد و بلێسەی بەرزو بەرزتر دەبوو .

سەربەرز بووین چونکە دۆستی هیچ دوژمنێکی خۆمان نەبووین ، دەمانگوت با لە برسان بمرین ، با بکوژرێین ، با لەسەرمای زستان ڕەق بینەوە ، بەڵام دوژمن دەست لە کارو بارمان نەدا با دوژمنان بزانن کورد رۆڵەی جەسوورو فیداکاری هەیە کوردیش بە خوێنی کوڕەکانی

دەبێ بچێتە ریزی گەلانی جیهان ئەوها شۆڕش دەستی پێکردەوە دوژمنان وەخت بوو لەداخان شەق بەرن .

شۆڕشی خنجیلانەی کوردستانی خۆمان بەهاواری کوردەکانی ئێرانیش چوو ، شەهیدمان دا هیلاکیی وماندوو بوونمان چێژت بەڵام گرەوی کوردستانی گەورەمان بردەوە ، چەند سەربەرز بووین لە دەشتی هەولێرو گەرمیان و خۆشناوەتی و شارەزوور بەرەو سەردەشت و بانەو بۆکان و مەهاباد و خانە دەڕۆیشتین ئاواتی قازی محەمەد و بارزانی نەمرو شێخ سەعیدی پیرانمان دەهێنا دی .

ئەدی بۆچی پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران بەست پرسیارێکە دەبێ وەڵام بدرێتەوە ئێرانیەکان چەندین ساڵ بوو لەگەڵ عێراق شەریان دەکرد پێیان وابوو بە تەنیا دەتوان حکومەتی عێراق بڕوخێنن کەچی لە ساڵی ١٩٨٦ سەرەڕای گرتنی( فاو ) لەلایەن ئێرانیەکان گەیشتنە ئەو راستیە کە ناتوانن عێراق بەتەنیا بڕوخێنن ، هێرشەکانی ئێران بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق هەمووی تووشی شکستی گەورە دەهات ئەگەر سەرکەوتنیش بەدەست بهاتایە بەدەیان هەزار کوشتارو بریندراریان دەدا ، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە مەترسی لەناو هێزەکانی ئێران پەیدا کرد بۆیە دەیویست بەرەی شەڕ لەگەڵ عێراق فراوانتر بکات لە کوردستانەوە بە یارمەتی ئێمە خاکی عێراق داگیر بکات .

ی . ن . ك هێزێکی خاوەن هەڵوێست و رای خۆی هەبوو لەسەر گۆڕەپانی ناوچەکە و کوردستان ، ئێران دەیویست ئەو دەنگە سوڕ گوم بکات بەلای خۆی رابکێشێ و سوود لە ئازایی و فیداکاری پێشمەرگەکان وەربگرێ ، دەیویست کوردستانیش وێران بکات ( بە بەردێك دوو چۆلەکە بکوژێ )

ئێران لە جیهان نموونەی نەمابوو زۆربەی وڵاتان گازاندەیان لێ دەکرد دەیویست بڵێ لەگەڵ کوردەکانی عێراق دۆستم تەنیا دژی رژێمی سەدامم ئێران دەیویست لە رێگای دۆستایەتی و پەیوەندی پەیدا کردن سیخوڕو جاسوسەکانی لەناو کوردستانی عێراق بلاوبکاتەوە بۆ کۆکردنەوەی دەنگ و باس لەسەر سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان و دروست کردنی تۆڕی جاسوسی لەپێنا ئەو پەیوەندی و هاوکاری کردنە ئێرانیەکان دەیانویست چەك و پارە و تەقەمەنی بدەن بە پێشمەرگەی کوردستان تا بتوانن سوپای عێراق لە کوردستان سەرقاڵ بکەن وە ئەویش لەناکاو هێرش بکاتە سەر شوێنێك کە خۆی دەستنیشانی دەکات .

ئێرانیەکان کە نەیانتوانی بەرگری لە بیرە نەوتەکانی خۆیان بکەن رۆژانە فرۆکەکانی عێراق کۆمپانیاکانی دەکوتا زەرەرو زیانی زۆری لێ دەکەوت دەیویست بەهۆی یەکێتی نیشتمانی کوردستان نەوتی کەرکوك بوەستێنێ .

ئێرانییەکان پێیان وابوو ئەگەر یارمەتی ی . ن . ك نەدەن وە رێگای هاتووچۆمان بگرن ئەوا یەکێتی لاواز دەبێ لە هەلێك زەبری خۆی دەوەشێنێ .

هێزی پێشمەرگەی کوردستان گەلێك شوێنی گرنگ و ستراتیژی رزگار کردبوو بنکەو بارەگای سەرکردایەتی چەند کیلۆمەترێك لە شارەکانی کوردستان دوور بوو ، زەمینەی هێرشی ئێرانی لەبار دەکرد بۆیە چاوی بڕیبووە پەیوەندی بەستن لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەوانەو هەندێ هۆی تریش هەبووە بەتایبەتی لەباری ئەو کاتی ناوچەکە کە ئێرانی هان دەدا بۆ ئەو مەبەستە دەباشە ئەگەر ئێران ئەو قازانج و دەسکەوتانەی لە پەیوەندی کردن هەبوو ، دەبێ کورد و ( ی . ن . ك) بە چ بیرو بۆچونێك پەیوەندی لەگەڵ ئێران بەستبێ دە ساڵ بوو( ی . ن . ك بەپشت و پەنای میللەت شۆڕشی دەکرد ، قۆناغە سەخت و ناخۆشەکانی بڕیبوو لە ژێر زەبری هێزی پێشمەرگەی کوردستان حکومەت بۆ ماوەی تێپەڕی مفاوەزاتی لەگەڵ ی . ن . ك کرد و ئەو ماوەیەی شەڕ راوەستا رێکخستنەکانی ی . ن . ك بە کۆمەڵە و شۆڕشگێڕانیشەوە بەهێزتر بوون ژمارەی پێشمەرگە بەرەو زیاد بوون دەچوو ، زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بووە مەیدانی چالاکی پێشمەرگە دە ساڵ بەشانازیەوە بەربەرەکانی هەموو دوژمنان کرا لەو تاقی کردنەوە سەختە زۆر سەرکەوتوانە هاتە دەرەوە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بە میرات بۆی بەجێماوە دەبێ لەگەڵ دەوڵەتێکی دراوسێ پەیوەندی هەبێ ئەگەر زەرەریشی لێ بکات، راستە رێگای هاتووچۆ بۆ دەرەوە داخرابوو ، راستە برینداراکانمان وەکو پێویست بۆ چارەسەر نەدەکرا ، راستە لە یارمەتی دانی دەرەوە بێ بەش کرابووین ( فیشەك و تەقەمەنی و چەك وەکو پێویست نەبوو ) وە هەرچی خاڵێکی تر هەیە بێتە سەر ئەو هۆیانە هەمووی رەش دەبێتەوە ، چونکە ئێمە دە ساڵ بەبێ یارمەتی هیچ دەوڵەتێك شۆڕشی کوردستانمان بەردەوام کرد رۆژ لە رۆژیش بەرەو سەرکەوتن هەنگاوی دەگینا ، گەلێك ناوچەی گرنگ و ئەستەم و ستراتیژیمان ئازاد کردبوو بەتایبەتی جافەتی ، دۆڵی بالیسان ، سەفرەو زەروون ، دۆڵی سماقولی ، مەلەکان ، گەرەوان ، بناری قەندیل ، چەمی رێزان ......) بۆ دابین کردنی ژیانی پێشمەرگەو هەڵسوڕاندنی کاروباری شۆڕش رۆژنە دەیان هەزار دینار لە گومرگەکان دەهاتە دەست چونکە

ئەو کات ئابووری ئێران زۆر خراپ بوو خەڵکی کوردستانی ئێران بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی بە کەروبارئازووقەی لە عێراق دەبرد

ئێرانیەکان بۆ چاو بەستەکی هەندێ چەکیان نارد بریتی بوو لە ( کلاشینکۆف ، بی کەی سی ، هەندێ هاوەنی ١٢٠ملم ٨٢ملم و ٨١ملم ) هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە چەندین داستان بە سەدان پارچە چەکی لەو جۆرانەی گرت بۆ نمونە شەڕی دێگەڵە ٢٠٠ کلاشینکۆف ، شەڕی سەری ڕەش (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد پارچە چەك ، داستانی رزگاری بە سەدان پارچە چەك .....!!، جگە لە چالاکی جیا جیای هێزی پێشمەرگە لە ناوچەکانی هەولێرو سلێمانی و کەرکوك ، دەباشە چ پێویستیمان بە چەکی ئێران هەیە.

حکومەتی عێراق دەیزانی ی . ن . ك دۆستی ئێران نی یە بۆیە هێزەکانی خۆی زۆر سەرقاڵ نەدەکرد بۆ گرتنەوەی هەندێ شوێن کە دەبووە مایەی زەرەرو زیانی زۆر بۆ خۆی کەچی پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران گرێ دا ناچار بوو هەندێ هێز لە ناوچە گرنگەکانی شەڕی عێراق — ئێران بگوازێتەوە کوردستان و پەلەی کرد لە گرتنەوەی سنوورەکان وە بووە هۆی شەڕێکی ڕووبەڕوو لەگەڵ هێزی پێشمەرگە کە بەڕاستی قازانجی نەبوو .

( ئێرانیەکان زۆر درۆزنن قسەی راست ناستەنگ بزانن رەنگە بەهاریان هێنابێتە چۆکان وایان باس کردبێ کە بەو زووانە حکومەتی عێراق بە پیلانێك دەڕوخێنن.)من زۆر جاران لەگەڵ برادەران باسی ئێرانیەکانم کردوە هەرگیز بڕوام نەبووە کە ئەوان دەتوانن حکومەتی عێراق بڕوخێنن وە ڕۆژێ دادێ عێراقیەکان لە شەڕیش چۆکیان پێ دادەدەن زۆر جار برادەران دەیانگوت ( کاکە رەش ) واتە سەدام هەر دەڕووخێ بەڕاستی گاڵتەم پێ دەهات چەنکە ئێرانییەکان ئەوەندە گەمژە بوون دنیایان لە عەقڵی خۆیان دەدۆزیەوە .

لەسەرەتای مانگی تەموز ی . ن . ك بەتەواوی پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ ئێران بەست ، ئێران حکومەتێکی کۆن و دەوڵەمەند و خاوەن هێزە، کورد میللەتێکی ژێردەست و خاوەن شۆڕشێکی بێ پشتیوانە چۆن لە ڕێکەوتن ئەو تەرازوە رادەگیرێ ، هەردەم ڕێکەوتن لەگەڵ خاوەن هێزەو بە قازانجی ئەو دەگەڕێتەوە .

بەڵێن دان بەبێ هێز هیچ دەورو کاریگەری نابێ ، ئێران بە قسەی پان و نەرم و گەورە هیچی تێدا نەهێشتبۆوە کەچی لەڕۆژی تەنگانە یەك ڕۆژە شەڕیشی لەسەر نەکردین لە درێژەی ئەو یاداشتە هەڵوێستی ئێرانیەکان بە چاکی روون دەبێتەوە .

حکومەتی عێراق هەستی کرد کە ی . ن . ك و ئێران رێکەوتنیان مور کردوە بە بەپەلە کەوتە خۆ بۆئەوەی رێگای هاتنی چەك و تەقەمەنی بگرێ خۆی ساز و ئامادە کرد بۆ هێرش هێنانە سەر کوردستان لە ١٩٨٦/٧/٢٥ بە بروسکەی سەرکردایەتی هێزەکانی لای ئێمەش داواکران بەرێز مام غەفور لەگەڵ هێزێك بەرەو سەرکردایەتی بەرێ کەوت ئێرانیەکان لەیەکەم رۆژی پەیوەندی بەستن دەستیان بەکارەکانی خۆیان کرد و جاسوس و سیخورەکانیان خزاندە کوردستان یەکەم جار بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ لەسەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان و دراسەکردنی ناوچەکان و بەکرێ گرتنی هەندێ کەسی نەفس نزم .

لەسەرەتای مانگی ١٩٨٦/٨ بە بروسکە ئاگاداری من و کاك سەفینیان کردەوە کە بچین بۆ سنووری تیپی ٢١ ی کەرکوك بۆ ناوچەی شێخ بزێنی دیار بوو کاك سەفین نەهات ، من بەتەنیا پەڕیمەوە لەگەڵ سەیارەیەکی ت ٢١ ی کەرکوك چوینە لای کاك کۆسرەت و کاك عەلی بچکۆل کە سەیرم کرد شەش پاسداریش لەوێ بوون پاش نان خواردن کاك کۆسرەت بە درێژی قسەی لەگەڵ کردم .

لەگەڵ پاسدارەکان بەرێ کەوتین ئێوارە لە گوندی ( بیناتی ) نانمان خوارد درەنگی شەو لە چیای کانی دومبەلان ئاودیو بووین چوینە نزیك کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بە جیهازێکی مۆدێرن وێنەیان گرت ، زۆر شوێنێکی خەتەر بوو هیچ رەبییەکی دوژمن (٣٠٠) سێ سەد مەتر نێوانمان زیاتر نەبوو شەوێ درەنگ لە کەلوڕ لە دەرەوەی گوندەکە نان و ماستاومان خوارد بەیانی هاتینەوە شێخ بزێنی کە بۆم ساغ بۆوە ئەوە نەخشەی لێدانی کەرکوکە لەگەڵ برایەکی هاوسەنگەرو خۆشەویستم ئەو قسانەم کرد .

سەیرێکی کاك (     ) م کرد ووتم بەراستیتە لە کەرکوك دەدەین .... ووتی بۆ ، هەمووی دەسووتێنین عێراق بەتێپەڕی ناتوانێ ئەو خەسارەتە پڕ بکاتەوە ...!!؟ دیسان پێم ووت ئەدی میللەتی خۆمان ، باشە ئەو گوندانە ، باشە خەڵکەکە ، حکومەت دڕندەیە هەرچی لەدەستی بێت دەیکات .... ووتی کاکە تۆ هەر دژی ئێرانی ئەگینا ئەوە کارێکی زۆر گرنگە.... ووتم راستە کارێکی زۆر گرنگە بەڵام ئەو قورمساغانە نازانن تۆپ بەکاربهێنن ، هەر عەیب دارمان دەکەن و تەنها میللەتەکەمان باری خراپی بەسەر دێ ..... ووتی باشە کاکە واز لەو قسە هەڵەق و مەڵەقانە بێنە بڕۆوە لای دەشتی هەولێر بەڵام لای کەس باسی نەکەی چونکە کەس نازانێ .

# شەڕی قەیوان - ماوەت

ماوەت ناحیەکە سەر بە قەزای شارباژێرە ( چوارتا ) لە پارێزگای سلێمانی چل کیلۆمەتر لە سەرووی سلێمانیە .

قەیوان : دوو گوندن لە نزیك سلێمانی رۆژهەلاتی لووتکەی دووبرا لە رۆژئاوای گوندی سنگرە کارێزەش دەکەوێتە سەرووی قەیوان لە سەربازگەی کانی ساردی سلێمانی جادەیەکی کۆن گوندەکانی ( فیال ، کانی بەردینە ، قەیوان ) دەبڕێ و لە کارێزەو قەلاچۆلان دەکاتەوە ، حکومەتی عێراق پێشتەوەی دەست بە هێرش کردن بکات هێزەکانی تەنها لەسەر جادەی گشتی ( سلێمانی - ئەزمەڕ - قەلاچۆلان - سوورەقەلات - ماوەت حسەن بەگ ) بوو ، هێزەکانی پێشمەرگە پێش دەست پێکردنی هێرشی دوژمن لە نزیك جادەی ( ئەزمەڕ ، مۆکەبە ، گۆڕەنگ ، باغ ، دۆڵ بێشك ، بالوسە تا سنووری ئێران ) بوو .

شەڕی قەیوان – ماوەت یەکێکە لەشەڕە هەرە گەورەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ رژێمی عێراق نزیکەی سێ مانگی خایاند زیاتر لە (٨٠٠) هەشت سەد جاش و سەرباز کوژرا و بەسەدانی تریش بریندار بوون وە نزیکەی سەد رۆڵەی تێکۆشەری گەلەکەمان گیانی پیرۆزیان پێشکەش بە خاکی نیشتمان کرد ، رژێمی عێراق پاش ئەوەی بۆی ساغ بۆوە کە ئێران و ی . ن . ك بەتەواوی لە رووی سەربازی رێکەوتوون بەپەلە کەوتە بیرکردنەوە بۆ تەسك کردنەوەی سنووری دەسەلاتی هێزی پێشمەرگە و کردنەوەی رێگای قەیوان و گرتنەوەی دۆڵی سەفرە و زەروون لە ناوچەی ماوەت تا گردە رەش لەسەر سنووری عێراق – ئێران . بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پیلانە سەرەتا دەیان فەوجی جاشی هێنا ناوچەکە و دەستی کرد بەشەڕی بەرەیی ( الجبهە) . هەرچەندە شەڕ پێش مانگی ئەیلول دەستی پێکرد بەلام لەسەرەتای مانگی ئەیلول دوژمن پالەپەستۆی زۆری خستە سەر شوێنەکانی پێشمەرگە و رۆژانەچەندین هێرشی دەکردە سەر سەنگەرەکان .

لیوا روکن قوات خاصە نزار عبدالحکیم الخزرجی ئەو کات قائیدی فەیلەقی یەك بو گوایە بە کابرایەك بە سەرکردایەتی( ی . ن . ك )ی راگەیاندوە ئەگەر بکرێ رێگای قەیوان چۆڵ بکرێ چونکە حکومەتی ئێران لە مانگی موحەرەم رەنگە هێرش بکات دەڵێن بەڵێنی دابوو کە موحەرەم تەواو بێت بکشێنەوە شوێنەکانی خۆیان ، ئەو قسە راستە بەلام هەرگیز رژێم

نەدەكشاوە ئەگەر هێزی پێشمەرگە شوێنەكەی چۆڵ بكردایە بەرەی شەڕ درێژایی ٣٠كم دەبوو بۆ دیفاع كردن لەو هەموو شوێنە گرنگە پێویستی بە ژمارەیەكی زۆری پێشمەرگە دەكرد هاوزەمان لەگەڵ هێرشی دوژمن جكومەتی چەك و تەقەمەنی و تۆپی ١٢٠ملم و گوللەتۆپەكانی لە ڕێگای سەفرەو ولاغلودەگوازتەوە بۆ گوندەكانی ( گوێزێ – مالومە ) بۆ ئەنجامدانی عەمەلیاتی كەركوك بەرە بەرە هێزەكانی ی . ن . ك بەشداری شەڕیان كرد دەتوانم بلێم لە ٨٥٪ هێزی پێشمەرگە بەشداری ئەو شەڕەیان كرد .

لە ١٩٨٦/٩/١ هێزەكانی ئێمەش لەگەڵ بەشێك لە ت ٢١ ی كەركوك لە ناوچەی دەشتی كۆیە كۆبوینەوە بەمەبەستی ڕۆیشتن بۆ سەركردایەتی لەگەڵ هەڤاڵ كاك كۆسرەت لە بیەمە ئەو ڕۆژە ئێران هێرشی كردە سەر ( منصەكانی عمیق ) لە ئاوی خەلیج عێراق گورزێكی لێ داو پێی بەجێ هێشت . كە گەیشتینە سەركردایەتی لەوێ بەسەر بەرەكانی شەڕ دابەش كراین ، بەم شێوەیە :

١- ت ٢١ ی كەركوك بۆ لووتكەی دووبرا ڕۆژی دواتر دوژمن هێرشی كرد پاش شەڕێكی قارەمانانەی كەم وێنە دوو پێشمەرگە شەهید بوون لەوانە كاك برایم سوور جێگری فەرماندەی ت ٢١ ی كەركوك پاش ئەوەی پێشمەرگەكان فیشەكیان لێ بڕا دوژمن توانی لووتكەی دووبرا بگرێ .

٢- ت ٨٧ ی قەرەچوغ بۆ دۆڵ بێشك .

٣- بەشێك لە ت ٨٦ و ٨٥ بۆ نزیك قەیوان .

دوژمنی دڕندە و وەحشی بەدەیان هێرشی یەك لە دوایەكی كردە سەر ( دۆڵ بێشك ، بالوسە ، كۆڕەنگ ، بالخ ، خەجە لەرزۆك ، كەپكی قەیوان ، كونە ماسی ، وراغلو ، گردەرەش ) لەلایەن پێشمەرگەكانی ی . ن . ك ئازایانە بەرگری كرا ، پێشمەرگەكانی ت٢١ ی كەركوك ، ت٢٥ ی خالخالان ، ت ٤٧ ی پیرەمەگرون ، ت٥١ ی گەرمیان ، ت٥٧ ی سەگرمە ، ت ٩٣ ی كۆیە ، ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر ، ت٨٧ ی قەرەچوغ ، ت ١٢ ی سۆران ت ٧٨ ی كاروخ ، ت ١٩ كۆڕەك ، مەردانە ، ئازایانە ، جوامێرانە بەرەو ڕووی ئەو هێزەی دوژمن وەستان هەڤاڵ عەولا بۆر ، سەلاح چاوشین ، مام غەفور ، كاكە رەهبەرسەید برایم ، سابیر رەسوڵ، سامان گەرمیانی ، كاك سەرهەنگ ، شێخ جەعفەر ، وە دەیانی تر لە فەرماندە ئازاكانی هێزی پێشمەرگەی كوردستان بەشداری ئەو شەڕەیان كرد .

لە ناوەراستی تشرینی دووەم رژێم توانی هەموو ئەو شوێنە گرنگانە بگرێ وداگیری بکاتەوە لە ماوەی ئەو سێ مانگەی شەڕ ئەوەی جێگای داخە دۆستەکەمان ئەو ئێرانەی بەڵێنی دابوو لەگەڵ ئێمە بێت یەك گوللە تۆپیشی بە هێزەکانی عێراق دانەدا ، سنووری ماوەتیش گیرا و ئەگەر پسپۆڕێکی عەسکەری سەیری شوێنی سەرکردایەتی بکردایە سەری سوڕ دەما چونکە بەراستی ئابلوقە درابوو لە هەموو لایەك وە تەنها چەند کیلۆمەترێکی چوار گۆشە مابوو بنکەو بارەگای لێ دامەزرابوو ئەویش رۆژانە لە هەموو لایەك تۆپ باران دەکرا ، رۆژانە فڕۆکەکانی رژێم بۆردومانیان دەکرد . جێگای شانازی بوو کە هەڤاڵانی سەرکردایەتی بەتایبەتی بەڕێزان مام جەلال و کاك نەوشیروان لە نزیکەوە لەگەڵ پێشمەرگەکان دەژیان ئەوانیش وەکو ئێمە و باقی ئەندامانی سەرکردایەتی لەگەڵ ئێش و ئازارمان دەژیان.

شەڕی ماوەت – قەیوان بووە هۆی کەم کردنەوەی چالاکی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان چونکە زۆربەی هەرە زۆری سەرقاڵ بوون بەو شەڕە گەورەیە . خاڵێکی تری گرنگ شەڕی قەیوان – ماوەت پێشمەرگەی ماندوو کرد وە هەم تاقی کردنەوەیەکی گەورەی شەڕی بەرەیی بوو کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەو بوارە دەستی کورت بوو . تا رادەیەکیش هەڵوێستی ئێرانییەکان بۆ هەندێ کەس ساغ بۆوە چونکە تا ئەو کاتەش هەندێ کەس گرۆی لەسەر پشتگیری هێزەکانی ئێران دەکرد .

سەرەتای مانگی ١٠/١٩٨٦ بوو ، شەو بوو لەبەرامبەر گوندی باخ چادرمان هەڵدا بوو، لرمەی تۆپ دارەکانی دەهەژاند ، تەقە هاژەی دەهات ، جیهازە بچوکەکان قسەیان دەکرد و هەواڵیان دەدا ، ئاگری دار بەرەو لە نزاری چیاکان گەشتر دەبوو ، ئێمەش لەو هەڵلایە سوالفەی خۆشمان بۆیەکتر دەگێڕایەوە کاك کۆسرەت و شێخ جەعفەر و کاك سابیر رەسوڵ و مامۆستا بەکر و فاروق عەلی مەولود و من چەند بڵێ ی بە قسەی زەمان پێ دەکەنین لەلایەکیش بروسکە هاتبوو کەلە سماقوڵی دوو کوڕەی هەڤاڵ کۆسرەت ( پێشڕەو ئاراس ) شەهید بوونە باوکیان بێ ئاگا لەو کارەساتە دڵتەزێنە هەر بیری لەلای پێشمەرگەکان بوو کاك نەوشیروان رەوانەی دوای کرد لەوێ ئەو رووداوەی پێ راگەیاند کە ئەو خەبەرەم بیست زۆر پێی شڵەژام زۆر دڵگیر بووم چونکە شەهید بوونی دوو پارچەی جەرگ کارێکی ئاسان نی یە . بەیانی چوومە بارەگای کاك نەوشیروان هەستم کرد کاك کۆسرەت ئەم هەواڵە کاری خۆی لێ کردوە و خەمگینە هەر ئەو رۆژە لەگەڵی گەراینەوە تا رۆژهەلات گەیشتینە گوندی پەلکانە بەرامبەر گوندی سێ کانیان ئێوارەی ئایندە گەیشتینە سماقوڵی کاك کۆسرەت لای دا چووە سەر گۆڕی هەردوو کوڕە شەهیدەکەی

برادەران بانگیان کردم کە بچمە لای منیش قسەم لەگەڵ کرد و دڵم داوە ، دوو شەو لە سماقوڵی مامەوە و گەڕامەوە دەشتی هەولێر لەو ماوەیە بەسەدان تەن چەك و تەقەمەنی لە ئێران گوازترایەوە بۆ سەرکردایەتی لەوێش بۆناوچەکانی نزیك کەرکوك ئەوەی جێگای باسە لەو هەموو جموجۆڵەی هێزی پێشمەرگە عێراقیەکان بەو دەزگا جاسوسیەی کە ساڵانەیە پارەی بۆ سەرف دەکەن نەیان توانی بزانن ئەو چەك و کەرەستەیە بۆچی دێت بۆ کوردستان تا یەکەم گوللە تۆپ نزیك کۆمپانیای نەوت نەکەوت ئەوان هەستیان پێ نەکرد بوو هەر بۆیە لێدانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بە عەمەلیاتێکی زۆر گەورەو سامناك لە قەڵەم دەدرا چونکە پێیان وابوو حکومەت کەم هەتا زۆر دەنگ و باس وەردەگرێ کەچی بە پێچەوانەوە دەزگاکانی رژێم ( لە گوێ ی گا خەوتبوون ) .

# لێدانی کەرکوک

لەمێژ بوو ئێرانیەکان لە هەلێك دەگەڕان تاکو تۆڵەی لە حکومەتی عێراق بکەنەوە چونکە فڕۆکەکانی عێراق ڕۆژانە شوێنە گرنگەکانی ئەو وولاتەی دەکوتا . هێزی ئاسمانی ئێران پێش هاتنی جمهوری ئیسلامی یەکێك بوو لەو هێزانەی لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست حیسابی بۆ دەکرا پاش هەلاتنی شا ئەو هێزە تووشی گیروگرفتی زۆر هات سەرەڕای ئەوەش دژە ئاسمانیەکانی عێراقیش چەندین فڕۆکەی ئێرانیان خستە خوارەوە ، چەکە دژە ئاسمانیەکانی عێراقیش وای لە فڕۆکە ئێرانیەکان کرد بوو کە نەتوانێ لە کۆمپانیاکانی نەوت نزیك ببنەوە . باشترین چارە بۆ ئەو مەسەلەیە بەکارهێنانی تۆپ و هێزی پیادەیە . کەرکوك نزیکەی دوو سەد کیلۆمەتر لە بەرەکانی شەڕ دوور بوو ، هیچ تۆپێکی ئێرانی ئەوەندە دوورهاوێژ نەبوو، بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ ی ن . ك باشترین هەل بوو کە ئێرانیەکان ئەو کارە ئەنجام بدەن .

بە ڕێگای سەفرەو زەروون چەندین تۆپی ١٢٠ملم و بەهەزاران گوللە تۆپیان گوازتەوە کوردستان وە توانرا ئەو چەك ز تەقەمەنیە بەبێ ئەوەی عێراق هەستی پێبکات بگوازرێتەوە ناوچەکانی کەرکوك چ لەلای چەمی ڕێزان یان لە سنووری تیپەکانی گەرمیان ، دەزگاکانی ئەمن و ئیستخبارات و مخابراتی عێراقی لەو هەموو هاتوچۆو جموجۆلە بێ خەبەر بوون ، بۆئەوەی ئەو چالاکیە بەرێك و پێکی جێبەجێ بکرێ هەڤاڵ نەوشیروان سەرپەرشتی دانانی نەخشەو پیلان و بە ئەنجا گەیاندنی کرد ، هێزی پێشمەرگە ئامادە کرا نزیکە (٢٥٠٠) دووهەزارو پێنج سەد پ . م بۆ ئەو مەبەستە گواسترانەوە شوێنە نزیکەکان لە ناوچەی کەرکوك ڕۆژی ٩/١٠/١٩٨٦ هەموو هێزەکانی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە سازدرا بوون لە نزیك کەرکوك کۆکرانەوە بەشێك لە هێزەکانی مەڵبەندی دوو ، مەڵبەندی سێ لە ناوچەی شوان و خاڵخالان چاوەنواڕی فەرمانیان دەکرد کە بریتی بوون لە تیپەکانی ٨٦ ی دەشتی هەولێر و ٨٧ ی قەرەچوغ و ٢١ ی کەرکوك و ٢٥ ی خاڵخالان و ٩٣ ی کۆیە بە فەرماندەی هەڤالان مام غەفور، کاك سەفین کاك رەهبەر ، شەهید مەلا ئاراس ئەو قۆڵە لەلایەن هەڤاڵ کاك نەوشیروان سەرپەرشتی دەکرا .ئەو قۆڵە دەبوایە هەندێك لە رەبیەکانی سێ کانیان و کانی دومبەلان بگرێ و تۆپەکانیش لە نزیکەوە بوردومانی ناوجەرگەی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بکەن . دیارە کاك

نەوشیروان ئەو چالاکیەی بە خەتەر ناك دەزانی بۆیە لەکاتی بەڕێ کردنی فەرماندەکانی بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکە یەکە یەکەی فەرماندەکانی ماچ کردبوو .

قۆڵی دووەم بە فەرماندەی هەڤاڵ شەوکەت حاجی مشیر و مام ڕۆستەم کە زۆربەی تیپەکانی ٥١ ی گەرمیان و ٥٣ ی شێروانە و ٥٥ ی قەرەداغ و ٥٧ ی سەرگرمە و هەورامان و شارەزوور بەشداریان لەو چالاکیە کرد ئەرکی ئەو قۆڵە گرتنی هەموو ئەو ڕەبایانە بوو کەلە سەر چاڵە نەوتەکانی زەمبوور بوو هاوزەمان تۆپ بارانی شوێنە گرنگەکانیش بکەن . بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێ لەکاتی ئەنجامدانی ئەو چالاکیە مەزنە هێز بەهانای کەرکوك بیات بەتایبەتی هێزەکانی فەیلەقی پێنج کە بارەگای لە هەولێر بوو باقی تیپەکانی ٨٦ و ٨٧ و ٨٥ ی بەرانبەتی و ٩١ ی سەفین بۆ مشاغەلە کردنی هێزەکانی دوژمن تەرخان کرا .

ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/٩ کاك کۆسرەت گەیشتە لامان لە گوندی بانە قەلآت ئەو هێزانەمان دابەش کرد بۆ مشاغەلە کردنی هێزەکانی ڕژێم بۆ ئەو شوێنانە :

١- گوێر ٢-دیبەگە ٣- قوشتەپە ٤- ناو هەولێر

پاش نان خواردنی ئێوارە چووینە سەر دێدەوان هەموو شوێنێك دیار بوو ، ئاگری نەوتی کەرکوك بڵێسەی هەڵدەستا ، دنیا کش و مات بوو تا کاتژمێر (١) یەکی بەیانی ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/١٠ لە هەموو لایەك تەقە دەستی پێکرد ، تۆپەکان کەوتنە کار پاش ماوەیەك ئاگرە شەریکەی کەرکوك کوژایەوە ، هاوزەمان لەگەڵ دەست پێکردنی تۆپ باران فڕۆکەکانی شەڕکەر و کۆپتەر بە ئاسمانی ناوچەکە دەسوڕانەوە بە تەنویر ناوچەکەیان ڕووناك کردەوە چەند کاتژمێرێك تۆپ باران بەردەوام بوو پاش ئەو ماوەیە دنیا کش و مات بوو ، ئاگر لە شەریکە هەڵنەستا کەواتە چالاکیەکە وەکو پێویست سەرکەوتوو نەبوو .

لەوێ بیرم کردەوە وتم ڕژێم ئەو تۆڵەیە لە جووتیارە هەژارەکان دەکاتەوە ، گوندەکانیان دەسوتێنێ ، خەڵکەکەشی ئاوارە و دەربەدەر دەکات . بۆ بەیانی ئێزگەی تاران بە زمانی فارسی کردیە هەڵلا مۆسیقای عەسکەری لێ دەدا لە پاشان وتی ( ڕۆڵەکانمان لە { ڕەزمەندگانی ئیسلام} توانیان کۆمپانیای نەوتی کەرکوك خاپور بکەن و بە سەدان لە هێزەکانی عێراقیان کوشتوە و بەدەیان منافقین {مجاهیدی خلق} یان کوشتوە ) نە لە دوور نە لەنزیك ناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی نەهێنا .

لەو چالاکیە تەنها (١٠٠) پاسدار بەشداریان کرد ئەویش وەکو (فنی) لە کاتێکدا دوو هەزارو پێنج سەد پێشمەرگەی کوردستان ئازایانە هێرشیان بۆ شوێنە گرنگەکان کرد و چەندین

رەبایــە و ســەربازگەیان گــرت . هــەم پێشــمەرگەو هــەم ســەرکردایەتی ی . ن . ك لــەو هەڵسووکەوتەی ئێران دڵگیر بوون بروسکەو بروسکە کاری بە ناچاری ئێران پاش چەند کاتژمێر ئەو جارە نـاوی یـەکێتی نیشتمانی کوردسـتانی لـە پـاڵ هێزەکـانی خـۆی هێنـا . جـەماوەری گەلەکەمان زۆریەیان بە چاوی گومان و ترسەوە سـەیری ئـەو چـالاکیەی دەکـرد سـەرەڕای ئـەوەی گلەیی دەکرا کە نابوایە لەگەڵ ئێرانیەکان بکرێ کە هیچ ڕۆڵیان تێدا نەبوو لەوەش ترسان ڕژێم کاردانەوەیەکی توند و تیژی هەبێ بەرامبەر خـەڵکی کوردسـتان هـەتا لـە شـارەکانیش . ئەگـەر ئێران و خۆمان پێمان وابوو ناردنی نەوت لەکار کەوتووە ئـەوا ڕۆژی دواتـر پـەیامنێرانی دەرەوە سەریان لە کەرکوك دا و ئیزگەی مونتی کـارلۆ وتـی بـە گـوێرەی کومپیوتـەر کـە دانـراوە بـۆ حیساب کردنـی بۆشـکەی نـەوت بـۆ دەرەوەی عێـراق هـەر ئـەمڕۆ یـەك ملیـۆن و پـەنجا هـەزار بۆشکەی نەوت بۆ دەرەوەی عێراق ڕۆیشتووە بەم شێوەیە ئەو ئاواتەی کەلە مێژبوو هـەوڵمان بـۆ دەدا نەهاتە دی .

ڕژێمی فاشی و پیاو کوژی بەغدا بۆ قـەرەبوو کردنـەوەی ئـەو چـالاکیەی کـەرکوك لـە ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/٢٢ لە چەندین قۆڵ هێرشی بۆ سـەر ناوچـە ڕزگـار کراوەکـانی کوردسـتان دەسـت پێکرد ئەو هێزانەی دوژمن لە سێ قۆڵ لەگەڵ ئازایی و چاو نەترسی پێشمەرگە ڕوو بەڕوو بوو :

١- هێزێکی گەورەی دوژمن بە پاڵپشتی فڕۆکەو دەبابە لـە ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/٢٢ لـە هـەولێر بۆ گوندەکانی قەشقە - کانی سلێمانە - خوڕ خوڕ - سارتك - ئاومـاڵ - شـەیتان - سـێ کـانی - سێگردکان - ئۆمەر گۆمبەت - بـەردە سـپی - نـیرە گـین هێرشـی خـۆی دەسـت پێکـرد لـە کاتژمێر (٣) ی پاش نیوەڕۆ لەگـەڵ پێشـمەرگەکانی ت ٨٦ ی دەشـتی هـەولێر بـە فەرمانـدەی هەڤاڵ مام غەفور و شەهید عەلی پونگینە و هێزێکی حزبی شیوعی عێراقی لـە گونـدی نێـرە گین تووشی یەکتر هاتن پاش شەڕێکی قـورس و دژوار چـەندین لاشـەی جاشـە خۆفرۆشـەکان لـە گۆڕەپانی شەڕەکە بە جێما و دەسکەوتی پێشمەرگەکان چەندین پارچە چەك و سێ ئوتومبیل بوو سەرەڕای هـەوڵ و تەقـەلای زۆری دوژمـن بـۆ ئابلوقـەدانی پێشـمەرگەکان بـەڵام ڕۆڵـە ئازاکـانی گەلەکەمان توانیان بێ زیان بکشێنەوە .

٢- هێزێکی تری دوژمن هێرشی کردە سەر گوندی ئیلینجاغ لە نزیك کۆیە لەلایەن بەشێك لـە پێشمەرگەکانی ت ٨٧ ی دەشتی هەولێر و مەفرەزەیـەکی ت ٨٧ ی قەرەچـوغ پێشـیان لێ گـیرا پاش شەڕێکی کورت کە چەندین خۆفرۆشی تیادا کوژرا دوژمن لە کاتژمێر (٢) ی پاش نیوەڕۆ توانی هێزێك لە ڕێگای دار بەسەر بهێنێتە گوندی ئیلینجاغ لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی شـەڕەکە

به رێك و پێكی نەدەكرا لەوێ شەش رۆڵەی قارەمانی گەلەكەمان ، شەش پێشمەرگەی فیداكار شەهید كران ( یوسف جمیل قشقە) فەرماندەی كەرتی دووی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر و كاك مەغدید فەرماندەی مەفرەزە لە ت ٨٧ ی قەرەچوغ .

بۆ رۆژی ١٩٨٦/١٠/٢٣ دوژمن گوندەكانی نێرەگێن و ئیلینجاغی تەخت كرد و سەروەت و سامانی جووتیارانی هەژاری كوردی بەتالان برد ، بێ گومان خۆماڵیەكان دەوری گرنگیان لە تالان و برۆی خەڵكی كوردستان . لە ئێوارەی رۆژی ١٩٨٦/١٠/٢٢ ئێمە كەمینەكەمان لە نزیك ئاریانی و تەرگینەداناوە كە شەو داهات بەشێك لە هێزەكانی دوژمن لەشەر دەگەڕانەوەكەوتنە بەر دەست رێژی پێشمەرگە لە ئەنجام فەرماندەی هێزەكانی دوژمن ( عقید زیدان ) بە خەستی بریندار بوو چاوێكی لەدەست دا لەناو خەڵك بە ( زیدانە كوێر ) بەناو بانگ بوو .

٣- داستانی زمارە : میلە هۆرد : كاتی خۆی كاك سەفین لە رۆژنامەی كوردستانی نوێی لەم داستانە دواوە بۆیە بە پێویستم نەزانی بینووسمەوە .

بۆ ئەوەی وورەی تاقمە چلكاو خۆرەكانی خۆیان بەرز بكەنەوە ، رۆژانە كۆپتەرەكان لە ناوچەی دەشتی هەولێر دەسوڕانەوە لە زۆر شوێن خەڵكی بێ تاوان و بێ چەكیان شەهید دەكرد ، دوژمنی فاشی پاش ئەو شەڕانە گوندەكانی ( زمارەی مەرزان ، میلە هۆرد ، تل الخیم ی گەورە ، تل الخیم ی گچكە ، كورتاندرو ، ناسر ، كەپەنە رەش ، بیرە بەرازە ) ی لەگەڵ خاك یەكسان كرد . حكومەتی عێراق هەرچەند جارێك لەشەڕ شكستی خوارد بۆ دامركانەوەی رق و قینەی فاشیانە دەكەوتە گیانی خەڵكی بێ تاوان و گوندەكانی دەسووتاند تالانی دەكردن ، دەربەدەری دەكردن ، بە فڕوكە و تۆپ ناوچەكەی دەكوتا . بەڵێ بەم جۆرە سەركردایەتی بەعس ، بێچوە هیتلەریەكان ، شاگردەكانی موسولینی ئیتالیا بڕیاری تەخت كردنی هەمو گوندەكانی كوردستانیان دەركرد بە بیانووی لێدانی كەركوك پاش چەند رۆژێك گوندەكانی ( قەرەبەگ ، شێخەیی ، دەرماناوە ، بیرە سپان ، قەرە سالم ، بیبانی ، توركی ، كەلور ، عەلی بەیان ) و دەیان و بگرە سەدان گوندی تری ناوچەی كەركوكیان لە هاوولاتیان چۆل كرد و لەپاشان تەختیان كردن .

پاش لێدانی كەركوك تێكۆشەرێكی كوردستانی ئێران چاوی بە عەلی حسەن مەجید دەكەوێ ( ئەو كات لێ پرسراوی رێكخستنەكانی حزبی بەعس بوو لە كەركوك و هەولێر و سلێمانی و

دهۆك و موسل ) داوای لێدەكات كە دەست هەڵبگرن لە چۆل كردن و وێران كردنی لادێیەكانی كوردستان لە وەلامدا عەلی حسەن مەجید دەڵێ :

لە مێژ ساڵە سەركردایەتی شۆڕش ...!! پیلانی گواستنەوەی هەموو گوندەكانی كوردستانی داوە ماوەیەك لەبەر شەڕی ئێران دوامان خست . لێدانی كەركوك وای لێكردین پەلە لەو مەسەلەیە بكەین ...!!؟ ئەوە دەقی قسەكانی عەلی مەجید بوو . لە ماوەی دوو ساڵ تا ناوەراستی ساڵی ١٩٨٨ زۆربەی هەرە زۆری گوندەكانی كوردستان لەسەر نەخشە لابردران یەك گوندیش لە ناوچەی سلێمانی نەما جگە لە تێكدانی قەزای پێنجوین ، دوكان ، چوارتا ، هەڵەبجەو ناحیەكانی ، ماوەت ، بن گرد ، سورداش ، ناڵ پارێز ، خورماڵ، سیوان ، سەنگسەر ، لە هەولێر قەزای چۆمان و مێرگسوور وناحیەكانی ، گەلاڵە و حاجی ئۆمەران و سیدەكان و هیران و دێگەڵە و دیبەگە و زۆربەی گوندەكانیش خاپوور كران جگە لە ناوچەی زرارەتی و ئوردوگا زۆرە ملێیەكان كەلە خوارەوە دەیانووسم :

( قەپەكیان ، كاوانیان ، باوە خەلان ، زەرگە زەوی ، مام خاران ، رەشوان ، خاروان ، مەموندیان ، گۆپاڵ ، چرە ، تووە ، گەرو دەلالان ، هەبابان ، قەرە قاچین ، زیرواو ) بەشێك لە عەشیرەتی خەیلانی و زۆربەی گوندەكانی سورچی و بەشێك لە گوندەكانی شێتنەی لەگەڵ گوندەكانی بەرانەتی لە ئەنفال رزگاریان بوو كە پێم وایە ئەگەر مەسەلەی كوێتی بەسەر نەهاتبا ئەوە ئەوانیش وەبەر پەلاماری بەعس دەكەوتن . لە پارێزگای دهۆك دەتوانم بڵێم تەنیا گوندێكیش بەسەلامەتی دەرنەچوو قەزای ئاكرێ رژێم لە كوردستانی دابڕی بوو لەلایەن پارێگای موسل سەرپەرشتی دەكرا مەڵبەندی چوار عەشیرەتی گەورەیە گوندەكانیان چۆل نەكران عەشیرەتی هەركی و سورچی و زێباری و ( عشائر السبعە ) لەسەر جێگاو رێگای خۆیان مانەوە، رژێم لە ساڵی ١٩٨٩ شاری قەلادزەی وێران كرد و خەلكەكەی گواستەوە ئۆردوگای زۆرە ملێیەكان . خەلكی لادێیەكان و قەزاو ناحیە وێران كراوەكان گوازرانەوە ئەو ئۆردوگایانەی كەلە خوارەوە نووسراوە :

لە هەولێر : پیرزین ، شاوێس ، بەحركە ، چیێژنیكان ، گردەچاڵ ، بەرحوشتر ، شاخۆران ، كەورگۆسك ، كەلەك ، تۆبزاوە ، جدیدە ، كانی قرژاڵە ، سێ بیان ، كسنەزان ، بستۆرە ، حەریر ، باسرمە ، دیانە ، بنەسلاوە ، دارەتوو ، چوار ئوردوگا لە قوشتەپە ، قادریە .

لە سلێمانی : چوار قورنە ، رانیە ، حاجی ئاوا ، پیرە مەگرون ، نصر ، برایەتی ، هەڵەبجەی نوێی .

له کەرکوك : صمود ، شۆڕش .

له دهۆك : کەلەك چی ، چرە ، قسرۆك ، کوری گاڤانان ، خارۆك .

خەڵکی ئەو ئوردوگایانه له هەموو پێداویستیەکی ژیان بێ بەش کرا بوون بێ کارو کاسبی مابوونەوە لەژێر باری ئابوری سەخت دەژیان سەرەڕای ئەوەش لـه هەنـدێ ئوردوگـا نەدەبوایـه لـه کیلۆمەترێك زیاتر دوور بکەونەوە بەڕاستی له زیندان بوون . بێ کاری و برسیەتی و نائومێـدی باڵی رەشی بەسەر ئەو خەڵکه هەژارەدا کێشابوو ، خانـەدانی وا هـەبوو بـەدەیان هـۆدە خـانووی خۆی هەبوو ، حەوشەو حساری پان و بەرینی بۆخۆی دروست کردبوو کەچی لـه ئوردوگـا لـەژێر یەك خەیمە دەژیا . حکومـەت دەیویسـت پـەردەی عـەیبـە لـەناو میللـەتی ئێمـه بـدڕێنێ کەچـی میللەتەکەمان شەرەفی خۆی پاراست لەو محنەته رزگاری بوو لەبەشی سـێ یـەم بەدرێـژی لەسـەر وەزع و گوزەرانی خەڵکی ئوردوگاکان دەدوێم .

لـه رۆژی ١٩٨٦/١٢/١٨ بـه بڕیـاری سـەرکردایەتی ی . ن . ك بـووم بـه فەرمانـدەی ت٨٧ ی قەرەچـوغ ، لـه رۆژی ١٩٨٦/١٢/٢٠ بـه بروسـکەی بـەڕێز مـام جـەلال ت ٨٧ ی قەرەچوغ بەرەو ناوچەی دەشتی کۆیه بەرێکەوت له رۆژی ١٩٨٦/١٢/٢١ له گوندەکانی (کانی بی) کۆبونەوەیەکمان کرد لەگەڵ هەڤاڵان عەلی بچکۆل ، مـام رۆسـتەم ، کـاك شـێخ جەعفـەر ، کاك رەهبەر ، شەهید مەلا ئاراس و کاك سیروان کوێخا نـەجم ، شـەهید دەشـتی ، کـاك حەمـه گیب ، نەخشەو پیلانی گرتنی ناحیەی ئاغجەلەر دانرا تیپی ئێمه و بەشێك له ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بۆ گرتنی رەبیەکانی تەوەکەل و تەوەکەل لەسەر جادەی گشـتی تکیـەر ئاغجەلـەر دانـرا بڕیاردرا شەوی ١٩٨٦/١٢/٢٦\٢٥ ئەو کارە ئەنجام بـدرێ ، هەرچـەندە هەنـدێك لـه هێزەکـان کارەکەی خۆیان به رێك و پێکی ئەنجام دا کەچی داخی گرانم ناکۆکی نێوان هەندێك له هەڤاڵان و ململانەی ناراست کارەکەی هەڵوەشاندەوە و پەکی خست . هاوزەمان ئێرانیش هێرشی بۆ سەر هێزەکانی عێراق و خاکی عێـراق لـه رۆژهـەڵاتی بەسـرە دەسـت پێکـرد ، سـەرەتا ئێرانیـەکان هەندێك پێشڕەویان کرد و جزیرەی (ام الرصاص ) داگیر کرا ، هێزەکانی عێراق بـه فەرمانـدەی ( بارق عـبدوڵا حاج حنگه ) ئێرانیەکانیان لەو جەزیرە دەرپەڕاند . ئێران بۆ ماوەی یەك مـانگ چەندین هێرشی گەورەی کردە سـەر رۆژهـەڵاتی بەسـرە و عێراقیـەکان توانیـان خـۆ رابگـرن لـه شەلەمچە و شلهه الاغوان و ام الرصاص ...هتد به دەیان هەزار سەربازی ئێرانی بکـوژن عێـراق ناوی لەو دوو شەڕە نا ( یوم العظیم ) و ( الحصاد الاکبر ) . بـەرای خـۆم ئـەو دوو شـەڕە پشـتی ماشێنی جەنگی ئێرانی شکاند ، وە نەیتوانی ئامانجی خۆی بپێکێ که گرتنی بەسـرە بـوو هـەر

بۆیەش لە پاشان ئێران شەڕەکانی گواستەوە کوردستان و لەوێرا بە هەردوولا کوردستانیان وێران کرد . بە گوێرەی ئەو هەواڵانەی بە سەرکردایەتی      ی . ن . ك گەیشتبوو کە نازانم سەرچاوەکەی کێ بوو دەبوایە سەدام ڕۆژی ١٩٨٧/١/١ لەسەر حوکم نەمێنێ . برادەران دیارە ئەو قسەیان بە منیش ڕاگەیاند هەرزوو بە مێشکم دا نەهات و زۆر گرنگیم پێ نەدا زۆر لە برادەران دەیانویست قەناعەتم پێ بهێنن کەچی چەند ڕۆژی تر دەگەڕێنەوە هەولێر هیچ چارەم نەما وتم ( برادەرینە چۆن سەدام حوسێن دەڕووخێ کە پێشتر هەموو دنیا لە پیلانی لابردنی بزانێ ) . بەهەر حاڵ ئەو برادەرانە هەندێکیان خۆیان بۆ ١٩٨٧/١/١ ئامادە دەکرد بەڕاستی جێگای سەرسووڕمان بوو. بڕیار وابوو کاك دارا برایم چەرمەگا مستەشاری فەوج بوو لەکاتی هاتنی بۆ ناو شۆڕش ئەو سەربازگە و عەمبارانەی عەسکەری تەسلیم بە هێزی پێشمەرگە بکات بۆ پاڵپشتی ئەو کارە هێزەکانی ئێمە بەرەو گەورە دێ و کانی بی نزیك بازیان بەڕێ کەوت دوو شەو لەوێ ماینەوە لە پاشان کاك شێخ دارا چەرمەگا خۆی و بەشێك لە چەکدارەکانی هاتن نەیویست خیانەت لەگەڵ حکومەت بکات دەستی بۆهیچ کەل و پەلی سەربازەکان نەبرد ئێمەش گەڕاینەوە دەشتی کۆیە .لە کاتێکدا دنیای بێ وەفا یادی سەری ساڵی تازەی دەکردەوە ، ئەو شەوە دە کاتژمێر بە پیادە ڕۆیشتین چەندین کیلۆمەترمان بڕی ، لە ڕۆژی ١٩٨٧/١/١ گەیشتینەوە گوندی ئۆمەر گۆمبەت کە سەیرم کرد پێشمەرگەکان هەموویان خەوتبوون تەنیا حەرەسەکەمان لەسەر لووتکەیەکی بەرز بە دووربینەکەی سەیری دەورو پشتی دەکرد لە دڵی خۆم وتم حەیف ئەگەر ئێستا پیاوێکی گەمژەو نەزان بێتە لامان لە هەندەران هاتبێ وا دەزانێ ئەو لاوە بەجەرگانە لە شەوی سەری ساڵ لە ئاهەنگ و سەما هەموویان مەست بوونە بۆیە وا خەوتوون ئەو گەمژانە نازانن (١٠) کاتژمێر بە پیادە لە دەیان هەوراز و نشێویان داوە دەیان جار بەو زستانە هەر بەو شەوە بە پێڵاوەوە بەناو جۆگە و ڕووبار کەوتوون ، دەیان جار ڕەتیان بردووە و خەو ڕێگای لێ بزر کردوون ، ڕەنگ بێ هەندێکیان نانی ئێوارەشیان نەخواردبێ ....کوردایەتی لەسەر شەراب خواردنەوە جیاوازە لەگەڵ ململانێی واقعی لەگەڵ مردن لە پێناوی گەل .

ئەو زەمانە بەبڕێن چێ کە ووشەیەك بەخراپە دەرهەق ئازایی و خۆڕاگری ئەو لاوە بەجەرگانە دەبێژێ ئەو چاوە کوێر بێ ماندووبوون و ئاستەنگی ئەو پێشمەرگانە نابینێ .

هەق و عەدالەت شوێن بزرن تا ئەو ڕۆژە نێتەوە یاد ، کە کوڕە دڵسۆزەکانی کورد بە نانە ڕەقە لە چیاکان دەژیان . هەقە دایکی شەهیدەکان جلی ڕەش فڕێ نەدەن ، هەقە جووتیارەکان و

باقی جەماوەری بەشەرەفی میللەتەکەمان مان بگرن بڵێن دەبێ ویژدان حەکەم بێ کوا هەقی کوڕانی ڕۆژی ڕەش کوا مافی ئەو کەسانەی کە شەو و ڕۆژ بەرگریان لە ناموسی گەلەکەمان دەکرد ؟

لە ڕۆژانی ١٠-٢٠/١/١٩٨٧ دوانزە پاسداری ئێرانی هاتنە لامان دەمزانی بۆ دوو مەبست هاتوون ، یەکیان کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر حکومەت وە دووەمیان : لەسەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە ئامادە بوونی چەند پێشمەرگەیەك لە گوندی ( شەیتان ) ئەو قسانەم لەگەڵ کردن :

ئێوە بە جاسوسی هاتوون ، من لێپرسراوی ئێرەم ڕێگا نادەم بگەڕێن چونکە ئێمە جاسوسی بۆ ئێران ناکەین ، ئەوە کاری پیاوی نامەردە ... خۆمان دوژمنی حکومەتی خۆمانین ئێوە چ پەیوەندیتان بەو مەسەلەیەوە نی یە ، ئەگەر دۆستایەتیمان دەکەن ئەوە دەتوانن یارمەتیمان بدەن ، ئێوە ناتوانن پارێزگاری لە ئێران بکەن ڕۆژانە بە دەیان جار فڕۆکەکانی عێراق شارەکانتان بۆردومان دەکەن لە تارانیش جێگاتان نابێتەوە جا چۆن دەتوانن پارێزگاری لە گوندی شەیتان بکەن کە چەند کیلۆمەترێك لە کەرکوك دوورە حکومەت بزانێ گوندەکان بە فڕۆکە دەکوتێ من یەك منداڵی کوردم لە هەموو ئێران خۆشتر دەوێ جا تکام وایە بڕۆن و لە کوێ هاتوون بگەڕێنەوە ئەوێ.پاسدارەکان دەیانویست بمان ترسێنن گوایە لەلای لێپرسراوانی خۆمان شکایەتمان لێ دەکەن بەهەرحاڵ زۆر مشت و مڕمان کرد دەرەهەرگیزیان نەهاتم لەبەر زۆر هۆ ناکرێ لێرە باسی بکەم ئەوەی هەقە بڵێم ئەوەیە :

پێشمەرگە دەبێ هەڵوێستی تایبەتی خۆی هەبێ و هەرگیز نابێ هەل پەرست بێ ڕەنگە منیش هەر ئەوەندەم پێ کرابێ و لە توانام دابێ بەڵام هەل پەرست بووین لەگەڵیان چووین تا نزیك کۆمپانیای سەربەشاخ لەوێ پاسدارێك بەناوی ( ڕەبانی ) ووتی چۆن دەتوانین ئەو ( محگە ) یە تێك بشکێنین منیش بۆم باس کرد کە چەند سەربازو ڕەبایە هەیە کارێکی ئاستەنگە ئەویش ووتی دەمەوێ خۆم بتەقێنمەوە یەکەم جار پاڕامەوە و ووتم : کاکە ئەوە هەرگیز نابێ چۆن کاری وا دەکەی لە پاشان بەرۆکی من دەگرن دەڵێن چۆن ئەو میوانەت بە کوشت دا زۆری پێ داگرت منیش ووتم وەرە بۆم بنووسە کە خۆت ئەو ڕێگایەت هەڵبژاردووە ئەوە لەگەڵت دێم هەتا نزیك ( سەربەشاخ ) جا حەز دەکەی دنیا بتەقێنەوە کە زانی کارەکە بووە ڕاست ووتی ( بعدا برگردین بە شەیتان تەماس برای اغای سادقی ) تێ گەیشتم ناوێرێ بەو جۆرە ئەو بەڵایەمان لەیەخە بۆوە

که گەڕاینەوە لە گوندی( قەمبەر ) بانگی کاك ئەنوەر عەزیز باوەم کرد هەندێك فارسی دەزانی زۆر داوام لێ کردن کە بگەڕێنەوە کە زانیم بە خۆشی ناسملێنن پێم وتن نەڕۆن بە زۆر دەرتان دەکەین بەو جۆرە گەڕانەوە .

ئێرانیەکان لەکاتی هاتنیان بۆ ناوچەکانی کوردستان هەر بەوە رازی نەبوون زانیاری لەسەر هێزەکانی بەعس کۆبکەنەوە بەڵکو هەوڵیان دەدا سیخوڕ و جاسوس پەیدا بکەن لە ناوچەکە بە هەزار فرت و فێڵ خەڵکیان بۆ خۆیان دەکڕی هەندێك کەسی وا دەهات پیاو شەرمی دەکرد لە مەجلیسی وا دابنیشێ کەچی دەبوایە زۆر رێزی لێ بگیرێ گوایە پشتگیری گەلی کورد دەکەن لە راستیدا بۆ شکانی پشتی شۆڕشی کورد هاتبوون .

لە رۆژانی ٢١ و ١٩٨٧/١/٢٢ هێزەکانی رژێم زنجیرە شاخی کلکە سماق و پشتی کانی سوور و الا الله یان داگیر کرد . ئەو زنجیرە شاخە گرنگی تایبەتی هەبوو چونکە دەیڕوانیە قەزای دوکان هەم ئیزگەی کارەبای لێیە وە هەم بە گرتنی ئەو زنجیرە شاخە مەترسی تۆپ بارانی دوور دەخستەوە . هەر ئەو رۆژە بەرێ کەوتین بۆ ناوچەی دەشتی کۆیە ( رۆژهەڵاتی کۆیە) هەمان شەو لە چەند قۆڵێك هێرشمان کردە سەر ئەو زنجیرە شاخە کە رژێم بە قوات خاصە پارێزگاری دەکرد

١/ ت ٢١ ی کەرکوك و ت٢٥ ی خاڵخالان بەفەرماندەی هەڤاڵ مام رۆستەم و شەهید مەلا ئاراس وکاك سیروان کوێخا نەجم بۆ جادەی کلکە سماق پاش شەڕێکی قورس و خوێناوی سەربازگەی ئەو شوێنە گیراو و زیاتر لە بیست پارچە چەك دەسکەوت و یەك دەبابەش بە ساغی کەوتە دەستی پێشمەرگەکان .

٢/ ت ٨٧ ی قەرەچوغ و بەشێك لە تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر لەلایەن ئێمە سەرپەرشتی دەکرا بۆ قۆیە بەرزەکانی پشتی گوندی الا الله پاش شەڕێك هەموو رەبیەکان گیران چەندین لاشەی سەرباز لە مەیدانی شەڕەکە بەجێما دەسکەوت (٢٣) کلاشینکۆف و دوو قەناسە و دوو جیهازی بچووك بوو .

٣/ ت ٩٣ ی کۆیە و بەشێك لە تیپی ٨٧ ی قەرەچوغ بۆ رەبیەکانی پشتی کانی کوردە بە فەرماندەی هەڤاڵ رابەر سەید برایم لەویش دوژمن بەهەمان دەستوور تێك شکا و دەسکەوتی پێشمەرگەش زۆر بوو . لەو شەڕە تەنها دوو پێشمەرگەمان شەهید بوون بە خوێنی ئەوان بە گریان و ناڵەی دایکی ئەوان ئەو داستانە تۆمار کرا .

هەق وابوو پاش گرتنەوەی پێشمەرگە بۆ بەرگری کردن لەوێ سەنگەری بگرتایە من شارەزای دۆخەکە نەبووم هەر ئەو رۆژە گەیشتبووینە ناوچەکە مام رۆستەم داوای کرد کە هەموومان

بگەڕێینەوە گۆپ تەپە و گەڕاینەوە ، هەر لەگەڵ گەردی بەیانی هێزێکی تری دوژمن لە دوکانەوە هات بەبێ تەقە شوێنەکانی گرتەوە .

بەڕێز مام جەلال بەیانی بروسکەی پیرۆزبایی بۆ کردین و سوپاسی پێشمەرگەو فەرماندەکانی کرد وایدەزانی ئێمە لەسەر شاخین کە سەیری بروسکەکانم کرد وا پێ دەچوو نەیزانیبێ کەلکە سماق دیسان لەلایەن دوژمن داگیرکراوەتەوە . بە مام رۆستەم و برادەرانم ووت کاکی خۆم با راستیەکەی بە مام جەلال بڵێین چونکە ئەوە مەسولیەتە جا هەر ئیجرائاتێك دەکات ئەوە ئازادە دیار بوو برادەران هەر نەیاندەویست راستیەکەی پێ بڵێین .

شەوی دواتر واتە نزیکەی(٤٨) چل و هەشت کاتژمێر بەسەر دۆخەکە تێ پەڕیبوو لە گوندی (سەرچنار) لەلای شەهید ( شوان ) دەعوەت بووین کاتژمێر(١) یەکی شەو پێم داگرت و بە مام رۆستەمم ووت دەبێ بروسکە بکەی کە شاخ لەدەستی دوژمنە بە ترس و شەرمەوە بروسکەی کرد بەیانی زوو گەڕامەوە ( ) چوومە لای جیهازەکەی خۆمان ئەو بروسکەیەم خوێندەوە:

لە- مام جەلال

بۆ / هەموو مەڵبەندەکان، هەموو تیپەکان، هەموو رێکخراوەکان

سلاوێکی شۆڕشگێرانە

بڕیارم دا (رۆستەم) لە ئەندامی مەڵبەند دەربکرێت .

بڕیارم دا (رەهبەر) لە فەرماندەی ت٩٣ لادرێت

تەواو .

هەرگیز نەدەبووایە ئەو مەسەلەیە لە مام جەلال بشارینەوە پاش ماوەیەك داوای منی کرد پرسیاری ژمارەی پێشمەرگەکانی کرد منیش ژمارەکەم پێ راگەیاند دەمزانی چەند تورەیە هەر مەپرسە .

پاش دوو رۆژ مام جەلال بروسکەیەکی بەو واتایەی بۆ کردین :

لە - مام جەلال

بۆ / کاك مەلا ئاراس + کاك رێباز + کاك سیوان

سلاوێکی گەرم :

وا کاك سەلاح چاو شین هات بۆلاتان ، بە قسەی من هاتووە ، هەرچی وت وابکەن .

پاش چەند ڕۆژێك كاك سەلاّح چاوشین گەیشتە لامان و لە گوندی گۆپتەپە كۆبونەوەیەكمان كرد پاش دیراسەیەكی زۆر بڕیار درا كە دۆخەكە لە مام جەلال بگەیەنین كاك سەلاّح بروسكەیەكی كرد بریتی بوو لە (٣٦٤) سیّ سەد و شەست و چوار پیتی جفرە مام جەلال بەیەك دێڕ وەلاّمی بروسكەكەی دایەوە :

لە - مام جەلال

بۆ / كاك سەلاّح چاوشین

نیازی شەڕ كردنتان نی یە .

تەواو .

ڕاستە گرتنی كلكە سماق و زنجیرە شاخی ناوچەكانی دەشتی كۆیە و خەلەكان دەخاتە ژێر كونرۆلی دوژمن ، ڕاستەكەلكە سماق زالّە ( مسیگر ) بەسەر ئیسگە (محگە ) ی كارەبای دوكان بەلاّم تاقی كردنەوەكانی شەڕ لەو ناوچانە ساغی كردەوە ئەگەر دوژمن بیەویّ شوێنێكبگریّ بەتایبەتی لە ناوچە دەشتاییەكان وە پێویستی عەسكەری وا بخوازیّ بە خسارەتی زۆریش بیّ دەیگریّ گرنگ ئەوەیە پێشمەرگەكان بتوانن دەستی چاكی لیّ بوەشێنن وە ماوەی حەسانەوەی نەدەن . لەویّ بڕیارمان دا زنجیرە ڕەبیەكانی جادەی گشتی تەق تەق — كۆیە بگرین لە شەوێكی ساردو چلەی زستان لە چەند لایەك هێرش كرایە سەر ئەو زنجیرە ڕەبیانە زۆربەیان گیران و دەسكەوت و دیل زۆر بوو لە ڕۆژی ١٩٨٧/٢/٦ گەڕاینەوە دەشتی هەولێری ڕەنگین .

لە ڕۆژی ١٩٨٧/٢/٧ هێشتا لە خەو هەڵنەستابووین كاك كۆسرەت بە بروسكە ئاگاداری كردینەوە كە لەگەلّ هێزەكانمان بەپەلە بگەینە بالیسان ، زۆر سەیرم پیّ هات دەمگووت دەبیّ برادەران حیسابی ماندوو بوونی پێشمەرگەكان نەكەن ....!!؟ ئەوە لەو مانگە بەبەردەوامی لە شەڕو شۆڕ دابووینە ، بریندارمان هەیە چەند جارێك بچینە دەشتی كۆیە و شێخ بزینی ، باشە دەبیّ پێشمەرگە لە پۆلاّ بەهێز تر بێت .. ئەمری خوای و ڕەزای هەق بەریّ كەوتین دوری دۆڵی بالیسان لە دەشتی هەولێر (١٥) كاتژمێر كەمتر نی یە بە پیادە . دیسان ڕیزمان بەست لە جادە پەڕینەوە هەورازی پیرە روو باقوب دەستی ماچ كردین ئێمەش نێوچاوانی چیای سەفینمان ماچ كرد چیای بەدارو بار و ڕەقانی هەورێمان بڕی ئێوارەی ١٩٨٧/٢/٩ گەیشتینە گوندی (توتمە )بەفر بە هەشتاوی دەهاتە خواریّ دنیا وەكو كافوری لێهاتبوو هەر ئێوارە كۆبووینەوە

بڕیاردرا شەوی ١٠\١١/٢/١٩٨٧ چالاكی گرتنی چیای كۆڕەك و فەوجی ئاكۆیان و رەبیەكانی دەورو بەر ئەنجام بدرێ بەیانی هەموو كەسێك وای پێشبینی دەكرد كە دوا بخرێ لەبەر بەفرو باران .

ئێرانیەكان پێیان داگرت بیرم كردەوە ووتم برادەرینە خۆتان ماندوو مەكەن ئەوان نیازیان نی یە هیچ بكەن تەنیا مەبەستیان ئەوەیە لە یادی سەركەوتنی شۆڕشی ئێران چالاكیەك بكەن چونكە ١١/٢/١٩٨٧ یادی سەركەوتنی شۆڕشی ئێرانە بەهەر حاڵ هێزەكانی مەڵبەندی سێ هێرشیان كرد فەوجی ئاكۆیان و رەبیەكانی گیران كەلەلایەن ت ١٢ ی سۆران بەفەرماندەی سەعید حەمە زیاد و مام غەفور فەرماندەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر هێرشیان بۆ كرا . ت ١٩ ی كۆڕەك بە فەرماندەی كاك عەولا بۆر بارەگای سریەی لەسەر جادەی كۆڕەك – خەلیفان گرت . ت ٨٧ ی قەرەچوغ دوو رەبیەمان بۆ دیاری كرا هەردوو گیران بەڵام جاشەكان زوو رایان كرد . پاسدارەكانیش بە شەلە شەل و پرمە پرم هەر هات و چوون هیچیان پێ نەكرا چەند تۆپێكیان لە كۆڕەك گرت بەڵام هیچی شوێنی خۆی نەپێكا . بۆ بەیانی ئێزگەی ئێران جارێ دا درۆی گەورەی كرد لەقەدەر خۆیان نەبوو ووتی رەزمەندگای ئیسلام شەوی گوزەشتە بەهەزاران لە ئەفرادی سەدامیەكان كوشت و بریندار كرد . سەرم سوڕ نەما و سەیرم پێ نەهات چونكە درۆی لەوەش گەورەتریان كرد بوو ، پاش ئەنجام دانی ئەو چالاكیە ماوەیەك لە دۆڵی بالیسان ماینەوە بۆ ئەوەی ئامادە بین نەوەكو رژێم كاردانەوەیەكی سەربازی هەبێت .

دۆڵی بالیسان شوێنی قایمە دوژمن وا بەئاسانی ناتوانێ هێرشی بۆ بهێنێ بەتایبەتی لەو زروفەی كە شەڕی عێراق – ئێران لە قۆناغێكی ناسكدا بوو وە هەم زستانیش سوپەرێكی چاكە بۆ ناوچە شاخاویەكان . لە پاشان گەڕاینەوە دەشتی هەولێر دیسان ئەو رێگا دوورو درێژەمان بە پیادە بڕی ، لە رۆژی ١/٣/١٩٨٧ كاك كۆسرەت هاتە دەشتی هەولێر لەوێ بڕیاردرا كە زنجیرە رەبیەكانی نێوان قوشتەپە و پردێ بگیرێ و زەبرێكی كوشندە بە دوژمن كەوێ لە شەوی ٣\٤/٣/١٩٨٧ لە چەندین قۆڵ هێرش كرایە سەر رەبیەكان و بارەگای سریەی جەیشی شەعبی لە ماوەیەكی كورت چەندین رەبیە گیراو بە دەیان لاشەی داگیركەران لە مەیدان بەجێما دەسكەوتی ئەو نەبەردە نزیكەی هەشتا پارچە چەكی هەمە جۆر بوو لەو شەڕە پڕ لە سەروەریە رۆڵەی بەوەفای گەلەكەمان كاكە ( رەوەند ) جێگری فەرماندەی كەرت شەهید بوو وە چەندین پێشمەرگەشمان بریندار بوون لەوانە كاك ( قارەمان شینە ) . كاك كۆسرەت بەرێ كەوت بۆئەوەی لە كۆبونەوەی سەركردایەتی بەشداری بكات لە رۆژی ١٤/٣/١٩٨٧ بەلای ئێمە

گەڕایەوە بۆ مەڵبەند ، گرنگترین بڕیارەکانی کۆبونەوەی سەرکردایەتی چۆنیەتی هاوکاری کردن بوو لەگەڵ ئێرانیەکان وە هەروەها لەوێ بڕیار درا کە جێ گۆڕکێ بە لێپرسراوانی مەڵبەند و سەر تیپەکان بکرێ لە زۆربەی شوێنەکان ئەو جێ گۆڕکێ یە کرا ، بۆئەوەی هیچ لێپرسراوێك نەبێتە مایەی بارگرانی لەسەر خەڵك و بەرژەوەندی تەسکی خۆی رەچاو نەکات وە هەم بۆ ئەوەی شارەزایی لە ناوچەکانی تر پەیدا بکات و ئەزموون و تاقی کردنەوەکانیش بگوازرێنەوە زۆر پێویستە ئەو ئاڵو گۆڕیە بکرێ بۆئەوەی هەڤاڵان لە کادیری خۆجێ ی رزگاریان بێت وە خۆیان بە کادیری میللەت بزانن .

جێ گۆڕکێی لێ پرسراو و کادیرو فەرماندەکان بە قازانجی گەورە دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕش و رێکخراوەکان چونکە مانەوەیان بۆ ماوەیەکی دوو رو درێژ لە شوێنی خۆیان بۆگەنیان دەکات و تووشی گێوگرفتی زیاد دەبن وە دەتوانن تەنها بۆ قازانجی خۆیان کار بکەن ، پیاو پیاوێنەو خزم خزمێنەو برادەرایەتی زۆر رەچاو دەکرێت . لەرۆژی پاش نەورۆزی ۱۹۸۷ بڕیار وابوو لەگەڵ کاك شاخەوان و مام غەفور و شەهید دەشتی بچین بۆ نزیك هەولێر بۆ ئەنجام دانی هەندێ ئیش و کاری پێشمەرگە ، رۆژێکی زۆر خۆش بوو بەهار تازە بەرەو هەوراز دەهات لە گوندی ئاوماڵ لەگەڵ فەرماندەی کەرتەکانی ت ۸۷ ی قەرەچوغ کۆبونەوەم هەبوو ئەو برادەرانەی کەلەسەرەوە باسم کردن هاتنە لامان لەبەر ئەوەی کۆبونەوەمان تەواو نەبوو ئەوان رۆیشتن بەو هیوایەی لە گوندی بێستانە یەك بگرینەوە کەچی ( تەقدیر و تەگبیر ) یەك نەبوو برادەران لە رێگا لەگەڵ کۆپتەرەکانی دوژمن تووشی شەڕ هاتن (۱۲) دوانزە کۆپتەرو چوار فرۆکەی پیلاتۆز رێگایان لێ گرتن تا ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو. هێزەکانی خۆمانمان کۆکردەوە کە گەیشتینە سەر پردی ( ئازیانە ) رۆژ لە کەل ئاواببو کە سەیرم کرد سێ سەیارەی برادەرانی سووتاندوە پێشمەرگەیەك شەهید بووە دوو پێشمەرگەش بریندار ببوون ، من کاك شاخەوان و کاك بەهرۆزم لەگەڵ خۆم برد ، شەو داهات لە ترسی تۆپ بارانی دوژمن بێ لایت دەڕۆیشتین لە نێوان کانی بزرە و کەردز لەگەڵ لۆریەك سەیارەکەمان دەعمی کرد کە چاوم هەڵێنا وا لە گوندی ئاوماڵ لەلایەن دکتۆر چارەسەر دەکرێم چەند رۆژێك وەزعم زۆر خراپ بوو هیمەتی شەهید ( د . فاچل ) هەرگیز لە یاد ناکرێت کە زۆر بە پەرۆشەوە چارەسەری دەکردین . بەڕاستی ماڵی مام جەبار ئاوماڵی خوا پاداشتی بداتەوە ماڵێکی خنجیلانەی شۆڕشەکەمان بوو زۆر حورمەتیان گرتین . پاش یەك هەفتە بەرە بەرە بەرەو باش بوون دەچووم ئەو جارەش خوای گەورە بەزەیی خۆی بەسەردا باراندین .

# داستانی رزگاری

لەرۆژی ١٩٨٧/٣/٢٩ بروسکەی مەڵبەند هات داوای کۆبونەوەی لێپرسراوانی دەکرد لە گوندی سماقوڵی سەروچاوە ، وەزعم زۆر خراپ بوو هێشتا لەناو جێگا کەوتبووم ، مێشکم کاس ببوو زۆر هەوڵم دا کە مۆڵەتم بدەن کاک کۆسرەت پێی داگرت و ووتی هەرچۆنێك بێت دەبێ بگەیە لامان . بەهاران رێگا و بان لەبەر باران دەبێتە قورِ و چڵپاو دەقنە ، ئوتوموبیل دەرناچێ بەتایبەتی بۆ کوێرە رێگاکان ، بە وولاغ رۆیشتین لە رِێگا لە گوندی قورتە- لاس سێ بەرخمان کرِی بۆئەوەی لەگەڵ برادەران لە پاش کۆبونەوە بیخۆین . لە رۆژی ١٩٨٧/٣/٣٠ کۆبونەوەکەمان لە گوندی سماقوڵی سەروچاوە دەستی پێکرد بە ئامادەبوونی ئەو هەڤاڵانە :

١. کاك کۆسرەت - لێپرسراوی مەڵبەندی سێ .
٢. کاك حەسەن کوێستانی - جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی سێ (ئەندامی سەرکرایەتی).
٣. کاك شێخ محمد ( ئەندامی سەرکردایەتی شۆرِشگێرِان { مسؤل تنظیم }
٤. کاك سابیر رەسوڵ ( لێ پرسراوی عەسکەری مەڵبەندی سێ )
٥. کاك رائد جەلال ( لێ پرسراوی عەسکەری مەڵبەندی سێ ) .
٦. کاك شاخەوان ( لێ پرسراوی رێکخراوی یەك - کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان ).
٧. کاك عبد الرزاق ( لێپرسراوی رێکخراوی دوو - کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان ).
٨. کاك رێباز ( فەرماندەی ت٨٧ ی قەرەچوغ ) . ٠
٩. کاك مەلا خدر ( لێ پرسراوی رێکخستنی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر — ك . رِ . ك
١٠. شەهید دەشتی ( جێگری فەرماندەی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر ) .
١١. مامۆستا بەکر ( فەرماندەی ت٩٣ ی کۆیە ) .
١٢. کاك محمد شینە ( جێگری فەرماندەی ت ٩٣ ی کۆیە )
١٣. کاك شۆرِش حاجی ( لێ پرسراوی رێکخستنی ت٩٣ ی کۆیە — ك . رِ . ك )
١٤. کاك عەولاّ بۆر ( فەرماندەی ت ١٩ ی کۆرەك )
١٥. مامۆستا سیف الدین ( لێ پرسراوی رێکخستنی ت ١٩ ی کۆرك — ك . رِ . ك) .
١٦. کاك تحسین کاوانی ( فەرماندەی ت٨٥ ی بەرانەتی ) .
١٧. شەهید عەلی مصیفی ( جێگرە فەرماندەی ت٨٥ ی بەرانەتی )

١٨. كاك بێستون ( لێ پرسراوی ڕێکخستنی ت٨٥ ی بەرانەتی ك . ڕ . ك) .
١٩. شەهید جوامێر ( جێگری فەرماندەی ت٩١ ی سەفین ) .
٢٠. کاك شوان (بهرۆز قەشقە) لێ پرسراوی ڕێکخستنی ت ٩١ ی سەفین ك.ڕ.ك .
٢١. کاك سەعید حەمە زیاد ( فەرماندەی ت١٢ ی سۆران ) .
٢٢. کاك گلعت خدر ( لێ پرسراوی ڕێکخستنی ت ١٢ سۆران - ك . ڕ . ك ) .
٢٣. کاك عەلی وەیس ( فەرماندەی ت٨٣ ی هەورێ ) .
٢٤. کاك عەبدولڵا توفیق ( لێ پرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی لە مەڵبەندی سێ ) .
٢٥. مامۆستا ئەحمەد جمد امین ( رابەری سیاسی ت ٨٧ ی قەرەچوغ ) .
٢٦. مامۆستا تەحسین کەریم ( رابەری سیاسی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر ) .
٢٧. مامۆستا ئازاد عوسمان ( رابەری سیاسی ت ٩٣ ی کۆیە )
٢٨. کاك شوکر ( رابەری سیاسی ت٨٥ ی بەرانەتی ) .
٢٩. کاك شێخ خالید ( رابەری سیاسی تیپی ٩١ ی سەفین ) .
٣٠. شەهید حسین بن دایزانی ( فەرماندەی ت٧٨ ی کاروخ ) .

ئەوانەو گەلێ لە کادیرو فەرماندەی تر بەشداری ئەو کۆبونەوەیان کرد لەسەر زۆر مەسەلەکانی سیاسی ، کۆمەلایەتی ڕێکخراوەیی ، پێشمەرگەیی ، باس و لێکۆلینەوە کرا . لە کۆبونەوەی دووەم تەنها سەرتیپەکان و لێپرسراوی مەڵبەند و جێگری لێپرسراوی مەڵبەند بەشدار بوون لەوێ دەقی بروسکەی بەڕێز مام جەلال خوێندرایەوە تێدا داوای هەزارو دوو سەد پێشمەرگەی مەڵبەندی سێ ی دەکرد کە لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١ لە دەشتی کۆیە ئامادە بن بەبێ ئەوەی کەسمان بزانێ ئەو هێزە ئەرکی چی یە بۆ کوێندەر دەڕوا.

بەپەلە من و شەهید دەشتی و مامۆستا ئەحمەد گەڕاینەوە هەر ئەو ڕۆژە جێ گۆڕکێ کراین دیسان چوومەوە ت٨٦ ی دەشتی هەولێر لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٢ هێزەکانی خۆمان لە دەشتی کۆیە ئامادە کرد لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٣ کاك کۆسرەت و برادەرانیش هاتنە دەشتی کۆیە لەوێ سەرژمێری تیپەکانمان کرد ئەو ژمارەی مام جەلال دەیویست تەواو نەبوو بۆیە لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٧ گەڕامەوە دەشتی هەولێر بۆ کۆکردنەوەی باقی هێزەکانی دەشتی هەولێر و قەرەچوغ . تاکو ئەو ڕۆژەش هیچ کەسمان نەمان دەزانی ئامانجی شەڕ کردنمان کوێندەرە هەر بە مەزندەی هەندێکمان دەمان گووت ڕەنگە بۆ دوکان بێت ، یان بۆ پاککردنەوەی زنجیرە شاخی

کلکە سماقە ، هەتا هەندێ کەس بیری بۆ هێرش بردنە سەر کەرکوك دەچوو ، هەر کاتێك هێزەکانمان لە ناوچەکەی خۆی دەبزووی هەندێ پێشمەرگە فێر ببوون بە بیانوی جیاجیا خۆیان دەدزیەوە چونکە لەلای ئێمە هەرگیز بەباش نەگوترا باش و بە خراپیش نەگوترا خراپ بۆیە خۆ دزینەوە ببوە کارێکی ئاسایی . هەقە هەنگاو بە هەنگاو کادیر و فەرماندە و پێشمەرگەکان هەڵبسەنگێندرێن ئەگەر وا نەکرێ کەس هەقی خۆی وەرناگرێ ( قوز بەسەریۆ ئەو گەلەی کە بە خراپ ناڵێ خراپ و بەچاك ناڵێ چاك. ) .

ئێوارەی رۆژی ١٩٨٧/٤/٧ گەیشتمەوە کەردز لە ماڵی مامۆستا عەزیز کەردزی (حاجی زەرد) تەوزیع بووین مامۆستا لەسەرەخۆ پرسیاری لێ کردم ووتی ئەو هێزە بۆ کوێندەر دەبەن منیش نەمدەزانی بۆ کوێ دەچین دەمویست سەر لەویش بشێوێنم دەمگوت رەنگە بەسەر سلێمانی دابدەین ئەویش بە پێکەنینەوە ووتی ئێوە لەلای جافەتی بەسەر حکومەت دادەدەن ئێرانیش لەلای ماوەت دێ . هەرچەندە هیچ زانیاریم نەبوو بەڵام لە مێشکی خۆم جێگایەکم بۆ ئەو قسە کردەوە بۆ برادەرانم گێڕاوە جانازانم مامۆستا ئەو دەنگ و باسەی چۆن و چلۆن زانی قسەکانی مامۆستا کەردزی دەرچوون .

رۆژی دواتر دیسان گەڕامەوە دەشتی کۆیە ، دوژمن دەیویست لە رێگا زەبر لە هێزەکانمان بدات رۆژانە بە بۆمبا گوندەکانی ( قزلو ، کانی بی ، گۆمە شین ) ی بۆردومان دەکرد زەرەر و زیانی ماڵی و گیانی لەخەڵك دا بەرە بەرە تیپەکان بەرەو سەرکردایەتی بەرێ کران بارەگای سەرکردایەتی ی . ن . ك لە دۆڵی جافەتی بوو ( یاغسەمەر ، بەرگەلو ) رۆژی ١٩٨٧/٤/٩ ئێمە بەرەو سەرکردایەتی رۆیشتین لە گۆپتەپە بەرەو عەسکەرو سووتکەو مایلەو کەلەشێرە و گەورە دێ ، گەپە و شیلان ئاوا کەلە پاش و لە جادەی دووکان پەڕینەوە بەرەو شەدەلە شۆڕمان کردەوە . رۆژی ١٩٨٧/٤/١١ گەیشتینە بارەگای سەرکردایەتی بەو هیوایەی باقی هێزەکانی تر لەگەڵ ئێمە بگەنە شوێنی دیاری کراو . رۆژی ١٩٨٧/٤/١٢ لەگەڵ کاك کۆسرەت و کاك سەعیدی حەمە زیاد و هەندێ لێپرسراوانی تر بەسەر شاخی باییز بەگ پشتی مێولاکە کەوتین بە دووربین سەیری شوێنەکانی دوژمنمان کرد لەسەر چیای ( حەسەن بەگ )و باخ و پشتی وراغلو ئەو دەورو بەرە بە مەزندەی هەموومان گرتنی چیای حەسەن بەگ لەیەکەم رۆژی دەست پێکردنی شەڕ کارێکی ئاستەنگ بوو، نوێژی شێوان هەموومان چووینە لای مام جەلال (بارەگای لە گوندی یاغسەمەر ) بوو لەسەرە خۆ بە هێمنی پێمان ووت کە چیای حەسەن بەگ

هەل و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە ئەویش رازی بوو کەلە قۆناغی دووەم چیای حەسەن بەگ بگرین . ویستمان لە دەرگا بچینە دەرەوە مام جەلال فەرمووی :

لە بیرم چوو پێتان بڵێم دەبێ قوماشی سوور پەیدا بکەن چونکە کۆپتەرەکانی ئێرانی فیشەك و ئازوقە فڕێ دەدەن ئەگەر ئالآی بۆ بەرز نەکەنەوە نازانێ هێزی پێشمەرگە لە کوێندەرە . راستە ئێرانیەکان ئەو بەڵێنەیان دابوو بەڵام من هەرگیز بڕوام بە قسەکانیان نەدەکرد ....!! شەو لەگەڵ شەهید عبد الرحیم لە هەڵەدن پرسیارمان کرد قوماشمان دەست نەکەوت لە بیرمە کاك عوسمانی قالە مەنەوەر کە هەڤاڵێکی پارتی بوو لەوێ لەگەڵ کاك عبد الرحیم زۆر بەو مەسەلەیە پێکەنین . شەوێ لە سەرگەڵو لە بارەگای کاك عبد الرحیم بووین هەر ئەو شەوە وەکو شەوانی پێشووتر رژێم تۆپ بارانی گوندی سەرگەڵوی کرد

ماوەیەکی زۆر رژێم بە فڕۆکە و تۆپ گوندی سەرگەڵوی بوردومان دەکرد ئەو گوندە خۆ راگرە زیاتر لە چل ڕۆڵەیان شەهید بوو تەنها بەهۆی بوردومانی فڕۆکەو تۆپەکانی بەعسی کەچی لەناو گوندی خۆیان دەژیان تۆپ باران ببووە شتێکی ئاسایی.

زۆر دڵگیر بووین چونکە تا پاش نیوەڕۆی رۆژی ١٩٨٧/٤/١٣ ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر و هەندێ لە هێزەکانی تر نەگەیشتبوون . بۆ ئێوارەی رۆژی ١٩٨٧/٤/١٣ هەموو هێزی پێشمەرگە ئامادە بوو . بڕیار وابوو هێزەکانی ی . ن . ك ( خەجە لەرزۆك ، کورەنگ ، قەیوان ، دوو برا ، باخ ، حەسەن بەگ ، وراغلو ، لووتکەی گۆچار ، جادەی ئەزمەڕ ، گوێژە ، بەشێك لە دۆڵی سەفرە و زەروون ) لە دوژمن پاك بکاتەوە هێزەکانی ئێرانیش هاوکات لەگەڵ هێرشی پێشمەرگە ( گردە رەش ، ماوەت ، گمو ، چوارتا ) بگرێت هێزەکانی دوژمن لە شارباژێر و ماوەت تەفرو تونا بکات . دیارە حکومەتی عێراق لەو دۆخە بێ ئاگا نەبوو هەر بۆیە رۆژی پێش دەست پێکردنی هێرشی پێشمەرگە ، قائیدی فرقەی (٣٦) سی و شەش لەسەر رەبایە و سەربازگەکان گەڕابوو پێی وتبوون هێرشتان بۆ دەهێنن ، وە هەرچی قوات خاصە هەبوو لەو شوێنانە کێشابوویەوە و جاشەکانی لەوێ بەجێ هێشتبوو . وە بروسکەشیان بۆ هەموو وەحدەکان کرد بوو .

لە شەوی ١٣\١٤/٤/١٩٨٧ هێرشی پێشمەرگە بۆ شوێنە دیاری کراوەکان دەستی پێکرد لە هەموو لایەکەوە بەم شێوەیەی خوارەوە :

١- مەڵبەندی یەك تیپەکانی ٥١ ی گەرمیان ، ٥٣ ی شێروانە ، ٥٧ ی سەرگرمە ، ٥٩ ی حەمرین ، ٥٥ ی قەرەداغ ، ١١ ی هەورەمان بۆ سەر لووتکەی ( خەجە لەرزۆك ، چیای

کورەنگ ، کەلکی قەیوان ، دووبرا ، چیای ئەزمەڕ ، سلێمانی ) لە ماوەی چەند کاتژمێرێك هەموو ئەو شوێنانە ئازاد کران بۆ نموونە لووتکەی خەجە لەرزۆك لەلایەن ت ٥٩ ی حەمرین هێرشی بۆکرا لە ماوەی یەك چارەك ئەو شوێنە هەڵەمووندە ئازاد کرا بە دەیان رەبایەی دوژمن و چەند سەربازگەو سەنگەری قایمی دوژمن گیرا بە دەیان لاشەی جاش و سەرباز لە مەیدانی شەڕەکە بەجێما ، وە بە سەدان پارچە چەك کەوتە دەستی پێشمەرگەکان هەموو ئەو شوێنانە بە خۆبەخت کردنێکی زۆر کەم بە واتایەکی تر بێ ئەوەی هێزی پێشمەرگە خوێنی زۆر بڕژێ ئازاد کرا .

٢- مەڵبەندی دوو بە هاوکاری لەگەڵ هەندێ تیپی مەڵبەندی سێ بە تایبەتی ت ٨٥ ی بەرانەتی بۆ دۆڵی گەلاڵە و سەفرەو زەروون دانرا لەبەر ئەوەی هێزەکانی دوژمن زۆر بە چڕی ناوچەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو وە زیاتر لەیەك لیوای لێ بوو نەتوانرا ئەو شوێنانە ئازاد بکرێن وە پێشمەرگەکان تووشی هەڵوێستی زۆر ناخۆش هاتن وە هەندێك زەرەرو زیانیشیان هەبوو .

٣- مەڵبەندی سێ : تیپەکانی ٧٨ ی کاروخ و ٨٣ ی هەورێ و ٨٦ ی دەشتی هەولێر و ٨٧ ی قەرەچوغ و ١٢ ی سۆران ٩٣ ی کۆیە و ٩١ ی سەفین بۆسەر لووتکەی بەرزی گۆچار و گوندی وراغلو و رەبایەکانی دەوروبەری و گوندی باخ و رەبایەکانی دەورو بەری.

ئەو شوێنانەی ئازاد کران لە زۆربەی شوێنەکان پێشمەرگە سەرکەوتووانە کارەکانی خۆی ئەنجام دا . لە گوندی باخ هێزێکی ت٧٨ ی کاروخ و ١٩ ی کۆرەك تووشی کەمینی دوژمن بوون و بە ئەلغام چەندین پێشمەرگە شەهید و بریندار بوون لەو قۆڵەش بەدەیان خۆفرۆشی دوژمن کوژراو و بەدەیانیش بەدیل گیران وە بەسەدان پارچە چەکی هەمەجۆر بەدەست پێشمەرگەکان کەوت ، بۆ بەیانی هێزەکانی مەڵبەندی سێ هەمووی جگە لەوانەی لەسەر لووتکەی گۆچار و بەرامبەر وراغلو سەنگەریان بەرامبەر دوژمن گرت گەڕایەوە گوندی ( گەڕە دێ ) . سەرجەم ئەو رەبیانەی گیرا (١١٤) سەد و چواردە رەبیە بوو وە چەندین سەربازگەش .

رۆژی ١٤/٤/١٩٨٧ شەڕ لەسەر جادەی گشتی ئەزمەڕ - سلێمانی وەهەتا قۆپی دووبرا زۆر گەرم بوو دوژمن توانی کۆنترۆڵی شەقامە گشتیەکە بکاتەوە .

دوژمن بواری نەداین دەستی کردەوە بە هێرشی پێچەوانە یەکەم جار هێرشی کردە سەر ( کۆرەنگ و خەجە لەرزۆك ) زۆر بە توندی ئاگربارانی شاخەکانی کرد . لە دەقیقەیەك چەند تۆپ بەو لووتکانە دەکەوت لەوێ زیاتر لە دە پێشمەرگە شەهید کرا وە چەندین بریندار بوون پاش سێ رۆژ توانی ئەو شاخ و لووتکە بەرزانە داگیر بکاتەوە . ئەو جارە بای داوە قۆڵی ( لووتکەی

گۆچار ) تیپی ئێمە لە بەرامبەر وراغلو بوو سێ شەو لەوێ ماینەوە شەو و رۆژ تۆپ باران دەکراین پێشمەرگەکان ئازایانە سەنگەریان گرتبوو ت٧٨ ی کاروخ و ت١٩ ی کوڕەك ئێمەیان گۆڕی شەوی دواتر پاش تۆپ باران هێرشی دوژمن دەستی پێکرد لەوێ پێشمەرگەی ئازا ( کێخوا ) فەرماندەی کەرت شەهید بوو . لە رۆژی ١٩ و ١٩٨٧/٤/٢٠ دوژمن لە هێرشێکی گەورە کە فڕۆکەی سەمتی و پیلاتۆز و تۆپی قورس بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەکار هێنا زیاتر لە سەد جار چەندین کۆپتەر بە نۆبەت شوێنەکانیان دەکوتا ت٨٥ ی بەرانەتی تا ئێوارە لە شەڕێکی کەم وێنە بەرگری لە لووتکەی گۆچار کرد پاش ئەوەی فیشەك و تەقەمەنیان تەواو بوو دوژمن لە هەموو لایەك هێرشی بۆ دەهێنان پاشەکشەیان کرد و رۆڵەی دڵسۆزی کورد و پێشمەرگەی ئازا و جەسور کاکە عەلی مەسیفی جێگری فەرماندەی ت٨٥ ی بەرانەتی لە خوار بەرزاییەکانی گۆچار بە خوێنی گەشی ئاڵای کوردستان یان نەمانی نەخشاند لەو شەڕە دوو کەرتی ت٨٦ ی دەشتی هەولێر ئازایانە بەشداری شەڕەکەیان کرد . بەم جۆرە دوژمن توانی هەموو ئەو شوێنانە داگیر بکاتەوە کە شەوی ١٣\١٤/٤/١٩٨٧ لەلایەن هێزی پێشمەرگە ئازاد کرابوو. هەقە ئەوەش بڵێین دوژمن هەموو ئەو شوێنانەی لە ساڵی ١٩٨٦ بە سێ مانگ داگیر کرد کە بەشەڕی( قەیوان - ماوەت ) ناوبانگی دەرکرد بوو ، کەچی پێشمەرگەکانی گەلی کورد ، ئەو رۆڵە بەجەرگانە بەچەند کاتژمێرێك لە شەوی ١٣\١٤/٤/١٩٨٧ وەریان گرتەوە و دوژمنیش بە هەفتەیەك داگیری کردەوە . لەو داستانە پڕلە شانازیە ، لەو شەڕە دلێرانەیە ، لەو شەڕی مان و نەمانە ، لەو گیان بازی کردنە ، لەو هەڵمەت و مەردایەتیە زیاتر لە (١٠٠) سەد رۆڵەی ئازا و نەبەز ، سەد لاوی قەشەنگ و خوێن گەرم ، سەد هیوای دوا رۆژی کورد ، سەد ئومێدی هەموو پارچەکانی کوردستان ، سەد فریشتەی پاك و بێگەرد سەد ئەسحابەی گەلی کورد شەهید بوون و خوێن و ماڵ و منداڵیان و کەسەری دایك و باوکیان خستە ئەستۆی ئێمە ، ئەو رۆڵە وەفادارانە سەلماندیان کە راست گۆ بوون لەگەڵ هەژارانی کورد ، دڵسۆزی راستەقینە بوون بۆ کوردستانی دایك یادیان بەخێر بێت . وە بەدەیان پێشمەرگەی وەفادارو جەربەزەش بریندار کران . لەو داستانە پڕ واتایە سەدان کوڕی کورد و دەیان فەرماندەی لێوەشاوە بەشداریان تێدا کرد لەوانە ( کاك عەولا بۆر ، هێمن ، عادل گەرمیانی ، کاك سامان ، کاك وەهاب ، کاك جەعفەر ، مام رۆستەم ، حسین بێ دایزانی ، مامۆستا بەکر ، محمد شینە ، رێباز ، سابیر رەسوڵ ، شەهید دەشتی ، شەهید جوامێر ، کاك سەرهەنگ ، کاك حەمە رەحیم ، کاك تحسین کاوانی ، نەهرۆ سەعید سۆفی ، مەلا سلێمان ، کاك بورهان ، کاك فاقە ، نوری قادر

،ئاوات قارەمان ، کاك حامید ، محمود سەنگاوی ، و بەدەیان تێکۆشەری تر جگە هەڤالانی سەرکردایەتی ی . ن . ك لەوانە هەڤالان کاك کۆسرەت ، کاك شێخ دارا ، کاك مولازم عومەر ، کاك فەرەیدون .....هتد)

ئێرانیش بێ ئەوەی یەك گوللە تۆپیش بەکاربێنێ بۆ پشتیوانی پێشمەرگە لە دوورەوە سەیری شەڕەکەی دەکرد پێویست ناکا دیسان دووبارەی بکەینەوە کە چەند درۆزن و مالوێران بوون سەرەڕای ئەوەی خۆیان بەشەرمەزار بزانن لە ناکاو بارەگای سەرکردایەتی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان لە ( گەرە دێ ) خستە بەر هێرش و پەلاماری تۆپەکانیان . بۆ ئەوەی وورەی خۆفرۆشەکانی بەرزبکاتەوە دوژمن لە زۆر شوێن چەکی کیمیاوی بەکارهێنا بە تایبەتی لە گوندی شێخ وەسانان کە زیاتر لە سەد و پەنجا کەس شەهید کران وە بە فڕۆکە لە گوندەکانی دۆڵی جافەتی دا و لە هەندێ گوند چەکی کیمیاوی بەکارهێنا ، بۆ خۆپاراستن لەو چەکە کۆمەڵ کوژە هێزەکانمان لە گوندەکانی ( مێولاکە ، چۆغماغ ، مالومە ، چالاوە قەرەنگێ ، قومرغان ، سی دەر ، مولان ، یاخیان ، ...هتد ) بارەگای خۆیان دانا . لە داستانی رزگاری دەرسێکی گرنگ بە دوژمن درا ، دەسکەوت و قازانجی زۆری بە شۆڕش و گەلی کورد گەیاند لەهەمان کات دۆستایەتی و هاوکاری کردن لەگەڵ ئێران بە چاوی گومانەوە لەلایەن پێشمەرگەوە سەیر دەکرا .

هێزەکانی مەڵبەندی سێ تا رۆژی ١٩٨٧/٥/٢٥ لە دۆڵی جافەتی مایەوە لە پاشان گەڕاینەوە دەشتی کۆیە ، دوژمنیش ، ناوچەکانی شەمامك ، مرکیە ، کەندیناوە ، قەراجی ، لە بێژنگ دابوو ، هەرچی گوندی ئەو ناوچانە هەبوو تەختی کردبوو ، رۆژانە هەواڵمان بۆ دەهات بە سەدان کوڕی ئەو ناوچانە پەیوەندیان بە شۆڕش دەکرد ، ئەگەر داستانی رزگاری هێزی پێشمەرگەی کوردستانی زۆر ماندوو هیلاك کردبێ ئەوە سەرلەنوێ خوێنی تازە هاتەوە ناو جەستەی چونکە هەر هەزاران سوتەمەنی شۆڕشەکانی کورد بوونە .

## دوو نەبەردی گەورە

## گرتنی تەق تەق وقاطعی ابو جعفر منصور

لە نیسان و مایسی ١٩٨٧ دوژمنی فاشی بێ بەزەییانە کەوتبووە گیانی میللەتەکەمان دەستی کردبوو بە تالآن و برۆ ، گوندەکانی تەخت دەکرد ، خەلکەکەی سەرگەردان دەکرد حکومەتی عێراق حکومەتێکی نان برە بیری لەوە نەدەکردەوە ئەو خەلکە چۆن دەتوانێ بێ کارو کاسبی بژی . بەلێشاو خەلکی لە ئۆردوگاکان دەپەستا ، زۆر خێزان هەبوو توانای دروست کردنی خانووی نەبوو بەناچاری تا دەستی دەهاتەوە بەرە خۆی لە چادر دەژیا ، شینایی و باخچەکانی تێك دەدا ، بیرەکان و کانیاوەکانی کوێر دەکردەوە بە کورتی جووتیارەکان ئەوەی بەرەنج و ماندووبوونی چەندین ساڵ وەدەستیان هێنابوو بەیەك کاتژمێر کەوتنە سەر ساجی عەلی ، زۆر پیاوی خانەدان و خاوەن قۆناغ لە شەقام و کۆلانەکانی ئۆردوگاکان دەکەوت خەلك خێری پێ دەکرد ، مەرو مالاتی گوند نشینەکان بە ناچاری بە نرخێکی هەرزان فرۆشران و زگ گەورەکان لەگەڵ قاقای پێکەنین فرمێسکیان لە خاوەن مەرو مالات دەهێنا . حەرام کرابوو خەلك بە سەردانیش بچێتەوە شوێنی باوك و باپیران ، تاوان بوو بەسەری زمانیش گلەیی بکەی کە چۆن ئەو دەردە هاتە سەرمان . سەدان گوندی خۆش و سەفا لەگەڵ زەوی یەکسان کرا ، خەلك بە چاوی پڕلە گریان لە خاك و نیشتمانی خۆی دوورخرایەوە . دوژمن لێفەو قاپ و قاچاغی ناو مالیشی بەتالآن بردن . سەرانسەری گوندەکانی قەراج، کەندیناوە شەمامك ، بناری دیدەوان هەتا ئەو شوێنەی دوژمن دەستی پێ رادەگەیشت بە ماوەی مانگێك شوێنەواریشیان نەما ، سالەیی و شوان و شێخ بزێنی و بەشێك لە گوندەکانی گەرمیان بە دەردی ناوچەی دەشتی هەولێر رۆیشتن .

لە داستانی رزگاری زەبرێکی کوشندە بە دوژمن کەوت بەلآم نەتوانرا ئەو ئامانجەی بۆی چووبووین جێبەجێ بکەین ، هەر زوو ناوچەکەیان داگیر کردەوە بۆ ترساندنی میللەتەکەمان بە دەیان جار چەکی کیمیاوی بەکار هێنا ، خەلك لە ترسی چەکی کیمیاوی بێ ئەوەی دوژمن بەهێز بیگاتێ بە ناچاری گوندەکانی چۆل کران ، پیاوەکانی رژێمیش پروپاگەندەیان دەکرد گوایە رژێم دەیەوێ لەو گوندانە بدات کە تائیستا ئاوەدانی لێ ماوە .

که ڕۆیشتین بۆ داستانی ڕزگاری خەڵك لەسەر جێگاو ڕێگای خۆی بوو گوندەکان جمەیان دەهات هەر کەسە خەریکی ژیانی خۆی بوو .

گەراینەوە سەر ( هەواری خاڵی ) پیاو بەدەستە خۆی نەبوو گریانی دەهات دەتگوت ، لە بیابانێکی گەورە داین ، دیوار بەسەر یەکدا رووخابوو ، نەمام و دارەکانی حەوشەی ماڵەکان لە بێ ئاوی سیس و ووشك ببوون یان بەبەردەمی شۆفل کەوتبوون ، دەشتی پان و بەرینی دزەییان زیندەواری لێ نەدەجولا ، نەسەیارە تۆزی دەکرد ، نەفانۆسێك لە دوورەوە تروسکەی دیار بوو ، نەمێگەلە مەرێك دەچوە سەر کول و ئاو ، لە هەموو لایەك دووکەڵ هەڵدەستا ، جاش و هێزە سەربازیەکان بۆئەوەی بەیەکجاری کۆری بکەنەوە ئاگریان لە پوش و پەڵاشیش بەردەدا ، تەنیا ئێواران چەند جووتیارێك دەهاتنەوە گوندەکەی خۆیان بۆئەوەی ئەگەر پاشماوەی ماڵەکەیان مابێ بە دزی بیبەنەوە ئۆردوگا . لەو حاڵەتە ناخۆشە گەراینەوە ، چارەی دەردی ئەوها گران ، ئەو داخ و کەسەرە هەر بە زەبری وەشاندن چارەسەر دەکرێ ... نائومێدی دادی کوردان نادات هەر بۆیە لە ڕۆژی ۲۹/۵/۱۹۸۷ پاش دانانی پیلانێکی ڕێك و پێك لە چەند لایەك هێرش کرایە سەر شارۆچکەی تەق تەق کە لەمێژ ساڵبوو دوژمن وەکو مۆڵگایەکی سەرەکی ئەو شوێنەی هەڵبژاردبوو بۆدابین کردنی هاتووچۆ لە نێوان هێزەکانی کەرکەك تا قەڵادزێ و سنووری ئێران . چەند ڕۆژێك خەریکی خۆئامادە کردن بووین ، چەند سەرۆك جاش و مەفرەزە خاسە پەیوەندیان پێوە کردین ئەویش ئاشکرایە لە ترسان بوو چونکە بێ گومان بوون لەوەی کەلە تەق تەق دەدەین هەرچەند لەکاتی جێبە جێ کردنی کارەکەمان ئەو جاش و مەفرەزە خاسانە پەشیمان بوونەوە ، رابواردن و پارەی زۆرو قسەرو قسووریان پێ باشتر بوو لە سەربەرزی و شەرەف و کەرامەت .

پاش کۆبوونەوەیەکی چەند کاتژمێری لە رووباری کۆیە لە نزیك گوندی ئۆمەر گومبەت بە لێپرسراویەتی کاك کۆسرەت لە ڕۆژی دیاری کراو بەم شێوەیە هێرش دەستی پێکرد بۆ سەر هەموو مۆڵگاکانی دوژمن لە شارۆچکەی تەق تەق :

١- <u>**قۆڵی یەکەم :**</u> ت٢١ ی کەرکوك و ت٢٥ ی خاڵ خالان بە فەرماندەی هەڤاڵی شەهید کاك عبدالرحیم لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی دوو بۆ سەر بازگەی قەڵاتە کە لەلایەن (قاگع) یەك جەیشی شەعبی پارێزگاری لێ دەکرا پاش شەرێکی کەم وێنە پێشمەرگەکانی کوردستان کورەکانی بابە گور گور کەلە مەیدانی شەڕو پێك دادان تاقی کرابوونەوە هەر زوو هێزەکەی دوژمنیان تەفرو توناکردزیاتر لە ( ٣٠ ) سی جەیشی شەعبی کوژران

وهەندێك بەدیل گیران دوو زریپۆشیش بە ساغ و سەلامەتی کەوتە دەستی پێشمەرگەکان و زیاتر لە شەست پارچە چەك کە دۆشکەیەکی تێدابوو دەسکەوتی رۆڵەکانی کەرکوك بوو بە داخەوە بەهۆی گوللەیەکی وێڵ رۆڵەی بە وەفای گەلەکەمان ، فەرماندەی ئازا و جەسوور کاك عبد الرحیم شەهید بوو .

٢- قۆڵی دووەم : ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر بۆ رۆژئاوای تەق تەق بوو لێدانی سێ رەبیە بەماوەیەکی کورت هەر سێ رەبیەکە گیرا و (١٤) کلاشینکۆف و گەلێ کەل و پەلی سەربازی کەوتە دەستی پێشمەرگەکان (١٠) دەجاشیش بەدیل گیران . گرنگی ئەو قۆڵە لەوە بوو رێگای تەق تەق بۆ رووباری کۆیە کەوتە ژێ کۆنترۆڵی پێشمەرگە بە ئاسانی هاتووچۆ کشانەوەی هێزەکانی ناو تەق تەق دابین کرا ، مەترسی ئەوە نەما کە هێزەکانمان بکەونە ئابلوقەی دوژمن .

٣- <u>قۆڵی سێ یەم :</u> ت٨٥ ی بەرانەتی و ت٩٣ ی کۆیە بۆ رۆژهەڵاتی کۆیێ توانیان یەك رەبیە بگرن ، پێشمەرگەکان تووشی کەمین بوون لە ئەنجام چوار پێشمەرگە شەهید بوون .

٤- <u>قۆڵی چوارەم :</u> بەشێك لە ت٨٧ ی قەرەچوغ بۆ سەر بارەگای فەوجی جاشەکان لە نزیك تەق تەق بە ماوەیەکی کورت دەست بەسەر بارەگای فەوج گیرا لە هەمان هێرش مەفرەزەیەکی دەستەی کاك کۆسرەتیش بەشداری کاریگەریان کرد . لەوێ زیاتر لە (٣٥) سی و پێنج پارچە چەك دەسکەوت بوو .

٥- <u>قۆڵی پێنجەم :</u> ت ١٢ ی سۆران و ت٧٨ ی کارۆخ وت ٩٣ ی کۆیە و بەشێك لە تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر و بەشێك لە ت ٨٧ ی قرەچوغ بۆ سەر دام و دەزاگاکانی رژێم و مۆڵگای جاشەکان لە ناو شاری تەق تەق . شەڕ لەوێ تا بەیانی گەرم بوو ئێمەش چووینە ناو شار لەوێش چەندین شوێنی گرنگ گیرا و چەندین پارچە چەك دەسکەوت تەنیا مەخفەری پۆلیس و بارەگای رێکخراوی بەعس ( منظمە ) کەلەلایەن موختارە هەڵاتووەکانی گوندەکان پارێزگاری لێ دەکرا نەتوانرا دەستی بەسەردا بگیرێ . ئەو شەوە شارۆچکەی تەق تەق بەتەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی هێزی پێشمەرگە دابوو ، شەوێ درەنگ لەناو شار لەگەڵ کاك کۆسرەت و برادەران یەکترمان گرتەوە ، خەڵکە نیشتمان پەروەرو دڵسۆزەکان زۆر شاد و سەربەرز بوون ، جاش و کاسە لێسەکانیش هەردەم شەرمەزارو رووڕەش بوون وەکو سەگ کلکە سووتەیان دەکرد .

پاش نیوه شەو کۆپتەرەکانی دوژمن هاتنە سەر شار بەدەیان جار بە ساروخ شارو دەورو بەری شارەکەیان بوردومان کرد بەیانی لەگەڵ رۆژهەڵات گەڕاینەوە گوندی ئۆمەر گومبەت و ڕووباری کۆیی پاش ئەوەی دەستی باشمان لە دوژمن وەشاند.

لەو نەبەردە یازدە ڕۆڵەی تری گەلەکەمان گیانیان بە خاك و نیشتمان پێش کەش کرد ئەو داستانەیان بە خوێنی گەشیان لە مێژووی میللەتەکەیان نووسیوە لە پێشەوەی هەموویان شەهید عەبدولرەحیم و شەهید ئازاد داربەسەری (فەرماندەی کەرت لە ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر). پێویستە ناوی ئەو تێکۆشەرانەش بە ئێوە ئاشنا بکەم، کە ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لە تۆمارکردنی ئەو داستانە لە پێشەوەی هەمووان هەڤاڵ کۆسرەت و شەهید عەبدولرەحیم و شەهید دەشتی و مام غەفور، ڕێباز، سەعید حەمە زیاد، حوسێن بن دایزانی، شەهید عەریف ئەکرەم، شەهید ئازاد داربەسەری، شەهید محەمەد شینە، کاك فاروق عەلی مەولود (کاك فاروق زۆر بە خەستی بریندار بوو پاش تێپەڕی ئێستاش شوێنەواری برینداریەکەی پێوە دیارە)، کاك مەلا سلێمان و تەحسین کاوانی و کاك ئاسۆ، بورهان سەعید سۆفی، لەتیفە سوور، عومەر ناسر، شەهید مەناف، نەهرۆ سەعید سۆفی، نووری قادر باریکەوە بەدەیان تێکۆشەری تر، کە بە داخەوە ناوی یەکە یەکەیان نازانم وە هەندێکیان گەیشتوونەتە کاروانی نەمرانەوە، کە ڕۆژ داهات کۆپتەرەکانی دوژمن زۆر دڕندانە کەوتنە بوردومان کردنی ناوچەکە و دەور و بەری خۆش بەختانە هیچ زیانی گیانی بەدواوە نەبوو.

پاش ئەو چالاکیە شۆڕمان کردەوە سێ گردکان و ئاوماڵ و شەیتان، لەوێ ڕاوێژ دەستی پێ کرد (تەکبیر) لەوە کرا، کە چۆن زەبرێکی کوشندەی تر لە دوژمن بوەشێندرێ بۆ ئەوەی دڵی جووتیار و هەژارانی کورد شاد بکەین، بۆ ئەوەی کوردەکان بزانن هەقیان بە فیڕۆ ناڕوات و هەم دوژمنیش بزانی ئەگەر هەموو کوردستان کاوڵ بکات دەست لە خەبات هەڵگرتن لە پێناوی ئازادی کوردستانی ئازیز مەحاڵە و نەستەمە.

لەمێژ بوو گرتنی (قاگعی جەیشی شەعبی ـ ئەبو جەعفەر ئەلمەنسور لە گوندی سێ قوچان لەسەر جادەی گشتی کەرکوك — هەولێر ) باسی لێ دەکرا ، چەند جارێك هەوڵی بۆدرا سەری نەگرت ، شەوی ١١\٢/٦/١٩٨٧ چەند سەرتیپ و فەرماندەی کەرت چووین بۆئەوەی ڕێگاو شوێنی گرتنی دابنێین لەوانە سەعید حەمە زیاد و مام غەفور و من لەگەڵ بووین پەرچی تێکەوت بۆمان نەکرا گەڕاینەوە لای کاك کۆسرەت لەوێ هەردوو فەرماندەی کەرت کاك نوری قادر و شەهید عومەر عەوێنە بەڵێنیان دا کە بە هەردوو کەرتەکەی خۆیان ئەو قاتعە دەگرن .

لەشەوی ٣\٤/٦/١٩٨٧ ئەو دوو کەرتەی ت ٨٧ ی قەرەچوغ بە فەرماندەی ئەو فەرماندە ئازایانە هێرشیان کردە سەر بارەگای (قاگع ) زۆر بەئاسانی و بەبێ زیان دەستیان بەسەرداگرت لەوێ زیاتر لە (٢٠٠) دوو سەد کلاشینکۆف و چەندین چەکی هەمەجۆری تر و چەندین ئوتومبیل و تەقەمەنیەکی یەکجار زۆر کەوتە دەستی پێشمەرگە بەچەند ئوتومبیلێك هەموو کەل و پەلەکان گوازرانەوە ناوچە ئازاد کراوەکان وە (٣٦) لە لێپرسراو و جەیشی شەعبی کوژران و گەلێکیش بە دیل گیران . هاوزەمان لەگەڵ لێدانی قاتعی جەیشی شەعبی چەندین کەرتی ت٨٦ و ت٨٧ هێرشیان بۆسەر رەبیەکانی سەر جادەی گشتی کرد ئەوانیش چەند رەبیەکیان دەست بەسەردا گرت و چەك و تەقەمەنی زۆریان دەسکەوت ، لەو شەڕ و پێك دادانە رۆڵەی بەوەفای گەلەکەمان پێشمەرگەی رۆح سووك فەرماندەی کەرت کاك فۆاد گۆمەشینی شەهید بوو ، لەگەڵ گەردی بەیانی کۆپتەر و پیلاتۆزەکانی دوژمن هاتنە سەر ناوچەکەمان لە دۆڵی (شەرغە ) چەندین ئوتومبیلیان سووتاند و زەرەرو زیانی ماڵیان بە کێلگەی جووتیارە هەژارەکان گەیاند ، ئەنجام دانی ئەو دوو چالاکیە لە سەرانسەری کوردستان و بەتایبەتی لە شاری هەولێر دەنگ و سەدای باشی داوە . بەڕێز مام جەلال بە بروسکەی تایبەتی بەهۆی ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان پیرۆزبایی لە لێپرسراوی مەڵبەند و فەرماندەی تیپەکان و کەرتەکان کرد . لە رۆژی ٧/٦/١٩٨٧ کاك کۆسرەت گەڕایەوە دۆڵی سماقوڵی ( بارەگای مەڵبەند )

# برایەتی و تەبایی

لە درێژەی باسەکەمان زۆر جار دڵی خوێنەرمان بریندار کردوە ، شەڕی براکوژیمان باس کردوە رەنگە خۆشم بەخراپم زانیبێ بەڵام هەروەکو بەڵێنم پێدابوون کە هیچتان لێ نەشارمەوە بۆیە ناچار بووم رووداوەکان ، پاز نەدەم تاکو هەموومان پێکەوە شارەزایی تەواو پەیدا بکەین و بزانین لە شاخەکانی کوردستان چ باس و خواس بووە .

زۆر جار لە کۆڕو کۆبونەوەو هەڵسان و دانیشتن بە هەڤاڵانی خۆمانم دەگوت بابە شەڕیش دەبێ بای ئاشتی تێدا بهێڵینەوە هەموومان کوردین براو خزم و کەس و کاری یەکترین ، چارەنووسمان هاوبەشە ، رۆژێك دادێ بەو کارو کردەوەی کە کردوومانە پێدەکەنین و پەشیمان دەبینەوە رەنگە هەندێ کەس ئێستاش بڵێ پەشیمان نیم چونکە دەزانم دەیەوێ جێ پاروی خۆی چەور بکات و ئەوەندە خۆی بە دڵسۆز بزانێ هەق و ناهەق لێك ناکاتەوە ئەو کاتە هەست پێ دەکات کە تەراززی حاکم دەبێت . شەڕی براکوژی دیاردەیەکی خراپ و دزێوە ، کوشتنی برای هاوسەنگەر لە زیان هیچ هەنگاوێك شۆڕش و حزبایەتی بەرەو پێش نابات . کوشتن و بڕین دیاردەیەکی ناشارستانیە جا دەبێ لە رەگ و ریشەوە هەڵیتەکێنین و بن بڕی بکەین خۆ بێ شك هەوڵو کۆششی زۆری گەرەکە . ساڵەها بوو گەلەکەمان لە ژێر باری شەڕی براکوژی دەیناڵاند ، بەسەدان کادیرو پێشمەرگە و تێکۆشەری میللەتەکەمان بە ناهەق شەهید کران . زۆر جووتیارو رۆشنبیرو کرێکار بوونە سووتەمەنی ئەو سیاسەتە ناڕاستە . هیچ کارێك رێگای راست و دروستی خۆی ناگرێ ئەگەر پێشتر بە ووردی بیری لێ نەکرێتەوە . ئەو هەموو هەڵلاو هوریایە پێم وایە هەمووی بڕیاری سەرپێ یی بوو ئەگینا قازانجی گەلی کورد لە کورد کوشتن نەبووە .

پاش کۆتایی هاتنی مفاوەزات لە ساڵی ١٩٨٥ هەموو حزب و رێکخراوە کوردستانیەکان کەوتنە خۆ ، هاتووچۆ دەستی پێکرد بەشەرمەوە لەگەڵ یەکتر قسە دەکرا چونکە هەموومان دەمانزانی چ جۆرە خراپیەك کراوە . بەرە بەرە ئەو هاتووچۆیە بووبە رێککەوتنی دوو قۆڵی لەناو شۆڕش .

لە بەهاری ١٩٨٦ رێکەوتنێکی دوو قۆڵی لە نێوان ( ی . ن . ك ) و حزبی سۆسیالیستی کوردستان مۆرکرا بە گوێرەی ئەو رێکەوتنە کۆتایی هات بە حاڵەتی شەڕ کردن لە نێوان هەردوو ئەو هێزە ، بەو جۆرە پێشمەرگەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان ، بەهەمان شێوە

هەڤالانی پارتی سۆسیالیستی کورد (پاسۆك) و پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان رێکەوتن نامەیان لەگەڵ ی . ن . ك مۆر کرد هەڤاڵ سامی عبد الرحمن ئەمینداری پارتی گەل لە هاوینی ١٩٨٧ سەردانی بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کرد لەوێ لەگەڵ مام جەلال و هەڤالان بیرو ڕای خۆیان گۆڕیەوە لەسەر چۆنێتی بەرەنگاربوونەوەی ڕژێم کاك سامی لەکاتی گەڕانەوەی بەلای ئێمەدا گەڕایەوە بەچاوی خۆی دڕندەیی و فاشیتی بەعسی بینی ئازایی و جەربەزەیی پێشمەرگەکانی کوردستانی ڕێز لێ نان لە نامیلکەیەك بەناوی ( جولە فی الارج المحروقە ) . لەسەرەتای سالی ١٩٨٧ بە تەواوی لەگەڵ لایەنەکانی تری کوردستان ڕێکەوتن مۆرکرا ، ئەگەر شەڕی براکوژی لەسەرەتای هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بەردەوام بوو بێ تا سالی ١٩٨٧ ئەوە لەو کاتەوە ئەو دیاردەیە تا ڕادەیەکی زۆر کەم بیۆوە دەتوانم بڵێم بە واتای شەڕی برا کوژی هەر نەماوە جگە لەهەندێ کەسی نامەسئول کە هەست بە قازانجی گەلی کورد ناکات یان هەر نایەوێ کورد بگاتە جێگای شایستەی خۆی لەم لاو لەو لاهەندێ جارشەڕو شۆڕی ناعادیلانە ڕوودەدات خەڵك دەخاتە گومان لەو برایەتیە و تەباییە ئەگینا بە شێوەیەکی گشتی حزبەکان ڕێکەوتن ئەگەر هەندێ حزب و ڕێکخراویش دڵی بۆ شەڕی براکوژی لێ بدات ئەوە گەلەکەمان چاو و مێشکی کراوەتەوە ، پەنجەی تاوانی بۆ درێژ دەکات ئەو جۆرە کەسانە ناچار بوونە بە دڵە کوتە مردن بۆ خۆیان نزیك دەکەنەوە . بن بڕ کردنی شەڕی براکوژی ئەرکی سەرەکی سەرکردەکانی شۆڕشی کوردستانە بە پلەی یەکەم ، وە میللەتەکەشمان دەبێ لەمەو دوا هەق و حیساب بۆئەو حزب و ڕێکخراو و کەسانە بکات کە دەست پێشخەر دەبن لە هەڵگیرساندنی ، وەبیری لێ بکاتەوە و بپرسێ بۆچی ئەو شەڕە کراوە و دەکرێ.

میللەتی کورد خزمەتکاری هیچ حزب و ڕێکخراوێك نی یە گەلی کورد قاوەچی و شەقرچی و سەپانی هیچ کەسێك نیە ، ئەوان کوڕیان لە مەیدان شەهید دەبێ ، ئەوانە گوندیان تالان دەکرێ و تەخت دەکرێ ، ئەوان ئاوارەو دەربەدەر دەبن بۆیە هەقیشە ئەوان حاکم بن لەسەر حزب و ڕێکخراوەکان وە بواری هیچ کەسێکی تێکدەر نەدەن گاڵتە بە چارەنووسمان بکات . کوردستان یەك حاڵەتە لە زاخۆ تا خانەقین ، نابێ هیچ لایەك پاوان کاری بکات خەڵك سەربەستە چ نوێنەرێك بۆخۆی هەڵدەبژێرێ دیاردەی پاوان کاری و سەرکوت کردنی خەڵك هێشتا لە کوردستان تا ڕادەیەك ماوە ، هێشتا هەندێ کەس میللەتی کوردی پێ نەزان و ناوشیاوە ، ئەوەی لە بیر خۆی بردۆتەوە کە دڕندە ترین ڕژێمی لە کوردستان راماڵی و دەزگا جاسوسیەکانی تەفرو تونا کرد ...!!؟

چاکو خراپە بە تەنیا بەکەسێك ناکرێ بۆیە بە هەوڵ و کۆششی هەموو لایەك بەرەی کوردستانی لە ١٩٨٨/٥/٧ دامەزرا کە دەبوایە بیست ساڵ پێش ئەو مێژووە ئەو بەرەییە سەرکردایەتی شۆڕشی بکردایە . بەرەی کوردستانی دەسکەوتێکی مەزنی گەلی کوردە دەبێ وەکو گیانی خۆمان بیپارێزین دەبێ بوواری هیچ کسێك نەدەین تۆز قاڵێك کەلێن بخاتە ئەو بەرەییە . بەرەی کوردستانی پێك هات لە :

پارتی دیموکراتی کوردستان ، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، حزبی شیوعی عێراق(هەرێمی کوردستان) ، حزبی سۆسیالیستی کوردستان ، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان ، پارتی سۆسیالیستی کورد ( پاسۆك ) ، پاش ماوەیەك حزبی ئاستەنگکێشانی کوردستانیش بوو بە ئەندام لەبەرە . بەم جۆرە لاپەڕەی براکوژی (لاپەڕەی رەش) کۆتایی هات و لاپەڕەی سپی (برایەتی و تەبایی و هاوکاری ) کرایەوە ئاواتی هەموو کوردێکە ئەو تەبایی و برایەتیە لە ئاستی بەرز تر ببینن بۆ ئەوەی هەمووومان بە ئاسودەیی ژیانی پڕ لە سەروەری ببەینە سەر .

# حزبی ئاستەنپکێشانی کوردستان

## ئالای شۆڕش

لە ئەنجامی کار و هەڵوێست و کردەوەی رۆژانە گەلێ حزب و رێکخراو تووشی پارچە پارچە بوون دەبن وە هەندێ جار چەند ئەندامێك بۆ بەرژەوەندی تەسکی خۆیان حزب و رێکخراوەکەیان تووشی پارچە پارچە بوون و لێك هەڵوەشانەوە دەکەن . ئەو دیاردەیە لە هەموو جیهان هەیە بەڵام زەرەرو زیانی بۆ هەمووان وەکو یەکتر نیە . پارتێك یا رێکخراوەیەك لە وولاتێکی وەکو فەرەنسا ، ئەڵمانیا ، نەمسا یان هەتا ولاتانی عەرەبی ئەگەر حزبەکەیان تووشی شکست و لێك ترازان ببێ ئەوە نەتەوەکە ئەوەندە زەرەر ناکات چونکە خاوەنی کیانی خۆیانن ( حکومەت و وڵاتی خۆیان) هەیە خەڵك بە چاوی شەرِ خودی حزبەکە یا رێکخراوەکە سەیر دەکات .

کوردستان وڵاتێکی داگیر دابەش کراوە ، هێشتا کەس دان بە وولاتی سەربەخۆی کوردستان نانێ هەتا نزیك ترین دۆستمان رازی نیە ( عێراق پارچە پارچە بکرێت) حزب لە کوردستان رۆڵی سەرەکی دەگێرێ بۆ ووشیار کردنەوە و هاندانی خەڵك و راوەستانی دژی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان ، حزب و رێکخراو و رۆڵی گرنگ دەگێرن بۆ بەرپاکردنی شۆڕش و بەرەو پێشەوە بردنی و سەرکەوتنی . بەهێز بوونی حزب و رێکخراو بەهێز بوونی میللەت و شۆرشە ، پشتگیری میللەت لە حزب و رێکخراوەکان کێشەکەمان بەرەو پێشەوە دەبات و لە سەرکەوتنی نزیك دەکاتەوە .

بێ هێزی حزب و رێکخراوەکان دەبێتە بێ هێزی شۆڕش و دەرئەنجام دەبێتە بێ هێزی میللەت و دوژمنان زیاتر پاڵەپستۆ دەخەنە سەر گەل و زوڵمی زیاتر لێ دەکەن — کەواتە پارچە پارچە بوونی حزب لە کوردستان کارێکی ترسناکە هێز و توانای میللەت بریرِ دەکات ، پارچە پارچە بوونی حزبی شیوعی عێراقی وای لەو حزبە کرد کە بەئاستەنگ بێتەوە سەر پێی خۆی و بواریشی فراوان کرد کە هەندێ دکتاتۆر و مل هورِ حوکمی عێراق بکەن ( رژێمی بەعس لە عێراق )

لێك ترازانی هەڤاڵانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٦٤ چ دەردێکی بەسەر کوردان هێنا تا ئیستاش شوێنەواری هەر ماوە . جیابوونەوەی چەند کەسێك لە پارتی لە پاش بەیانی ئازار هەرچەندە بەنسبەت هێزی ئەو کاتی پارتی سەنگێکی ئەوتۆیان نەبوو بەڵام توانیان پروپاگەندە دژی پارتی و شۆڕشی کورد بکەن و هەندێ ئەندامی دڵسۆزو بەکەڵك بەلای خۆیان

رابکێشن ، جیابوونەوەی پارتی گەل لە پارتی دیموکراتی کوردستان پشێوی و نارەحەتی لەناو پێشمەرگە و سیاسەت مەدارانی کورد زیاتر کرد رەنگە تووشی گیروگرفتی ناخۆشیش هاتبن .

جا ئەو هەموو ئەزمونەی کوردستان سودی لێ وەرنەگیراوە لە نێوان رێکخراوە تازەکانی کوردستانیش هەندێ کەس بە بیانوی جیاجیا ریستویەتی دووبەرەکی و پشێوی پەیدا بکات لە کۆتایی هەمووی زیان بەخش بوون . لەناو ی . ن . ك کۆمەڵە رۆڵی کاریگەر و پڕ لەسەروەری هەبوو ، پێشمەرگە و ئەندامەکانی خۆبەخت کەر و دڵسۆزانە کاریان دەکرد ، هەمیشە لەناو حزب و رێکخراوەکان کەسانی دەسەڵاتدار و بەئەزمون دەردەکەون رەنگە دەسەڵاتداری هەندێکیان بۆنی خۆسەپاندنی لێ بێت کەچی هەندێك لە هەڤاڵانی تر هەست بەلاوازی و ماف خوراوی دەکەن ئەو جۆرە کێشانە لە بنچینەدا لەناو ی . ن . ك بووە هۆی دروست بوونی ( ئاڵای شۆڕش ) سەرەتا هەندێك ئەندام و فەرماندەو پێشمەرگەکان جۆش دران گوایە سەرکردایەتی دەیەوێ واز لە مارکسیەت بێنێ و تاکە کەسی لەناو کۆمەڵە و هەم ی . ن . ك رەگی خۆی دادەکوتێ ، بەو جۆرە قسانەهەندێك لە کادیرەکان بە گومانەوە سەیری سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵەیان دەکرد . کار گەیشتە رادەیەك رێکخستن لەناو رێکخستن ( تنظیم داخل تنظیم ) ئیشی دەکرد

ئەو بینەو بەردەیە هەموو کادیرو فەرماندەو پێشمەرگەو هەتا دۆستانی یەکێتی کۆمەڵە و خەڵکی کوردستان هەستیان پێ کرد لە هەموو لایەك هەوڵ و کۆشش کرا ،سێ کۆنفرانسی کۆمەڵە نەیتوانی لە ریشەوە ئەوگیروگرفتە بن بڕ بکات. تا کار گەیشتە رادەیەك پێکەوە ژیان ببوە محالا ( بە قسەی هەندێ برادەران). لە ساڵی ١٩٨٥ هەندێك لەو برادەرانە جارێ جیا بونەوەیان دا لە کۆمەڵە و ی.ن. ك نائارامی لەناو رێزەکانی کۆمەڵە گەیشتە ئاستێك هەندێك لەو کادیرە دڵسۆزانە هەڕەشەی لێدان و گرتنیان لێ کرا (ی. ن. ك) و سەرکردایەتیەکەی ئەزمونی گەورەیان هەبوو لەو بوارە دەیان زانی دوبەرەکی و ناتەبایی چەند زەرەر بە گەلی کورد دەگەیێنی، بوونی کێشەی گەلەکەمان و باری شۆڕش دەکات بە تایبەتی هێشتا بەرەی کوردستانی لە دایك نەببوو، حزب و رێکخراوە کوردستانیەکان زۆربەیان دژی یەکتر بوون شەڕی چەکداریان لەگەڵ یەکتر دەکرد. زیاد بوونی رێکخراوێك لەسەر خوێنی کۆمەڵە و ئەو تێك هەڵکێشەی نێوان ئەندامان و لێك نزیك بوونیان لەبیر و بۆچوون و فکر دەبێتە گیروگرفتێکی مەزن دەبێ سەرکردایەتی ی. ن. ك و کۆمەڵە بەلای کەم دوو ساڵ تەرخان بکەن بۆ یەك لابوونەوەی ئەو کێشە لە کاتێکدا رژێم زۆر وەحشیانە هێرشی دەکردە سەر کوردستان و تەڕ و وشکی بەیەکەوە دەسووتاند.

به ناچاری بڕیاری دا نابێ لەناو ڕیزەکانی ی. ن. ك کەس بەناوی (ئالآی شۆڕش) کار بکات ئەوە مافێکی ڕەوای خۆی بوو چونکە ئەو کەسانەی لەسەرەوە خۆیان بە یەکێتی دەزانی و لەبەنەوە هەولّی هەڵتەکانیان دەدا نابێ بواریان بدرێ ..!!؟ ئالآی شۆڕش، کە جارێ جیابوونەوەی دا هەندێ خۆی نەگرت، ئەو برادەرانەی، کە بەڵێنیان پێ دابوون زوو پەشیمان بوونەوە ئەوەندە خاوەن بیر و باوەڕ نەبوون، ئەوەندە مارکسی ـ لینینی پەرست نەبوون، بەڵکو زۆر حەزیان بە مەسئوولیەت دەکرد جا لە کوێ ئەو مەسئوولیەتەیان دەست بکەوێ لەوێ دەبن. بە کورتی سەرکردەکانی بیر و باوەڕی ئالآی شۆڕش دەستخە ڕۆکران لەلایەن خودی هەڤاڵەکانی خۆیان. ئەوانەی مانەوە لە چەند کەسێك تێ پەڕی نەدەکرد و ڕۆیشتن بۆ ئێران و خێمەیەکیان هەڵدا، دەستیان کرد بە لێکدانەوە و تێ ڕوانین و دروست کردنی (تیۆری تازە) لەناوە خۆشیان نەگەیشتنە یەك، دوو پارچە و سێ و ئیتر حاڵیان خراپ بوو.

بەڕای من ئەو هەڤاڵنە هەڵەیەکی گەورەیان کرد چونکە وەزعی ی. ن. ك ئەو کات بواری ئەوەی دەدان، کە بە ئاشکرا بیر و بۆچوونی خۆیان دەربڕن و پشوو درێژ بن، هەستیان ڕابگرتایە ئاخۆ کێشەی گەلی کورد و شۆڕشەکەی چی بەسەر دێ. دەبوایە وەکو پێشمەرگەیەکی دڵسۆز، لەبەر خاتری گەلی کورد بە پەرۆشەوە لە پێشەوە خەباتیان بکردایە.

حزبی سۆسیالیستی کوردستان لە سەرەتای دەست پێکردنەوەی شۆڕش بە ناوی (بزووتنەوەی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان) لەناو ی. ن. ك کاری دەکرد لەبەر هەندێ هۆ، کە هەندێکیان هەق بوو وە هەندێك بیانوو بوو لە ٢١/ ٣/ ١٩٧٩ لەناو ی. ن. ك چوونە دەرەوە وەکو باسمان کرد ئەو ڕێکخراوە لە خەڵکی جیا جیا پێك هاتبوو (سۆسیالیست، دیموکراتی، نەتەوەیی، مارکسی ـ لینین، عەشائری) کورد ئەو کات پێویستی بە هەموو کەسێك هەبوو بێتە ڕیزی شۆڕش بەڵام ژیان لەناو ڕێکخراوێکی وا زۆر ئاستەنگ دەبێ. هەر لەکاتی جیابوونەوەیان باڵێك بەناوی بزووتنەوە لەناو ی. ن. ك مایەوە لە ساڵی ١٩٨١ لەگەڵ لێژنەی تەحزیری پارتی دیموکراتی کوردستان بوون بە (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، کە لە کۆنگرە هاتنە دەرەوە بە دوو باڵ یەکێك وەکو ناوی حزب، کە لە سەرەوە هاتووە کۆمەڵێك کادیر بە بیانوو پشتگیری کاك د. مەحموود جیابوونەوە لەوانە (شێخ محەمەد سەرگەڵوی و مولازم فوئاد) وە خۆیان ئیدیعای ئەوەیان دەکرد، کە حزبێك پێك دەهێنن پاش هێن و من هێن ئەوانە زۆربەیان هاتنەوە ناو ی. ن. ك حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان سەرکردایەتیەکی بە هێزی نەبوو هەر کەسە بۆ خۆی کاری دەکرد، هەر فەرماندەی هەرێمێك بۆ خۆی حکومەتێکی سەربەخۆ بوو پارە کۆکردنەوە، چەك فرۆشتن، خەڵك ڕووت کردن، خەڵك کوشتن، هیچ پرسیاری

لەسەر نەبوو. ڕاستییشە لەناو حزب خەڵکی دڵسۆز و سەرکردەی دلێریان هەبوو بەڵام سروشتی ئەو حزبە وا دروست ببوو. حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان دەیویست خۆ لە قەرەی ی. ن. ك بدات بۆی نەکرا، بنکە و بارەگەیان ڕۆیی بۆ (زێوە و مشکان) لە کوردستانی ئێران ـ یەك ڕەوشت هەیە لە کوردستان لە کاتی شکستی برادەرەکان سەر دەخەنە سەر سەری یەکتر لەوێش ناکۆکی پەیدا بوو هەندێك بەناوی پەیڕەوی مارکسی و لینینیەوە ناویان لەوانی تر نا عەشائیری.

ئەو حزبە زەمانێك لە کوردستان خاوەن سەدان و هەزاران پێشمەرگە بوو وە ڕۆڵی لە سەروەری هەبوو لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش بەڵام لە ساڵی ١٩٨٤ و ١٩٨٥ تووشی گێژاوی فیکری، تەنزیمی، پێشمەرگەی هات بۆ پاکسازی کردنی خۆیان هەندێك لە کادیرەکانیان ڕەوانەی ناوچەی بادینان کرد بەو بیانوەی، کە گەشە بە حزبەکە بدەن. بە داخەوە باڵەکانی ئەو حزبە ڕێگای هێمنانە و ڕاگۆڕینەوەیان نەگرتە بەر بەڵکو ڕێگای کوشتن و برینیان هەڵبژارد هەندێك لە کادیرە دڵسۆز و کارامەکانیان لە ئێران بە گرتن دا، کە هەرگیز نەدەبوایە ئەو کارە بکەن وە هەندێکی تر لە کادیرانی ناوەندی هەڤاڵ (قادر مستەفا)یان شەهید کرد، کە یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی دەوری سەرەکی گێرا لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لەناوچەی دەشتی هەولێر. پاش ماوەیەك ئەو حزبەش بوونە دوو بەش دەرئەنجام حزبی ئاستەنگکێشانی کوردستان هاتە مەیدان و لە پاشان لەناو بەرەی کوردستان وەرگیران. پاش گفتوگۆ و دانیشتن لە کۆنگرەیەك، کە لە شاری هەولێر بەسترا لە ساڵی ١٩٩٢ حزبی ئاستەنگکێشان و ئاڵای شۆڕش یەکیان گرت.

ئێستا بە (٣) ئەندام لە پەرلەمانی کوردستان بەشدارن وە ماوەیەك هەڤاڵی بەڕێز قادر عەزیز سکرتێری حزبی ئاستەنگکێشانی کوردستان وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری لە ئەستۆ بوو. جیابوونەوەی کەسان لە حزب و پارچە پارچە بوونی حزب دەردێکی کوشندەیە بۆ گەلەکەمان هەقە هەست بەو لێ پرسراوەتیە بکرێ. یەکگرتنەوەی حزب و گروپ و ڕێکخراوەکان، کە ئێستا لە کوردستان بە گەرمی باسی لێ دەکرێ هەنگاوی باش و پیرۆزە خەڵك ڕزگار دەکات لە زۆر کاری نا شەرعی وە لەو مەسروفاتە زۆرەی، کە دەکرێ، ئەگەر گەلەکەمان ئاڵای سەربەخۆی هەڵدا، ئەگەر گەلەکەمان بووە خاوەن دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی ئەو کاتە هەقی هەموو کەسێکە بە ئارەزووی خۆی حزب و ڕێکخراو دروست بکات.

# گرتنی دێگەڵە

پاش داستانی ڕزگاری تیپەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەبوایە بە نۆرە لە هەندێ شوێنی گرنگ لە سەرکردایەتی حەرەسیات بگرن لە ١٥/ ٧/ ١٩٨٧ ت ٨٦ی دەشتی هەولێر، کە من فەرماندەیان بووم چووین بۆ سەرکردایەتی لە ٢٠/ ٧/ ١٩٨٧ ت ٨٧ی قەرەچوغمان گۆڕی. لەوێ لەگەڵ مام غەفور شوێنەکەمان گۆڕیەوە تا ٢٥/ ٨/ ١٩٨٧ لە سەرکردایەتی بووین و گەڕاینەوە دەشتی هەولێر لە ٢٨/ ٨/ ١٩٨٧ لەگەڵ برادەران کاک کۆسرەت نامەیەکی بۆ نوسیووم بە درێژی باسی چۆنیەتی گرتنی دێگەڵەی تێدا بوو. هەموو فەرماندەی تیپ و کەرتەکان لە مەڵبەندی کۆبوونەوە ئێمە لەوێ نەبووین. لە ڕۆژی ١/ ٩/ ١٩٨٧ لە چەند لایەك هێرش کرایە سەر هەردوو فەوجی جاش، کە لە دێگەڵە بوون بەم جۆرەی خوارەوە:

١- ت ٨٥ی بەرانەتی بۆ سەر مۆڵگای دوژمن لەناو مەخفەری دێگەڵە لە شوێنێکی قایم و ئەستەم بوو پاش شەڕیکی چەند سەعاتی هەموو جاشەکان کوژران تەنها یەك جاش خۆی نەدا بە دەستەوە. ئەو هێرشە لەلایەن هەڤاڵان تەحسین کاوانی و ئاسۆ و کاك بورهان سەعید سۆفی سەرپەرشتی کرا.

٢- ت ٨٦ی دەشتی هەولێر بۆ سەری مولکای جاشەکان و هەردوو زریپۆشەکە پاش شەڕیکی قورس پێشمەرگەکان توانیان دەست بەسەر هەردوو زریپۆشەکەدا بگرن و هەموو جاشەکان تەفرو تونا بکەن ئەو هێرشە بە فەرماندەی هەڤاڵ مەلا سلێمان و شەهید کاك عەلی پونگینە بوو.

٣- ت ٨٧ی قەرەچوغ بۆ سەر بارەگای فەوج لە نزیك مەشروعی دێگەڵە لەوێ دوژمن وای بەسەر هات با بە دەواری شڕی نەکردبێ زیاتر لە (٣٠) سی جاش کوژراو نزیکەی (٤٠) چل جاشیش بەدیل گیران ئەو هێرشە بە فەرماندەی مام غەفور و کاك نوری قادر بوو.

٤- ت ٩١ی سەفین بۆ سەر ڕەبیەکانی لووتکەی کورە دێر ئەوانیش تەفر و تونا کران لەو هەڵمەتە پێشمەرگەی ئازا ئیسماعیل ونکە شەهید بوو ئەو شەڕە بە فەرماندەی هەڤاڵ سەفین بوو.

٥- ت ٩٣ی کۆیێ بۆ سەر ڕەبیەکانی دەور و پشتی دێگەڵە بوو بە فەرماندەی مامۆستا بەکر ئەو ڕەبیانەش بە ئاسانی دەستی بەسەردا گیرا.

لەو شەڕ و پێك دادانە خوێناویە زیاتر لە (٥٠) پەنجا جاش کوژران و بە دەیانیش بەدیل گیران دەسکەوتی پێشمەرگەش زیاتر لە دووسەد کلاشینکۆف و یەك جیهازی ڕاکاڵ و چەك و تەقەمەنی هەمە جۆری تر و یەك زریپۆشیش گوازرایەوە ناوچە ئازاد کراوەکان، سووتان و شکانی چەند ئۆتۆمبیل.. لەو شەڕە چوار پێشمەرگەی دڵسۆز و وەفاداری کوردستان شەهید بوون.

ئەو زنجیرە چالاکیە دوژمن تەزێنە بە تایبەتی گرتنی دێگەڵە و لێدانی دوژمن لەناو شاری تەق تەق و گرتنی قاتعی جەیشی شەعبی ئەبو جەعفەر مەنسور لەسەر ڕێگای هەولێر ـ کەرکووك نزیك گوندی سێ قوچان و لێدانی عەرەبەکانی مشار و هەوارغەر و معێجیلە لە ناوچەی قەراج لەلایەن ت ٨٧ی قەرەچوغ چەندین چالاکی تر، کە لەلایەن تیپەکانی ٩١ی سەفین و ١٩ی کۆڕەك و ٧٨ی کارۆخ و ١٢ی سۆران ئەنجام درابوون دوا جاریش هەڵاتنی دوژمن لە لە شارۆچکەی هیران، کە شوێنێکی ستراتیژی گرنگ بوو هەم بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان وە هەم بۆ ڕژێمی عێراق لە ترسی پەلاماری هێرشی پێشمەرگەکانی ی. ن. ك لە دەروونەوە کاری کردە سەر فەرماندەکانی سوپای عێراق هەتا سەرکردایەتی ڕژێمی بەعس، بۆیە ویستیان ئەو هەموو شکستە بە گرتنی بارەگای مەڵبەندی سێ لە دۆڵی سماقولی قەرەبوو بکەنەوە لە ٦/ ٩/ ١٩٨٧ بۆ ماوەی یازدە ڕۆژ بە هەموو جۆرە چەکێك و بەکار هێنانی جاش و قوات خاسە هێرشیان هێنایە سەر بارەگای مەڵبەندی سێ لەلایەن پێشمەرگەکانی (ی. ن. ك) و هەموو لایەنەکانی تری بەرەی کوردستانی (سۆسیالیست و شیوعی و پارتی) مەردانە بەرگری کرا (بڕوانە ڕۆژانی ڕەش قوتابخانەی دلێرانە داستانی سماقولی لە بەشی قەندیل بەغدای هەژاند).

لە ڕۆژانی ١٧ و ١٨/ ٩/ ١٩٨٧ هێزەکانی لقی ١ پارتی دیموکراتی کوردستان لە بادینان وە بە هاوکاری پێشمەرگەکانی مەڵبەندی چواری ی. ن. ك شارۆچکەی کانی ماسی ئازاد کرا بەو شێوەیە دەبینین هاوکاری تەبایی و برایەتی یارمەتیمان دەدا بۆ زیاتر زەبر وەشاندن و لاواز کردنی ڕژێمی بەعس لە عێراق.

شەڕی سماقولی و کانی ماسی بە دوژمنی سەلماند ئەگەر گەلی کورد یەکگرتوو بێت ئەوە دوژمن تووشی شکستی گەورە دەکات. شەڕی دێگەڵە داستانێکە هەر بە زیندووی دەمێنێتەوە لە مێژووی شۆڕشی کوردستان.

## شەڕی مشراق

لە کۆتایی ئابی ١٩٨٧ کاک نەوشیروان لە سەفەری دەرەوەی کوردستان گەڕایەوە. کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی لە مانگی تشرین بەسترا لە ٨/ ١١/ ١٩٨٧ بەڕێز مام جەلال بە ئیش و کاری شۆڕش بەرەو ئەورووپا و وڵاتانی تر بەڕێ کەوت.

لە هەفتەی دووەمی تشرینی دووەمی ١٩٨٧ تیپەکانی ٨٥ی بەرانەتی ٨٦ی دەشتی هەولێر و ت ٨٧ی قەرەچوغ بۆ لێدانی کبریتی مشراق بەرەو قەرەچوغ بەڕێ کەوتن. شەوی پایز یارمەتی هێزی پێشمەرگە دەدات، کە ڕێگای دوور و درێژی ناو جەرگەی مولکاکانی دوژمن ببڕێ ـ بە یەك شەو سەدانپێشمەرگە بە ئۆتۆمبیل جادەی گشتی کەرکووك ـ هەولێر، هەولێر ـ مەخمور، گوێر ـ موسڵ مان بڕی لەگەڵ تاریك و ڕوون گەیشتینە بناری قەرەچۆغ دوژمن بە قسەی خۆی ناوچەکانی کەندیناوە و قەراجی باش کۆنترۆڵ کردبوو کەچی سەدان پێشمەرگە بە ڕۆژ لە بناری چیای قەرەچۆغ ماینەوە من لەگەڵ کاك کۆسرەت و مەفرەزەکەی مەڵبەند بەیەکەوە بووین ئۆتۆمبیلەکانمان لە گوندی چۆڵ کراو لەناو کاولە خانووەکان بەجێهێشت لەگەڵ چەند کەرتی پێشمەرگە، لەبیرمە کاك کۆسرەت دەیزانی لە کەندیناوە ئاوەدانی نەماوە نان و هێلکە و خواردنی زۆری لەگەڵ خۆی هێنابوو بەشی هەموانی دەکرد، عەسران پایزی کەندیناوە لە بەهاری کوردستانان گەلێك خۆشترە بە چاوێکی پڕ لە گریان سەیری وڵاتی جوان و دڵگیری خۆمانم کردەوە بە دووربینەکەم تێر تێر سەیری دەشتی پان و بەرین و بەخێر هەڵێناوە ئەو وڵاتەی، کە دوژمن لێی داگیر کردین، ئەو ناوچە پڕ خێر و بێرەی، کە خەڵکی وڵاتی تریان لێ نیشتەجێ کردووە عەسر بووە لەگەڵ کاك کۆسرەت و برادەران دانیشتبووین فرۆکەکانی دوژمن هاتنە ناوچەکە و دەسووڕانەوە ئێوارە داهات لە هەموو لایەك پێشمەرگە هاتن بۆ گوندی (میلە هورد) تا لەوێ فەرمان وەرگرن و بڕۆن بەرەو قوڵایی خاکی کوردستانی خۆشەویست بۆ ئەو شوێنەی، کە هەرگیز دۆست و دوژمن بە خەیاڵی دا نایێ هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەستی بگاتێ، بەرەو کوشافی عارەبان، بەرەو گەیارە ئەو شوێنەی دوژمن بە جێگایەکی گەلێك هێمنی دەزانی، هەر یەکە فەرمانی خۆی وەرگرت کاك کۆسرەت زۆر هەوڵی دا، کە لەلای ئەوان بمێنمەوە بە خۆم نەوەستام لەگەڵ پێشمەرگەکان ڕۆیشتم ، شارەزاکانمان تەواو نەبوو لەناو ئەو هەموو ڕەبایە ئێمەی گیرا، دەنگی هاوەن هات براچەی تەقینەوەی دڵی دوژمنانی کوردی لە

گەیارە و مشراق و شرقات دەهەژاند هەر گوللە تۆپێك دڵی سەدامی لە بەغدا دەهەژاند لەگەڵ لرمەی نرکەی گەلی کوردستانی پێوە دیار بوو، دوژمن لە هەر شوێنێك بێ ڕۆڵەکانی دەشتی هەولێر و کوڕەکانی کەندیناوە و قەراجی داگیرکراوی دێتە سەر، لە هەموو لایەك تەقە دەستی پێ کرد دوژمن دەتگوت کەڕ و لاڵە لە هیچ شوێنێك بەهانای هێزەکانی نەهات. خۆشیان بڕوایان نەدەکرد چۆن پێشمەرگەی کوردستان دەگاتە نزیك مشراق، چۆن و لەکوێوە ئەو سەدان پێشمەرگەیە بەو شەوە گەیشتنە ئەو شوێنە، ئەوەی بە ڕۆژ لە کوێ بوون. دوژمنی گەمژە و گێل هەروەکو کورسی پەرستانی ئەمڕۆ وا دەزانن پێشمەرگە ناوێکی وا ئاسانە هەموو کەسێك دەتوانێ هەڵی بگرێ نەیان دەزانی پێشمەرگە باشترین و چاکترین ڕۆڵەی کوردستانە. ماوەی دوو کاتژمێر خوێنی پێشمەرگە دڵۆپ دڵۆپ لە جەستەی دەهاتە خوارێ لەسەر سنووری کوردستان بەخوێنی گەش هێڵی دەکێشا، دوو کاتژمێر لەسەر زێی گەورە گیان بازی پێشمەرگە بەردەوام بوو.

بۆ یەکەم جار لە مێژووی شۆڕشی گەلی کورد لە شوێنێکی وا دوور وا ئەستەم هێزی پێشمەرگە دڵی دوژمن دەهەژێنێ ئەو دەشتە ڕەنگینە بەخوێنی یازدە ڕۆڵەی کوردستان یازدە لاوی بە جەرگ ئاو درا بۆ مێژوو مایەوە تا نەوەکانی دوا ڕۆژ، کوڕ و کچانی کورد سنووری وڵاتی خۆیان بزانن وە پازدە پێشمەرگەش بریندار بوون پاش ئەوەی دوژمن زەرەر و زیانی زۆری لێ کەوت زیاتر لە بیست و پێنج جەیشی شەعبی کوژران و چەك و تەقەمەنی زۆریش دەسکەوت بوو، کوڕەکانی هەولێر، ڕۆڵەکانی دەشتی دزەیی بەڕانەتی و شەمامك و مرکییە، وەفادارانی گەلی کورد چاونەترسانی کەندیناوە و قەراج وەکو ئاگری نەوتی سەر بە شاخ و سارەلوو، دوژمنیان سووتاند و سنووری چالاکی خۆیان بەزاند و پەڕینەوە بۆ پارێزگای موسڵ ئەو شارەی کە بە ناهەق و بە زوڵم لە کوردستان جیا کراوەتەوە، ئەو وڵاتەی کە بەخشکە مۆرکی کوردایەتی لەسەر لاچوو. باڵا دەستانی عەرەب خۆیان بەهێزتر دەزانن لە میللەتی ئێمە هەر بۆیە ئەو خاکەی بە پیت و بەرەکەتە پڕە لە نەوت و زێڕ، بۆخۆیان زەوتی دەکەن و کوردی تێدا ناهێڵن بەڵام زەمان هەروا نابێ ئەو خوێنە گەشانە ئازادی دەچێنن ئەو داری ئازادیەش هەر دێتە بەر دەبێ ئەو کار بەدەستە چاوچنۆکانە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەموو ئەو تاوانانە قەرەبوو بکەنەوە جا کوڕی کوردیش خوێنی هەرگیز بەفیڕۆ ناڕوات. شەو دەرەنگ لە کلکەی قەرەچوغ یەکمان گرتەوە لە دیمەنێکی یەکجار خەفەتبار بەتەرمی پیرۆزی یازدە ڕۆڵەمان ڕیز کرابوو، پازدە پێشمەرگەمان لەبەر برینەکانیان بە ئازار بوون زۆربەی پێشمەرگەکان جل و بەرگیان لە خوێن سوور

هەڵگەڕابوو بە کۆڵی خۆیان هەڤاڵە شەهید و برینندارەکانیان گەیاندەوە لای ئۆتۆمبیلەکان.
هەموومان چەند کاتژمێرێك پێشتر پێکەوە بووین، ڕۆژی پێشتر بەیەکەوە هاتینەوە قەرەچوغ هەمووشمان بەیەکەوە گەڕاینەوە بەڵام یازدە گوڵە جەرگمان خەوتبوون و بەرەو بەهەشتی نەمری دەڕۆیشتن تا لەوێ هەتا هەتایە ئۆقرە بگرن ـ دڵی دایك و باوك و خوشك و براکانیان لە گەرمەی خەوی خۆش ڕادەچلەکێ دەیانزانی شێرەکەیان ئەو شەوە گیانبازی کردووە.

یازدە گوڵمان لەگەڵ خۆمان هێناوە دێدەوان، بەیانی یازدە گۆڕمان بۆ هەڵکەندن تا لەوێ بە خاکی نیشتمانمان سپاردن، کە شەو گەڕاینەوە من و کاك کۆسرەت لەگەڵ شەش پێشمەرگە لە گوندی (یدی قزلر) لە دەواجنێك لامان دا برادەران لەوێ بوون تا پشوومان دا کەس نەمابوو، بەڕێ کەوتین ڕێگامان لێ ون بوو سەرە دەریمان دەرنەکرد شۆفێرەکەمان ڕێگای هەولێر ـ مەخمووری گرت، کە بەرەبییەی دوژمن چێندرابوو کاك کۆسرەت زۆر تووڕە بوو، بەهێمنی قسەم لەگەڵ کرد، هەستمان ڕاگرت بە لەسەرە خۆیی ڕێگای خۆمان دۆزییەوە هەر ئەوەندە کەسە لەگەڵ ڕۆژهەڵات لە جادەی کەرکووك ـ هەولێر پەڕینەوە نازانم لەو هاتوچوونە چۆن دوژمن هەستی پێ نەکرد، دەمزانی خوای گەورە و میهرەبان لەگەڵ پێشمەرگەیە چونکە لەسەر هەق بووین، دژی زاڵم و زۆرداران دەجەنگاین، لەبیرمە لە گوندی سێ کانیان بووین ئەو گەیشتە سەرکردایەتی کاك نەوشیروان بە پەرۆشەوە هەواڵی کاك کۆسرەتی پرسی وتی (خۆ کاك کۆسرەت سەلامەتە).

شەڕی مشراق تام و چێژی تایبەتی هەبووە، مانای خۆی هەبوو هەموو نەخشە و پیلانی دوژمنی دەشێواند، هەقە ناوی ئەو تێکۆشەرانەش بنووسمەوە، کە فەرماندەی ئەو نەبەردییەیان کرد جگە لەو هەموو پێشمەرگە قارەمان و بە جەرگانەی، کە دلێرانە شەڕیان کرد ئەو تێکۆشەرانەش بەشداری کاریگەریان تێدا هەبوو:
هەڤاڵ کاك کۆسرەت فەرماندەی گشتی شەڕەکە، مام غەفوور ف ت ٨٧ی قەرەچوغ، ڕێباز ف ت ٨٦ی دەشتی هەولێر، مەلا سلێمان جێگری ف ت ٨٦، کاك کەریمە ڕەش، لەتیفە سوور، کاك شەفیق برایم، کاك نووری قادر، کاك سوارە جەلال، شەهید ع. ئەکرەم، شەهید سەربەست، کاك عوسمانی بانی مارانی، کاك مامەند مەنتك.

پاش ئەو چالاکییە مەزنە بڕیار وابوو ڕۆژی ٢٠/ ١١/ ١٩٨٧ هێرش بکەینە سەر هاوینە هەواری سەری ڕەش، بەڵام دوژمن ڕێگای دێگەڵە ـ دەربەندی گۆمەسپانی گرت. ئێران لە ڕۆژی ٢٠ و ٢١ و ٢٢/ ١١/ ١٩٨٧ هێرشی کردە سەر چیای (گردە ڕەش) لەناوچەی ماوەت لەسەر

زێی بچووك لەسەر سنوور بەو نیازەی هێرشەکەیان فراوانتر بکەن بە بروسکەی سەرکردایەتی ت ٨٦ و ت ٨٧ و بەشێك لە ت ٩١ ی سەفین بەرەو سەرکردایەتی بەرێ کەوتین لە رۆژی ٢٦/ ١١/ ١٩٨٧ گەیشتینە بارەگای کاك نەوشیروان لەبەر گەلو وا پێ دەچوو هێزەکانی ئێران چیتر بەردەوام نەبن لە هێرش. دەیانویست بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان هێزەکانی ئێران چیتر بەردەوام نەبن لە هێرش. دەیانویست بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان هێزەکانی عێراق مەشغوول بکەن لە سەفرەو زەروون و ئەو ناوە، ئێمە ئەو شتەمان قبوولّ نەکرد هەرچەند لە هەندێ شوێن هێزەکان تووشی ئەو شەڕە بوون.

لەو ماوەیە هێزەکانمان لە گوندەکانی قەرانکی و قومرغان و مۆلان بوو لەو کاتەوە لەگەڵخەڵکی ئەو گوندانە دۆستایەتی بەتین و برایەتی بەهێزم پەیدا کرد و ئێستاش پیاوەتی و چاکەی ئەو جووتیارە هەژارانە لە یاد ناکەم کە لەگەڵ خۆیان جیاوازیان نەدەکردین هەرچی بۆخۆیان دەیانخوارد بەشی ئێمەشیان دەدا ، قسەی خۆشی مام بەکر و مام مەولود و ئاورەحمان دووری دۆستان و ئازیزانیان لەبیر دەبردینەوە . زۆر جار لەگەڵ مام غەفور شەو لە بارەگای کاك نەشیروان دەماینەوە . سوالفەو مەسەلۆکەی مام غەفوریش شەوی درێژی زستانی شڕ دەکرد ، تا رۆژی ٥/ ١١/١٩٨٧ لەو گوندانە بووین لە شەوی ٥\٦/١١/١٩٨٧ بە هاوکاری لەگەڵ هێزەکانی مەڵبەندی یەك و ت٩٩ ی بیتوێن هێرشمان کردە سەر(کانی خان) بە داخەوە برادەرێکی مەڵبەندی دوو حەزم نەکرد ناوی بهێنم هەموو ئەو زانیاری و دەنگ و باسانەی بە ئێمەی دابوو زۆربەی راست نەبوو ، خەڵکی هەژارو بێ چەك لە گوندەکە مابوو تەنها چەند رەبیەك لە دەوری گوندەکە بوو کە سەیرم کرد ماڵ و ژن و خەڵك لەبەر تەقەی پێشمەرگە خۆی لە ژوورەوە قایم کردبوو نەعلەتم لەو جۆرە لێپرسراوانە کرد کە بۆ بەرژەوەندی خۆیان زانیاری ناراست بە سەرکردایەتی دەدەن. لە هێرش بۆسەر رەبیەکان بە فەرماندەی کاك تۆفیق کانی وەتمانی سێ پێشمەرگەی ئازا شەهید بوون وە بە ئاستەنگ تەرمەکەیان رزگار بوو . لە هەورازی تەلانمان دا لەگەڵ رۆژهەڵات چووینە گوندی ( سرد ) لە ناوچەی چەمی رێزان لە ماڵێك میوان بووین خوا بەرەکەت بداتە خانوادەکەیان زۆر حورمەتیان گرتین هەرچی لە دەستیان هات بۆیان جێبەجێ کردین داخی گرانم رێگام بەو شوێنە نەکەوتەوە خوا عومر بدات دەبێ ئەو پاداشتەیان بدەینەوە . لەگەڵ نوێژی عەسر بەرێ کەوتین پاش نوێژی شێوان گەیشتینە گۆیتەپە خەڵکەکە لە ترسی فڕۆکە لە ( حاویەکە ) واتە ئەو شوێنەی دەکرێتە شینایی ( دەم زێ ) خانوویان کردبوو .

رۆژی ۱۹۸۷/۱۱/۷ گەیشتینە سات و قەلاّ لە نزیك تەق تەق لەوێ بە ئۆتۆمبیل بەرێ کەوتین بەرەو ناوچەی دەشتی هەولێر ئێوارەی هەمان رۆژ گەیشتینە سێ گردکان .

هێشتا هەموو دۆست و ئاشنامان بسەر نەکردبۆوە هێشتا سەرمای دۆڵی جافەتی و دۆڵی سورداش دەرنەچوو بوو ، هێشتا ماندوو بوونی هەورازی تەلان و پشتی سور قاوشان و شێخان لە ژانی بن پێمان مابوو ، هێشتا پێلاّومان قوری گۆپتەپەی پێوە دیار بوو ، هێشتا تیر تیر خەوی بە ئیسراحەتمان نەچوو بووە چاوان بروسکەی کاك کۆسرەت هات تا بچینە مەڵبەند لە ۱۹۸۷/۱۱/۱۳ لەگەڵ مام غەفور بەرێ کەوتین هەر یەکە (۱۵) پازدە پێشمەرگەمان لەگەڵ بوو لە گوندی (سماق شیرین ) شەو ماینەوە ، تۆفان هەڵسا باران بە گوڕ دەهاتە خوارێ هەرگیز ساڵی وا بەبارانم نەدیبوو ، هەموو کەند و چۆمەکان هەڵسابوون بواریان نەدەدا ، رۆژی دواتر لەگەڵ تاریکی لە جادەی دێگەڵە – هەولێر پەڕینەوە شەو درەنگ گەیشتینە ونکە لەماڵی ( سمایل خومار ) خۆمان ووشك کردەوە کە گەیشتینە مەڵبەند لەگەڵ کاك کۆسرەت تووشی کێشە بووین ، بروسکەی ئەو داوای هەریەکە (۱۵۰) سەد و پەنجا پێشمەرگەی دەکرد دیارە عدد جیهازەکەمان بە هەڵە وەری گرتبوو سفرەکەیان فڕێ دابوو بەهەرحاڵ بەدوای هێزەکەی تریشمان نارد لەوێش ماینەوە ناوەناوە بەفر دنیای سپی دەکردەوە چاوەڕوانمان کرد تا ئەو هەلە زێڕینەمان بۆ هەڵکەوت بەرەو سەری رەش کەوتینە رێ و ئەو داستانە پڕ سەروەریەمان تۆمار کرد ( بڕوانە داستانی سەری رەش ) لە بەشی یەکەمی قەندیل بەغدای هەژاند ، پێم وایە پاش سەریرەش شۆڕش کەوتە قۆناغی تر . حکومەتی عێراق لەبەر چەند هۆیەك کەلە پاشان دێمەوە سەری بڕیاری دا کە سەرکردایەتی ی . ن . ك بگرێ شەڕی عێراق و ئێرانیش کەوتە قۆناغێکی تر .

لە رۆژی ۱۹۸۷/۱۱/۲۷ لەگەڵ کاك کۆسرەت چووینە گوندی مەرزان رۆژی پاشتر ئەو بەرێ کەوت بۆ سەرکردایەتی ئێمەش گەڕاینەوە ناوچەکەی خۆمان .

## داستانی جافایەتی

## هێرش بۆ سەرکردایەتی (ی . ن . ك)

سەرکردایەتی ی . ن . ك لەسەرەتای دەست پێکردنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بنکەو بارەگای لە نزیك پێشمەرگەکان بوو ، لەوان دابڕاو نەبوو ، لەناو خاکی کوردستان بوو .

لەساڵی ١٩٧٦ بارەگای سەرکردایەتی لە بناری قەندیل لە گوندەکانی پشت ئاشان، قرناقە، ئاش قولکە ، سورە دێ بوو . لە بەهاری ساڵی ١٩٧٧ دوژمن لە چەندین لا هێرشی بۆکرد لەو هەل و مەرجە دژوارەی ئەو کات چەندین ڕۆژ پێشمەرگە بەرگری کرد پاشان سەرکردەکانی شۆڕش بڵاوەیان لێ کرد و هەریەکە بە قۆڵێك بۆ ناوچەکانی کوردستان ڕۆیشتن تا لە نزیکەوە سەرپەرشتی مەفرەزە سەرەتاکان بکەن ، لە هاوینی ١٩٧٧ بەڕێزان مام جەلال و کاك نەوشیروان هاتنەوە کوردستان ، چەك و پێداویستی پێشمەرگەیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو ئەو جارە بارەگای سەرکردایەتی لە ناوچەی خواکورك دامەزرا چەندین کۆڕو کۆبوونەوەی لەوێ کرا تا ناوەراستی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ بنکەی سەرکردایەتی لەوێ مایەوە لەبەر چەند هۆیەك و بۆئەوەی سەرکردایەتی بتوانێ راستەوخۆ سەرپەرشتی هێزەکانی پێشمەرگە بکات لە زستانی ساڵی ١٩٧٨ بارەگای سەرکردایەتی لە نۆکان دامەزرا ، لەوێش چەند کۆبونەوەیەکی سەرکرایەتی کرا هەر لەوێ بریار درا رێ پێوانی بادینان بکرێ و ئەوە بوو کارەساتی جەرگبڕ سامناك و دڵ تەزێن و ماڵ وێران کردنی هەکاری بەسەر کورد هات . ماوەیەك سەرکردەکانی شۆڕش مام جەلال و کاك نەوشیروان و برای بەڕێز کاك د . محمود بەناچاری بنکەی نهێنیان لە گوندی باڵەیان و دۆڵەنێ دانا لە پایزی ساڵی ١٩٧٨ بارەگای سەرکردایەتی چوە دەراوی گورگان تا ڕۆژی ٧/١٠/١٩٧٨ لەوێ مایەوە لەو ڕۆژە تا ١٩/١٠/١٩٧٨ بارەگای سەرکردایەتی لە دەراوی گوێزێ نزیك دۆڵە کۆك بوو لە ڕۆژی ٢٠/١٠/١٩٧٨ تا ساڵی ١٩٨٣ بارەگای سەرکردایەتی لە گوندەکانی توژەڵەو خڕی ناوزەنگ و زەڵێ جێگیر بوو ، دوژمن چەندین جار هێرشی بۆ کرد بەڵام نەیتوانی داگیری بکات لە کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩٨٣ لەبەر ئەوەی شەڕی ئێران - عێراق لە ناوچەکە نزیك ببوو بارەگای کاتی سەرکردایەتی بۆ چەند ڕۆژێك هاتە گوندی ( باوزێ ) لە ناوچەی قەڵادزە . لە هاوینی ساڵی ١٩٨٣ بارەگای سەرکردایەتی هاتە گوندی خەتێ لە دۆڵی بالیسان لە ناوچەی خۆشناوەتی . پاش ئەوەی وتووێژ لەگەڵ ڕژێم دەستی پێکرد چەند مانگێك بارەگای سەرکردایەتی لە ناحیەی سورداش دانرا ، پێش دەست

پێکردنەوەی شەڕ بارەگا گوازرایەوە مەرگە ( گوندەکانی سێ روان ، تاوەژێ ، کانی تو ) دوژمن هێزێکی زۆری لە دەورو بەری سەرکردایەتی کۆکردەوە وە لەبەر ئەوەی شوێنەکەش وەکو پێویست نەبوو بنکەی سەرکردایەتی لە ناوەراستی سالّی ١٩٨٥ چووە ( یاغسەمەر و بەر گەلو ) تا رۆژی ١٧/٣/١٩٨٨ لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی دوژمن هێرشی فراوانی کردە سەر سەرکردایەتی بە دەیان جار فڕۆکەکانی رژێم لە دۆلّی جافەتی لە بنکەی سەرکردایەتیان دا بەسەدان بگرە بە هەزاران گوللە تۆپ بە دەورو بەری بارەگای مام جەلال و کاك نەوشیروان و برادەرانی تری سەرکردایەتی کەوت چەندین جار بەچەکی کیمیاوی ناوچەکەی کیمیا باران کرد . شایانی ووتنە بارەگای سەرکردایەتی لە جافەتی لە (٣٠) کم زیاتر لە سلێمانی دوور نەبوو ، بەکورتی بارەگای سەرکردایەتی لەناو جەماوەر و خەلّك و خاکی کوردستان بوو لەگەلّ ئێش و ئازارەکانی گەل دەژیا شوێنەکانی بارەگای سەرکردایەتی :

بناری قەندیل ، خواکورك ، نۆکان ، بالّەیان دۆلّەنی ، دەراوی گورگان ، دەراوی گوێزی ، خڕی ناوزەنگ ، باوەزێ خەتێ ، سورداش ، مەرگە ، جافەتی ، دیسان قاسمە رەش و زەلێ .

سەرکردایەتی ی . ن . ك رۆلّی گرنگی گێرا لە هاندان و بەگەڕ خستن و جۆش دانی خەلّك و هێزی پێشمەرگەی کوردستان ، بۆماوەی یەك رۆژیش بێ ئاگا نەبووە لە باری ناو کوردستان بەتایبەتی ناو شارەکان بە شارە گەورەکانیشەوە ، رۆژانە خەلّك هاتووچۆی سەرکردایەتی دەکرد ، رەخنەو پێشنیارەکانی خۆی بە سکرتێری گشتی و مەکتەبی سیاسی رادەگەیاند .

هەڤالآن مام جەلال و کاك نەوشیروان سەرکردایەتی چەندین شەڕی گەورەیان لە قولآیی خاکی داگیر کراو کرد . ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان لەناو جەرگەی رووداوەکان دەژیا لەگەلّ یلآوکردنەوەی چالاکیەکانی پێشمەرگە بۆردومانی تۆپ و فڕۆکەی لەسەر بوو ، دەنگی فەرهاد سەنگاوی و حاکم فەرهاد لەگەلّ هاژەی فڕۆکەی مێك و سۆخۆی تێکەلآو دەبوو لرمەی تۆپ و هاڕەی فڕۆکە لەسەر بنکەی سەرکردایەتی نەدەبڕا ، هەڤالآنی تری سەرکردایەتی راستەوخۆ سەرپەرشتی مەلّبەندەکانیان دەکرد دەهاتنە نزیك شارەکان ، لەگەلّ پێشمەرگەکان چەك بەدەست بوون ، بارەگاو هەواری مەلّبەندەکان لە نزیك شارە گەورەکان بوو ، هیچ بیانوییەك نەبوو پێشمەرگە خۆی ماندوو نەکات لەناو چەند مانگێك جارێك کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆدەبۆوە پیلانی تازەی دائەگینا ، ناوەناوە فەرماندەکانی پێشمەرگە ، کادیرەکانی رێکخستن هەردووك پێکەوە لە بارەگای مەکتەبی سیاسی کۆدەبوونەوە ، ئەو هەموو کارە دوژمن هەراسان دەکات و هێزی پێشمەرگەو خەلّك دەخاتە جۆش و خرۆش لە سالّی ١٩٧٨ بەرێز کاك مەسعود

بارزانی سەرۆکی پ . د . ك سەردانێکی ناوچەی بادینانی کرد بووە هۆی گەشەپێدان و بە جۆش خستن و بە گەڕ خستنی هێزی پێشمەرگەی ئەو ناوچەیە وە چەندین چالاکی گەورە کرا . بۆیە نزیك بوونەوەی سەرکردەکان لە جەماوەرو خەلك و پێشمەرگە خوێنی تازە ، پێشکەوتنی تازە بە شۆڕش دەگەیەنێ .

زۆر جار دوژمن دەیویست مەترسی بوونی سەرکردایەتی لەناو خاکی کوردستان لە خۆی دوور بخاتەوە بەڕاستی بۆی نەکرا هێرشی ساڵی ١٩٧٧ بۆ بناری قەندیل نەك هەر نەیتوانی سەرکردەکان لە وولات دەربپەڕێنێ بەڵکو خستیە قوڵایی کوردستان . شەهید ئارام لە قەرەداغ ، کاك د . خالید لە خۆشناوەتی و سەفین و چەمی ڕێزان و جافەتی ، کاك عەلی عەسکەری بۆ ناوچەی سلێمانی چوون باقی سەرکردەکانی تریش وەکو سەعدی گچکە و مولازم عومەرو تالیب ڕۆستەم و گاهر عەلی والی و سەید کاکە و..هتد لەگەڵ هەرێمەکانی پێشمەرگە دابوون . شەڕی شێنێ لە پاییزی ١٩٧٨ بۆ سەر سەرکردایەتی دوژمن بە دەیان لاشەی سەربازی لێ بەجێما . وە بەم جۆرە هەموو ڕێگایەك لەلایەن ڕژێم تاقی کرایەوە بەڵام مەیسەر نەبوو .

نەك پێویستە بارەگای سەرکردایەتی لەناو وولات بێت بەڵکو دەبێ سەرکردایەتیبزووتنەوەی کوردایەتی ئامادەی خۆ بە کوشتن دان و ماندووبوون و بەرگە گرتنی ئێشو ئازاریشی هەبێت تاکو بە کردەوە بسەلێنن کە سەرکردەی ڕاستەقینەی میللەتن ، خەبات لە ڕۆژانی خۆش و سەرشەقام و ناو دائیرەو لەپاڵ کچی شۆخ و جوان زۆر ئاسانە بەڵام دەبێ ئەو ڕاستیە بزانین دلێران ، پیاوان ، گیان بازان لە ڕۆژی ڕەش مەیدان دەگرن .

ئەوجا هەقە بزانین بۆچی حکومەتی عێراق ئەو کاتەی هەڵبژارد تا هێرش بکاتە سەر سەرکردایەتی ی . ن . ك

پاش ئەوەی لە سەرانسەری کوردستان هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەستی کاریگەری لە ڕژێم وەشاند و ئێشو ئازاری زۆری پێ گەیاند دوژمن کەوتە بیر کردنەوە ... بنکەی سەرکردایەتی ی . ن . ك لە قوڵایی خاکی کوردستان بوو دەتوانم بڵێم هێزەکانی خودی سەرکردایەتی هەر کاتێك بیویستایە ڕێگای گرنگی سلێمانی – دوکانی دەبڕی ، هێرشی ئێرانیەکان بۆسەر ناوچەی ماوەت و داگیر کردنی زۆر شوێنی گرنگ لەو ناوچانە بەتایبەتی گردە ڕەش و گۆجار و بالوسە و بەیەك گەیشتنی هێزەکانی ئێران و هێزە پێشمەرگە لە هەندێ نوختەی گرنگ بەتایبەتی گۆجار مەترسی گەورەی خستە دڵی ڕژێمی عێراق . بێ مەسعوودە ( بێ ئەوەی هیچ خاڵێکی عەسکەری هەبێت ڕێگا بۆ ئێران کرایەوە حکومەت پێی وابوو ئیتر لەمەو دوا چەك و

تەقەمەنی و پێویستیەکانی شۆڕش بە ئاسانی دەگاتە کوردستان ) دوور خستنەوەی مەترسی لەسەر دەرباچەی دوکان و و شاری سلێمانی یەك بوو لە هۆیە گرنگەکانی دەست پێکردنی ئەو هێرشە گەورەیە بۆسەر کوردستان . لێك ترازانی هێزەکانی حکومەت لە شارباژێر بە تەواوی لەگەڵ بەری مەرگەو دوکان پچڕا بوون دەبوایە ڕێگایەکی دوورو درێژ بڕن تا دەگەنە یەکتر بوونی سەرکردایەتی لە جافەتی بە خەیاڵی عێراقیەکان جێ پێ یەکی گرنگە بۆ ئێرانیەکان ئەگەر بیانەوێ زەبر لە هێزەکانی ڕژێم بدەن لە دوکان و شارباژێر . هاتووچۆی ئێرانیەکان بەتایبەتی سوپای پاسداران بۆناو کوردستان وە بۆ قوڵایی گەرمیانەکان رق و تووڕەیی دوژمنی یەکجار زیاد کرد . هاتووچۆی کۆپتەرەکانی ئێران و نیشتنەوەیان لە سەرکردایەتی واچووە مێشکی حکومەت گوایە ئەوە هەموو پێویستیە گرنگەکانی سەربازی دەهێنن و چەند سەد یان هەزار پاسدارێکیش لەو ناوچەیە بوون حکومەت لەو خاڵە زۆر بێ خەبەر بوو نەیدەزانی کۆپتەرەکانی ئێران جارێك ( مەسینە ) دەهێنن ، جارێك پێڵاو دەهێنن جارێك بەتانی شڕ دەهێنن چونکە لێرەدا روون تر دەبێتەوە کە حکومەتی ئێران هەرگیز نەیویستووە شۆڕشی کوردستان بەهێز بێت ، دیارە ئێرانیەکان لەو هات و چوو جرت و فرتە نیازیان چاو بەستەکی بوو بۆئەوەی لەلایەکی تر دەستی خۆیان بوەشێنن لەلایەك ئێرانییەکان پیلانیان لەگەڵ سەرکردایەتی دائەگێنا گوایە هێزی پێشمەرگە هەندێ شوێن بگرێ و ئەوانیش دەورو بەری سلێمانی و هەتا ئەگەر لە توانا دابێ دوکانیش بگرن .

لە تیپەکانی کوردستان پێشمەرگە بەرەو سەرکردایەتی کەوتنە رێ بەو نیازەی سەرەوە ، لەلایەکیش حکومەتی عێراق بەرەبەرە هێزی لەسەر جادەی سورداش – دوکان و سلێمانی کوچکردەوە بە قسەی هەندێ لە برادەران گوایە هەر کاتێك باسی کۆبونەوەی هێزەکانی عێراقیان کردبێ هەر ئەوەیان لێك داوەتەوە کە حکومەت دەترسێ ئێران و پێشمەرگە بەیەکەوە هێرش دەکەن و ئەوانیش لە دوکان و ئەو ناوە خۆیان قایم دەکەن وەکو خۆم گوێم لێ بووە بیریان بۆئەوە نەچووە کە حکومەت دەست پێشخەری دەکات ، ئەگەر ئەو هاتووچۆیەی ئێران نەبوایە و ئەو کۆپتەرو شتانە وا بەگەرمی هاتوچۆی سەرکردایەتیان نەکردبایە ، بەرای زۆر کەس حکومەت لەو هەل و مەرجە هێرشی نەدەکرد چونکە ماوەیەك بوو خەریکی مەشق پێکردنی چەند لیوایەکی سەربازی بوو بۆ ئەوەی ( فاو ) بگرێتەوە کە کاری دەروونی کردبووە سەر سەرانی عێراق و سوپای بەعس و خەڵکی عێراق و تا وولاتانی نیمچە دورگەی عەرەبی ( کوێت و

سعودیە و هەرگیزەر و بەحرێن و عومان و ئیمارات ) وە هەتا ببووە جێگـای نیگـەرانی زۆریـەی دەوڵەتە عەرەبیەکان .

ئەگەر هەموومان شوباتی ١٩٨٨ بخەینەوە یاد ئەوجا دەزانین دۆخەکە چەند ئـاڵۆز بـوو چـەند پشێوی دروست ببوو ، چەند باری گەلی کورد لە مەترسی دابوو لـە هـەموو لایـەك هەرەشـە لـە کورد دەکرا ، هەرچی گوند هـەبوو دوژمـن دەسـتی پـێ راگەیشـتبوو خـاپورو وێرانـی دەکـرد و بەردەوامیش بوو ، ئابلوقەیەکی ئابووری توند خرابووە سەر ناوچە رزگار کراوەکـان ، هێزەکـانی رژێم هەوڵیان دەدا سنورەکان بگرنەوە بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کـە شـەڕی عێـراق و ئێرانـی لێ بوو. هێزی پێشمەرگەی کوردستان ناوچەکانی شارباژێرو شلێرو پێنجوێنی چـۆڵ کـرد ، چـونکە بە چڕی هێزەکانی عێراق و ئێرانی لێ دامەزرابوو وە هەم تەنیا گوندێکیش لەو ناوچانە نەمابوو . دۆڵی خانەقا هێزەکانی حکومەت داگیری کردبـۆوە هەنـدێ هێـزی مەڵبەنـدی سـێ ی لەیـەکتر بچراندبوو . هەتا رادەیەکی زۆر بادینان و سۆرانی لەیـەکتر جیـاکردبۆوە چـونکە رێگـای حـاجی ئۆمەران – هەولێر و هەتا ناوچەی برادۆستیش حکومەتی لێ بوو ( رودان ، راس العابد ، حسن بەگ ، ......هتد ) لەلایەن حکومـەت داگـیر کرابـو ن لەسـەرەتای شـوبات تـا ١٩٨٨/٢/٢١ رژێمـی عێـراق ئامـادەیی سـەربازی خـۆی تـەواو کـرد و ئامـادە بـوو بـۆ هێـرش کـردن بۆسـەر سەرکردایەتی رۆژی ١٩٨٨/٢/٢٣ لە چەندین قـۆڵی گـرنگ دوژمـن بـە پیـادەوتۆپ و فرۆکـە هێرشی کردە سەر دۆڵی جافەتی تەنها ناوی قۆڵە گرنگەکان دەنووسمەوە پێویسـتی نـەکرد نـاوی فەرمانـدەی تیـپ و کـەرت و مـەفرەزەکان بنووسـمەوە . چـونکە زۆریـەی هـەرە زۆری هێـزی پێشمەرگەی کوردستان لە هەموو مەڵبەندەکان ، زۆریەی تیپ و کەرتەکان مەردانە و قارەمانانە بەرەنگاری رژێم بوونەوە وە هەموو فەرماندەی تیپ و کـەرت و مـەفرەزەکان جێگـای شایسـتەو دیاریان هەبوو وە رۆڵی خۆیان بینی ، ئەوەی پێویستە بڵێین ئەو شەڕە لەلایەن هـەڤاڵ نەوشـیروان مستەفا جێگری سکرتێری گشتی ی . ن . ك سەرپەرشتی کرا ، هەڤاڵان مولازم عومەر عبدلله ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی لێپرسـراوی مەکتـەبی عەسـکەری ، کـاك کۆسـرەت ئەنـدامی سەرکردایەتی لێپرسـراوی مەڵبەنـدی سـێ و کـاك قـادر حـاجی عـەلی ئەندامی سـەرکردایەتی لێپرسراوی مەڵبەندی یەك دەوری پڕ لـە سـەروەری و ئازایانـەیان بینـی ، لـەو شـەڕە پێم وایـە مێژووی گەلەکەمان ئەو دڵسـۆزانەو بـاقی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان لـە بـیر ناکـات و بـە خەتێکی زێڕین ناویان تۆمار دەکات .

ئەو قۆڵە گرنگانەی هێرشی دوژمن بۆ سەرکردایەتی لە :

١- هێزێکی گەورەی دوژمن پێك هاتبوو لە سەربازو جاش لە ئۆمەر قەوم هێرشی کردە سەر گوندی شەدەڵە و بەرزاییەکانی ( قولە پوشینە ) لە کلکەی پیرەمەگرون توانی داگیریان بکات لە هێرشێکی پێچەوانەی هێزی پێشمەرگە لە شەوێکی بەفرو باران ، رووبار هەڵسان ، تاریکە شەو نەتوانرا ئەو شوێنانە بگرنەوە ، لەوێ چەندین پێشمەرگەی ئازا شەهید بوون و دوو پێشمەرگەش بەنەشارەزایی تووشی جاشەکان دەبن و ئەوانیش خۆیان لێ دەکەنە پێشمەرگە لە ئەنجامدا هەردوو پێشمەرگەکە دەگیرێن ، یەکێك بەناوی (عەبدوڵا جیهاز ) کورێکی تێکۆشەرو قارەمان و راستگۆ دڵسۆز بوو دوژمن شەدەڵەی کردە بنکەی خۆی لەوێرا هێرشەکانی بۆسەر شاخی دابان و هەلاج دەکرد و ببووە شوێنی پشوودانی هێزەکانی .

٢- قۆڵی شەدەڵە – دابان : گرتنی زنجیرە شاخی دابان پشوودانی پێشمەرگە لە سەرگەڵو ویاغسەمەر بەئاستەنگ دەیەخێ و کۆنترۆڵی ناوچەیەکی گرنگ دەکات ، بەدەیان هێرشی یەك لەدوا یەك کرا سەر ئەو زنجیرە شاخە بەهەزاران گوللە تۆپ لەبەرد و شاخەکان درا ، سەنگەر نەما ساچمەو گوللەی پێ نەکەوێ کەچی رۆڵەکانی گەلەکەمان ، پێشمەرگەکان بەو بەفرو بارانە شاخیان بەرنەدا هەموو هێرشەکانی دوژمنیان تێکشکاند بە سەدان جاش و قوات خاصە و پیاوەکانی رژێمیان کوشتو چەندین سەربازو ئەفسەرو جاشیان بەدیل گرت . زۆر جار دوژمن چەکی کیمیاوی لەو زنجیرە شاخە بەکار هێنا ، کەچی پێشمەرگەکان ، ئازیزانی گەلی کورد وەفادارانی هەژارانی کوردستان بە ئەزموونی تایبەتی خۆیان کاری چەکە کیمیاویەکانیان بەتاڵ دەکرد هەرچەندە زۆر تاکەم کاری خۆی دەکرد ، زستانێکی تووش بوو ، باران شەو و رۆژ لێ نەدەکردەوە ، بەفر چیای بەرنەدەدا کەچی پێشمەرگە بەو بێ ئیمکانیەتە سەنگەری لەناو بەفر قایم گرتبوو ، هێرشەکان بۆسەر لووتکەی دابان ئەوەندە توندو تیژ و بەهێز بوو هیچ عەقلێك پسەند ناکات کە پێشمەرگە بەرگری لێ کردبێ کەچی دوژمنیشی دەشکاند ، تائەو رۆژەی بەفەرمانی سەرکردایەتی فەرمانی چۆڵ کردنی سەنگەرەکان نەدرا پێشمەرگە چۆڵی نەکرد . لەو پێك دادان و تێك هەڵچوون و شەڕو شۆڕەی دابان چەندین لاوی کورد شەهید بوون و چەندین رۆڵەی ئازاش بریندار بوون .

٣- لە هەناران و کانی بەردینە بۆسەر چیای قزلەر و پشتی قزلەر لەوێش دوژمن بەهێزی گەورە هاوزەمان لەگەڵ قۆڵەکانی تر هێرشی دەست پێکرد ئەو هێزەی دوژمن ، ئەو بەعسیەی توانی هێزی ئێرانی بشکێنێ نەیتوانی تا کۆتای شەڕ گوندی قزلەر بگرێ ، سەرەڕای بەکارهێنانی تۆپ و فڕۆکەو راجیمەو چەکی کیمیاوی بەهەزاران لە هێزە پیادەکان . لەوێش

دوژمن هەموو جارێ ملی کەچ دەکرد و شەرمەزار دەبووە بەرامبەر شاری سلێمانی شاری هەڵمەت و قوربانی ، کورەکانی هێزی پێشمەرگە بە گردار تەپڵی سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەو شکان و بەزینی دوژمنیان لێ دەدا ، بێ شك خەڵکی بەشەرەفی سلێمانی تا سەرکەوتنی کوڕەکانی خۆیان بە چاوی خۆیان نەدیبایە شەو چاوییان نامۆیی لە خەو دەکرد . لەوێ سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە تام چێژێکی تایبەتی خۆی هەبوو ، چونکە هێزەکانی دوژمنیان لەپێش چاوی میللەتی کورد دەشکاند . لاشەی جاش و سەرباز و ئەفسەری دوژمن ئەو ناوەی داگرتبوو ، بێگومان ئەو سەرکەوتنانەش هەر بە خوێنی شەهیدانی کوردستان ئەنجام دەدرێ .

٤- هێزێکی تری دوژمن لە مۆڵگاکانی کەپکی قەیوان بۆسەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە لە سنگرو پشتی سنگر دەستی پێکرد . دوژمن لەو قۆڵە هێزە تایبەتیەکانی بەکار هێنا چونکە ئەو شوێنە راستەوخۆ بۆ مێولاوکەو چوغماغ و یاغسەمەر دەهات ، دوژمن لەوێش چەند جارێ شکا ، بەڵام پاش چەند رۆژێك توانی هەندێ پێشڕەوی بەرچاو بکات ، وەتوانی سنگر بگرێ و لە گوندی مێولاکە نزیك بێتەوە.

٥- لە کارێزەو مالومە وباخ بۆقۆپی بابیز بەگ ( مێولاکە) لە رۆژی یەکەمی هێرشی دوژمن ، پێشمەرگەکانی کوردستان دەرسێکی باشیان بە دوژمن دا بەدەیان لاشەی سەرباز کەوتە دەست پێشمەرگەکان تا ماوەیەك دوژمن لەم قۆڵە نەهاتەوە سەر خۆی هەموو بەردو دارو شاخێکی لێ ببووە پێشمەرگە ، پاش چەند رۆژ هێرشی دەست پێکردەوە ، یەك لەدوای یەك هێرشەکانی دوژمن شکستی خوارد . پاش ماوەیەك ئەو هێزانەی پێشمەرگە گۆڕان هەر مەڵبەندێك سنوری بۆدانرا . دیارە بابز بەگیش پاش چەندین داستان لەلایەن رژێم داگیرکرایەوە.

٦- لە قەرەچەتان بۆ گوندی زێویە لەناو چیای پیرەمەگرون :

پێشمەرگەکان لە دەرگای گەلی زێویە سەنگەریان لە دوژمن گرتبوو ، بە هیچ جۆرێك دوژمن نەیتوانی پێشڕەوی بکات ئەو شەڕەش لە پێش چاوی خەڵکی کوردستان بوو .

٧- لە کانی خان بۆ گوندی قەمچوغە : جارجار کۆمەڵە جاشێکی ترسنۆك و بێ خێر بە کوڕە کوڕە هێرشیان دەکرد ، لەگەڵ تەقەی پێشمەرگە سەرەو نشێو دەبوونەوە شێری زەمان . قەمچوغە گوندەکەی ( مام عومەر ) رێبازی پێشمەرگەکان بوو ، دلێرانە لەگەڵ پێشمەرگە مانەوە تا ئەو رۆژەی کوردستان ئەنفالی بەسەردا سەپا .

٨- لە سەری سارای بۆپشتی سەرمۆرد و لەوێش کوێستانی شێخ باغ :

٨. لەوێ دوژمن لە مێژ ساڵە لوتکەی گرنگ و ستراتیژی سەربازی (سارای ) کردبۆوە مۆڵگا ،ئەو لوتکە بەرزە بەسەر شوێنە گرنگەکانی ناوچەکە دەڕوانێ کۆنترۆڵی دەرباچەی دوکان دەکات ، لەوێڕا دوژمن هێرشی خۆی دەست پێکرد پاش چەندین شەڕ وە پاش چەندین رۆژ و شەو توانی بگاتە نزیك کوێستانی شێخ باغ . کوردو کوردستان پێشمەرگەی ناکارامەی نەبووە بۆیە بێ گومرگ دوژمن بستێك لە هیچ شوێنێك نەهاتۆتە پێشەوە ، لەو شەڕەش بگرە بە دەیان سەرباز کوژران و چەند سەربازێك بە دیل گیران تا کۆتایی شەڕەکە دوژمن نەیتوانی نزیك گوندی سێ کانیان ببێتەوە کە دەکاتە نزیك سەرگەڵو . لەو کوێستانە شەڕی مان و نەمان لەگەڵ دوژمن کرا .

٩- لەقەڵەم پاشا نزیك بۆ بەرزاییەکانی پێش گوندی قەرانکی شەڕ لەو قۆڵە گرنگی تایبەتی هەبووە چونکە دوژمن لە مێژ بوو چیای ( قەرەسردی ) لەبەر دەست بوو ئەگەر ئەو بەرزاییانەی بگرتایە ئەوا رێگای ئوتومبێل بۆ دۆڵی جافەتی والا دەبوو ئەگەر گرتنی زنجیرە شاخی دابان بو بوو ئەوا گرتنی بەرزاییەکانی پێش گوندی قەرانکی گرنگیەکی تایبەتی هەبوو . رۆژانە دوژمن چەند جار هێرشی دەکرد . بەتوندی سەنگەرەکانی دەکوتا بەڵام ئازایی پێشمەرگەکان گەلێك لەچەك و تفاقی دوژمن بەهێز تر بوو ، ئەو قۆڵە سەنگەریان بەر نەدا تا بەفەرمانی سەرکردایەتی کشانەوە لەوێش رۆڵەکانی کورد خاکی نیشتمانیان بە خوێنی گەشیان ئاودا . لەوێش لاشەی کوڕانی کورد بە غەریبی مایەوە لەوێش چەندین پێشمەرگەی ئازا و بەجەرگ بریندار بوون . دوژمنیش زەرەرو زیانی گەورەی لێکەوت کوشتار و بریندار و دیلی زۆری هەبوو

١٠- لە سێ دەر بەرەو زنجیرە شاخی پشتی قۆڕ مرغان مۆلان :

٢. دوژمن تا رۆژی ١٩٨٨/٣/١٥ نەیتوانی لەو قۆڵە هیچ پێشڕەویەك بکات بە داخەوە لە ١٤ و ١٥ ی مانگ توانی بەرەبەرە ئەو لوتکانە بگرێ و بگاتەبەرامبەر بەرگەڵو واتە پشتی بەرەی شەڕی گرت لەوێ بڕ لە کشانەوەی هێزەکان کرا

١١- لە گۆجارو وراغلو و باخ بۆ سەر گوندی گەورەدێ : لە رۆژانی یەکەم بە دەیان لاشەی دوژمن کەوتە دوستی پێشمەرگە چەندین پارچە چەکی هەمەجۆر گیرا ، چەندین سەربازو ئەفسەر بەدیل گیران وە چەندین پێشمەرگەش شەهید بوون .

١٢- له مەرگه بۆ كانی توو : هەرچەندە لەو بەرەیەش شەڕ كرا بەڵام هەر زوو دوژمن توانی دۆڵی كانی توو بگرێ لەوێ بەهۆی بەفروباران و ڕێبەندان زیاتر لە حەفتا ژن و منال شەهید بوون لەسەرمان ڕەق بوونەوە . جاشەكان چاوساغی دوژمنیان كرد ئەو زەبرەیان وەشاند .
١٣- له شارستێن بۆ داری زەكەریاو یاخیان : لە چەندین هێرشی یەك بەدوایەك دوژمن زۆر شوێنی گرت لە چەندین هێرشی پێچەوانە پێشمەرگەكان شوێنەكانیان لە دوژمن وەردەگرتەوە .

لەو شەڕانە زیاتر لە سەدان سەربازی دوژمن كوژران و بە سەدانیش بریندار بوون ، بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە دوژمن زیاتر لە سەد فەوجی جاش و (٣٦) سیو شەش لیوای سەربازی بەكارهێنا هەرچەند ( كامل ساجد عەزیز) قائد فەیلەقی یەك بوو لەبەر گرنگی شەڕەكە لەلایەن سەدام حسین و عدنان خیرالله سەرپەرشتی كرا .

سەدام ڕۆژی ١٢ و ١٣ /٣/١٩٨٨ هاتە شاری سلێمانی و سەری لە بەرەكانی شەڕەكە دا و لەوێ بەتەلەفون قسەی لەگەڵ ( كامل ساجد عەزیز ) كرد و پێی ووت ( وەزعتان چۆنە ) دیار بوو وەڵامی دایەوە لە قسەكانی سەدام ووتی ( دەزانم جەبهەكەتان دوورو درێژە بەڵام وا لیوا روكن (سلگان ) م هێناوە ئەو كارە تەواو دەكات ) وە لە درێژەی قسەكانی سەدام ووتی ( لازم نسحق راس الحیە ) واتە پێویستە سەری مارەكە پان بكەینەوە ..
ئەو قسەیەی لەگەڵ سەركردایەتی بوو ( تەلەفزیۆنی كۆماری عێراق ) .لە ١٢ و ١٣/٣/١٩٨٨ هێزەكانی ( ی . ن . ك ) و ( پ . د . ك ) و ( ح . س . ك ) بۆئەوەی پاڵەپەستۆ لەسەر سەركردایەتی ی . ن . ك كەم بكەنەوە هێرشیان كردە سەر شاری هەڵەبجە و ئازادیان كرد . ئێرانیەكان دۆست و هاوپەیمانی خۆشمان لەو هەموو هێرش و پەلاماری دوژمن بۆسەر سەركردایەتی لە هەندێ شوێن تەنها (٣كم) سێ كیلۆمەتر دوور بوون خۆیان بێ دەنگ كرد سەیری دوژمنیان دەكرد چۆن كوردستان بە بۆمبا و كیمیا دەسووتێنێ ، هەموو قسەو بەڵێنێكیان بە درۆ دەرچوو ، لەكاتی كشانەوەی هێزەكانیش چ هاوكاریەكی ئەوتۆیان نەكرد .

كە هێزەكانی بەرەی كوردستانی هەڵەبجەیان ڕزگارركرد ئەوانیش بەتەپڵ و دەهۆڵ لە بیارەو تەوێڵە و خورماڵ هاتن تا ناحیەی سیروان چوونەوە هەڵەبجە هەموو ئەو چالاكیەی دەشتی شارەزووریان كردە هی خۆیان . ڕێكەوتن بێت لەگەڵ ئێرن یا ڕێكەوتن نەبێت هێزەكانی هەردوولا لە هەڵەبجە یەكیان گرتەوە دوژمنیش تەنها یەك سەربازی لەشەڕی سەركردایەتی كەم نەكردەوە بەڵكو هێزی نیی هێنا بەشێك لەو هێزانەی بەكارهێنا كە بۆ ڕزگاری فاو ئامادەی كردبوو وە چەندین فەرماندەی سوپای عێراقی هێنا كوردستان ، دوژمن بۆئەوەی هێرشی

ئێرانیەکان رابگرێ تاوانێکی مەزنی دەرهەق بە گەلی کورد بە گشتی و شاری هەڵەبجە بەتایبەتی ئەنجامدا لە رۆژانی١٦ و١٧/٣/١٩٨٨ بە فڕۆکە کە (١٠٠) (گلعە) یان کرد ، شاری هەڵەبجەی کیمیا باران کرد کە زیاتر لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار کەسی شەهید کرد و چەندین کەسیشی بریندار کرد . ئەو رەفتارە فاشیانە دنیای هەژاند و ویژدانی مرۆڤایەتی جولاند و بووە جێ ی پرسیار. لەسەر لێدانی هەڵەبجە زۆر نووسراوە پێویستی نەکرد دووبارەی بکەمەوە بەڵام هەقە یەك راستی هەیە پێتان رابگەیەنم ئەویش : لە کاتێکدا بەهەزاران منداڵ و ژن و کوڕ و کچ و پیر و جوان لاشەکانیان لەناو هەڵەبجە و عەنەب و دەوروپشتی کەوتبوو ، لەکاتێکدا دایك کوڕەکەی بەجێ دەهێشت لە کاتێکدا کچی گەنج بە تەنیا هەورازی سەختی دەبڕی ، لەکاتێکدا پیری بەساڵاچو بە گۆچانەوە لەبەر هێرشی دوژمن لە چیا نشێو دەبۆوە ، لەکاتێکدا منداڵ و دایك بەدەست لە ملان بەرەو بەهەشتی نەمری دەڕۆیشتن ، لەکاتێکدا کورد چارەنووسی خۆی نەدەزانی ، چەند کەسێکی نالێپرسراو و ویژدان مردوو لەگەڵ پاسدارانی ئێران خەریکی تالآن کردنی شاری هەڵەبجە بوون ، میراتی شەهیدەکانیان لە نێوان خۆیان دابەش دەکرد ، ئەڵقەیان لە پەنجەی بووك و ئافرەتان دەکردەوە ....!!؟ ئەگەر بەعسیەکان بەو کارەیان رووی رەشیان رەش تر بوو ئەوە ئەو چەند کەس و تاقمانەش دەبێ چاوەنواڕی ئەوە بکەن شەهیدەکانی هەڵەبجە هەرگیز لێیان نابورێ ناکرێ لێرە ناوی ئەو سەگە لێپرسراوانە بنووسینەوە ، رۆژگارێك دادێ ئەو راستیەش هەر دێتە روو جا فرمێسکی درۆزنانە دادی هیچ کەسێك نادات . کارەساتی هەڵەبجە ویژدانی مرۆڤایەتی هێنایە هەژاندن، هیچ کەسێك نەیتوانی لە بەرامبەر ئەو تاوانەی رژێم بێ دەنگ بوەستێ بەدەیان کۆڕو کۆبونەوە کراوە ، بەدەیان سیمینار بەستراوە . هەڵەبجە کوردی زیاتر بە دنیای دەرەوە ناساند . شەڕ لە سەرکردایەتی بە گەرمی بەردەوام بوو ، لە ١٦/٣/١٩٨٨ بەتەواوی هێزەکانی ی . ن . ك بەتەواوی بڕیاری کشانەوەیان وەرگرت لە رۆژی ١٧/٣/١٩٨٨ بەیەکجاری هێزەکانی بە رێك و پێکی ناوچەکەیان چۆل کرد ، لە رۆژی ١٨/٣/١٩٨٨ حکومەتی عێراق بەیانێکی بەناوی ( القیادە العامە للقوات المسلحە ) دەرکرد هەواڵی داگیر کردنی سەرکردایەتی ( ی . ن . ك ) ی راگەیاند زۆر بەشان و باڵی هێزەکانی عێراقی هەڵدا بە ئازایەتی ناوی دەبردن وە ئەو چالاکیەی ناونا (الانفال) پاش (٢٥) بیست و پێنج رۆژ شەڕی قورس و گران ئەوجا دوژمن توانی دۆڵی جافەتی بگرێ کە هەمووی لە (٢٥٠کم-٣٠٠کم٢) تێپەری نەدەکرد ئازایەتی و فیداکاری پێشمەرگەکانی ی . ن . ك لەو شەڕە بەچاکی بۆ دوژمنانی کورد بە دیار کەوت ، لە قسەیەکی لیوا روکن ( سلگان هاشم احمد

) که ئیستا معاون رئیس ئەرکانی جەیشە وتبووی ( ئەگەر سـەد پێشـمەرگەی وام بدەنـە دەسـت هەموو سوپای ئێرانـی پـێ دەشـکێنم ) . سـەرکردەیەکی سـوپای عێراقـی ئـەوها شـاهێدی بـۆ پێشمەرگەکانی کوردستان دەدا .

ئەی ئەو کسانەی ماوەیەك پێشـمەرگەتان بـە دزو جـەردە لەقەڵـەم دەدا ، بـێ گومـان ئێـوە بەشێکن لە پاشماوە دوژمن ، دوژمنیش هەرگیز وابە پێشمەرگە نـاڵێ، هێشـتا ئێـوە رازی نـین ، هەقی ماندوو بوونی ئەو پێشمەرگانەشتان خوارد ، هێشتا ئێوە پەلارو جنێو دەدەن کـە خـوێنی شەهیدەکانە، هێشتا گاڵتە بە دنیا دەکەن ، بەڕاستی ( یا من تعب یا من شقا یا من علـی الحاچر لگا )

دوژمن رۆژانە جگە لە کوێتەر بەدەیان جار فڕۆکەی میك و سۆخۆی بـەکار دەهێنـا ، رۆژانـە بسەدان تۆپی لە گوندەکان دەدا ، بۆخەڵکی بەشەرەفی ناوچەی جافەتی لەکاتی ئاوارە بوونیـان لەبەر ئەوەی رێگا بەفر گرتبووی هەر بە ئاستەنگ گیانی خۆیان پێ رزگار کرا ، مەڕو مالاَت و هەرچی هەیان بوو بەجێیان هێشـت ، لـە دیـمەنێکی زۆر خەفـەتبار و دڵتـەزێن خـەڵك رووی لـە ئێران کرد ، منالّی یەك رۆژە بـەو سـەرمایە لـەناو ئـەو بـەفرە لـە ئـامێزی دایکـی دەینالاَنـد ، ئافرەت و منالّ لە سەرمان و لە برسان رێگایان لێ بزر دەبوو هـەموو خـەڵکی ناوچـەکە هاتنـە سەر ساجی عەلی و لە ئێران کـەوتن بـە کولـە مـەرگی ژیانیـان بـەڕێ کـرد ، بـەلاَم سـەربەرز و سەرفراز خۆیان نەفرۆشت ناوی پیرۆزی کوردایەتیان بزر نەکرد ، خەڵکی گوندەکانی ( قـەرانگی ، قومرغـان ، مـۆلان ، سـەرگەڵو ، چـالاوە ، مالومـە ، گـەڕە دێ ، هەڵـە دن ، یاغسـەمەر ، چوخماخ ، مێولاکە ، سێ دەر ، شارستێن ، یاخیان سیروان ، ئاوژێ ، کانی تـوو ، چـنارێ . سـێ کانی ، سەرمۆرد ، قەمچوغە ، شەدەڵە ، قزلەر ......هتد هەموویان لەگەڵ هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان هاوکـاری تـەواویان کـرد ، بـۆ بـەرگری لـە خـاك و شـەرەف و نیشـتمانی کـورد و کوردستان .

لەو داستانە مێژوویە ، لەو شەڕە پڕ لەسەروەری و سەربەرزیە ، لەو فیداکاریە، لـەو دلێـری و مەردایەتیە کەم وێنەیە لە مێژووی گەلی کوردمان سەد و بیسـت رۆڵـەی بـەوەفای گەلەکـەمان ، سەد و بیست پێشمەرگەی سەنگەری خەبات و کوردایەتی ، سەد و بیست پێشمەرگەی وەفـادار و بەئیمان و بێ غەل و غەش شەهید بوون بـەرەو ژیـانی هەمیشـەیی رۆیشـتن ، بـەو هیوایـەی کـە دوارۆژێکی رووناك و ئازاد بۆ گەلەکەیان بنیات بنێن ، وە زیاتر لە دووسەد پێشـمەرگە برینـدار بوون کە برینەکانیان هەمەجۆر بوون .

مەکتەبی سیاسی ی . ن . ك بەیانێکی تایبەتی ئەو هەواڵەی بەخەڵکی بەشەرەفی کوردستان ڕاگەیاند و ئاماژەی بۆ زیانەکانی دوژمن و چۆنیەتی کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە کرد ، داوای لەگەڵەکەمان کرد کە خۆ ڕاگرو پشوو درێژ بن و کۆڵ نەدەن بەرامبەر دوژمنانی سەر سەختی گەلی کورد . هەموو هێزەکانی پێشمەرگە بە ڕێگای سەفەرو زەروون بە ڕێگای ئێران هاتنە قاسمەرەش و لەوێ بەرەو مەڵبەندی سێ گەڕانەوە بۆئەوەی لەوێش ئازایەتی بنوێنن و ئەوەندەی لە توانا بێت بەرگری لە خاکی پیرۆز و خەڵکی ڕەش و ڕووت بکەن .

هاو زەمان لەگەڵ هێرشی دوژمن بۆ سەر سەرکردایەتی ی . ن . ك ڕژێم لە دوولا هێرشی هێنا بۆسەر مەڵبەندی سێ ی ی . ن . ك بۆئەوەی لەو هەلە سوود وەربگرێ کە زۆربەی هێزەکانی ی . ن . ك بەشەڕی سەرکردایەتی سەرقاڵ بوونە . لە قۆڵی بێتواتە بۆ گوندەکانی مێرگە سوور لەلایەن پێشمەرگەکانی مەڵبەندی سێ بەر پەرچیان درایەوە بە داخەوە لەو قۆڵە چەند پێشمەرگەیەکی دڵسۆز شەهیدە بوون ، لەوانە شەهیدی قارەمان کاکە محمد شینە .لە ئارانی بەرەو دۆڵی بالیسان هێزەکانی ی . ن . ك بە تۆپ شوێنی کۆبوونەوەی هێزەکانی دوژمنیان تۆپ باران کرد ، لەئەنجامدا فەرماندەی ئەو چالاکیە لەگەڵ هەینەتی ئەرکانی شەڕەکە کوژران و زۆر چەك و کەل و پەلی سەربازیش کەوتە دەست پێشمەرگەکان ، ئەو شەڕە لەلایەن هەڤاڵی تێکۆشەر کاك حەسەن کوێستانی ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی دووەمی مەڵبەندی سێ سەرپەرشتی دەکرا .

یەك شت ماوە بڵێم لە درێژەی شەڕەکانی سەرکردایەتی و ئەو شەڕەی مەڵبەندی سێ بەفروباران و زریان و تۆف وێنەی نەبوو ، کەم ساڵ زستانی وا تووش هەبووە بۆیە بە دەیان پێشمەرگە تووشی نەخۆشی هات ، دەیان کارەساتی سەیرو سەمەرە لەو ماوەیە ڕوویدا ، گرتنی بنکەی سەرکردایەتی زەبرێکی کوشندە بوو لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد درا ، گەلەکەمان تووشی دۆخێکی نەفسی گەورە هات . ڕژێم دەستی کرد بە کاول کردنی کوردستان ( عمليات الانفال) ی لە سەرانسەری کوردستان دەستی پێکرد کە لەپاشان بە درێژی لەسەر باری گەرمیان و بادینان دەنووسین .

لە کۆتایی باسی شەڕی سەرکردایەتی دەڵێم هەرکەسێك بڕوا بە دوژمنی خۆی بکات تووشی نەگبەتی و ماڵ وێرانی دەبێت .

# لێدانی گوندی مجلوبه

دوژمن پێنج هەزار کەسی بێ تاوانی بێ چەك ، ژن و منداڵ ، پیرەپەکەوتەی لە هەڵەبجە بە کیمیا باران شەهید کرد ، لەگەڵ هێزێکی گەورە نیازمان وابوو بچینە سەرکردایەتی کاك کۆسرەت لەسەر جیهاز قسەی لەگەڵ کردم ووتی : ( لێرە ئیشەکەمان تەواو بوو لە شوێنی خۆتان بن تێگەیشتم واتای ئەوەیە لە سەرکردایەتی دەکشێینەوە ) بەڵام ئەو بروسکەی کاك نەوشیروان جێ بەجێ بکەن ( کاك نەوشیروان پاش لێدانی هەڵەبجە بە بروسکە ئاگاداری هەموو هێزەکانی کردەوە کە پێویستە تۆڵەی هەڵەبجە بکرێتەوە ) لەسەر جیهازەکە لەگەڵ کاك کۆسرەت باسی ئەو بابەتەمان کرد لێك حاڵی بووین ، هێزەکانمان کۆکردەوەو چاوەڕوانی شەهید عبدالرزاق و مام غەفورومامۆستا بەکرمان دەکرد ئەوانیش بەخۆیان و هێزەکانیان بێنە لامان لە رۆژی ١٩٨٨/٣/٢٤ گەیشتینە دەشتی هەولێر کۆبوینەوە بڕیارماندا لە گوندی ( مجلوبە) بدەین لەبەر ئەوەی زۆربەی کەس و کاریان لە دائیرەکانی ئەمن و ئیستیخبارات مەنزومە ، کار دەکەن ، نزیکەی (٤٠)کم لە رۆژئاوای هەولێرە ، شەوی ٢٦\٢٧/٣/١٩٨٨ بەرێ کەوتین لە نزیك گوندی ماجیداوە ئوتومبیلەکانمان راگرت بەسێ قۆڵ بەرەو گوندەکە بەرێ کەوتین .

بەهار بوو ، دەغڵ لە شەمامك بەتەواوی بەژنی کردبوو لە نزیك گوند هەر قۆڵە بەرەو شوێنی خۆی کەوتە رێ ، سەگەکان بۆنیان کرد دەستیان کرد بە چەقە لورانە ناوە ناوەش حەرەسەکانیان تەقەیان بۆلای ئێمە دەکرد . یەکەم جار کۆشکی مالێکی سەرپەڕمان گرت و چووینە گوندەکە رۆژی عەشر لە هەموولایەك دوکەڵ هەڵسا ، شەڕ بەگەرمی خانوو بە خانوو دەستی پێکرد خەڵك دەکوژرا ئەو ساتە ویژدان و بەزەییمان بوو بە ویژدان و بەزەیی ئەو هەڵەبجەیەی لە خێزانێکی (١٥) کەسی تەنیا خۆی دەرباز بوبێ بە چ شێوەیەك لەگەڵ دوژمنەکەی رەفتار بکا ، لەو سات و بەینە منداڵێکی حەوت هەشت ساڵانی عەرەبی جۆداشەیەکی سپی خاوێنی لەبەر دابوو بە هەڵەداوان هاتە لای من ، رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو هەر هانکە هانکی بوو ، خۆی بەباوەشم دادا نەی دەزانی چ دەڵێ زۆر خوێنی شیرین بوو تومەز رای کردبوو لە پێش چاویشی چەند کەسێك کوژرابوو ، دڵم پێی سووتا دەمزانی بەجێ ی بهێڵم ئەویش دەکوژرێ دەستم بەسەردا هێنا ووتم ( شلونك ) لە ترسان هەڵدەپەڕی ددانی قرچەی دەهات پێم ووت ( لاتخاف ) زمانی تێك ئاڵا بوو هەر خۆی پێ شۆڕ دەکردەوە لەگەڵ خۆم

بردم هەر تەقە بوو لەناکاو پێشمەرگەیەك هات ووتی کاکە سێ پێشمەرگەمان لەو خانووە شەهید بوونە عارەبێك عاسی بووە ویستم منالەکە تەسلیم بە پێشمەرگەکان بکەم تا بزانم شەهیدەکان کێن لەو کاتە من و شەهید دەهام و کاك مامەند مەنتك و ( بەختیار پێشمەرگەی لای کاك مەلا سلێمان ) و چەند پێشمەرگەیەکی تر لە حەوشەیەك راوەستابووین منالەکە رازی نەبوو بەجێ ی بهێلم لەگەڵ خۆم بردم کە چووین هەر سێ پێشمەرگەکە بریندار بوون هێرشمان بۆ مالەکە کرد برینداوەکانمان هێناوە،لەپاشان هەر لە رێگا ( محمد تورەقی و کازم ) شەهید بوو ، زیرە و هاوار ئاسمانی دەلەرزاند ، خوێنی کورد و عەرەب لە مجلوبەجۆگەلەی بەستبوو سوێندم خوارد نابێ ئەو منالە چی بەسەر بێ لەو چەند کاتژمێرە ئەو منالە منی کردە گەورەی خۆی کە هاتەوە سەر خۆ لەناکاو ووتی ( عمی ولله مو صوچنا صوچ صدام) ماچم کرد ووتم کاکە کامە مالی ئێوەیە ئیشارەتی بۆ کردم تومەز یەکەم مال کە هاتینە ناو گوند کۆشکەکە هی ئەوان بوو ، کەلەشەڕ تەواو بووین لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك ئەو منالەمان بردەوە مالی خۆیان ووتم بانگی دایکت بکە بەلکو مابێ زۆری بانگ کرد کەس وەلامی نەداوە منالەکە گریا دایکە کە گوێ ی لە گریانی کورەکەی بوو خۆی بۆ نەگیرا هەر چەند وای دەزانی خۆی ئاشکرا بکا دەیکوژین چونکە زۆر کەس وا کوژرا بوو لە زیرەی گریانی دا بێ گوێ دانە مردن ئامبەلوزی منالەکەی بوو تێری ماچ کرد ، ووتی دەمان کوژن ووتم نا ، پێم ووتن لەبەر خاتری ئەو منالە جوانە ناتان کوژین ئەگینا زۆر کەس کوژراوە بەلام ووتم ئەو رووداوە ناخۆشە بۆ هەموو خەلك بگێرنەوە دایك و باوك و خوشك و برای هەموویان لە خۆشیان گریان بەم جۆرە ژیانی ئەوانەم رزگار کرد کەلە ترسان لە شوێنێکی لاچەپ خۆیان حەشار دابوو تا نەبینرێن .

بەم جۆرە گوندەکەمان چۆل کردو زیاتر لە حەفتا کەس کوژران چوار پێشمەرگەش لە هێزەکانی ئێمە شەهید بوون ، هەر ئەو شەوە گەراینەوە ناوچەی ( شەرغە )

بۆ بەیانی رژێم دیسان بەگژ برایەکان و دایکم و باوکم و داهات و خۆیان شاردەوە برایەکیان لەسەر کار گرتم تا مانگی ١٠/١٩٨٨ لەگەڵ لێبووردنی گشتی ئازاد کرا ، بەم جۆرە ئەو کارەساتە دلتەزێن و ناخۆشانە پیاو بەچاوی خۆی دەبینێ ، من هەر چەند سەرکردایەتی ئەو شەڕەشم کرد بەلام کە منالی بچوکم دەدیت گوللە مێشکی پژاندبوو ئێستاش لەگەڵ ویژدانی خۆم شەڕ دەکەم هەر چەند هەرگیز دلم نەهات نە ئافرەت نە منال بکوژم وە تەقەشم لەوانە نەکرد بەلام شەڕ شەڕە هەموو کەسێکی تیا دەکوژرێ ، راستە کوشتنی ژن و منال و خەلکی بێ دەسەلات کارێکی زۆر خراپە بەلام بێ دەنگی خەلك لە ئاست هەلسووکەوتەکانی رژێم ،

نۆکەرایەتی کردنی رژێم زۆر جار شۆڕشگێران ناچار دەکات کە توندو تیژی شۆڕشگێرانە ( العنف الپوری ) بەکاربهێنن بەداخەوە زۆر کەس ناو لەو توندو تیژیە دەنێ (ارهاب ) کەچی حکومەتی عیراق بەهەزاران ژن و منداڵ و پیرو لاوی ئێمە دەکوژێ خۆیان لێ بێ دەنگ دەکەن پاشان دوژمن بە ڤیدیو وێنەی کوژراوەکانی گرتبوو لە بیرمە جارێك لەکاتی شەڕی پارتیزانی لە ساڵی ١٩٨٩ چەند کەسێك هاتنە لام من زۆر بە توندی هێرشم کردە سەر رژێم وە بەفاشیست و ئیرهابیم ناو برد دیارە ئەو برادەرە باشانە لەلای (مدیر الامن ) ی هەولێر قسەکانی منیان دەقاو دەق بۆ گێرابۆوە بەڕێوەبەری ئاسایشیش ( مدیرالامن ) لە وەڵامدا ووتبووی ئێمە ئیرهابین یان ڕێباز ئیرهابییە لە گوندی مچلوبە ئیرهاب دەرکەوت .

دیارە بەڕێوەبەری ئاسایش لە بیری چوبۆوە کە سەدان رووداوی لە مچلوبە گەورەتریان کردوە ، گوندەکانی چیمەن لە کەرکوك ، جل بەسەر لە دەشتی هەولێر ، وەرتێ لە خۆشناوەتی ، قەڵادزە لەساڵی ١٩٧٤ گەرمیان و هەڵەبجەو بە دەیان رووداوی خوێناوی تر بە پیلانی ئەوان و لەسەر دەستی جەللادە خوێن رێژەکانی وان ئەنجام دراوە، کە هەزاران منداڵ و پیرو ئافرەتی کوردیان تیا کوشتوە بەهەق ئیرهاب و رەشە کوژی هەروا دەبێ من پێم وایە پولپوت و هیتلەر و فرانکۆ و بوکاسا و موسولینیش هەر ئەوەندە دڕندەو وەحشی بوونە ، کام دەوڵەت بە کیمیاوی لەگەڵەکەی خۆی داوە کام دەوڵەت (٤٠٠٠) چوار هەزار گوندی رووخاندووە کام رژێم ئاگری لە وولاتی خۆی بەرداوە کاربەدەستانی رژێم دەیانەوێ خۆ لەو هەموو کردەوە فاشیانە بدزنەوە کەچی تا دنیا ماوە لە گەردەنی حزبی بەعسی عەفلەقی دڕندە گرەدراوە ، رۆژێك دەبێ گەلی عێراق تۆڵەی ئەو هەموو تاوانەیان لێ بکاتەوە .

# كارەساتی گەرمیان

پاش كشانەوەی هێزەكانی ی . ن . ك لە دۆڵی جافەتی و مەرگە و پیرەمەگرون لەشاری سەقز كۆبونەوەیەكی سەركردایەتی بەسترا بڕیاردرا بەرگری لە شوێن و مەڵبەندەكانی كوردستان بكرێت دیارە بەپەلە هێزەكان گەڕانەوە ، لە گەرمیان و قەرەداغ و هێزێكی بچوكی یەكێتی و پارتی و هەندێ جەماعەتی مجلس اعلی اسلامی لێ مابوو هێزەكانی تر كەلە شەڕی سەركردایەتی بوون بەو ماندووبوون و هیلاكیەی دەبوایە رێگای (١٠) دە رۆژی رێ بگرن ، لەناوچەی سەردەشت تا گەرمیان ، دەبوایە بە ناوچەكانی هەولێر بگەڕێنەوە گەرمیان ئەگینا هەموو رێگاكانی تر گیرابوون ماوەی هات و چۆ نەبوو حكومەت فرسەتێكی وای نەدا تا هەموو هێزەكان بگەنەوە جێ ی خۆیان لە پاش ١٩٨٨/٣/٢٠ هێرشی بەربلاوی بۆ ناوچەی قەرەداغ دەست پێكرد لە ١٩٨٨/٤/٢ بەلاغی فەرمی بلاوكردەوە كە ناوچەكەی گرتووە وە راستیش بوو گرتبووی لەوێش چەند جار چەكی كیمیاوی بەكارهێنا لەو رۆژە واتە ١٩٨٨/٤/٢ هێزەكەی ئێمە ناوچەی هەولێری چۆل كرد بۆ پارێزگاری كردن لە مەڵبەندی سێ چووین بۆخۆشناوەتی لە مانگی ١٩٨٨/٤ حكومەتی عێراق لە دە قۆل زیاتر هێزەكانی بۆ گەرمیان هێرشیان برد لەچەند قۆلێك شەڕ كرا بەلام هەموومان دەزانین گەرمیان چیا و چۆل نیە لێرەواری نیە ، ئاستەم نیە ، بۆ شەڕكردنی درێژلە بەرژەوەندی پێشمەرگە نیە بۆیە پێشمەرگەكان كشانەوە چەند مەفرەزەیەك بەشێوەی پارتیزانی بە جیماو ئەوانی تر پەڕینەوە قەلا سێوكەو دەشتی كۆیە و چەمی رێزان داخەكەم لەو هێرشەی دوژمن بەدەیان هەزار ژن و منال و پیاوی كورد گیران كە ئیستاش بێ سەرو شوێنن .

لێپرسراوی ناوچەكە كاك (              ) رێگای نەدابوو خەلك ناوچەكە چۆل بكات وە پێشمەرگەش توانای بەرگری نەبوو نازانم ئەو برادەرە تێكۆشەرە بە چ هەقێك رێگای لەو خەلكە گرت و تووشی ئەو كاراساتەی كرد ، گەرچی لە هەموو كۆبونەوەكان پێشمەرگەو كادیرەكان داوای سزادانی ئەو برادەرەیان دەكرد ، ئەو برادەرەو ئەو لێپرسراوانەی لە هەڵبجە كاری ناجوامێرانەی دوور لە رەوشتی پێشمەرگەیان ئەنجامدا پێویستە بۆ كۆمەلانی خەلك دەست نیشان بكرێن تا رەش و سپی لێك جیابكرێتەوە ، بەڕاستی رێگا گرتن لەو خەلكە تاوانێكە مەگەر بەعسیەكان لە دەستیان هاتبێ .

کارەساتی گەرمیان یەکێکە لە کارەساتە دڵتەزێنەکانی کوردستان بە سەدان مێگەلە مەڕ تالآن کرا ، ماڵو خانووی جووتیاران سووتێنرا ، خۆشیان سەریان تیا چوو ئەوەیە ( سەری چوو ماڵیشی چوو) بەھەق ئەو جووتیارە تێکۆشەرانە بەردی بناغەی شۆڕش بوون لەبەوەش ئەوان شۆڕش گەشەی کرد ئەوەش پیاوەتی و چاکەیان بوو کە دامانەوە بەھەرحاڵ دەبێ ڕۆژێک ئەوانە سزا بدرێن .

لەو هێرش و پەلامارە دوژمن بەسەدان گوندی سووتاند و تەختی کرد وە بەسەدان کەسیشی شەھید کرد ڕژێم لە ١٧/٤/١٩٨٨ هێرشی گەورەی کردە سەر ئێران پاش دوو ڕۆژ شەڕ ئێرانیەکان لە بەندەری ( فاو ) دەرکرد بەو سەرکەوتنە تەرازووی هێز گۆڕا عێراق بووە شێری مەیدان دەوڵەتە کەنداویەکان ترسیان لە ئێران شکا دیارە لە ھەمان ڕۆژیش ئەمریکا لە سەکۆی نەوتی ئێرانی دا زەرەرو زیانێکی زۆری پێگەیاند ھەر مانگێکی نەبرد عێراق ڕۆژھەڵاتی بەسرەشی لە ئێران وەرگرتەوە شەڕی فاو بەناوی عملیات ( رمچان مبارك ) بوو شەڕەکانی ڕۆژھەڵاتی بەسرەو عمارەو بەعقوبە هۆر حوێزە بەناوی ( توکلنا علی الله ١ و ٢ و ٣ و ٤ ) بوو ، لە هێرشەکانی کوردستان کە ئێرانیەکان لە ناوچەی ماوەت و کۆجارو سەفرەو زەروون دەرکرد ناونرا (محمد رسول الله ) بۆچالاکی دژی خەڵکی کوردستان و پێشمەرگە ( الانفال ) (١ و ٢ و ٣ و ٤ و ٥ و ٦ ) ناونرا واتە گرتنی دۆڵی جافەتی ئەنفال(١) گرتنی قەرەداغ ئەنفال (٢) لە ڕۆژی ١٣/٥/١٩٨٨ دوژمن ھەموو گوندەکانی ناوچەی کەرکوك - قەلا سێوکە - شوان - شێخ بزێنی - ساڵەیی تەخت کرد پێشمەرگە ھەندێ شەڕی تیا کرد بەڵام دوژمن بەخەستی چەکی کیمیایی لە گوندی گۆپتەپە بەکار ھێنا بووە ھۆی کوشتنی زیاتر لە (١٠٠) کەس و شەھید بوونی چەند پێشمەرگە ، بە ناچاری پێشمەرگەکانیش ناوچەکەیان چۆل کرد ھەر لە ھەمان کات هێرشی کردە سەر ناوچەی دەشتی کۆیە و دەشتی ھەولێر زیاتر لە ( ١٠٠ ) گوندی بەچەند ڕۆژ تەخت کرد وە چەند جارێك چەکی کیمیای بەکارھێنا ، بەم جۆرە ھەموو ناوچەکانی گەرمیان قەرەداغ ، دۆڵی جافەتی ، مەرگە ، شارباژێر سەفرەو زەروون ، سورداش ، چەمی ڕێزان قەلا سێوکە سالەیی شوان شێخ بزێنی دەشتی کۆیە دەشتی ھەولێر کەوتە دەست حکومەت ھیچ پێشمەرگەی لێ نەما تەنیا دوو سەرتیپ لەگەڵ (١٠٠) سەد پێشمەرگە گەڕانەوە گەرمیان بە شێوەی پارتیزانی کاریان کرد بەداخەوە یەکێکیان بەناوی ( ھێمن ) چەند پێشمەرگەیەکی حزبی شیوعی شەھید کردو خۆی تەسلیم کردەوە ، کاك حەمەرەشیش ساڵ و مانگێك بە مەردانە لە چۆلیەکانی گەرمیان مایەوە لە پاشان گەڕایەوە سەرکردایەتی ئەو

چالاكیەی ناوچەی كەركوك و دەشتی كۆیە و دەشتی هەولێر ناونرا ( عملیات الانفال الرابعە ) من ئەو رۆژانە لە دۆڵی بالیسان و نزیك شەقلاوە بووم رۆژ بە رۆژ ئێرانیەكانیش لە جەبهەكان دەشكان وەكو بڵێ ی لە یەكترمان گێرابێتەوە بەهەر حاڵ دوژمن هەرچی لە دەستی هات لەو چالاكیانە كردی ، كوشتن ، برین ، تالان كردن ، خەڵك گرتن ، بێ سەرو شوێن كردنی خەڵك ، ئیستاش بەدەیان هەزار كەس لە خەڵكی كوردستان بێ سەروشوێنن لە دەشتی كۆیەش نزیكەی هەزار كەس بێ سەرو شوێنە دوژمن خۆی ئامادەكرد هێرش بكاتە سەر مەڵبەندی سێ بە حیسابی خۆی سەركردایەتی و مەڵبەندی یەك و مەڵبەندی دووی تەواو كرد ئێمە سەنگەرمان گرت تا رۆژی ١٩٨٨/٨/٢٨ شەرمان لەگەڵ كرد بۆیە پێویستە باسی بكەم .

# شەڕەکانی مەڵبەندی سێ

وەکو پێشتر باسم کرد لە ۱۹۸۸/٤/۲ لەگەڵ هێزەکانی خۆمان بۆ خۆشناوەتی بەرێ کەوتم لە رۆژی ۱۹۸۸/٤/٥ گەیشتمە ( توتمێ ) کە بارەگای مەڵبەند لەوێ بوو دیار بوو رۆژی پێشتر کاک کۆسرەتیش گەیشتبوو ، دوو رۆژ ماینەوە جبهەکان دامەزرا چیای هەورێ کەوتە بەر تیپی ئێمە واتە بەرامبەر شەقلاوە و هەریر ، من لە رۆژی ۱۹۸۸/٤/۹ هەموو هێزەکانی خۆمانم لە ( بەرەکە ) کۆبونەوە پێکرد باری کوردستانم بۆ شی کردنەوە و داوام لێ کردن کە کورِی رۆژی رەش و تەنگانە بن پێویستە تا مردن شەڕ بکەین راستە هەندێ پێشمەرگە وورەی رووخا بوو ، بەرگەی ئەو هێرشانەی نەدەگرت ئەو رۆژە ناخۆشەی پێ نەدەچووە سەر بەڵام بەهەق زۆربەی پێشمەرگەکان زۆر دڵسۆزانە زۆر ئازایانە تا رۆژی ۱۹۸۸/۸/۲۸ شەڕیان لەگەڵ رژێم کرد زۆریش گیانی خۆیان لە پێناوی ئامانجە رەواکانی گەل بەخت کرد ، من لەو ماوەیە تووشی ( مەلاریا ) بووم دکتۆرەکان سەریان دەرنەکرد بەهۆی برادەرێکی گەلێك خۆشەویست دکتۆرێکی هەولێر بۆی دەست نیشان کردم کە ( مەلاریا ) یە بەڕاستی یارمەتی و دڵسۆزی ئەو برا ئازیزە نەبوایە رەنگە ئیستا لەو دونیایە نەمابام لە مانگی ۱۹۸۸/٥ تووشی هەمان نەخۆشی بوومەوە ئەو جارە خراپتر بووم ، هورِێنەم دەکرد دیسان ئەو برادەرانەی شەقلاوە بە هاوارم هاتن و رزگاریان کردم لە دەوروبەری ۱۹۸۸/٥/۲۰ دوژمن لە هەموو قۆڵەکان هێرشی دەست پێکرد تەنها لە وەرتێ سەرکەوتنی وەدەست هێنا پشتی هێزەکانی ئێمەی گرت بەڵام ئێمە بڕیارمان دا هەر شەڕ بکەین بیست رۆژ زیاتر شەڕ لەهەموو قۆڵەکان کرا :

١. کۆڕەك بۆسەر قۆپی جوانەگا – مەلەکان دوژمن زەبرێکی کوشندەی خوارد لەسەر دەستی پێشمەرگەکانی ت۹۱ ی سەفین کە هاورِێ سەفین خۆی سەرپەرشتی دەکرد ئەو بەرەیە بە نۆرە لەلایەن ت۹۱ ی سەفین و ت ۱۹ ی کۆڕەك و هەندێ بەرگری میللی دەگۆڕدرا لەو بەرەیە زیاتر لە (۱۰۰) سەرباز کوژرا وەلاشەی زۆربەیان کەوتە دەست پێشمەرگەکان .

٢. بەرەی کاروخ لەلایەن کاك حسەن کوێستانی ئەندامی سەرکردایەتی سەرپەرشتی دەکرا کە دوژمن لە زینوێی ی ئەستیێکان هێرشی بۆسەر شاخی کاروخ دەکرد ت ۷۸ ی کاروخ و ت ۷٤ ی بالەك و مەڵبەند و بەشێك لە تیپی ۸۷ ی قەرەچوغ لەوێ بوون لەگەڵ تیپەکانی مەڵبەندی یەك و مەڵبەندی دوو دەگۆڕدران لەو بەرەیەش بە خراپی دوژمن شکا.

٣. بەرەی گەرەوان دوژمن لەچەند قۆڵێك هێرشی دەكرد لە رەواندز بۆ گەرەوان لە رەواندز بۆ سەر شاخی هەندرێن لەدەرگەڵە بۆ زینوێی سەران ئەو بەرەیە لەلایەن كاك جەعفەر ( شێخ جەعفەر ) سەرپەرشتی دەكرا كاك عەولا بۆر فەرماندەی ت١٢ ی سۆران یارمەتی دەدا ، دوژمن هەندێ پێشڕەوی كرد لەسەر شاخی هەندرێن وە زۆر زەرەرو زیانی لێكەوت .

٤. بەنی حەریر : لەسەر چیا بۆ بەنی حەریر هێرشی دەكرد ، وەلەلایەن مامۆستا بەكر فەرماندەی ت٩٣ ی كۆیە سەرپەرشتی دەكرا

٥. بەرەی شاخی سوور – شەكرۆك : دوژمن لەسەر جادەی گشتی شەقلاوە – حەریر هێرشی دەكرد لەلایەن پێشمەرگەكانی ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر پارێزگاری لێ دەكرا رێباز سەرپەرستی دەكرد تا كشانەوەی هێزەكان دوژمن نەیتوانی یەك بست بگرێت .

٦. بەرەی دۆڵی سماقوڵی : لەلایەن پێشمەرگەكانی ت٨٥ ی بەرانەتی پارێزگاری لێ دەكرا لەگەڵ بەشێك لە پێشمەرگەكانی ت٩١ ی سەفین و پێشمەرگەكانی رێكخراوی یەك لە لایەن هاورێ شاخەوان سەرپەرشتی دەكرا دوژمن تا زیارەت هات و نەیتوانی چیتر پێشڕەوی بكات .

٧. بەرەی مێرگە سەر – نوسەك : لەلایەن مام غەفور فەرماندەی ت ٧٨ ی قەرەچوغ سەرپەرشتی دەكرا وە بەشێك لە پێشمەرگەكانی لقی دووی پ . د . ك لەو بەرەیە بوو دوژمن هێرشی بۆ ئەو بەرەیە نەكرد تەنها چەند جارێك بە كۆپتەر و فرۆكەی شەڕكەر بوردومانی كردن .

٨. بەرەی زێوە – هەرتەل : پێشمەرگەكانی پ . د . ك پارێزگاریان لێ دەكرد دیسان لەو قۆڵەشەوە دوژمن هێرشی نەكرد ، تۆپ بارانی زۆر لەسەر بەرەی كوڕەك – جوانەگا و مەلەكان و كاروخ و گەرەوان و شاخی سوور هەبوو دەستی كاریگەر لە شاخی جوانەگا لە دوژمن وەشێنرا.

ئەو شەڕە تاكو ١٩٨٨/٦/١٢ ی خایاند لە پاشان دوژمن چیتر هێرشی نەكرد بەڵام لە ناوچەكانی نەكشایەوە ئێمەش لە شوێنەكانی خۆمان ماینەوە

# ئایا مفاوەزات دەستی پێکردەوە

دیارە سەرکردایەتی ی . ن . ك لە راستیەکان گەیشت ، ئێران ئەو جۆرە دوژمنەیە کە خۆی بە دۆست دەزانی ، من رۆژێك چووم بۆ مەڵبەند لەوێ کاك مولازم عومەر ووتی شتێك هەیە کەس نایزانی دەمەوێ لای تۆی باس بکەم بەڵام نابێ بیدرکێنی ووتم باشە : لە پشت خانووەکەی مەڵبەند بە درێژی باسی مفاوەزاتی بۆ کردم دیارە لە رێگای (موکەرەم تاڵەبانی ) نامە لە نێوان حکومەت و کاك نەوشیروان دەهات و دەچوو ، هێشتا شەڕی عێراق – ئێران نەوەستابوو ، هێشتا ئێران دانی نەنابوو بەبڕیاری (٥٩٨) ئەنجومەنی ئاسایشی دەوڵەتان ( قرار مجلس الامن الدولي المرقم ( ٥٩٨ ) حول وقف اگلاق النار بين العراق وايران ) لە لایەکی تریش بەهۆی (حاجی عبد ) کە سەرۆکی شوعبەی سێ ی ئەمنی عامەیە برای ( علی حسن المجيد ) ە واتا ئامۆزای سەدامیشە هەندێ هاتووچۆ هەبوو ، دیار بوو برادەران داوایان لە حکومەت کردبوو کە هێرشەکان بۆ سەر مەڵبەندی سێ رابگرێ دیارە ئەو خاڵەی جێبەجێ کردو هێرشەکانی راگرت بەرای من ئەگەر ئێران دانی نەنابا بە بڕیاری (٥٩٨) حکومەت لەگەڵ ئێمە پێك دەهات ، پێی خۆش نەبوو ئەو هەموو پێشمەرگەیە روو لە ئێران بکات وە جارێکی تریش ئێران سودیان لێ وەربگرێ دیارە ئەو هاتوو چونە تا وەختێکی درەنگ هەر بەردەوام بوو .

لە رۆژی ١٩٨٨/٧/١٩ ئێرانیەکان بەفەرمی دانیان نا بە بڕیاری (٥٩٨) وە خومەینی لە ووتارێکی دوورو درێژ ( ژەهری خوارد ) . بەم جۆرە عێراق پاشەکشەی لە مفاوەزات کرد هەرچەندە برادەرانی ئێمە زۆریان لایان وابوو کە حکومەت رێك دەکەوێ ، رژێمی عێراق باشترین فرسەتی دەسکەوت تا زەبرێکی کوشندە لەگەڵی کوردو بزووتنەوەی کوردایەتی بدات و درێژە بە سیاسەتی فاشیانەی بدات ، بەم جۆرە جارێکی تریش هەلی لە دەست دانی مفاوەزات رۆیشت .

لە رۆژی ١٩٨٨/٧/٢٥ لە مەڵبەندی سێ کۆبونەوەیەکی فراوانی هەموو سەرتیپ و رابەر سیاسی و لێپرسراوی رێکخستن و کادیرە پێشکەوتووەکان کرا مولازم عومەر بەباس کردنی باری کوردستان کۆبونەوەکەی دەست پێکرد لە پاشان نامەی کاك نەوشیروان باس کرا کە دەڵێت شەڕکردن بەشێوەی بەرە لەگەڵ حکومەت زیانی زۆر دەبەخشێ وە داوای دەکردکە چەند وەحدەیەکی پێشمەرگە لە ناوچەکان بەشێوەی پارتیزانی کار بکەن وە باقی هێزەکەش بگەڕێتەوە

قەندیل ، دیار بوو دەست نیشان کرابوو چ سەرتیپێك دەمێنێتەوەو کێ دەڕوا ، باسی هەموو سەرتیپەکان کرا هەندێك بچن بۆ قەندیل هەندێك ببنە لێپرسراوی وەحدە ، باسی من و کاك سەفین لە دوور و نزیك نەکرا پاش ماوەیەك کاك مولازم عومەر و کاك کۆسرەت ووتیان ڕێباز و سەفین باسی ناکەین چونکە کاری ترمان لەگەڵیان هەیە ، پاش کۆبونەوەکە قسەیان بەتەنها لەگەڵ دەکەین ، زۆر باس و لێکۆڵینەوە کرا لەو ڕۆژەوە خێزان و ماڵ ڕێگا درا بڕوات و بەرە بەرە هێزەکانمان لە ناوچەکە کەم بکەینەوە پاش کۆبونەوەکە من و کاك سەفین لەگەڵ برادەرانی سەرکردایەتی کاك مولازم عومەر ، کاك کۆسرەت ، کاك حەسەن کوێستانی دانیشتین بە ئێمەیان ڕاگەیاند کە دەبێ لە کوردستان بمێننەوە وەسەرپەرشتی تیپەکان بکەن من کرام بە لێپرسراوی ڕەتلی هەولێر واتە سنوورەکانی ت ۸۷ و ت۸٦ و هەندێ لە تیپی ۹۰ ی باواجی من لێپرسراوایان بم وە کاك سەفینیش کرا بە لێپرسراوی ڕەتلی خۆشناوەتی ، کە گەڕامەوە ، بۆ پێشمەرگەکانم گێڕایەوە زۆریان پێ خۆش بوو ، لەپاشان بە درێژی باسی ئەو دۆخەی پاش ۱۹۸۸/۸/۲۸ دەکەم وە خۆم نامیلکەیەکی سێ لاپەرەم بەناوی ( شەڕی پارتیزانی لە کوردستان ) بلاّوکردەوە کە تایبەت بوو بە ژیانی پارتیزانەکان لە دەشتی هەولێر لە دوای ئەنفالەکان ، حکومەتی عێراقیش ، بەرە بەرە هێزی زیاد دەکرد لە بەرەکان شەڕی عێراق و ئێرانیش لە ۱۹۸۸/۸/۸ ڕاوەستا وە ( وقف اگلاق النار ) لە ۱۹۸۸/۸/۲۰ جێبەجێ کرا لە ۱۹۸۸/۸/۲۵ گارق عزیز علی اکبر ولایەتی لە نیۆیورك بۆیەکەم جار بەناو بژیوانی ( خافیر پیریز دیکویلار ) ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دانیشتن بەم جۆرە حکومەتی عێراق هەموو هێزەکانی دەست بەتاڵ مایەوە گەلی کوردیش بێ پشتیوان لەو مەیدانە دەبێ بەرامبەر ئەو ڕژێمە درندەیە ڕابوەستێ بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەلایەن عێراق ببووە شتێکی ئاسایی دیارە کوردیش لەم ڕۆژەدا چاوەڕێ ی کارەساتێکی تری دەکرد .

لەو ماوەیەدا ڕەتلی ئێمە کە بریتی بوو لە تیپەکانی ۸۵ ی بەرانەتی و ۸٦ ی دەشتی هەولێر و ۸۷ ی قەرەچوغ ئیش و کارەکانمان تەواو کرد وە ئامادەیی هەموو زروفێکمان وەرگرتبوو ، دیارە کاك سەفینیش بەهۆی شەڕی ( کونە کۆتر ) سەحب کرایەوە من لێپرسراوەتی هەموو هێزەکانی خۆشناوەتی ، دەشتی هەولێر، قەرەچوغ ، بەرانەتی باواجی ، دەشتی کۆیە کەوتە سەر شان مەبلەغی (۱۰۰۰۰) دینارم لە برادەران وەرگرت وەچەند جیهازێکی تەلەفۆن کنگ و جیهازی ڕاکالی گەورەم ئامادە کرد ، هەموو ئەو پێشمەرگە خاوەن خێزان و ماندوو ، ئەوانەی بەکەڵکی پارتیزانی نەدەهاتن ڕەوانەی چیای کاروخم کردن تا لە هێزەکەی پارتیزان جیایان

بکەمەوە ، حکومەتی عێراق هێزێکی گەورەی لە هەموو لایەك کۆکردبۆوە ، مـن هەسـتم کـرد کە دەیەوێ ( عملیـە التگویـق والابـادە ) لەسـەرمان جێبـەجێ بکـات ، زۆر جـار بـە بـرادەرانم دەگوت کاکە خۆمن نایەم بۆ ئێران هەر لێرە دەمێنمەوە حەز دەکەم ئێرەش قەلەبالغ بێـت بـەلاّم دەبێ ئەوە بزانن چوونی ئەو هێزە بۆ قەندیل لەکاتی هێرشی رژێم زۆر ناستەنگ دەبێ ئەو کاتـە (٥) پێنج ئەندامی سەرکردایەتی ی . ن . ك لەوێ بوون دووانیـان ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی بوون کاك فەرەیدون عبد القادر و کاك مولازم عومەر جگە لە کاك کۆسـرەت و کاکـە حەسـەن کوێستانی و مامۆستا عەبدولاّ ، لە رۆژی ١٩٨٨/٧/٢٥ ئـەو پێـنج سـەرکردەیە لـە مەڵبەنـد کۆبونەوە بانگی منیان کرد ووتیان حەز دەکـەین رای خـۆت دەربـڕی ئێسـتا چـی بکـەین ، مـن یەکسەر رای خۆم داو ووتم : ئەگەر ئێستا بەرێ کەون بۆ قەندیل هێشـتا درەنگـە چـونکە ئەگـەر دوا کەون من زۆر بەناستەنگی دەزانم بەسەلامەتی ئەو هێزە بگاتە شـوێنی خـۆی دیـارە مـولازم عومەر یەکسەر ووتی زۆر راستە وە لەوێ بێ گفتوگۆ بڕیار درا بەرە بەرە ناوچەکە چـۆل بکـەن ، بڕیار درا کـاك حەسـەن کوێسـتانی کـە بـۆ ماوەیـەك بمێنێتـەوە ، برادەرانـی تـریش وەکـو کـاك فەرەیدون عبدالقادر و کاك عومەر و کاك کۆسرەت هەر بـە منیـان دەگـوت لەگـەڵ تـۆ دێـین ، بەڕاستی بـەوانم ووت ئەگـەر وا بکـەن ناچـمە خـوارەوە نـابێ لـەو رۆژە هەڵوێسـت بەسـەر یـەکتر بفرۆشین هیچ عەیب نی یە دۆخەکەمان وایە من ئەو رۆژە لەو برادەرانە جیا بوومەوە چووم بۆلای هەموو برادەران پێم راگەیاندن کە دەبێ ئێستا بـەرێ کـەون بـۆ دۆڵـی نـازەنین وە منـیش دەچـم بۆلای راجیمەکە بۆئەوەی لە رانیە بدەین تا فیشەکەکان ئـەوها بـەجێ نـەهێڵین، دوژمنـیش هـەر خـەریکی کۆکردنـەوەی هێزەکـان بـوو ، لـەو رۆژانـە هەرچـی پێشـمەرگەی مەڵبەنـدی یـەك و مەڵبەندی دوو هەبوو بەرەو قەندیل بەرێ کرانەوە جگە لە ت٢١ ی کەرکوك نەبێ ، بەسەدان ماڵ بەرەو ئێران رۆیشتن دۆخەکە هەر بەرەو ناخۆشی دەڕۆیشت خەڵك نەیدەزانی چی بکات دەستێکی لە پاش و دەستێکی لەپێش، لەماوەی رابردوو هەرچی پێشمەرگەی تەسلیم بە رژێم ببۆوە ئەگـەر کارێکی بـۆ رژێـم نەکردبایـەو خیانـەتی دەرهـەق برادەرانـی نەکردبایـە شـوێن بزربـان دەکـرد ، ئێستاش کەس نازانێ لە کوێن ، بەم جۆرە مفاوەزاتەکـەش هیچـی بـە هـیچ نـەبوو دوژمـن لـە رۆژی١٩٨٨/٨/٢٨ لە سەرانسەری کوردستان هێرشی دەست پێکرد .

## ١٩٨٨/٨/٢٥

## ئەو رۆژەی لەگەڵ برادەران جیابووینەوە

رۆژی ١٩٨٨/٨/٢٥ بەدڵێکی پڕ پەژارە و خەفەتەوە ئەو هەموو برادەرانەی کە ماوەیەکی دوور و درێژ بوو بەیەکەوە لە سەنگەری خەبات پێشمەرگایەتیمان دەکرد دەستمان خستە ملی یەکتر تێر تێر یەکترمان ماچ کرد ، دەمزانی تا ماوەیەکی زۆر لەیەك دادەبڕێین ، کێ دەڵێ هەر یەکتر دەبینینەوە ، دەمزانی ئەوان دەڕۆن بۆ ئێران منیش لەناو کوردستان دەمێنمەوە ، کوردستانیش چۆڵ و هۆڵە ، یەك گوند نەماوە ، تەنانەت چەقەڵ و گورگ و دەعباش لەو چۆڵیە ناژی ئەدی چۆن ئێمە دەژین زۆرم بیر کردەوە بەڵام هەرگیز لەلای برادەران بسەرە خۆم نەهێنا زۆر لە برادەران کە خواحافیزیان لێ دەکردم لە ناخی دڵەوە دەیانگووت ( توخوا ڕێباز زۆر ئاگاداری خۆت بە ) دەمزانی چەند پەرۆشم بوون هەموویان دەترسان نەوەکو بە دەستی ڕەفیقەکانی خۆم دوژمن بە کوشتنم بدات ، منیش هەمیشە بە پێکەنینەوە دەمگووت هیچ خەمی منتان نەبێ جێگای هیوا ڕەزامەندی هەمووتان دەبم ئێوارە لەگەڵ ڕۆژئاوا چوومەوە گوندی ئەشکەوتە چووم بۆلای (ش) ئافرەتێکی زۆر جوان بوو زۆر منی خۆش دەویست بەڵام هەرگیز رووم نەدەدایێ ووتم دەڕۆم هاتووم خواحافیزیت لێ بکەم زۆر خەفەتی خوارد ووتی زۆر ئاگاداری خۆت بە دەتکوژن ووتم نا بشکوژرێم لە پێناوی سەربەرزی گەلەکەم دەکوژرێم ، داوای هەندێ شتی لێ کردم بۆم جێبەجێ نەکرد چوومەوە لای مامۆستا بەکر زۆر دۆستێکی لەمێژینەم بوو فەرماندەیی تیپی ٩٣ ی کۆیە بوو ساڵەها بوو گرێ ی دڵی خۆمان لەلای یەکتر دەکردەوە، پێم ووت من دەڕۆم بە جیهاز هەموو جارێ قسەت لەگەڵ دەکەم ، ئێوارە کاك مولازم عومەر و کاك فەرەیدون و کاك کۆسرەت دەعوەتیان کردم کاك عومەر خواردنێکی زۆر خۆشی کردبوو پاش نان خواردن کاك کۆسرەت بەتەنیا گەلێك قسەی لەگەڵ کردم زانیم زۆر خەفەتبارە بۆم ، چەند جار دووبارەی کردەوە کە ئاگاداری خۆم بم لەگەڵ خەڵکی گومانلێکراو نەگەڕێم زۆر سەیری ناوچاوی دەکردم دەمزانی پێی ناخۆش بوو شتێکم بسەر بێ بە کاك کۆسرەتم ووت بە جیهاز زۆر قسەم لەگەڵ بکە وە زوو زوو چونکە بۆ ڕنگای هات و نەهات دەڕۆم با ئاگاداری یەکتر بین کە قسەکانم لەگەڵ ئەو تەواو کرد چومەوە لای کاك فەرەیدون و کاك مولازم عومەر چەند جارێك یەکترمان ماچ کرد زۆر بەڕێزو حورمەتەوە خواحافیزیان لێ کردم کە لە ژووری

مەڵبەند چوومە دەرەوە شەو بوو گریان رێگای لێ گرتم کە چۆن وامان بەسەر هات چۆن ئەو هەموو پێشمەرگە خۆشەویستانە دەڕۆن بۆ ئێران ، ئەرێ دەبێ جارێکی تر سەرکردەکانم ببینمەوە ، جارێکی تر لەگەڵ ئەو سەرتیپە خۆشەویستانەم کۆ ببینەوە ، پێشمەرگەکانیش کە چوار پێشمەرگە بۆ پارێزگاری کردن لێم هەمیشە لەو ماوەیە لەگەڵم بوون سەریان سوورما وتیان شتێك بووە ووتم نا ووتیان ئەدی بۆچی دڵت تەنگە ووتم بۆ برادەران دەڕۆن ، بە ئوتومبیلی مەڵبەند چووم بۆلای پێشمەرگەکانی ت۸۷ ی قەرەچوغ ئەوانەی دەچوون بۆ ئێران ، شەو درەنگ لە چێوە چوومە لایان هەموویانم ماچ کرد مام غەفور فەرمانەدەی تیپ لەخەو هەڵسا زۆر بەرێزەوە هاتە لام کاك فاقە و کاك عومەر ناسر ، کاكُ بەکر گردە سووری هەموو ئەو تێکۆشەرانەم دیت کە چەند پێیان ناخۆش بوو لە یەکتر جیادەبینەوە .

هەرچەندی کردم لە دانیشتنی لای پێشمەرگەکانی ت۸۷ ی قەرەچوغ تێرنەبووم ئەو تیپەی کە ماوەیەك فەرماندەیان بووم لەگەڵ هەموویان شەرم کردوە ، لەگەڵ هەموویان دۆستایەتی بەهێزم هەبوو ، چۆن ئەو کۆرە قارەمانانە ، ئەو پێشمەرگە نەبەزانە کە دوژمنیان بەسەگ دەزانی ئیستا وابەمەلوول و کەساسی رێگای ئێران بگرنە بەر ، هەر چۆنێك بوو لەیەکتر جیابووینەوە بەپیادە بەرێ کەوتم بۆنزیك سکتان لە رێگا بەو شەوە چەندین پێشمەرگەم دیت هەموویان دەیان گووت خۆزگەمان بەخۆت دەچیەوە لای هەولێر ووتم نا ئێوەش وەزعتان باشتر دەبێ .

لە رۆژی ۲۶/۸/۱۹۸۸ گەیشتمە هیران خەڵکی لێ نەمابوو ئەو رۆژە دیسان دوژمن بە فرۆکە گازی ژەهراوی پێدا کردبوو شەهیدی نەمر هاشم شەمامکی بە کیمیاوی بریندار بوو ، نیوەرۆ لای پێشمەرگەکانی ت۸٥ ی بەرانەتی نانم خوارد بۆ ئێوارە ئاودیوی زیارەت و سولاوك بووین لە رۆژی ۲۷/۸/۱۹۸۸ لە گوندی قەلاسنج هەموو ئەو پێشمەرگانەی کە بۆخوارەوە تەرخان کرابوون کۆم کردنەوە کۆبونەوەم بە فەرماندەو پێشمەرگەکان کرد وە دابەشم کردن بەسەر ناوچەکان ئەو هێزانەی کەسەربە رەتلی ئێمە بوون ئەمانە بوون :

رەتلی دەشتی هەولێر بەفەرماندەی رێباز لەو تیپانەی خوارەوە پێك هاتبوون :

١. ت۸٥ ی بەرانەتی کاك ئاسۆ فەرماندەیان بوو کاك بورهان سەعید سۆفی جێگر .
٢. ت۸٦ ی دەشتی هەولێر کاك جەلال ئیلنجاغی فەرماندەیان بوو کاك شەفیق ابراهیم جێگر.
٣. ت۸۷ ی قەرەچوغ کاك بێستون فەرماندەیان کاك هاشم جێگر .
٤. ت۹۰ ی باواجی کاك ئازاد چاوشین فەرماندەیان بوو . ناسراو بە ( ئازاد باوەقوبی ).

٥. ت٩٣ ی کۆیە شەهید جەعفەری حەمە دەروێش فەرماندەیان وە جێگرەکەی مامۆستا زیرەك بوو .

ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی بۆ شەڕی پارتیزانی تەرخان کرابوون (٤٠٠) چوار سەد پێشمەرگە دەبوون بڕیارماندا تیپی ٨٥ ی بەرانەتی و ت٨٧ ی قەرەچوغ بە ڕێگای کۆڕێ مەسیف بەرەو بەرانەتی بڕوا چونکە هێشتا گوندەکانی مابوو ت٨٦ و ئێمەش بچین بۆ دەشتی هەولێر ڕۆژی ٦/٩/ ١٩٨٨ لە گوندی (ش) لەگەڵ لێپرسراوەکان یەکتر ببینینەوە ت٩٠ ی باواجی و ت٩٣ ی کۆیە بەرەو ناوچەکانی خۆیان ڕۆیشتبوون ، بۆ ئێوارە بەو شێوەی سەرەوە لەیەکتر دابڕاین دیارە ڕژێمیش تەواو هێزەکانی ساز دابوو لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٨ لە سەرانسەری کوردستان هێرش دەستی پێکرد زۆر بەتوندی ناوچەکانی پیس کرد بە ژەهری کیمیاوی بەتایبەتی لە بادینان و بالیسان ، پێشمەرگەکانی یەکێتی زۆر بە ئاستەنگ لە جادەی گشتی سەنگەسەر - چۆمان پەڕینەوە . بۆ بەیانی (١٥) پازدە پێشمەرگە لە وەرتێ بێ سەروشوێن بوون لەبەر ئەوەی نەیانتوانی بپەڕنەوە .

ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٧ لە کاتێك دەمانویست لە ڕێگای سارتکە بۆ هەنارە بڕۆین لەپڕ سەرچیا لەلایەن سەرباز گیرابوو ، زۆر بە ئاستەنگ لە چیا ئاودیوی هەنارە بووین کە سەیرم کرد هەموو سەربازگە و هێزی دوژمنە کۆدەبێتەوە زانیم تازە هێرش دەکات کاتژمێر (١٢) شەو گەیشتینە گوندی (شەرەبۆت ) کە نزیکەی (٣٠)کم لە هەولێر دوورە وە هەولێری زۆر بەچاکی لێ دیارە گوندەکە دوو ماڵی مەڕ لەوەڕێنی لێ بوو لەوێ نانم خوارد پێشمەرگەکانیش لەناو باخچەکان نانیان خوارد نووستن گوندەکانی شەرەبۆتی خواروو شەرەبۆتی سەروو زۆر باغ و ڕەزی لێیە ، هەناری شەرەبۆت لە هەولێر زۆر بەناوبانگە بەیانی لە ماڵەکە هەڵسام لەگەڵ دەنگی کۆپتەرەکان بەخەبەر هاتم ڕەنگە زیاتر لە (٥٠) کۆپتەر بەرەو خۆشناوەتی ڕۆیشتن ، زۆر خەمم بوو تا ئێوارە لەناو باخچەکان خۆمان شاردەوە ئێوارە لە گوندی شەرەبۆت نانمان خوارد کە ئەوێ (٦) شەش ماڵی لێبوو هەرچەندی کردم جیهازی مەڵبەند قسەی نەدەکرد زۆر خەمم خوارد پاش نان خواردن بەرێ کەوتین بۆ دەشتی هەولێر شەوێ کاتژمێر (١) ی پاش نیوە شەو گەیشتینە گوندی ( باغچە ) لەوێ چاومان بە مام ( ح . س ) کەوت لەلای مەڕ بوو زۆر ترسا کە منی ناسیەوە ووتی چی دەکەی ووتم دەمێنینەوە ووتی کاکە ناکرێ کەس نەماوە لەم چۆلیە چی دەخۆن بەڕاستی دەمرن ووتم چارە چی یە خوا کەریمە جیاوازی کردمەوە ووتی ئەمڕۆ تەرمێکم دۆزیوەتەوە ، ووتم نەت ناسی ووتی با کابرای باغەمرە ووتم نازانی کێ شەهیدی کردیە

ووتی لای تۆی باس دەکەم ( زوك) کە هەردووکیان بران ئەو کابرایە پێشمەرگەیەکی کۆنی پارتی بوو یەکسەر بە مام (ح . س ) ووت دەبێ بەیانی لەبەر خاتری من بچی بیشاریەوە چونکە پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی ( پ . د . ك ) ە بەیانی زوو چوو شاردیەوە وە لەپاشان چووم بۆ سەر گۆڕەکەی باشترمان ڕێك خست ، بەڵێ دوژمن ئاگری لە سەرانسەری کوردستان بەردا هێزەکانی پارتی و یەکێتی کشانەوە سەر سنورەکان لە بناری قەندیل پێشمەرگەکانی ی . ن . ك چەند شەڕێکیان کرد بەڵام داخەکەم بەهێزی دوژمن بواری پێشمەرگەکانی نەدا زیاتر لە (٢٠) پێشمەرگە لەوێ شەهید بوون ، لەبادینان خەلکی ناوچەکە بەرەو تورکیا بەدەیان لاشەی منالّ و ژن و پیر لەشاخ و چیاکانی کوردستان بەجێما و بوونە خواردنی دالاش .

دەیان تێکۆشەری گەلەکەمان بەگازی کیمیاوی لە کێوە سەربەرزەکانی کوردستان خنکان وە لاشەکەیان بێ سەروشوێنە . دیسان ژن و منالّ بێ پشتیوانی کورد هانای بردەوە بەر دوژمنێکی دڕندەتری گەلەکەمان تورکیای کنعان ایفرین ، پاش کارەساتەکە ئینجا دنیا گوێ ی کرایەوە و ئەوجا باسی کوردیان کرد تا کورد ماوە ئەو کارەساتانەی لە بیر ناچێ ، تا رۆژلە کوردێك بمێنێ نابێ ئەو هەموو زوڵم و زۆریە لە بیر بکرێن .

# شەڕی پارتیزانی لە کوردستان

# دوای ئەنفالەکان

لە کاتێدا شۆڕشگێڕەکان ناتوانن شەڕی بەرەیی (جبهە ) لەگەڵ دوژمن بکەن ، لەو کاتەی دوژمن هێزو توانای زۆر دەبێ و پێشمەرگە و شۆڕشیش هێزو توانای کەم دەبێتەوە ، ، هەر شەڕکردنێك کە روو بەروو لەگەڵ حکومەت بکرێ بە زەرەری شۆڕشگێڕەکان دەشکێتەوە بۆیە لەو حاڵەتە دەبێ شەڕی پارتیزانی هەڵبژێرین ( حرب العصابات ) ( چرب وهرب ) ، لە هەموو دنیا شەڕی پارتیزانی پشتی بەلادێیەکان بەستوە ، خواردن و خۆراك و دەنگ و باسی دوژمن هەر لە جووتیارەکان وەرگیراوە وە زۆربەی پێشمەرگەکانیش کوڕی ئەو جووتیارانەن لە قۆناغی یەکەم کە تازە شۆڕش لە کوردستان دەستی پێ دەکردەوە واتە لە ساڵەکانی ٩٧٦ و ٩٧٧ و ٩٧٨ و ٩٧٩ شۆڕشی گەلی کورد وەکو شۆڕشی گەلانی دنیا ( چین ، ڤیتنام ، لاوس ، کمبودیا ، کوبا ، سلڤادور ، نیکاراغوا، ڤڤار .....) بەو قۆناغە تێپەڕی ئیستا لە کوردستان دوژمن هەموو گوندەکانی تەخت کردوە ، هەندێ لە قەزاو ناحیەکانی تەخت کردوە وەکو ( چۆمان ، چوارتا ، دوکان ، پێنجوێن ، قەلادزە ، ماوەت ، بن گرد ، کەناروێ ، کارێزە ، سورداش ، سیروان ، دێگەڵە ، (شۆڕش) ، هیران ، ئاغجەلەر ) خەڵکی کوردستانی لە چەندین ئۆردوگا زیندانی کردوە وە هەموو ئەو ناوچانەی چۆڵ کراون هاتووچۆکردنی قەدەغەیەتەنها لە پارێزگای هەولێر زیاتر لە ( ٢٥) ئۆردوگای تازەی دروست کردوە بێجگە لە ئۆردوگا کۆنەکان ( دارەتوو ، بنەسلاوە ،باسرمە ، جێژنیکان ، بەرحوشتر ، تۆبزاوە جدیدە ، قادریە ، باقرەت ، گردەچال ، شیوەڕەش ، کەور گۆسك، ) کۆنەکانیش ( پیرزین ، بەستۆرە ، شاوێس ، حەریر ، دیانا ، گۆرەتو ، کسنەزان ، قودس ، مزۆری باڵا ، بەرزانیەکان ، کەڵەك ( خەبات ) ، کانی قرژاڵە ، سێبیران ) وە لە پارێزگای سلێمانی ئۆردوگای ( سوسێ ، حاجیاوە ، شکارتە ، اللەیی ، تەکیە ، نصر صداماوە ، وە دەیان ئۆردوگای زۆرە ملی تر ) بۆیە ژیانی پێشمەرگەی پارتیزان زۆر ئاڵۆزو سەخت دەبێت چونکە ژیانی پێشمەرگەی پارتیزان لە بنچینەدا دەبێ لەسەر لادێیەکان بێت ، بەو دۆخە ئاڵۆزە ی ن. ك بۆ مانەوەی پێشمەرگە لەناو خاکی کوردستان سێ رەتلی دروست کرد لە هەرسێ پارێزگای هەولێرسلێمانی ، کەرکوك بەم شێوەیە :

١. ١- رەتلی گەرمیان - سلێمانی : پێك هات لە (٥٠) پەنجا پێشمەرگە بە فەرماندەی کاك ئازاد سەگرمە کە بەداخەوە لە هێرشێکی گەورەی کۆپتەرەکانی دوژمن بۆ ناوچەی

گەرمیان بریندار بوو بە ڕێگایەکی تایبەتی گەرایەوە سەرکردایەتی ئێستاش سەهەرگیزە وا لە ئێران دەژی وە چەندین چالاکیان کرد ( مەبەست ساڵی ١٩٩٠)

٢. ڕەتلی دەشتی هەولێر – هەولێر پێك هاتبوو لە (٣٠٠) پێشمەرگە پاش لێبوردنی گشتی ( ٥٠) پ . م مانەوە بە فەرماندەی ڕێباز تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ لەناو خاکی کوردستان کارەکانیان ئەنجام دا وە چەندین چالاکی پێشمەرگانەشیان کرد

٣. ڕەتلی کەرکوك : بەفەرماندەی مام ڕۆستەم (٤٠) پێشمەرگە بوون تا مانگی ١٢/١٩٨٨ مانەوە لە پاشان گەڕانەوە سەرکردایەتی وە چەند جارێك تووشی شەڕی نابەرامبەر بوون چەند پێشمەرگەیان شەهید بوو .

٤. پاش گەڕانەوەی مام ڕۆستەم و برادەران لە ناوچەی کەرکوك سەرکردایەتی بڕیاری دا کە ڕەتلێکی تر بنێرێتە ناوچەی سورداش بە فەرماندەی شەهیدی قارەمان غەریب هەڵەدنی ئەو ڕەتلە لە لێدانی دوژمن بەناوی ڕەتلی سورداش، هەموو پێشمەرگە پارتیزانەکان لە کوڕی دڵسۆز و نیشتمان پەروەرو ئازا و دلێر پێك هاتبوون.

لەو ساڵە دوژمن بەسەدان هێرشی کردە سەر پێشمەرگەکان بەدەیان پیلانی گڵاوی بۆ ڕێکخستن ، بەدەیان کەمینی بۆ دانان ، دەیان جار برسیەتی و تینویەتی هیلاکی دەکردن ناخۆشی هێز و توانای لێ دەبڕین بەڵام دوژمن هەر نەیتوانی چۆکیان پێ دابدا شەڕی پارتیزانی لە وڵاتێکی بێ گوند و ئاوەدانی زۆر ئاستەنگە هەر بە قسە خۆشە هەر چەندی دەکەم ناتوانم کام باری ناخۆش باس بکەم هەرچی بیری لێ دەکەمەوە لەوەی تر ناخۆشترو ئاستەم ترە دوژمنیش سەری سووڕمابوو دەیگوت بەچی دەژین ، چۆن لە سەرمان نامرن ، بۆچ بەو هێزە زۆرە نایان دۆزینەوە دەیان پرسیاری تری لە خۆی دەکرد ، کەسێك ئاڵای کوردستان یان نەمانی بەرز کردبێتەوە، ڕۆڵەیەك بیەوێ خزمەتی گەلەکەی بکات پێشمەرگەیەك ئامادەیی مردنی تیابێ بۆ خاکی پیرۆزی خۆی ، کوردێك ئەو هەموو زوڵم و زۆریەی دوژمنی پێ پەسەند نەکرێت بێ گومان لەگەڵ هەموو دۆخێکی ناخۆش و نالەبار هەڵدەکا ، سەرما و گەرما ، برسیەتی و تینویەتی ، ماندوو بوون و شەکەت بوون ، بەفرو باران ، هێرشی دوژمن بۆردومانی کۆپتەر ، پیلانی دوژمن ، بەڵێ ئەو پێشمەرگانە ئاش بەتاڵیان بەئاش بەتاڵ کرد ئەو کەسانەی بیری ئاش بەتاڵیان دەکردەوە ڕۆڵە پارتیزانەکان لوتیان شکاندن ، بەو دەرد و ناخۆشیە مەردانەو ئازایانە کارو ئەرکەکانی سەر شانیان جێ بەجێ کرد ، نامەوێ لێرە بەوردی لە هەموو باری پارتیزانەکان خەڵك ئاگادار بکەمەوە هەرچەند من بەدرێژی ژیان و گوزەرانی پارتیزانەکانم لە

نامیلکەیەك بەناوی ( شەڕی پارتیزانی لە کوردستان ) بلاّوکردەوە کە تایبەتە بە دەزگاکانی سەرکردایەتی و سەرتیپەکان چونکە کاری نهێنی بواری پەخش کردنی زیاتری نیە ( مەبەست ساڵی ١٩٩٠) دەمەوێ بە خەڵکی کوردستان رابگەیەنم کە پارتیزانەکان نەك هەر رۆڵەی رۆژی رەشی کوردستان بوون بەڵکو کوردستانیشیان رووناك کردەوە زۆر کەس باسی ئێمەی کردوە پیاوەتی و تێکۆشانی پارتیزانەکانی لەرادە بەدەر ڕێزگرتووە بەلاّم دەبێ ئەوە بزانین ڕێزو حورمەت دەبێ بە کردەوە بێت نەك بە قسە ، بەڵێ راست بوو پێشمەرگە ئەو کاتە لە کوردستان تەواو دەبێت کە دوژمن توانی رەگی هەموو دارێك لە کوردستان هەڵبکەنێ شاخەکان تەخت بکات ، پارتیزانەکان بوون بە چقلی چاوی دوژمن هەموو قسەکانی دوژمنیان بەدرۆخستەوە ، خۆیان لەبەر هەموو ناخۆشیەك راگرت و توانیان دڵو دەروونی گەلەکەمان بپارێزن لە پرۆپاگەندەی ژەهراوی دوژمن بەسەدان کەس بۆ بینینی پارتیزانەکان خۆی دەخستە مەترسیەوە بگرە سەدان نامەمان بۆ دەهات کە چەند بەپەرۆشەوە بوون بۆ ئێمە ، ژیانی سەخت و دژوار فێرە خۆڕاگریمان دەکات .

## چەند بەسەرهاتێکی ڕۆژانی پارتیزانی

لە ڕۆژی ١٣/٩/١٩٨٨ دوژمن لە چەند قۆڵێك هێرشی هێنا بۆ ناوچەی دەشتی هەولێر بۆ ئەوەی ئێمە بدۆزێتەوە ، من پێشتر هەموو پێشمەرگەکانم بەسەر مەفرەزەی بچووك دابەش کردبوو ، مەفرەزەکەی خۆمان (٨) هەشت پێشمەرگە بووین لەپڕ کۆپتەرەکان بەسەرماندا سوڕانەوە بواری ئەوەیان نەداین ولاغەکانمان تەگبیر بکەین خۆمان شاردەوە ، هێزێکی یەکجار زۆری دوژمن بە پیادە لە دەوروبەرمان بلاوەی کرد ، دەتگوت شایی دەکەن وابەچڕی دەڕۆیشتن دیارە بەدوای ئێمە دەگەڕان ، ئێمە لەناو چەمێکی بچووك خۆمان حەشار دابوو ، لە بەیانی زوو تاکو تاریکی دنیای پۆشی نەمان توانی لەو شوێنە بجولێین وولاغەکانیش بەنان و چاو شت و مەکەوە ڕۆیشتبوون ، ئێمەش نەمانتوانی بە دوایاندا بگەڕێین ، چونکە ئێوارەش دوژمن هەر لە دەورمان بوو زۆر بەئاستەنگ لە چەمەکە دەرچووین هەزاران گوللەیان بەچەمەکەوە نا زۆر جار گوللەکان زۆر لێمان نزیك دەبوونەوە ئەو شەوە تابەیانی بەبێ ئەوەی ڕێگایەك بگرین ڕویشتین تا لە دوژمن دوور بکەوینەوە زۆر زۆر ماندووبووین لەبەیانیەوە نانمان خواردبوو ئەو بەیانیە بیرم کردەوە باشە ئەگەر دوژمن نەکشاوە چی دەکەین . دەمرین لە برسان ئەو ڕۆژەش تا ئێوارە بێ نان ماینەوە لە ئەشکەوتی ( مام خدرۆکە ) ی بناری دیدەوان ، ئێوارە بە دووربینەکە سەیرم کرد دوژمن هەروا لە شوێنەکان ماوە ئەوجا بەڕاستی بیری مردنم هاتە خەیاڵ کە سەیری پێشمەرگەکانم کرد دوانیان زۆر منداڵ بوون ڕەنگیان زەرد ببوو دەستم لە مل کردن ووتم ئەگەر دەتوانن بڕۆن ئەوە پێم چاکە لەو عەفو عامە کەڵك وەربگرن چونکە دەزانم ئێوە لاوی بەجەرگن بۆ دوارۆژ سوودتان بۆ میللەتەکەی خۆتان دەبێت ، کاوە و محمد بە دەنگێکی بەرز ووتیان خۆ ئێمە لەتۆ زیاتر نین با هەموومان بەیەکەوە لە برسان بمرین ، زۆر داخم هەلگرت چیتر قسەم نەکرد ئەو شەوەش بەبێ نان ماینەوە بەڵام هیچ نەڕۆیشتین ڕۆژی سێ یەم بەڕاستی من لە برسان پەکم کەوت لەبەر پێشمەرگەکان قسەم نەکرد سەریشم لەبەر بێ چایی دەئێشا ئێوارە کاك شۆڕشم ناردە شوێنێکی بەرز ووتم ها دووربین لەو (تیل ماچیە) لاسایی ئەوم کردەوە چونکە هەمیشە نێوان دوو گرد پێی دەڵێن ( سوگە) نازانم کاك شۆڕش ئەو (تیل ماچەی ) لەکوێ هێنا بوو زۆر تورە بوو ووتی هەمووومان وا دەمرین تۆش گاڵتە دەکەی کە بەسەر گردەکە کەوت . لە سەیر کردنی چوار دەوری خۆی بە دووربین تێ گەیشتم کەس دیار نەماوە چونکە من زۆر بە دووربین سەیری دنیام دەکرد لێ ی شارەزا بووم لە پڕ دەنگی هەڵبڕی ووتی حکومەت ئاش

بەتاڵی کرد ، یەکسەر بەرێ کەوتین بۆگوندی کاول کراوی بانە مورد کە زۆر ئەو گوندەم خۆش دەویست ( بانی بانە مورد قەلاکەی رەبات هەمووی وە قوربان خاڵی سەر گۆنات) لە رێگا نەمتوانی بڕۆم کە زۆر دووریش نەبوو هەر (٤٠) دەقیقەیەك بوو من هەمیشە دەمانچە و کلاشینکۆف و شەش مەخزەنم هەڵدەگرت کاوە بەپەلە مەخزەنەکانی لێ وەرگرتم بارم سووکتر بوو ئینجا بە لاکە لاك رۆیشتین بزانین لە نزیك گوندی چیمان بەدەست دەکەوێ چونکە جووتیارەکان پێش کاول کردنی گوندەکانیان هەر یەکە لە قوژبنێك ، لەپەنا بەردێك پشویاندەدا ئێمە بە شوێن کۆنە هەوار دەگەڕاین وەکو دەروێشی دەف لێدەر ( ئارد ، روون ، نیسك ، نۆك ، ماش ، شەکر ، چای ) هەرچی بەدەستمان کەوتبا راپێچمان دەدا ، لە نزیك گوندی هیچمان دەست نەکەوت دەمزانی خواردن لە نزیك گوندی سێ گردکان هەیە ، کە بەلای کەمی پیاو تێر بێ دەبێ چوار سەعات بڕوات تا دەگاتە گوندی ئێمەی وا برسی هەر نەدەگەیشتینێ بەڕاستی هەموومان پەکمان کەوت گوتم ئەو جارە بەڕاستی حزرائیل لە دوامان نابێتەوە دیار بوو یەکێکیان دەگەڕا هاواری کرد وەرن زراعەتە ، کە چووین دیار بوو (بیبەر) بوو بەڵام تیژنا ؟

وردە تەماتەی کاڵیشی پێوە بوو یەك شووتی خراپیش دیارە تۆی چەند ساڵ بوو سەری هەڵدابۆوە بەڕاستی نەمانزانی چۆن (بیبەر) دەخۆین رەنگە برادەرهەبێ لە بنجەوە هەڵیکێشا بێ ، ئەو زراعەتە زۆر باش بوو ئەگینا لە برسان ماڵ ئاواییمان لە دنیا دەکرد کەسیش نەیدەزانی چۆن مردووین ، هەر چەندە بیبەر خواردن برسی ترت دەکات بەڵام بۆ ماوەیەك مەعیدەت پڕ دەکات ، ووتم کوڕینە خێرا بن تا ئەو بیبەرە کار دەکات بڕۆین بۆلای سێگردکان لە( میرکە ) گوندێکە زۆر جار بە یادگار دەچوومەوە گوندەکە پشیلەیەك کە ئەوەتە لە برسان نوزەی تێدا مابوو کە بە گوندەکە تێپەڕین بە لاکە لاك کەوتە دوامان وای زانی ئێمە خواردنی دەدەینێ کاك شۆڕش ئاورێکی دایەوە ووتی واللە لە تۆ برسی ترم بڕۆ لای خوا چارەیەکت بکات. بەڵێ رۆژی دواتر نیوەڕۆ گەیشتینە نان و خواردەمەنیەکی زۆر وە کاوڕێکمان کڕی دیارە ( بەری تەنگانە کورتە ) ئینجا تێ ی گەیشتم پیاو بە سێ رۆژو سێ شەو لە برسان نامرێ ئەگەر هیمەتی هەبێ ، بەڵێ لە سەدەی بیستەم لەو چەرخەی ئادەمیزاد مانگی پشکنی گەیشتە ناو مەریخ ئێمەی پێشمەرگەی کوردستان لە برسان وەختبوو بمرین نازانم چۆن نەمردین چونکە ئێمە لەگەڵ ئەو برسێتیەش چەندین کاتژمێر رێگامان بڕیبوو ، هەموو جارێك کە پێشمەرگەکان خواردنی چاکیان بەدەست نەدەکەوت یان بۆ ماوەیەك بێ نان دەمانەوە یادی ئەو رۆژە ناخۆشەیان دەکردەوە منیش پێم دەووتن :

به سەربەرزی و ژیانی سەر حەسیری
به قوربانی بێ تەخت و تاجی میری

ئەو جارە بە پێشمەرگەکانم ووت دەبێ هەمیشە نانی چوار ژەم لـە کۆڵـە پشـتـەکەتاندا بێـت و لەسەر پشتی وولاّغ دایمەنێن چونکە تووشی باری وا دەبین کە دەبێ دەسـت لـەو کـەل و پەلانـەی سەر پشتی وولاّغەکە بشۆین ئیتر ئـەوە لـەناو پێشـمەرگەکان زۆر بـە ووردی جێبـەجێ کـرا ئـەو وولاّغەی لێمان وون بوو دیارە ئەویش کێوی ببوو ، نامۆیی لە ئێمە دەکرد هەر لە ناوچەکە بـوو بەلاّم هەرگیز خۆی بەدەستەوە نەدەدا ، زۆر جار ئەو قسە شیرینەی هێمنم دەهاتەوە یاد کە دەڵێ:

گەر لە برسان و لە بێ بەرگی ئەمرۆ رەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر ئەرزم ئەمـــن

# ژنێکی تێکۆشەر

لە رۆژی ۱۹۸۸/۱۰/۳ دوژمن دیسان هێرشی کردەوە سەرمان ، دیسان دوکەڵ لە هەموو ئاقارێك هەڵدەستا دەست رێژی گوللە دەتگووت شەپۆلی زێ ی خورمە هاژەی دەهات ، جاش و سەربازەکان هەموو بن دار و بەردێك دەگەڕان بۆئەوەی تێکۆشەرێك شەهید بکەن یا بیگرن تا شاباشی چاك وەربگرن ، لەو رۆژە ئێمە لە نزیك دێگەڵە بووین ئەو کات هێشتا تێك نەچووبو ، کاول نەکرابوو ، خەڵکەکەی دەربەدەر نەببوو ، شوانەکان هاتن لەگەڵ رەوینەوەی مەڕ ئێمەیان دیت دیار بوو پێشتر لەگەڵ شوانەکان یەکترمان ئەگیناسی خەڵکی سماق شیرینی سەیدان بوون ، هەرچی نان و پێخۆر هەبوو بە ئێمەیان دا ، زۆر خەفەتبار بوون بۆمان ، پرسیاریان لە باری ئێمە کرد بە درێژی بۆم باس کردن بەلێنیان دا بەیانیش نانمان بۆ بهێنن بەیانیش بەلێنەکەیان هێنا سەر ، من لە شوان و گاوانی کوردستان زۆر رازیم ئەوان زۆر یارمەتی ئێمەیان دا ژنێکم ئەگیناسی ئەو کات ماڵی لە دارەتوو بو زۆر جار دەیگوت منیش وەکو تۆ کوردم ئەو شوانانە باسی ئێمەیان بۆ کردبوو لە رۆژی ۱۹۸۸/۱۰/۸ ئەو ژنە تێکۆشەرە ئەو ژنە مەردە لە دارەتوو کە (۱۰) دە سەعات بە پیادە دوورە لە گوندەکانی نێرە گێن و مێرکە هاتە لامان هەموو جۆرە خواردنێکی بۆ هێناین ( گوشتی حەیوان ، گۆشتی مریشك ، تەماتە ، نان ، شەکر ، چای ، جگەرە ) دوو شەو لامان مایەوە دیارە لەگەڵ کابرایەکی گوندی بەلەبان هاتبوو بەناوی مام ( ئو....) کە بەدزی دەهات دەغڵ و دانی دەبردەوە ژنەکە لەتەمەنی (۳۰) ساڵی دابوو ووتم راستت کرد تۆش وەکو ئێمە کوردی زۆر تورە بوو وایزانی ئێمە لە بێ کسیان بە ئەودا هەڵدەدەین ووتی عەیبە قسەی وا مەکە من ئەرکی سەرشانی خۆم جێبەجێ دەکەم ئەو رۆژە چەند برادەرێکی حزبی شیوعی عێراقیشمان لابوو ئەو ژنە چەند جارێکی تریش هاتەوە لامان ، دیار بوو دائیرەی ئەمن بەهۆی خۆفرۆش ( شێخ ص) پێی زانیبوو چەند جارێك بانگیان کردبوو وە داوایان لێ کردبوو کە ژەهر بۆ من لەناو خواردن بکا تا بمکوژێ ئەو ژنە تێکۆشەرە ئەو مەردە هەموو قسەکانی بۆمن گێرایەوە ووتی مەهێڵە ئافرەت بێتە لات چونکە دەیانەوێ بەهۆی کچ و ئافرەت بتکوژن ، بەڵێ خانم (غ) لە رۆژێکی وا بەکەڵکی ئێمە هات کە تا دنیا ماوە ئەو هەڵوێستەی لە بیر ناکەم هەموو جار بە پێشمەرگەکانی دەگووت خەمتان نەبێ لەشار هەر باس باسی ئێوەیە ....!؟ من زۆر شێوە ژنی کوردی تێکۆشەرم دیوە کە خزمەتی زۆری میللەتی

خۆیان کردوه تەنیا ئەو ئافرەتەم بە نموونە هێنایەوە تاکو هەموو ئافرەتانی کوردستان بە سەرنجەوە سەیری ئەو هەڵوێستە مەردانەیە بکەن ، چونکە لە رۆژگارێکی وا دژوار هاتنە لای پێشمەرگەو لە رێگا گیران بێ گومان سێدارەی لەسەر جێ بەجێ دەکرا کورد نەك تا رۆڵەیەکی بمێنێ بەڵکو تا ژنێکی واتێکۆشەری بمێنێ لەناو چوونی گەلەك ئاستەنگە ، سلاو لەو ئافرەتانەی بە دڵ و گیان لەگەڵ پێشمەرگەکان خزمەتی گەلەکەیان دەکەن .

## چۆن له ئابلوقەی دوژمن رزگارمان بوو

دوژمن به مانەوەی ئێمه له ناوچەکه زۆر سەر گران و گێژ بوو نەیدەزانی چۆن فرسەتێك بەدەست بێنێ‌تاکو لەناومان ببات ، زۆر جار هێرشی دەکرد چی بەدەست نەدەکەوت دەگەڕایەوە ، دیاره هەندێ (قائیدی عسکەری ) بەڵێنیان دابوو که به هەفتەیەك ئێمه بەدەست بستراوی تسلیم به سەرۆکەکانیان بکەن ، ئەو هەواڵە بۆ ئێمه هات زانیم دەیانەوێ هەڕەشەمان لێ بکەن مەسەلەکەم بەجدی وەرگرت پێشمەرگەکانم بسەر چەند مەفرەزەیەك دابەش کرد ئێمه دە کەس بووین زۆر به دوای مەفرەزەکەی ئێمه دەگەڕان چونکه جیهازە گەورەکە لای من بوو وەمن لێپرسراوی ناوچەکه بووم وایان دەزانی من بکوژن پێشمەرگەکان بڵاوەی لێ دەکەن ، نامەم نووسی بۆ ت٨٥ ی بەرانەتی که بێنه لامان تا لەگەڵیان بڕۆین بۆ ناوچەی بەڕانەتی ، دیاره حکومەت فرسەتی نەدا لە سەرانسەری ناوچەکانی بەرانەتی ، دەشتی هەولێر ، باواجی ، خۆشناوەتی هێرشی کرد ، له هەموو قۆڵەکان تەنها له قۆڵی ئێمه هەر نەکشایەوە هێرشەکەی لای ئێمه له (١٢) دوانزە قۆڵ دەستی پێکرد بەم شێوەیە :

١- قەشقه – خوڕ خوڕ – کانی سلێمانه - بەردە سپی – نێرەگین .

٢- دێدەوان – بانه مورد – نێرەگین .

٣- بێستانه – رەسولێ بسکۆل – شیوه پیران .

٤- چەمرگه – کانی سوسکه – ئاخوڕە – بەردبڕ .

٥- حاجی وسو – باخچه – جادەی کۆیه .

٦- دێگەڵە – سماق شیرین – بانه قەلات .

٧- گورزەیی – کانی دەربەند – بانی ماران .

٨- گۆمەشین – شاخه پیسکه – بانی ماران .

٩- گۆمەشین – دار بسەری گەوره – سماقه .

١٠- گۆپتەپه – شیوا شۆك – دار بسەری عەلی مەولود.

١١- تاڵەبان – مەرزان – ئیلینجاغ .

١٢- تەق تەق – ئۆمەر گۆمبەت – سێ گردکان – سێ کانیان – شەیتان – قەمبەر- ئاوماڵ – سارتك .

هەر قۆڵێ لە هەزار سەرباز و جاش زیاتر بوو واتە نزیکەی چوارده هەزار سەرباز و جاش دەبوون ، بە پیادە دەگەڕان پێیان دەگوت ( تمشیگ ) وە بە دەیان کۆپتەریش لەسەر ناوچەکە دەسووڕایەوە ئێمە دە کەس نەمان توانی هیچ جووڵەیەك بکەین زۆر جار وادەبوو چەند مەترێك جاش یان سەرباز بەلای ئێمە دەڕۆیشتن ، رادەوەستان قسەیان دەکرد ، نانیان دەخوارد ، تەقەیان دەکرد ، باسی ئێمەیان دەکرد ، بانگی ئێمەیان دەکرد ، ئێمە بڕیارمان وابوو تا لەیەکتر ئاشکرا نەبین هەرگیز تەقە نەکەین دەمانزانی بەدوای ئێمەدا دەگەڕێن هەر ئاشکرا بین رزگار بوونمان نیە چونکە کۆپتەر زۆر زوو دەگەیشتە شەڕەکە وە هەموو لایەکیش دوژمن بوو بۆکوێ دەچی، دەمانگووت شەڕێك دەکەین لە مێژووی کورد بنووسرێتەوە ، جار جار دەمگووت باشە کەس دیار نیـیە کێ دەیگێڕێتەوە هەر خۆم دڵی خۆم دەداوە جاشەکان بۆ منالەکانیان دەگێڕنەوە ، مەرج نیە منالی جاشەکان وەکو باوکیان خوێڕی و پارە پەرست بن لە رۆژی ۳۱/۱۰/۱۹۸۸ ئەو هێرشانەی دوژمن دەستی پێکرد دنیا زۆر سارد بوو هەرگیز لەلای ئێمە لە مانگی ۱۱/تشرینی دووەم شەختە زەوی ناگرێ بەختی رەشی ئێمە دوو شەو زۆر سارد و شەختەی کرد لە دەشت ماینەوە ، ئاگرمان نەبوو چونکە ئاگر بەدیاری دەخستین ، نەمان دەهێشت شوێن پێمان دیار بێت چونکە بەیانی دوژمن بەدوای شوێنەکەدا دەهات دوو هاوڕێ ی شیوعیش کە پەراگەندە ببوون ( باوك و کوڕ ) بوون لەگەڵ ئێمە کەوتن بووین بە دوانزە کەس دیارە دوژمن هەرچی شوێن شکی لێ بوو گەڕا ، نازانم خوا لەگەڵ ئێمە بوو چۆن تووشی ئێمە نەبوون زۆر هەوڵمان دا لە ئابلوقەکە دەربچین نەمانتوانی ، نانی رەقی چەند رۆژمان دەخوارد ، ئاردی پڕ لە ئەسپێ لە ئاقار بوو دەمان هێنا و نانمان لێ ساز دەکرد ، شەکرو چامان هەبوو ، بێ جگەرەیی ماڵی وێران کردین ، چەوریمان نەخوارد ، چێشتی گەرم نەبوو ، نانی رەقی چەند رۆژە هەندێ پەنیری کۆنەمان لابوو راست بوو هەموو جار پێشمەرگەکان دەیانگووت ، بەیانی چاونان دەخۆین ، نیوەڕۆ نان و چا ، ئێوارانیش هەردووك ، هەمووی هەر یەك بوو بەڵێنمان لەگەڵ یەکتر دا کە هەرگیز یەکتر بەجێ نەهێڵین هەر چەند وەزع ناخۆش تریش بێت خۆمان تەسلیم بەو رژێمە فاشیە نەکەینەوە خیانەت لەگەڵ یەکتر نەکەین ، دیار بوو ئارد و نانەکەشمان کۆتایی پێ هات لە رۆژی ۱۸/۱۱/۱۹۸۸ لەگەڵ هەموو پێشمەرگەکان دانیشتم پێم ووتن ئەی مەردینە دەبێ لێرە بەهەر حاڵێك بێت بڕۆین چونکە نان و ئاردمان نەما دوژمن وابگەڕێ رۆژێك دەمان دۆزێتەوە با رێگایەك بۆ دەرچوون بدۆزینەوە ئێمە هەمووومان زۆر لە ناوچەکە شارەزا بووین ووتمان دەڕۆین لە کوێ تووشی دوژمن بووین شەڕ دەکەین یان دزەی لێ دەکەین.

لەپڕ پێشمەرگەیەك ووتی سەیرکەن سەیرکەن ئەوە دوو بزن لەقەد دێدەوان دەلەوەڕێن ئێمە هەر دەڕۆین بابچین بیان کوژینەوە عەسر بوو من لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر چووم بزنەکان لە بەهارەوە بەتەنیا لەو چۆڵیە مابوونەوە وابزانم هی گوندی بانەمورد بوون کە چاویان بە ئێمە کەوت شێت بوون و هەڵاتن نزیکەی دوو کاتژمێر خەریکی ئەو بزنانە بووین بۆمان نەگیرا دوژمن لە هەموو قۆپەکان هەبوو بەڵام ئێمەیان نەدیت ئێوارە بەڕێ کەوتین تا بەیانی رووناك داهات هەر رۆیشتین شەوی پاییز زۆر درێژە ئەو شەوە دوور و درێژە لە ئابلوقەی دوژمن رزگاری نەکردین بەڵام لە شوێنێکی باش ماینەوە تا ئێوارە بێ نان ، بێ چای بێ هەموو شتێك ئێوارەی ١٩/١١/١٩٨٨ بەڕێ کەوتین بەسەلامەتی لە جادەی دێگەڵە بێستانە پەڕینەوە هەر چەند دوژمنی لێ بوو بەڵام هەستیان پێ نەکردین سێ کاتژمێر رۆیشتین لە ئاقاری حاجی ووسو نووستین بەو سەرمایە نەمان دەزانی ئایا دوژمن لێرەش هەیە یان نا ؟ من پێش رۆژهەڵات بە دووربین سەیرم کرد دوژمن لە ناوچەکەی حاجی وسو نەبوو ئینجا بەرە بەرە شۆڕمان کردەوە بەلای کانی سەگان هێشتا بەدیوی حاجی وسو بووین سەیرم کرد ( رێچکەی مەڕ ) هەبوو وە قشپلی مەڕی تازەی لێ بوو ووتم ئاوەدانیەك لێرە هەیە کەبەسەر کەوتم بە دووربین سەیرم کرد دەیان مێگەل مەڕ واله نزیك ئۆردوگای بنەسلاوە بۆ لای ئێمە دێت ئێوارە کۆبونەوەیەکی ترم بە برادەران کرد حەوت پێشمەرگەم رەوانەی ئۆردوگاکان کرد کە خۆیان بشارنەوە وە خۆشم (٤) کەسم لەگەڵ مایەوە چووینە ناو شوانەکان زۆر بەسەرسووڕمانەوە سەیریان کردین ووتیان ئەگینا حکومەت گووتی هەموانم کوشتوە کاك شەفیق کە پێمان دەگووت شەفە شوانەکانی باش ئەگیناسی هەموویان بە شەفەیان گووت کاك رێباز و لەگەڵ نیە ئەویش چاوی لەمن سووڕاندو قسەی لەگەڵ شوانەکانیش دەکرد ووتی رێباز لە خۆشناوەتیە لەگەڵ ئێمە نیە زۆر باسی منیان کرد منیش دانیشتبووم قسەم نەدەکرد کە هەڵساین شەفیق ووتی کاکۆ نەمڕۆین ووتم فەرموو ، تا بەیانی (٥) جار لای شوانی جیاجیا نانمان خوارد و پەڕینەوە بەری شەریۆت ئێوارە چووین بۆ گوندی ( شائۆمەر ) کە یازدە کیلۆمەتر لە هەولێر دوورە لە عەشیرەتی شێخ مەموندین کۆچەر و مەڕ لەوەڕێنن پیاوی هەرچەند بلێ ی باشن من و شەفە و رەحمان و غەوسەو عەباس بەرەو ئەو گوندە کەوتینە رێگا شەفە بە گاڵتەوە ووتی بەخوا لێرەش ناڵێم رێبازی چونکە ئافرەتی جوان و زیرەکیان هەیە نانی ئێمە دەبرن پێکەنیم و گووتی وام لێ بکەی تەسلیم بە حکومەتم دەکەیەوە ، هەرچەند گوندەکە چەکدار بوون زۆر رێزیان گرتین جل و شت و مەکیان گۆڕین نانی باشیان بۆ ساز داین لەوێ شەفە خۆی ووتی ئەوە رێبازە هەموو خەڵکی گوندەکە کە (١٤) چواردە ماڵە

هاتن بە تیلکەی چاو تەماشای منیان دەکرد هەر یەکە بۆخۆی وەسفی دەکردم منیش قسەم بۆ دەکردن لەبەر ئەوەی تراکتۆر هەبوو جیهازەکەم خستە کار یەکسەر لەگەڵ سەرکردایەتی قسەم کرد کە (٢٢) رۆژ بوو نەمانتوانی بوو قسە بەیەکەوە بکەین زیاتر لە دوو کاتژمێر لەسەر جیهاز قسەمان کرد برادەران وتیان زۆر زۆر خەمان بوو وامان زانی هەمووتان شەهید بوونە لە بیرمە منیش دەمگووت هیچ نیە باش دەبێ وەزع باشە ئیستا لە قوناغێکی خۆشین جار جاریش بەعەرەبی دەمگووت (لادیربال) پێشمەرگەکان ئێستاش دەگێڕنەوە دەڵێن لەو دۆخە ناخۆشە دەیگووت گوێ مەدەنێ ( مام مارفیش – ردێن سپی گوندەکە کە حکومەت بانگی کردبوو پرسیاری ئێمەی لێ کردبوو کە گەڕابۆوە گوتبوی ( لادیر بالەکەی رێباز حکومەتی بەخەبەر هێنا ) مام مارف تەمەن (٧٠) ساڵ (٣) سێ ژنی هەیە زیاتر لە (١٥) کچ و کوڕی هەیە زۆر زۆر قسەی خۆشە من زۆر جار سەرم لێ دەدا تۆ لەرێگای مام جەلالی ئەوجا لای پێشمەرگەکان خۆی بە لێپرسراوی هەمووان دەزانی نەیدەزانی بڵێ مسعود دەیگوت ( محسود ) بە کاك عەزیز محەمەدی دەگوت ( عەزیز بێرکۆتی ) بێر کۆت گوندێکە ئیستا لەگەڵ هەولێر تێکەڵاو بووە چەند کیلۆمەتر لە شا ئۆمەر دوورە دوو رۆژ لە ( شائۆمەر ) ماینەوە دەمانچەیەکی چواردە خۆرم پێش کەش بە کوڕێکی لاو کرد کە زۆر یارمەتی داین وە چەند جارێك ڕەوانەی هەولێرمان کرد ، دەمگوت کورد چەند وەفادارە ئیستا ئەو کوڕە لای حکومەت ئیستخباری بکات بە سەدان هەزار دینار وەردەگرێ کەچی خۆی یارمەتی ئێمە دەدات کورد هێشتا گەلێك رۆڵەی ئازا و مەردی ماوە بەڵام ئاخ لەمێژ ساڵە وتراوە چەم بێ چەقڵ نابێ لە رۆژی ١٩٨٨/٣/٢٢ گەیشتینە ناوچەی بەرانەتی لەوێ لەگەڵ برادەرانی ت٨٥ ی بەرانەتی یەکترمان بینیەوە کۆبونەوەم پێکردن دوژمن زانی ئێمە گەیشتینە ناوچەکە هێرشێکی گەورەی کرد لە ١٩٨٨/١٢/٢ گوندەکانی زێبارۆك ، رزگە و سەرکەندی سوتاند بەم جۆرە بەو هێرش و پەلامارەی دوژمن رزگارمان بوو .

# چۆن بووم بە مام خدر

لەگەڵ برادەرانی ت٨٥ ی بەرانـەتی هاتمـە دەواجنـەکانی ( بانـەمان ) لـە نێـوان مـەسـیف و خانزاد لە تەنیشت قەلاتی خانزاد ، لەماڵێك دانیشتبووین دیار بوو پێشمەرگەکان زۆر دەچوونە ئەو ماڵە باسی منیان لە کاك بورهان برای شەهید سەردار سەعید سۆفی جێگری فەرمانـدەی ت٨٥ ی بەرانەتیان پرسی ئەرێ رێباز لە کوێیە پیاوەکانی رژێم زۆر مەرەقیانە بیدۆزنەوە ئەویش ووتی وابزانم لە خۆشناوەتیە پاش ماوەیەك گوتیان ئەو برایە ناوی چیە ووتی ( مام خدر ) دیارە ماڵی ( مام محمد ) کەلە پاشان بوون بە دۆستێکی نـزیکم ، باوەڕیـان کـرد پـاش سـەعاتێك شەفەو دوو پێشمەرگەی تر تەوزیع دەبن دێنەوە بۆلای ئێمە لە حەوشـەکە تووشـی کچـەکەی مـام محمد دەبن کە (١٧) حەڤـدە سـالان بـوو سـلاوی لێ دەکـەن و دەڵـێن رێبـاز و بورهـان لێـرەن کچەکەش دەڵێ کوا رێباز لێرەیە ، هەر بورهان و مام خدرن شەفە یەکسەر تێـدەگا دەزانـێ نـاو گۆڕاوە هەرچەند دەیسووڕێنێ کچەکە تێ دەگا من مام خدر نیم رێبازم ، شەفە دەڵێ راستە مام خدر و فلان و ئیتر . کچەکە رۆر عاقل بوو بە باوکیشی نەوت کە من رێبـازم بـەس هـەموو جـار کە چـای دەدا دەسـتم دەیگـووت هـا مـام خدرۆکـە پـێ دەکـەنی جارێـك بەتـەنیا لـە حەوشـەکە راوەستابووم ووتی کاك رێباز ماستاو دەخۆی پێکەنی ، قۆڵم گرت و ووتم چی تـر باسـی رێبـاز نەکەی ، مام محمد زۆر جار لە دائیرەی ئەمنی مـەسیف سوێندی دەخوارد کە من رێبازم نەدیوە ئەوانیش باوەڕیان نـەدەکرد ، نامـەم دەدا مـام محمـد بـۆ بـرادەران ئـەوانیش دەیـانگوت باشـە وەلامـەکەی بۆ کاك رێبازی دەنێرین ، مام محمد کە دەهاتەوە دەیگـوت هـەتا ئێـوە رێبازەکـەی دەشتی هەولێر نەکوژن هیچتان بۆ نابێ ، هەرچی هەیە بۆئەو دەچێ ئەویش خۆی لێ بزرکردینـە بەم جۆرە لای ئەو کەسانەی کە نەیاننەگیناسیم بە مام خدر ناسرام هەتا زۆر جـار پێشـمەرگەکان لە شوێنی خۆمانیش بە مام خدر بانگیان دەکردم .

دیسان بەهۆی خۆفرۆشێك دائیرەی هەولێر مام خدر هـەمان رێبـازە بـە ئاشـکرا لـەناو خـەڵك بڵاویان کردەوە وە لە رۆژی ١٩٨٩/٣/٢ هێزێکی گەورەیان نـاردە سـەرمان زۆر بـە ئاسـتەنگ لەبەر هێرشەکە رزگارمان بوو بەڵێ مام محمد و مام خدر و کاك سەعدی ئـەو سـێ تێکۆشـەرە بوون کە چەندین مانگ ئێمەیان خزمەت کرد من هەتا دەمرم چاکەیان فـەرامۆش ناکـەم هەقـە لە رۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆ چاکە و پیاوەتی ئەو خەڵکە دڵسۆزانە لەبیر نەکرێ و نەکەونە پەراوێز.

ئەو هێرشەی دوژمن هەموو ناوچەکانی گرتەوە ، بۆ خۆدزینەوە لە دوژمـن مـەفرەزەکانمان بـە جۆرێکی تازە تر رێك خستەوە ، دەبوایە هەر فەرماندەیەك لەگەڵ مەفرەزەکـەی تـەگبیری خۆیـان

بکەن ئێمە چووین بۆ ئوردوگای بەستۆرە لە ماڵی برادەرێکی زۆر دڵسۆز و خۆشەویست بووین لە پڕ هاتەوە ووتی جاش لەسەر ئێوە شەڕیان بووە سەلاح شینەی تاوەنبار کوژراوە من بڕوام نەکرد ئەو تاوانبارە هەر وا بەئاسانی بکوژرێ دەیان پێشمەرگەی شەهید کردبوو ، ڕۆژانە شوان و گاوان و کاسبکاری لە ناوچەکان دەگرت تەسلیمی حکومەتی دەکردن ئەو تاوەنبارە پێشتر فەرماندەی ت١٢ ی سۆران بوو ماوەیەکیش جێگری من بوو ، قسەکە بووە راست بەم جۆرە دوژمن بۆ ماوەیەك وازی لە ئێمە هێنا لە ١٩٨٩/٣/٥ لاشەی ئەو تاوەنبارەیان بە پێش بەستۆرە بردەوە هەولێر لە شەوی ١٩٨٩/٦/٥ چووین بۆ ئوردوگای پیرزین کە (٢) کم لە هەولێرەوە دوورە لە ماڵی تێکۆشەرێك ماینەوە بۆ بەیانی خێزانی خانە خوێکەمان بەدوای ( ئامینە ) خانی ناردبوو کە زۆر زۆرم خۆشدەویست یەکێك بوو لە کچە جوانەکانی کوردستان ئەویش بە دڵ و بە گیان منی خۆش دەویست دیارە چاوی بە من کەوت زۆر زۆر گریا زیاتر لە (٢٠) دەقیقە دەستی گرتم و بەری نەدا من هەرچەند زۆرم پێ ناخۆش بوو کە هات ، چونکە نەمدەزانی ئیستا هەلۆیستی چۆنە لەو زروفە دژوارە لەناو ئوردوگا هەر زمانی زەلە بکات هەموومان دەکوژرێین ئوردوگاکەش تەخت دەکرێ ، ووتم مەگریە ئەوە درێژە پێدانی ڕێبازی شەهیدانە ، ڕێگای وەفاییە ، ڕێگای مەردانە ، ڕێگای سەربەرزانە من خۆم ئەو ڕێگایەم بۆ خۆم هەڵبژاردوە هەر دەگریا ووتی باوکم غەدری لێ کردم ئیستا لەلای جاشێکم حەزم دەکرد بۆتۆ بم .. ترسام کە باسی جاشی کرد ووتم لەلای مێردەکەی نەیگێڕێتەوە ، ناڕاستەوخۆ تێم گەیاند کە لەلای کەس باسی ئێمە نەکات ووتی من زانیم بۆیە هاتم چۆن کاری وادەکەم بەڵێ ئەو کچە جوانە ئەو کچە تێکۆشەرە پاش ئەوەی منی لێ دوور کەوتەوە باوکی بۆ هەوەس و ماڵی دنیا بە جاشێك فرۆشتی من تێگەیشتم تا ژیانم وابێ ئەو ڕێگایە بگرم ، تا کوردایەتی بکەم ڕەنگە هیچ کچێك بە ژیانی من رازی نەبێت ، بەڵێ هەر لەو ماوەیە دوای گەڕانەوەمان لە پارتیزانی و چوونم بۆ فەرەنسا و ئیتالیا لە ئیتالیا کچێکی زۆر کوردپەروەرم خۆش ویست بەڵام داخەکەم ژیانی دەربەدەری و هەر ڕۆژە لەشاخێك ، هەر ساڵە لە شوێنێك زۆر جار بیانووم پێ دەگرێ بۆئەوەی لێك جیا ببینەوە من هەمیشە باری خەمی ئەویشم لەسەر شانە بەڵام هەرگیز کوردایەتی و وولاتەکەم بەو جۆرە خۆشەویستیانە نەگۆڕیتەوە هەرچەند دڵم ، جەرگم بۆی لەت لەت بووە ، بەڵام ڕۆژێك دەبێت ئەو کچە تێکۆشەرانە ئەو کچە جوانانە تێ بگەن کە پێشمەرگە باشترین ڕۆڵەی گەلی کوردە نەك هەر دەبێ دڵیان رابگرن بەڵکو دەبێ پێشوازیش لە هاوسەرێتیان بکەن کەلە پاشان بەدرێژی دێمەوە سەر ئەو باسە ، ڕۆژی دواتر چووین بۆ شائۆمەر و دەشتی هەولێر لەوێش چەند جارێك قسەمان لەگەڵ سەرکردایەتی کردەوە .

## دەربارەی مفاوەزات

لە رۆژی ۸/۱/۱۹۸۹ زۆر لە برادەران قسەیان لەگەڵ کردم وە بەئاشکرا باسی مفاوەزاتیان کرد دیارە راستیش بوو چونکە هەڵبژاردنی ( مجلس الوگنی ) مانگێك دواخرا ، ئێرانیەکانیش بەرێگای ی . ن . ك مفاوەزاتیان لەگەڵ د . عبدالرحمن قاسملو دەست پێکرد ، بەداخەوە بەو تاکتیکە شەهید قاسملو سەری دانا ، دیارە عێراق لە ژێر پاڵپستۆی ئەو شاڵاوی راگەیاندنە ( حملە اعلامیە ) ویستی جارێکی تریش چاو بەستەکی بە گەلی کورد بکات ، چونکە لەکاتێك مفاوەزات هەبوو هەر خەریکی کاول کردنی کوردستان بوو ، لەلایەکی تریش حکومەتی عێراق دەیویست ناکۆکی بخاتەوە پارتە کوردیەکان ،مفاوەزات لەگەڵ یەکێتی بکات و ئەوانی تر حیساب نەکات ، لەلایەکی تریش دەیویست ریزەکانی ی . ن . ك هەڵوەشێنێ گوایە مفاوەزات لەگەڵ کاك نەوشیروان دەکات بەڵام لەگەڵ مام جەلال ناکات گوایە مام جەلال جێگای بڕوا نیە ، بەهەر حاڵ باسی مفاوەزات زۆر گەرم بوو موکەرەم تالەبانی نوێنەری سەدام لە چیکوسلوفاکیا چاوی بە مام جەلال و کاك عەزیز محمەد سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی کەوتبوو ، زۆر لەسەر دۆخەکان قسەیان کردبوو لەسەر مەسەلەی سوریا مناقەشەکە گەرم ببوو ، مام جەلال بە موکەرەم تاڵەبانی ووتبوو بە سەدام بڵێ کە هەرچەند ئیستا قسەکانیش تۆمار دەکرێ پێی بڵێ ( قوندرە الرئیس حافظ الاسد تسوی راس مئە صدام حسین ) صدام لەو قسەیە کافر ببوو لە بەسرە بوو کە ئەو قسەی پێ گەیشتبۆوە ، لێبووردنێکی گشتی دەرکرد ، زۆر هێرشی کردە سەر مام جەلال ، بەم جۆرە مفاوەزات نەما لە دەوروبەری مانگی کانونی دووەم نامەیەکی سەرۆکایەتی کۆماری هات دەڵێ (( لا مفاوضات مع الخائن جلال الگالبانی لا مفاوضات مع الجبهە المزیفە )) واتە لەگەڵ نەوشیروان دەیکەین ، لەکاتی شەهید بوونی قاسملو ، سەدام ووتبووی ئەگەر دێت بۆ بەغدا بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی میوانی ماڵی خۆم بێت ئەوە پەلارێك بوو لە ئێرانیەکان دەدرا ، بەهەرحاڵ دەنگی مفاوەزات خەلکی راگرت کەلە ئێران تەسلیم بە عێراق نەبنەوە حاڵی حازر هیچ شتێك لە ئارادا نیە چونکە حکومەتی عێراق ئێستا معارەزەی عێراقی و کوردستانی بەلاواز دەزانێ بەعەقلی خۆی پێویست ناکات زیندوویان بکاتەوە ( مەبەست ساڵی ۱۹۹۰ ) . مفاوەزاتەکەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش چەند مانگێك بەردەوام بوو . لە کۆبونەوەیەك کە ماجەلالیش ئامادە بوو بەهەندێ خاڵ رازی

بوون وه چەند خالێکی تریان هێشتبۆوه بۆ ئەوەی جارێکی تریش بتوانن لەگەڵ قاسملو دابنیشن و ئەو خەنجەرەی لە پشتەوە لێ بدەن ، بەرای من د . قاسملو هەڵەیەکی یەکجار گەورەی کرد ، چونکە نەدەبوایە لەگەڵ پیاوێکی وەکو ( رەحیمی ) کە لە قەرارگای رەمەزان کار دەکات یان ( حاجی مصگفی ) کە لە اگلاعاتی غەربی کشورە ، خۆی لە خۆی دا ئەو جۆرە پیاوانە بەناونیشانی وەزیفەکەیان دیارن و پێویست بە باس کردنیان ناکات ، داخەکەم ئێستا ی ( رەحیمی – محمد جەعفەری ) لێپرسراوی قرارگای رەمەزانە هەموو لێپرسراوی کوردی عێراقی بە حزبەکانیشەوە دەبێ لەلای ئەو باسی مەسەلەی کورد بکەن ، دەست بخەنە دەستی ئەو تاوانبارە ، دەبێ دەستی ئەو کورد کوژە ، بگوشرێ تا شتێك روحمی دێتە دڵ من هێشتا لەو بڕوایەم کە دەبێ رۆڵەکانی کورد لە تۆڵەی قاسملو سەرۆك وەزیرانی نەمسا ئەو تاوەنبارانەو سەرانی رژێم ئەگەر بۆیان لوا بکوژن چونکە کورد تا ئەو کارە نەکات دنیا هیچ حسابی بۆ ناکات. ( مەبست سالی ۱۹۹۰ )

# چۆن زانیم قاسملۆ شەهید کرا

لە کاتژمێر (١٢/٥ ) ی پاش نیوەڕۆ بەکاتی هاوینەی بەغدا لەبن ئەشکەوتێك لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر ( تەماتەو روونێکی خۆشمان کرد بوو ) رۆژی ١٩٨٩/٧/١٣ بوو هەرچەند بڵێی ی گەرم بوو ، رەنگە پلەی گەرمای لە چل بەسەرەوە بێت ئیزگەی بەغدام کردەوە کە عادەتە لەو کاتژمێرە ئیسلامەتی دەژەنێتەوە پاش ماوەیەك کردمانە (دەنگی کوردستانی ئێران ) هەواڵی تەقە کرد\نی بە زمانی فارسی و کوردی لە قاسملوبلاوکردەوە ووتم برایان بەخوا قاسملو شەهید کراوە لە کاتژمێر (٢/٥ ) دەنگ و باسی بەغدام کردەوە دوای ئەوەی هەواڵەکانی خوێندەوە لە هەمان کاتژمێر هەواڵی ئێرانیش هەیە لە کۆتایی ئیزگەی ئێران ووتی ( دوێنێ لە ئوتریش (( ئێرانیەکان وا بەنەمسا دەڵێن ) د . عبدالرحمن قاسملو و دوو سەرکردەی تری کوردی کوژران لە کاتی مفاوەزات لەگەڵ نوێنەرانی کۆماری ئیسلامی وە زۆر کەسیش بریندارە ) ووتم ئەوە ئیشی ئێرانیەکانە ، پاش ماوەیەکی تر مەفرەزەیەکی تر هات ئەوان رایان وابوو ( جەماعەتی مجاهیدی خەلقە — مسعود رجوی ) من هەر پێم داگرت ئێرانیەکانن ، ئێوارە ئیزگەی دیموکرات بە درێژی باسی شەهید کردنی قاسملوی کرد زۆر خەمبار بووم بە لە دەست دانی ئەو سەرکردە مەزنە ، چونکە هەمیشە بڕوای وابوو دەبێ گەلی کورد خۆی خۆی رزگار بکات هەر لەپێش خۆم دەموت چۆن پیاوی وا زانا و ژیر وا دنیا دیدە وا بە تاقی کردنەوە ، سمکۆی شکاك و همزەئاغای مەنگورو قازی محمدی لە بیر چۆوە چۆن بە خۆی چۆتە بەردەستی ئێرانیەکان ، زۆر جار لەداخان جنێوم پێ دەدا چونکە دەمگووت بەڕاستی شەرمەزار بووین ئابڕوومان چوو ، دەمزانی تۆڵەشمان پێ ناکرێتەوە پێشمەرگەکانی ئێران ، رۆڵەکانی هەموو کوردستان گەر بەرگری لە خۆمان نەکەین ئەوها هەموو سەرکردە و کادیرەکانمان شەهید دەکەن گەر ئەوەیان لەسەر بچێ کاری نا مەردانە تریش دەکەن . هەقە هەوڵ بدەین چی لە دەست دێ بکرێ دەبێ ئەو ئالآیە بەسەر سەری ئێوە بەرز بکرێتەوە ( کوردستان یان نەمان ) .

# رێکخستن بۆ بەرەی پشتی پێشمەرگەیە

لەم یاداشتە نازانم بە چ زمانێك باسی رۆڵی چاکە و یارمەتی دان و پیاوەتی ئەو برادەرانەی ناو شار بکەم کەلە رێکخستنەکانی ( کۆرِەك ) خەباتیان دەکرد و نەپچرابوون ، بەهەق چۆن ئەو پێشمەرگانە مایەی سەروەری و شانازیان بۆ ی . ن . ك کە لە دوای ئەنفال و شکست خۆیان راگرت و سەنگەری خەباتیان چۆل نەکرد چ ئەوانەی رێ ی مان و نەمانیان گرت لە قوڵایی کوردستان بە مەفرەزەیە پارتیزانی مانەوە وەچ ئەوانەی لە بارەگاکانی سەر سنوور لەسەر قەندیل و چیای مامەندە ئێشکیان لە گوندە خۆشەویستەکانی زەڵێ و شێنێ و ناو زەنگ و دۆڵە کۆگە ...هتد دەگرت هەر ئاواش ئەو قارەمانانەی لە شارەکانی خەباتی ژێر زەمینیان دەکرد ، هیچیان لەو پێشمەرگانە کەمتر نەبوو ، لە کاتێکدا بە کۆمەڵ پ . م تەسلیم دەبوونەوە ، رەش بینی و نا ئومێدی باڵی بەسەر زۆربەی خەڵکی کوردستان دا کێشابوو ، کەچی ئەوان نەك سارد نەبوونەوە بەڵکو لە جاران بە گورِتر بازوی تێکۆشانیان لێ هەڵماڵیبوو ، بەڵێ لەو رۆژەدا کە رەش و سپی لێك ئاشکرا ببوون ، بەدیار کەوتبوو کە کێ شۆرِشگێری راستەقینەیە و کێ هەر سەرچۆپی کێشی ئاهەنگی سورداشە .

کورِەکانی رێکخستن جگە لەوەی کاری رێکخستنیان ئەنجام دەدا پەیوەندیەکی پتەویشیان لەگەڵ ئێمەی پارتیزان دا هەبوو ، دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەوان نەبوونایە ژیانمان زۆر ئاستەنگ و سەختتر دەبوو ، لەوانە بوو هەر نەمان توانیبا بژین هەندێك لەو برادەرانەی بەردەوام هاموشۆی ئێمەیان دەکرد و بە گوێرەی توانا پێویستیەکانیان بۆ دابین دەکردین ئەمانە بوون کاك مستەفای سەید قادر و کاکە زیاد ( چەتۆ) و کاك زیادی گەورەو سەرکەوت بوون ، دوای گەرانەوەی ئێمەش بۆ سەرکردایەتی بە هۆی خائینێك کاك ( چەتۆ ) لەلایەن رژێم دەست گیر کراو بەڵام قامچی و کێبڵ و زیندانە تاریکەکانی بەعس نەیانتوانی هیچ نهێنیەکی پێ بدرکێنێ و ئیعترافی لەسەر هیچ برادەرێك نەکرد و دواجار بە حوکمی ئەبەدی رەوانەی بەندیخانەی ئەبوغرێب کرا ، چەند مانگێك دوای ئەو مستەفا سەید قادریش دەست گیر کراو بەڵام خۆشبەختانە لە دوای راپەرین بەسەربەرزی گەرانەوە کوردستانی ئازاد ، برادەرێکی تریش کاك عبدالواحد ادریس شەریف ( رەوەند ) کە لەگەڵ کاك ( چەتۆ) کاری رێکخستنی دەکرد دوای گیرانی کاك چەتۆ بو بە پێشمەرگە و خۆی گەیاندە بارەگای سەر سنوور ، جگە لەوانە

برادەرانی ( قەرەج ) یش لە یارمەتی دان و خزمەت کردنی پارتیزانەکان رۆڵی بەر چاویان هەبوو ، هەر هەموویان شایانی رێزو وەفادارین ئەگەر وەفا و ئەمەك مابێ .
شایانی باسە ئەو برادەرانەی کە سەر بە کاك نەهرۆ سەعید سۆفی بوون لە ناوچەی بەرانەتی ئەو ماوەیە لە یارمەتی دانمان درێغیان نەکرد زۆر سوودمان لێ وەرگرتن .

# نەخۆشی مەلاریا

مەلاریا نەخۆشیەکی کوشندەیە ، پێش ئەوەی زانست و تەندروستی وا پێشکەوتوو بێت سالّی بەسەدان بگرە بە هەزاران کەس بەو نەخۆشیە مالّ ئاوایی لە دنیا دەکرد ، ئیستا بە هۆی بوونی پزیشکی باش و دۆزینەوەی دا و دەرمان لە هەندێ شوێن هەر شوێنەواری نەماوە ، بەهۆی چۆل بوونی کوردستان پێشکە و مێش مەگەز زیاتر ببوون جگە لە پێشمەرگەی بەجەرگ هیچ شتێکی تر جورئەتی نەدەکرد سەر بەشاخ و دەشتەکانی کوردستان دا بکات نەك مرۆڤ و حەیوان نەمابوون هەتا رووەکیش هەندێکی سیس و ووشك ببوون نێچیری راوی مێش و مەگەز هەر بەتەنیا پێشمەرگە بوو ، یەك جۆرە پێشکە هەیە ئەو نەخۆشیە دەگوازێتەوە ئەویش دیارە لە بەختی رەشی ئێمە لە ناوچەکە پەیدا بووە ، زۆربەی پێشمەرگەکان تووشی نەخۆشی مەلاریا بوون ، من سالّی پێشتر گرتبووم ، زۆری لێ دەترسام وە راستە دەلّێن ( ئەوەی بترسێ ناخەلەسێ ) راست وام بەسەر هات دووبارە گرتمەوە ، بەلاّم بەهۆی زیرەکی و ئازایی و چاو نەترسی رێکخستنەکانی کۆمەلّە لەناو شاری هەولێر هەموو دەرمانەکانمان بۆ هات ، پاش ئەوەی شەنگ و تاهەرگیزی لێ برین ئەو جارەش لەدەست حزرائیل نەجاتمان بوو ، دوژمنیش بەردەوام هێرشی دەکردینە سەر ، نەخۆشی مەلاریاش لە هێرشەکانی حکومەت نەك هەر خراپتر بوە بەلّکو مەترسی گەورەشی لەسەر پەیدا کردین ، بەدوای لێپرسراوانی ناو شاری هەولێرم دا نارد ، چەند جارێك کۆبوورینەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان ئامادەیی تەواویان هەبوو کەلەگەلّ خۆیان بچینەوە ناو شار تاکو چارەسەری باش و خواردەمەنی بەلەزەت پۆشتەمان دەکاتەوە ، ناکرێ لێرە بە درێژی باسی هاوکاری هاوڕێیانی کۆمەلّە بکەم کەلە ناو شار بوون ئەوەندە دەلّێم هیمەتی ئەوان نەبووایە ، ئیستا حالّ لە شوێنێکی تر بوو ، زۆر بە ئێمە ماندوو بوون زۆر دەنگ و باسی بە سوودیان بۆ هێناین بەتایبەتی منیان لە کوشتن رزگار کرد بە ووریایی چەند هاورێیەك پیلانێکی دائیرەی ئەمنی هەولێر کە بۆ کوشتنی من ساز کرابوو ، ئاشکرا کردوو ئەو برادەرانەی بە گرتندا لێرەدا هەقە بە گەرمی پیرۆزبایی ئەو خۆراگریەیان لێ بکەم کە دوژمن نەیتوانی هیچ نهێنیەك بەو تێکۆشەرانە بدرکێنێ ، هاورێیانی ناو شاری هەولێر دلّسۆزانە پێداویستیەکانیان جێ بەجێ دەکردین لە پارە ، خواردن ، جلوبەرگ ، پیلاو ،دەنگ و باس ، نامە رەوانە کردن بۆ سەرکردایەتی ، هەتا هێنانی دەنگ و باسی کەس و کاری پێشمەرگەکان ،

من له ماوه دوورو درێژه وه ساڵی پێشووش کسی ماڵی خۆمـانم نـهدیت ، تـهنها هـهر بـههۆی برادهران دهمزانی له کوێن ، چونکه دوژمن چاك تاقیبی دهکردن هەڵی پێچابوون ئـهوانیش لـه ترسـان هـهر یهکـه لـهماڵی دۆستێك خۆیـان شـاردبۆوه ، لـه مـانگی ئـابی ١٩٨٩ ئاگـاداری پێشمهرگهکانم کردهوه هەر کسێك دهیەوێ دایك و باوك و براو خوشکی ببینیێ تا مانگێکی تـر نارۆین ، چونکه وهکو زانیاریمان بۆ هاتبوو دوژمن خەریکی پیلانێکـی یـهکجار گـهوره بـوو بـۆ لهناو بردنمان ، دهبێ ناوچهکه به جێبهێلین ، لهو مانگه زۆربهی پێشـمەرگهکان بـه دوای کـهس و کاریان نارد ، منیش لهگهڵ برادهرانی ناو شار هەر خەریکی رێگا دۆزینـهوه بـووین ، ئاگـاداری رێکخستنی سلێمانیمان کـرد کـه ئاگاداری رێکخـراوی رانیـه بکـهن ، ئێمـه لـه ١٩٨٩/٩/٧ دهگهینه ناوچهی بیتوێن لهوێ یهکتر ببینین ، دیارهبرادهران وهکو پێویست کارهکانیـان جێبـهجێ کرد.

# چەند تێکۆشەرێکی تر لە رۆژانی سەنگی مەحەك

ئادەمیزاد هەتا تووشی باری ناخۆشی نەبێت ، دوست و دوژمنی بۆ ساغ نابێتەوە، تێکۆشەران هەتا لە ناخۆشترین بار نەژین نازانن رادەی خەلکی تێکۆشەر چەندە ، لە شەڕی پارتیزانی من گەلێك خەلکی دلسۆزم دیت زۆر پیاوی مەردم بە دی کرد کە هەرگیز لەو باوەڕە نەبووم لەو هەل و مەرجە ناسکە وا یارمەتی شۆڕش بدەن ، لە شارەکان لە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان ، لەو چەند گوندەی کە مابوو ، شوانەکان ، ئەوانەی زراعەتیان کردبوو کاری وا پیاوانەیان کرد مەگەر مێژوو بتوانێ بیگێڕێتەوە بە خەتی زێڕین لە سەریان بنووسێ ، ئەگینا منی وا کلۆل و سەرگەردان لە کوێ دەتوانم باسی پیاوەتی و ئازایەتی و چاو نەترسی و دلێری ئەو تێکۆشەرانە بنووسمەوە ، پێت سەیر نەبێت خەلکی وام دیوە نانی لە دەمی خۆی دەرهێناوە بە پێشمەرگەکانی داوە ژن و منالی خستۆتە مەترسی بۆئەوەی پێشمەرگەکان بحەسێنەوە ، زۆر لەو تێکۆشەرانە لە رۆژی رەش شۆڕشگێڕی خۆیان سەلماند داخەکەم ئیستا ناتوانم یەکە یەکەی تێکۆشەرەکان بە خەلك بناسێنم چونکە دوژمن ئەوەندە زالم و چەرچیە ، هەر بزانێ لە سێدارەیان دەدات ، رق و تورەیی خۆی بەوان هەلدەڕێژێ ، گەلی کورد هەزاران تێکۆشەری وای لە مەیدانی خەباتە ، کەسێك لەگەلێ جەماوەر ئاشنایی نەبێت وا دەزانێ دنیا جۆرێکی ترە ( مەبەست سالی ۱۹۹۰) بەلێ من لەو گەشت و کێشمە کێشە لەو رۆژە سەختانە دەیان ئافرەتی تێکۆشەرم دیت کە بە کۆلی خۆیان نان و پێخۆری بۆ پێشمەرگەکان دەهێنا ، دەیان پیاوی ئازام دیت ، کە هەموو توانای خستبووە کار بۆ ئەوەی ئێمە بژین و نەمرین ، هونەر هەر لە خۆمان نەبوو بەلکو پشت و پەنامان بە هێز بوو ، جەماوەری بەشەرەفی گەلەکەمان یارمەتی داین .

من لە باسی شوانەکان بە نموونە یەك حالەتم باس کرد دەبێ شوانەکان هەموویان بزانن ئێمە تا دەمرین تا دنیا ماوە قەرزاری ئەوانین نانی رەقی شوانەکان نەبوایەلە کوێ ئیستا من تاهەرگیزی ئەو نووسینەم دەما ، قاپوت و کەرك و ساقۆی شوانەکان نەبوایە بەبێ شك لە سوچێکی کوردستان لە سەرمان رەق دەبووینەوە ، ئیستا ئێسقانیشمان نەدەما ، قسەی خۆش و شیرینی پیاوی وەکو (لالە حەمە ) نەبوایە ، لەکوێ دەمانزانی باس و خواس چیە.

دەست و گۆچانی ( کانبی و عەبدولا ) ی بەستۆرە نەبوایە ، لە کوێ ئێمە رێگای تاریك و ناو دار و بەردمان بەشەو دەدۆزیەوە ، خواردن و چای کاکە عیسا نەبوایە ، لەکوێ ئێمە

دەمانتوانی شەقارێك بهارێژین و چاومان خەو داینەگرێ ، حراسەتی دوو منالّە ژێکەلەکەی گوندی ( کۆرەك ) ی نزیك هەولێر نەبووایە ، لەکوێ ئێمە لە پەلاماری دوژمن رزگارمان دەبوو. هۆهۆیەکەی مام عەولاّی بانی ماران دنیای چۆلّ و هۆلّی بۆ ئاوەدان کردینەوە شەوانە دەرەنگ چای بۆ تازە دەکردینەوە ، بنەگە و هەواری کچە جوانەکەی هەرکیان ( دەلال خان ) نەبووایە ، لەکوێ پەنیو ژاژی و کەشکمان هەڵدەگرت کە چەند رۆژ پێی دەژیاین ، شوانە پیرەکەی ( کانی سەگان ) نەبووایە ، چۆن نامەو هەواڵمان دەگەیشتە یاران ، کەی کیژ و کاڵ لەبەر بێری شەرپیان دەکرد لەسەر ئێمە . دەنگ و باسی ژنە مەرد و ئازا و نەبەزەکەی شاری سەری رەش ( بەسێ ) نەبووایە ، کوا دەمانزانی کەمین و داوی دوژمن چۆن رێك خراوە ئەگەر کوردستان شوانی لێ بڕایە ئێمە ئیستا شەو کوێر دەبووین ، بەحەزرەت خواردنی گۆشت بووین ، بەڵێ شوانەکان هەر کوردی دڵسۆز بوون ، بەڵکو پێشمەرگەی راستەقینەش بوون ، رۆژێك ئەگەر ( لاله حەمەسان ) نەدیبا ، یەکسەر دەیگوت ئەمڕۆ (بێ سەر بوون ) زۆر شەوان کە لە بناری مەسیف مێگەلە مەڕەکەی رادەگرتەوە لامان دەدا ، یەکسەر چای بۆ ساز دەکردین و دەکەوتە قسە و باس هەر دەتگووت فەیلەسوفە باسی حەشر و قرشی دەکرد ، لە باسی جاشەکان دەهاتەوە سەر باسی پێشمەرگەکان دەیکردە سوالفەکی درێژ زۆر جار بۆ (١٠) دەقیقە دەچووین (٥) پێنج کاتژمێرمان پێ دەچوو ، قسەی زۆر خۆش بوو هەموو جار دەیگووت منیش وەکو ئێوەم ، ئەوە خێزانەکەم (١٠) دەدەقیقە دوورە بەلاّم دوو مانگە لەگەڵی نەخەوتووم ، منیش دەمگووت بە قاچاغی برۆوە زۆر پێ دەکەنی ، هەمیشە بە هەرکیەکانی دەگوت ( شوێن هەڵگر ) چونکە بەیانیان لەسەر رێگاکان سەیری شوێن پێیان دەکرد بزانن ئێمە تێپەڕیوین یان نا ؟

لاله حەمەی قارەمان بە قسە خۆشەکانی یارمەتی ئێمەی دا هاوینان بەفری بۆ دەهێناین ماستی چاکی هەبوو ، شەو کەم دەخەوت هەمیشە خۆی بە کوردێکی زۆر باش دەزانی دنیای دیبوو چەند تێپەڕی گەرمیان و کوێستانی کردبوو ، زۆر خەڵکی ئەگیناسی ، تەمەنی لە پەنجا ساڵ بەسەرەوە بوو ، جارجار کەرەکەمان دەبرد بارمان گران دەکرد هەر لە دوورو پشتی کەرەکە دەسووڕا دەمزانی کەرەکەی خۆش دەوێ دەیگوت مام خدر ئێوارە بۆم بنێرەوە چونکە ( مەحتەمل ) سەگەکەی هەرگیز بە خۆڕا نەدەحەپی کە دەنگی دەهات دەیگوت گورگە هەتا ئێمە تەقەی پێوە بنێین چونکە گورگ زۆر لە تەقە دەترسێ .

شوانەکانی هەرکیان جاش بوون تەقە بێ حیساب دەکرا ، کۆنە دەمانچەیەکی هەبوو رەنگە هی سی ساڵ لەمەو پێش بێت زۆر وەسفی دەکرد دەمزانی دڵی چەکێکم بدەنێ رەنگە بێ

بەشمان نەکردبێ ......!! هەرگیز نەی دەگوت جاسوس هەر وەکو زەمانی پێشوو بە ( خەفیەیی ) ناو دەبردن . هەر دڵی ئێمەی دەداوە زۆر رقی لە جاشان بوو ، باسی کورێنی خۆی بۆ دەگێڕاینەوە کەلاو بوو ، من ئێستا کە ئەو تێکۆشەرە یاد دەکەمەوە مێگەلە مەڕ و بەرخۆلەکانی کوردستانم وەبیر دێتەوە کە ئەوانیش وەکو ئێمە لەلایەن رژێمی پیاو کوژی بەغدا ، رژێمی نامرۆڤی بەعسی وەحش و درندە زۆڵمیان لێ دەکرا ، ئێمە لە هەموو خۆشی ژیان بێ بەش کرابووین ئەوانیش لە پاوان و مێرگ و گەرمیان کوێستان و هەواو ئاوی سازگار قەدەغە کرابوون هەر بژی لالە حەمەی قارەمان شوانە کورد پەروەرەکەی بناری سەری رەش.

لەگەڵ هێرشی زستان دوژمنیش بۆ سەخلەت کردنی ئێمە هێرشی دەست پێ دەکرد هەموو کون و قوژبنێك دەگەڕا ، کۆپتەرەکان ، جاشەکان سەربازەکان ، جاسوسەکان ، موختارەکان ، دەکەوتنە کار وەکو سەگی هار دەسورانەوە بەو بەفرو سەهۆڵە لەناو تاشەبەردی گەورە لە بن ئەشکەوتی تەڕ خۆمان دەشاردەوە چاك بوو چەند شوانێکی دڵسۆز و مەرد لەسەر جادەی گشتی (بەستۆرە) لە کۆنە خانوویەك مابوون کە تاریکایی دادەهات بەلاکەلاك و لەرزە لەرز ، دەائمان شەقەی دەهات لە سەرمان دەچووینە خزمەت (کاك عەبدوڵا و کاك کانبی ) ئەوانیش خوا بەرەکەت بخاتە ماڵ و سەروەتیان هەر پیاوەتیان لەبرەو دا بێت زۆر بە پیاوانە وەریان دەگرتینەوە ، چێشتی چاکیان بۆ دەهێناین ، جگەرە و پێداویستیەکانی تریش هەر مەپرسە بەینی خۆمان بێت جارجار پاقلاوەشیان دەهێنا دوو منالی بچوکیان لەگەڵ بوو لە تەمەنی (١٠) دەساڵی کاکە عیسا منالێکی هەر چەند بلێی ی رووح سوك و جوان بوو زۆر زۆر منی خۆشدەویست هەمیشە چای بۆ چەند بارە دەکردمەوە دەیزانی من لە شوێنی وا ناخەوم هەر دادەنیشم دەهاتە لام دەیگووت مام خدر توخوا ناوی خۆت چی یە ......!!؟ منیش دەمگوت عیسا گیان بۆ ئەو پرسیارە دەکەی دەیگوت هەر پێم خۆشە بزانم چونکە ئەو ناوە بەهی تۆ ناچێ ....!! مام کانەبی لە بناغەدا جاش بوو دەم ترساند دەمگوت خۆم تەسلیم دەکەمەوە ئەویش بەڕاستی وەرگرتبوو بە بورهانی دەگوت ئەو مام خدرە لە زیندانم دەچێنێ ، مام کانەبی شەو نەدەخەوت لەگەڵ من دادەنیشت عیسا کە خەو چاوی دادەخست و رادەچلەکی و دەیگوت دیسان چایە منیش دەمگوت عیسا گیان شاعیر دەڵێ :

تاڵ و شیرین پێکەوە چا بێ چـــــا نەبێ
هـــەر کسێ هەمنشینی چا نەبێ پێت چا نەبێ

من هەر لەبەر خەو دەمویست چا زۆر بخۆم برادەران دەنووستن من دادەنیشتم زیاتر لە (٤٥) چل و پێنج شەو ئەو تێکۆشەرانە یارمەتیان داین ، لە رۆژی ١٩٨٩/٣/٥ لە ئۆردوگای بەستۆرە بە دزی بە رۆژ لەگەڵ شەش پێشمەرگە ماینەوە ئێوارە چووم بۆ ماڵی کانەبی خاڵەکەیان میوان بوو بە ناوی (حاجی سابیر ) کە منی باش ئەگیناسی کە چاوم پێ کەوت هەڵسا زیاتر لە دەجار ماچی کردم ووتی رێباز ئەوە ماوی ! کانەبی چاوی زەق بۆوە ووتی توخوا تۆ رێبازی ووتم بەڵێ ، زۆر گلەیی کرد کەمن خۆم بۆ ئەو تێکۆشەرە ئاشکرا نەکردووە ، بەراستی کانەبی یەکێکە لە تێکۆشەرانی گەل و نیشتمان بێ گومان منالانی وەکو عیساش لە دوا رۆژ ئەو سەنگەرانە قایمتر دەگرن ، چونکە لەگەڵ پێشمەرگە چاویان کردۆتەوە و پەروەردەی هەردوو شاخ و کێوی دڵگین و لە وێنەی ئەو تێکۆشەرانە هەر زۆر بێت .

بەڵێ گەلێك تێکۆشەری تر لە ژن و پیاو لە ریزی پێشەوەی شۆڕش کار دەکەن ، داخەکەم ناکرێ یەکە یەکەیان باس بکەم ، تێکۆشەری وەکو ( مام محمد ، سەعدی ، حاجی خدر ، وەزیر ، کاك حەسەن ، مام عارف ، مام عەولا ، مام قادر ، سەعدون ، کاك عەزیز ، و دەیان بگرە سەدانی تر جێگای دیار و پڕ لە شانازیان هەیە ، لە خەبات لە پێناوی کورد و کوردستان ، بە سەرو ماڵ لە رۆژی سەخت و دژوار یارمەتیان داین . ئافرەتی تێکۆشەری وەکو ( عەیشە خانی ، گوڵ ، ئەستی ، لەیلا ، ئەسمەر ، غەزال ، قەسپێ ، بەسێ ، ئاواز ، فەخریە ) بگرە دەیانی تر ، بێ گوێدانی دوژمن بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە رەوشتی کۆن بە ڕوو سوری هاتوچۆی پێشمەرگەیان دەکرد ، لە ماڵەکانیان شەو و رۆژ دەحەساینەوە ، جل و بەرگیان خاوێن دەکردینەوە، ئەو ئافرەتە تێکۆشەرانە ، لە رەچەڵەکی خانزادی سۆران و قەدەم خێر و لەیلا قاسم بوون ، بۆیە هەمیشە مردنیان بە خەیاڵ دا نەدەهات ، ئێمە زۆر بە رێزەوە هەوڵ و تەقەلای ئەوانەمان دەخستە پێش چاو .

# پیلانێکی تری دوژمن

دوژمن هەستی کرد کە پێشمەرگەیەکمان بە ناوی( شەفە ) حەز لە کچێك دەکات لە ئۆردوگای دارەتوو ، من زۆر جار بە پێشمەرگەکانم دەوت نابێ لەو رۆژگارە بیر لەمەسەلەی دڵداری بکەنەوە چونکە من هەمیشە ئافرەت بە (ئاگر) دەزانم. شەفە زۆر هاتوچۆیماڵە دۆستەکەی دەکرد ، دوژمن لە شەوی ١٢\١٣/٧/١٩٨٩ دەوری ماڵەکەی گرت زۆر بە ئاستەنگ شەفە رزگاری بوو .

کچەکە و باوکی لە دائیرەی ئەمن گیران ، دیارە کچەکە دوو رۆژ پاشتر بە دزی نامەی بۆشەفە نووسیبوو، ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ ئەمن نەکات وازی لێ دێنن کچەکە کاری لەو پێشمەرگەیەکرد، یەکسەر بەقسەی کچەکەی کرد وە بەڵێنی دابوو ئەگەر کچەکەو باوکی ئازاد بکەن ئەوە کارێکیان بۆ دەکات واتە من بکوژێ، دیارە سەرکردایەتی لەو مەسەلەیە بەهۆی خەتی تایبەتی ئاگادار بوون، یەکسەر بە ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان ئاگاداری منیان کردەوە کەشوێنی خۆم بەجێ بهێڵم بگەمەوە لای مەفرەزەکەی تر لە بیرمە ئیزگە چەند رۆژێ ئاگاداری بلاوەکردەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

بۆ ئاگاداری بۆ ئاگاداری

لە مەکتەبی سیاسی

بۆ / رێباز

( تکایە زۆر زۆر بەپەلە بگە لای بورهان وە زۆر ئاگاداری خۆت بە، تەواو )

من یەکسەر ووشیار بوومەوە، شەو و رۆژ چەند پێشمەرگەیەکی دڵسۆز بە چەکەوە لەلام دەمانەوە خائینیش کە زانی هەستمان کرد خۆی لەبەر دەستیان رزگار کردو بەم جۆرە ئەو جارەش لە کوشتن رزگار بووم .

# بەرەو بتوێن

لە کۆتایی ئاب/ ١٩٨٩ دوژمن زیاتر لە چوار لیوا سەربازی هێنا بۆ دۆڵی هەنارە ، کە لە پڕ ناوچەکانی تەوق بکات و کۆپتەریش دەست بە پشکنین بکات ، لە ئێوارەی ١٩٨٩/٨/٣١ لە پەنا مەسیف کۆبونەوەیەکم بە پێشمەرگەکان کرد ، کە زۆر پێویستیە و دەبێ لەو ناوچەیە بڕۆین ڕێگاکانمان دیاری کرد هەر ئەو شەوە دوو پێشمەرگەمان ناردە ( کۆڕێ ) دوو برادەری ڕێکخستن هاتن ، بۆ ئێوارەی ١٩٨٩/٩/١ لە ئاژگە بەڕێ کەوتین ، زیاتر لە (١١) کاتژمێر بە پیادە ڕۆیشتین ، تا گەیشتینە بناری چیای هەورێ لە دەواجنەکانی نزیك شەقلاوە نانمان وەرگرت ، بەیانی ئیخباریان لێکردین هێزێکی گەورەی دوژمن هاتە ناوچەکە لەپاشان دەواجنەکانی تەخت و کاول کرد ، دیسان نانمان نەما ، ئێوارەی ١٩٨٩/٩/٢ لە نزیك چەند رەبیەکی جاش لەناو رەزەکان گەراین زیاتر لە سەد سەموونمان دۆزیەوە ، دیارە ئەو کات رەزەکانی خەڵك جاش بۆ خۆیان ئیشیان تێدا دەکرد سەموون و شتیان لەوێ بەجێ هێشتبوو بۆ رۆژانی تر ، مـن هـەر دەمگوت خوا ناردوویەتی جا نازانم هی جاشان بوو یاخوا ئەو جارە رەحمی پێکردین ، بەهەر حاڵ ئەو رۆژەش لە چیای پڕ لێرەواری هەورێ ماینەوە رۆژی ١٩٨٩/٩/٣ بەسەر هەورێ کەوتین بۆ دۆڵی بالیسان کە سەیرم کرد هەمووی سەربازگەیە ، چووین بۆ نزیك چێوە ( لەکانی کەوان ) شوێنێکی زۆر خۆشە بارگەمان خست و دەستمان کرد بە چا لێنان لە پڕ سەگێك لە دوورەوە لوراندی ووتمان دەبێ چی بێ دوو پێشمەرگە چوون و گەڕانەوە ووتیان شوانە .

# شوانێکی بەئەمەك

شوان بۆ پارتیزانەکان بڕبڕەی پشتن زۆر یارمەتی ئێمەیان دا بە دەیان شوان بوونە دۆستم بە زۆری شیریان پێ دەداین ، شوان هەر چەند بلێی دڵسۆزن پاك و بێ گەردن رقیان زۆر لە دوژمنە ، زۆر پێشمەرگەیان خۆش دەوێ بە تایبەت ئەو شوانانەی کە تەمەنیان (١٢ -١٥ ) ساڵە هەمیشە حەزیان دەکرد بچینە لایان ، کە دەچووین تفەنگەکەیان لێ وەردەگرتین هەر بە شانی خۆیان دا دەدا ئێمەش باوەڕمان لەسەریان هەبوو لەلایان دەخەوتین لەکاتی ڕۆیشتنیان بۆ ( شەوین – شیوەخوار ) مەڕ لەوەڕاندن بە شەوو پێش عیشایان ئەو دوو ناوەی پێ دەوترێ بە قاپوت و شت و مەکەکانی ئەوان دەنووستین ، هەر چەند جارێك نانیان لە ماڵەوە بۆ دەهات بای ئێمەشیان دەهێنا ، زۆر جار بە مناڵەکانم دەگوت باشە ئەگەر لەماڵەوە پرسیاریان کرد ئەو نانە زۆرەتان بۆچی یە یان نانەکەتان چ لێ کرد ئەوان بۆ هەڵخەڵەتاندنی دایك و باوکیان دەیانگوت دەڵێین ( سەگ نانەکەی خوارد ) من زۆر پێدەکەنیم دەمگوت هەتیوینە ئەوە لەگەڵ ئێمەتانە زۆر عاجز دەبوون ، ماچم دەکردن دەمگوت گاڵتەتان لەگەڵ دەکەم بەڵێ لەناو شوانەکانیش هی لە هەمووان تێکۆشەر تر هەبوو .

ئێمە لە کانی کەوان سێ ڕۆژ و دوو شەو ماینەوە ، ئەو شوانە مێرد منداڵە خواردنی باشی بۆ هێناین مەڕێکی بۆ سەربڕین ، دەنگ و باسی دوژمنی پێ ووتین ئامادەیی تەواوی دەربڕی ئەگەر لە ڕێگای بیتوێن بۆ دۆڵە ڕەقە دەرنەچوون ووتی من بە ڕێگای ماکۆك ئاودیوی دۆڵە ڕەهەرگیزان دەکەم ، زۆر مەردانە سەری لێ دەداین خۆی وەکو ئێمە بە پێشمەرگە دەزانی زۆر پرسیاری دەکرد ، بۆ نموونە : چەند پێشمەرگە لە کوردستانە ؟ لە ئێران خەڵك چ دەکا ؟ چ جۆرە چەکیان هەیە ؟ مام جەلال لە کوێندەرە ، قاسملو کوژرا:، مفاوەزات هەیە؟، کێ لێ پرسراوتانە ؟ دەیان پرسیاری تر ، شوان هەمیشە پرسیاری بە دیهەرگیز دەکا لە ووردەوە دەست پێ دەکا شاش و واش نیە منیش زۆر بە ووردی بۆم شەرح دەکرد ، زۆر دژی ئێران قسەم کرد جارجار سەری لێ بادەدام دەیگوت نازانم دەڵێ ی چی ، منیش لەسەرخۆ دەمگوت بۆ ، لەکاتی باسی سیاسەت من هەر بۆ بەکاردەهێنم لە جیاتی ( بۆ) پیاو هەمیشە لەهجەکەی خۆی لا شیرینە ، بەڵام دیارە لەمەو دوا دەبێ هەر (بۆ ) بەکاربهێنم چونکە لەگەڵ خۆشەویستەکەم لێ ڕاهاتم ، ئەویش دەیگوت نازانم هەندێکیان لە ئێرانن تۆش جنێو دەدەی دەمگوت کاکە ناتەوێ ڕاستی بزانی دەیگوت با . با . با ئەو شوانە ووتی برایەکم شەهید بووە کە ناوی هێنا ناسیمان زۆر سوپاسی ئەو کاکە جوان و مەردە دەکەم کە سەلماندی ئەویش وەك ئێمە پێشمەرگەیە ، لە ڕۆژی ١٩٨٩/٩/٧ لە چیای نوسەکمان دا گوندەکانی ( سەردۆڵ ، نێوە ، خەلیفان ) مان بری

لە (نالّەشكێن ) برادەرانی ڕێكخستنی چوار قورنە و رانیە بەچەكەوە وەستا بوون پاش وەرگرتنی نهێنی یەكترمان گرتەوە ئەوان (٥) پێنج چەكدار بوون (٥) پێنج ئەندامی وەفاداری كۆمەڵە كە یەكێكیان كاك عەلی خەبات بوو ، لەو ڕۆژە تەنگە لەو دۆخە نالەبارە بەچەكەوە هاتنە پێشوازیمان ، كەلە چیا شۆڕبووینەوە لەسەر ڕووباری ( قەشان ) پشوومان دا دیاربوو هەندێ برادەرانی ڕێكخستنیش لەوێ نانیان ئامادە كردبوو سەموون و گۆشتی مریشك بەسەر پێشمەرگەكان دابەش كراو برادەرێكیان ووتی كاك ڕێباز كامەیە فەرمووم لێ كرد داوای كرد كە قسە بە تەنیا بكەین خۆی پێ ناساندم ووتی لێپرسراوی رانیەم كاك فلان و فلانیش لە هەولێر سلاویان هەبوو ، دەبێ ئەمشەو بچینە ئۆردوگای حاجیاوە بە ڕۆژیش لەوێ بێیننەوە ، ووتم ئێمە تازە تەسلیم بە ئێوە كراین و ئێوە چیتان پێ باشە وا دەكەین ، چووین لە (١٠) ماڵ تەوزیع بووین كوڕێك هاتە لامان ووتی كاك ڕێباز فەرموو كە سەیرم كرد ( م . و ) دەنگێكی زۆر هەبوو كە پیاوی ڕژێمە ووتم من ناتوانم سەربەخۆ بێم تا برادەران ڕێگا نەدەن ، ئیزنی لە برادەرانی ڕێكخستن وەرگرت بە دزی بە ئەوانم ووت كە قسەی وای لەسەرە گوتیان تا هەرچی ئێمە بڵێین وا دەكا ، بەڕۆژ لەگەڵ كاك مەلا سلێمان كە خزمێكی نزیكمە لەوێ ماینەوە زۆر ڕێزی گرتین دیارە هەموو قسەكانی خەڵك دەربارەی ئەو ڕاست نەبوو چونكە لە ئێمەی باشتر بەدەست نەدەكەوت لەو ڕۆژە لە ئۆردوگا چاوم بە زۆر لە برادەرانی ڕێكخستن كەوت باسی باری گشتیم بۆ كردن بۆ ئێوارەی ١٩٨٩/٩/٨ بە دوو سەیارەی جیب بۆ دۆڵە ڕەقە وە بەناو ڕەبیەكانی سوارئاغا ڕۆیشتین بەهەق زانیان پێشمەرگەین بەلام قسەیان نەكرد تا گەیشتینە بارەگای ( حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر) واتە ئەوانەی لە د . قاسملو جیابوونەتەوە زۆر ڕێزیان گرتین سێ ڕۆژ لەوێ ماینەوە ئینجا پەڕینەوە لە ڕۆژی ١٩٨٩/٩/١٢ لە جادەی خانەقا پەڕینەوە ڕۆژێك لە لای بارەگای ( حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران ) ماینەوە نان و ئازوقەیان داینێ ، تەنیا زنجیرە ڕەبابییەی سەر كونە كۆتر مابوو ئەگینا دەكەوتینە بناری قەندیل ، شەوانە دوژمن كەمینی دائەگیناوە زۆر بە وورياییی لە كەمینەكان خۆمان لادا لە كاتژمێر ( ١١) ی شەو لە مەترسی دەرچووین پاش ئەوەی تێپەڕی و یەك مانگ هیچ دەقیقەیەك نەبوو ئێمە غافل بین لە دوژمن بۆ بەیانی بەرێ كەوتین لەڕۆژی ١٩٨٩/٩/١٤ لە كاتژمێری (٣) ی ئێوارە گەیشتینە سەر لووتكەی قەندیل لەوێ ئاوڕێكم لە كوردستانی خۆمان داوەو ووتم :

وولاتی خۆش و دلگرم هەزار جارت دەبەر مرم لەلایەن پێشمەرگەكانی یەكێتی و پارتی دیموكراتی كوردستان زۆر زۆر بە گەرمی پێشوازی كراین .

لە رۆژی ١٥/٩/١٩٨٩ زیاتر لە (١٠) سەعات بە پیادە لە چیای قەندیل رۆیشتین ئێوارە لە نزیك گوێزێ تووشی دوو ڕەشماڵ بووین ، لە ماڵەکە تەوزیع بووین ماڵەکەی ئێمە دوو کچ و ژنێك بوون دیار بوو کوڕەکانی لەبەر مەڕی بوون ، پیاوەکەشیان بۆ دابین کردنی ئازووقەی زستان لە گوندی ( دزی ) ئێران بوو ئەو دوو کچ و ژنە تا بەیانی خزمەتیان کردین چونکە هەر دەم نادەمێك دەیانگوت خزمەت کردنی ئێوە ئەرکی سەر شانمانە چەند جارێك چایەیان بۆ نوێی کردینەوە ، قەندیل زۆر ساردەو ئەو شەوە بێ ئاگریش نەبووین ، (٢٥) بیست و پێنج دینارم دایە ژنەکە مەسروفاتەکەی بدەمەوە کچەکان بە ئەیرۆ و لە خۆدان ووتیان ئەوە عەیب نی یە چوارده مانگە لە کوردستانن هەق وایە لەسەر چاوی خۆمانتان دابنێین ئێوە پارە دەدەن بە ئێمە زۆر هەولّم دا لێم عاجز بوون ، ووتم باشە (٥) پێنج دینار دەدەم بەو منالە بچوکە ووتیان باشە . بەڕاستی جووتیارەکانی کوردستان ئەوانەی شۆڕشیان گەیاندە ئەمرۆ خێزانی وایان لێ هەڵکەوتبوو .

لە رۆژی ١٦/٩/١٩٨٩ لە کاتژمێر (١٠) بەیانی گەیشتینە بارەگای ت١٩ ی کوڕەك دیار بوو پێشتر دەیانزانی کە ئێمە دەگەین ، زۆر زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێکردین ، چەند حەیوانێکیان سەربڕی هەموو پێشمەرگەکان خۆیان پاك کردەوە جلەکانیان خاوێن کردەوە ، من لەبەر میوان و قسە هیچم بۆ نەکرا لەگەڵ سەرکردایەتی قسەم کرد پیرۆزباییان لێکردین کە بەسەلامەتی گەڕاینەوە ووتیان لەوێ بن بەیانی خۆمان ئۆتۆمبیلتان لەدوا دەنێرین وە نیوەڕۆ لای هیچ کەسێك نان نەخۆن لە مەکتەبی سیاسی دەعوەتن لە رۆژی ١٧/٩/١٩٨٩ لە کاتژمێر (١) ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە بارەگای مەکتەبی سیاسی لەلایەن کاك مولازم عومەر ئەندامی مەکتەبی سیاسی ، کاك نازم ئەندامی مەکتەبی سیاسی ، کاکحەمە توفیق ، ئەندامی سەرکردایەتی ، مامۆستا عەبدولا ئەندامی مەکتەبی رێکخستن لە شۆڕشگێران و ئەندامی سەرکردایەتی پێشوازیەکی زۆر بە رێزو حورمەتەوە کراین ، پاش ماوەیەك بەڕێز مام جەلال هاتە لامان زۆر بەڕێزەوە باسی ئێمەی کرد ووتی بەهەق کوڕی راستەقینەی کوردن ، پێشمەرگەی دڵسۆزن ، زۆر سوپاسی کردین وە چەندین رۆژ هەر لە مەکتەبی سیاسی دەعوەت بووین من مقابەلەیەکم بە ڤیدیو تۆمار کرد لەسەر باری خۆمان چەند جارێك رێنمان گیرا ، دەستە دەستە برادەران لە ئێران و تیپەکان دەهاتن بۆلامان زۆر نامەی پیرۆزباییم بۆ هات بەڕێز مام جەلال دەمانچەیەکی چوارده خۆری پێشکەش کردم لەگەڵ دووربینێك بەڵێ بەم جۆرە کوردستان

بەچکە شێرەکانی خۆی پەروەردە کردو و بەر ئەنجامەکەشی کوڕەکانی ئاوا دڵسۆزی خاك و گەل دەبن .

بەڵێ لەو چواردە مانگەی لە خوارەوە بووین زیاتر لە سەد جار رژێم هێرشی بۆ کردین ، دەیان پیلانی نامەردانەی رێك خست لە هەموو زستان کەلە خوارەوە بووین ئاگرمان نەکردەوە دەیان شەوی زستان و بەهار و پاییز لەسەر زەوی رەق و سارد نووستین ، زۆر جار برسیەتی هەرەشەی مردنی لێکردین ، جار وابوو مانگێك لە خۆمان زیاتر کەسی ترمان نەدیووە ، بێ بەش بووین لە دڵداری ، هەندێ جار چەند رۆژێك دەم و چامان ئاوی پێ نەدەکەت ، نانی رەقی دە رۆژیم خواردوە رۆژ و شەو جار وابوو (١٨) سەعات رێشتووم ، سەدان جار گوللەی دوژمنلە بن گوێ و سەرم رۆیشتووە ، لە دایك و باوکم و براو خوشکەو ئاموزا و کەس و کار و دۆست و ئاشنایان دوور بووم ، بەفر و باران زۆری لێ داوم ، شەڕی چاکمان لەگەڵ حکومەت کرد هەرەشەی دوژمن نەی ترساندین ، دەردە سەری زۆرمان چێشت ، زۆر لە پەنا بەرد و دار خۆمان شاردەوە ، بەلاّم ئەوانەو هەموو سەدان ناخۆشی تر گەلێك شیرین ترە لە کۆیلەتی هەر ئەوانە منیان گەیاندە ئەو رۆژە کە بەسەر بەرزی باسی میللەتەکەی خۆم بکەم ، ئەو جۆرە پێشمەرگایەتیە بوو وای لێ کرد کەچاو لەبەر هیچ کەس نەترووکێنم ئیستاش زۆر بیرەوەری خۆش و تاڵم لاماوە دەبێ رۆژانی تر بینووسمەوە .

راستە ئێمە لەو خەباتە سەخت و دژوارە نموونەی پێشمەرگەی کوردستان بووین، بەلاّم پێم وایە هەموو کوڕێکی کورد ئەو گیانەی تیایە کە خۆی لە پێناوی گەلەکەی بەخت بکات ، هەر چەندە ئەو بیرەوەریانەم لە فرسەتێکی باش نووسیوە پێم خۆشە لەسەر باری هاتنم لە ئێران و ئیتالیاش بنووسم ، بزانم ئایا ژیان هەر واتای رابواردنە یان ژیان سەربەرزیە ، ژیان وەفاداریە ، ژیان دڵسۆزیە ، ژیان رزگاری گەلە ، ژیان مل کەچ نەکردنە بەرامبەر دوژمن لە کۆبونەوەی ١٩٨٩/١٠/٢ بە بڕیاری سەرکردایەتی ی . ن . ك بووم بە ( ئەندامی سەرکردایەتی پارتیزانانی ناوەخۆ ) ئێستا لەو دەزگایەی شۆڕش کار دەکەم لە فەرەنسام رەنگە کاری نهێنی هەندێ شتی پێ شاردبمەوە ، ئیستا وا چوار سەد پێشمەرگەی قارەمان و دڵسۆز و وەفادار رێگای پارتیزانیان گرتووە ـ هەر بەو زووانە خوا یاربێ و گەلی کورد هاریکار بێ هەموو سەنگەرە خوێناویەکان ئاوەدان دەکرێنەوە ، با دوژمنانیش با هەلپەرستانیش با خۆفرۆش و بەزیوەکانیش با ئەوانەی بازرگانی بەخەڵك دەکەن ، با ئەوانەی لە ئەوروپا ژیانی خوێریەتی دەبەنە سەر بزانن پێشمەرگەکانی کوردستان ئەمڕۆ لە هەموو رۆژ زیاتر رێگایان رۆشن و ئاسۆ روونا کە سەرکەوتن لەو دیو کەلە ، رێگای خەباتی تازە تر و ناخۆشتر دەگرنە بەر تا ئازادی و سەربەخۆیی و سەربەستی کوردستان — ( مەبەست ساڵی ١٩٩٠)

# قەندیل بەغدای هەژاند

# هەنگاوێك بەرەو مێژوو

ئازاد جوندیانی

کە بەشی یەکەمی بیرەوەرییەکانی کاک رێباز بە ناونیشانی ( قەندیل بەغدای هەژاند ) کەوتە بازاڕەوە و ژمارەیەك لە دۆستان خوێندبوویانەوە ، شەوێك لەگەڵ چەند دۆستێکدا لەسەر ئەو کتێبە کەوتینە گفتوگۆ و پرسیارە جدیەکەی ئەو شەوە ئەوەبوو ئایا ئەم نووسینە دەچێتە خانەی مێژووەوە یاخود دەچێتە خانەی (السیرة الذاتیة)یان بیرەوەری بەهەرحاڵ بەهۆی ئەو هەموو تەفسیر و شەرح و پێناسە جیاجیایانەی کە بۆ هەر یەکە لە مێژوو و سیرەی ژاتی دانراوە زۆر جاران مرۆڤ زۆر بە وردی ناتوانێ شتەکانی لێك جیا بکاتەوەو گەر لێکیشی جیاکردەوە ئەوا رەنگە نەتوانێ قەناعەت بە هەمووان بێنێ .

لەبەر رۆشنایی هەمان پرسیارە جدیەکە ، وا بۆ بەشی دووەمە بیرەوەریەکانی پێشمەرگایەتی کاک رێباز ، نەختێك تاوتوێی هامان پرسیار دەکەم ، کە هیوادارم بتوانم شتێك لەم بارەوە بڵێم.

لەبەر ئەوەی کاک رێباز لە سەرەتای شۆڕشی نوێی ی گەلەکەمانەوە لە نزیکەوە تاگاداری زۆربەی کەینی و بەینە وخۆ ئامادە کردنەکانی دەست پێکردنەوەی شۆڕشی بووە و هەر لە سەرەتاشەوە پێشمەرگەیەکی ئەو شۆڕشە بووە ( لە شۆڕشی ئەیلولیشدا بەشداری بووە ) بۆیە دەیەوێ لەو رێگەیەوە لە نووسینەوەی بڕگەیەکی گرنگی مێژووی گەلەکەشی بەشدار بێ . بەڵام بە شێوەیەکی تێکەڵ بیرەوەریەکانی خۆی ، واتا نووسینەوەی مێژوو لە ڕێ ی بیرەوەریەکانی خۆیەوە بۆیە رووداوەکانیشی بە هۆی بوونی خۆی لەناو مێژووەکە تەفسیر دەکا ، ئەم شێوازەش لە تۆمار کردنی مێژوودا تا رادەیەك عەیب دارە چونکە هەم پایە زانستیەکانی نووسینەوەی مێژوو رۆڵێکی ئەوتۆیان نابێ هەم بەیەك دیدەوە رووداوەکان و رەوتی رووداوەکان تەفسیر دەکرێن ئەو کیماسیە لای کاک رێباز بەوە قەرەبوو دەکرێتەوە کە نووسەر نایەوێ وەك کارێکی زانستی رووت مێژوو بنووسێتەوە ، بەڵکو دەیەوێ لەڕێ ی بوونی خۆیەوە مێژوو تۆمار بکا و لە ڕێ ی مێژووشەوە بوونی خۆی تۆمار بکات ، واتا نووسینەکە شتێکی تێکەڵە لە بیرەوەری و زاتی مێژوو و رەنگە کەمترین دەرفەتیشی لەم نووسینەوەیدا بەر سیرەی زاتی کەوتبێ چونکە

نووسەر کەمتر خۆی لە قەرەی مەسەلەکانی ناو هەناوو ویژدانی خۆی داوە و هەر هەندە کەلکی لێ وەرگرتووە تا بۆ روونکردنەوەی رووداوێك یان کاریگەری رووداوێك پێویست بووبێ

بۆیە بەرای من ئەم نووسینەی کاك رێباز هەروا دەمێنێتەوە واتا شتێك دەبێ تێکەلاو لەهەرسێ رەگەزی مێژوو ، سیەی زاتی، وبیرەوەری بەلام بۆ نووسینەوەی مێژووی نوێی ی گەلەکەمان - گەریشێ واناوی ببەین – سەرچاوەیەکی باش و پڕ لە زانیاری دەبێ و هەولی کاك رێبازیش دەست پێشخەرێکی بەجێ یە و ئەگەر هەندێ ئیعتباراتی ئەو قۆناغەی مێژووی گەلەکەمان لەبەر چاو نەگیرابایە ئەوا زۆر مەسەلەی شێوێندراوی مێژوومان ، کە رەنگە نووسەریش نەیویستبێ بە راشکاویەوە پەنجەیان بۆ رابکێشێ دەکەوتنە بەر شەن و کەوی تازەوەو لە تەپ و تۆزی شێوان کە بە داخەوە لە تێڕامانی یەك دیدیەوە بەهۆی حزبەکانەوە دووچاری نووسینەوەی مێژوو بۆتەوە ، رزگاری دەبوو .

دەستی کاك رێباز دەگوشم کەلە نووسینەکەیدا زۆر جورئەتی بەخۆی داوەو ویستوویەتی لە رێ ی اپارە کردنەوە هەندێ شت بخاتەوە سەر مەنگەنەی مێژوو .

# جورئەت لە یاداشت نووسینەوەدا

ژیانی مرۆڤی تێکۆشەر ، چ لە رۆژگاری ترسناکی خەباتی نهێنی و چ لەبەسەر بردنی رۆژ و شەوی بێ ئەژماری مەرگ ئامێزی زیندان و چ لە قۆناغی بەرەنگار بوونەوە و پێشمەرگایەتیدا ، جورە ژیانێکە زۆر لە سەرووی ژیانی ئاسایی یەوە ! .

بۆیە تۆمار کردنی ساتە ئەستەم و دەگمەنەکانی ئەم تەرزە ژیانە وێرای ئەوەی هەوڵێکی جیدیە بۆ رۆشن کردنەوەی تونێلە تاریکەکانی مێژووی مرۆڤایەتی ، بنەمادانانێکی زەروریشە بۆ یەك بەستنەوەی جومگەلەبەر یەك ترازاوەکانی فیکری سیاسی .

ئەو شێوە نووسینەی کاك رێبازی سیاسی وپێشمەرگەی سەرکردە لە لاپەرەی رۆژنامەو دوو تویی نامیلکە و کتێب دا پەیرەوی دەکات بەر تخانەی ئەدەبی بیرەوەریش بە شێوازێکی ئەدەبی گرنگی ئەم سەردەمە دەزانرێ .

نووسینەکانی کاك رێباز دەکرێ بە چێژی رۆمان خوێندنەوە و حەزی بە دوای حەقیهەرگیزەمێژوویەکانی شۆرشی نوێی ی کورد دا گەران بخوێندرێتەوە .

دیارە ئەم هەستەیش لای خوێنەر لە ئەنجامی راستگۆیی لە نووسین و سادەیی لە دارشتن و و جورئەت لە گوزاریش کردنەوە پەیدا دەبێ زۆر بە گەرمیەوە دەم خۆشی و دەست خۆشی لە کاك رێبازی روح سوك و قسە خۆش و هاورێ و پێشمەرگە دەکەم . بۆ ئەو خەباتەی کە ئەمرۆ لە جیاتی تفەنگ بە قەڵەم بەردەوامی پێ دەدات .

سەعدوللا پەرۆش

سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی هەولێر

١٩٩٣/١٠/١٩

# ئەم چەند وشەیەش لە بیر مەکەن

عەبدولواحید ئیدریس شەریف

کە لاپەڕەکانی ئەم یاداشتە هەڵدەدەیتەوە بێ ئاگا لەم جیهانە جەنجاڵ و سیخناخ بە ئاژاوەیە دادەبڕێی ، ئاوێتەی جیهانێکی تر دەبی ، جیهانی قوربانی دان و راوی مەرگ ، ئەو جیهانەی کەسەکانی لە فریشتە پیرۆز و پاکترن ، جیهانی خۆنەویستی و سادەیی خۆشەویستی و راستی ، هەر زوو وشەکان سەرنجت رادەکێشن، ئەگەر چی هەندێکیان تاڵن ، بەڵام هەقیهەرگیزن ، سەرجەم وشەکان باس لە خۆبردویی و قارەمانیەتی و فیداکاری و گیانبازی گولە جەرگەکانی ئەم گەلەن ، خوێنەری ئەم یاداشتە ئەگەر لە ژیانی رابردووی تاکە رۆژێك سەنگەری لە لەشکری زوڵم و ستەم گرتبێ ، بەجۆرێ تێکەڵ دنیای ئەم یاداشتە دەبێ لە جیهانی دەوروبەر دادەبڕێ ، خوێنەر دەبێ لەسەرەتاوە ئاگادار بێ ، ئەو پەڕتوکەی دەیخوێنێتەوە نە رۆمانە ، نەچیرۆکە ، نە فەلسەفەیە ، نە بەرهەمی بیرو قەڵەمی نووسەرێکی بەناوبانگ ، بەڵکو بیرەوەری و یاداشتی رۆژانی سەختی پێشمەرگەیەکی قال بووی بۆتەی خەباتی شۆڕشی نوێی یە ، کە (١٧) حەڤدە ساڵ تەمەنی لە نێو جەرگەی هەڵمەت و داستان و ئازار و ژان و کوچ و شکست و سەرکەوتن بردۆتە سەر ، بە درێژای ئەم حەڤدە ساڵە چرکەیەك چی یە لە کاروانی هەڵۆ سوورەکانی شۆڕشی نوێی ی دانەبڕاوە ، بە کورتی ئەم حەڤدە ساڵە پێشمەرگەیەکی (فعلی) بەرەفتار و کردار پێشمەرگە بووە ، بۆیە هەقە هەر خوێنەر و نوسەرێك بە چاوی رەخنە دەیەوێ ئەم یاداشتە تاووتوێ بکات ، لە بیری نەچێ ئەم نووسینە هی خامەی پێشمەرگەیەکی حەڤدە ساڵ دوور لە شارستانیەت و ئاوەدانی ، هاودەمی لووتکەو پێ دەشت و کوێرە گوند و تولە ڕێ و هەورازە ڕێ و تفەنگ و بۆسەو شەڕ و نانە وشکە و کۆلە پشت ، بەفر و زریان و بارانی بە خور و جەنگان لەگەڵ سروشتی دژوار و دڕندە ترین داگیرکەری سەردەمە ، لە خوێندنەوەی ئەم یاداشتە ئەگەر تۆزێك بە قوڵ قاچی ئەو رۆژانەت دێتە بەرچاو ، کە ئەو کەڵە مێردانە بە بڕوایەکی هێندە قایم و ورەیەکی لە قەندیل بەرزتر سەنگەریان لە دوژمنان گرتوە ، کام لووتکەو هەوراز سەخت و ئەستەم بوو ، ئەوان کردوویانە بەناو لەپی دەست . بە کورتی بە زەبری تفەنگی بیرو باوەڕ مەرگی ترسنۆکیان راو ناوە ، نموونەی پەروەردەی شۆڕشی نوێی و بووینە ، دوای کەمێك خوێندنەوە ،

ئەگەر سەر هەڵبڕی سەیرێکی ئەمڕۆ بکەی سەرەتا لەوانەیە بڵێی ئۆخەی ئەوا ئەو رەنج و ماندوو بوون و قوربانی دانەی ئەو کەڵە پیاوانە بە فیڕۆ نەڕۆیشتوە ، ئەوەنیە بەرهەمەکەی ئێمە لێی دەخۆین ، بەڵام کە زیاتر بە ناخی ئەم یاداشتە رۆدەچی ، خوێنی دەیان شەهیدی کەم وێنەی ئەم گەلەت دێتە بەرچاو . ئەمڕۆی ئازادی لەگەڵ دوێنی سەختی تێکۆشان بەراورد دەکەی ، ئەمڕۆ چەند پیرۆز بێت سەدان هۆ وا لە خوێنەری ئەو یاداشتە دەکەن قیزی لێ بکاتەوە ، چونکە ئاورێك لەهەر لایەك بداتەوە ، دەبینێ وا چی تێکوشەر و ماندو نەناسی دوێنێ بەر لە راپەڕینە ، وا لەپەراوێز ؛ چی منالە شەهیدی راستەقینەیە وا لەسەر شەقام و ناو بازاڕ دەست لە نامەرد پان دەکاتەوە ، رووداوەکانی رۆژانە پێمان دەڵێن ئەگەر دەیان ساڵ خەبات و پێشمەرگایەتیت هەبێ ، بەڵام ئەگەر مەرایی کەرو زمانی ئەو سەردەمە بۆگەنە نەزانی ، ئەوا وەك دەڵێن نەمانت زۆر مەزنترە ، لە بوونت . لە خوێندنەوەی رووداوەکانی ئەم یاداشتە دەگەینە ئەو قەناعەتە ئەگەر لە جیهان زۆر بۆنی حزب و رێکخراو لە قازانج و بەرژەوەندی گەل دابوو بێ ، ئەوا لەلای ئێمە چەوساوەی دەستی دەیان ستەم و نەزانیش سەربار ، ئێستا و رابردوویە پێچەوانەی هەموو دنیا هەر بە زەرەر بۆ گەل و تێکۆشەران گەڕاوەتەوە ، بەڵکو بە تەنیا لە قازانجی دوو روو گەلۆرەکان دابوو ، لە رابروو رووبارێك خوێنی پێشمەرگەی شۆڕشگێڕ لە پێناو ناکۆکی حزبەکان بەهەدەر چوو ، لە مرۆی دیموکراتی و ئازادیش لە کێبڕکێی چەندایەتی زەرەرمەند هەر گەل و تێکۆشەرە دێرینەکانن کە بەناچاری گۆشەی تەنیایی وژیانی لاتەریکیان هەڵبژاردوە ، کەچی لە راستیدا خاوەن مەسەلە و پێشڕەوی قوربانی دان هەر ئەوان بوونە دوێنێ و ئەمڕۆ ، گومان لەوەدا نی یە لە دوای راپەڕین دەسکەوتی گەورە وەدی هاتووە بەڵام گەورەترین زیانیش کراوە ، لەدەست دانی قودسیەت و کەم کردنەوەی ناوی پیرۆزی ( پێشمەرگەیە ) . ئەویش لە ئەنجامی پێشبڕکێ ی نابەجێ ی حزبەکان کە هەر کوردێك لە ناخۆشترین رۆژی ژیانی دا تاکە هیوا لەلای ئەو ووشەیە بووە ، کەچی ئیستاکە ئەم ووشەیە لەجیاتی خەندە بخاتە سەر لێوان ، وایان لێ کردوە بەناو هێنانی پرتە و بۆڵە دەبیسترێ ، لەم هەراو کێشمە کێشمە ئەوی بەتەنیا سوودمەندە ، ئەو ناکەس بەچانەن لە رۆژانی بەعس ، چاووگوێ دەستی ئەنفال و کیمیاوی و تەرحیل و تەعریب بوون ، ئەگەر لەسەرەتای راپەڕین لە حەشارگەیەك دەگەڕان لە شەقی جەماوەر بیانپارێزێ و خۆیان بە قوربانی پێڵاوی منالە پێشمەرگەیەکی بەر لە راپەڕین دەکرد ، ئەوا ئەمڕۆ لە سایەی حزبەکان پلەو پایە وەردەگرن و هەندێکیان پلەو پایش دەبەخشن ، لە کۆتایی ئەم یاداشتە کاك رێباز وەك پێشمەرگەیەکی یەك پشوو ، فەرماندەی پێشمەرگە

پارتیزانەکانی دوای ئەنفال ، کە (١٤) چواردە مانگ لە خاکێکی سووتماك و بێ ئاوەدانی سەنگەریان گرت ۽ ببوون بە کێوێکی سەخت لەسەر دڵی بەعسیەکان ، ئەو ڕۆژانەی کەم کەس هەبوو قەناعەت بکا (٣٠)کم دوور لە هەولێر چەند مەفرەزەیەك پێشمەرگەی ی . ن . ك هەن و سرودی بەردەوامی شۆڕش دەچڕن ، ئەو (١٩) نۆزدە پێشمەرگەیەی (١٤) مانگ بە کوڵە مەرگی جەربەزەیی سەلماندیان کە پێشمەرگەی راستەقینەوبە بیرو باوەڕن .

کاك ڕێباز بە کورتی لەسەر چۆنیەتی ژیانی ئەو (١٤) چواردە مانگەی پارتیزانی نووسیوە وتا گەڕاونەتەوە بۆ سەرکردایەتی ، بەڵام ئەوەی شاراوە نیە هەر ڕۆژێکی ژیانی ئەم پێشمەرگە پارتیزانانە بۆخۆی چیرۆکێکە ، هیوادارین وەك بەڵێنی داوە لەبەشی سێیەمی یاداشتەکانی بە درێژی لەسەر ئەم (١٤) چواردە مانگەی پارتیزانی بنووسێ .



شەهیدی نەمر
عەبدولڕەزاق
لێپرسراوی رێکخراوی دووی
کۆمەڵەی رەنجدەران .
١٩٩١/٣/٢٧ لە بەرگریکردن لە
قودسی کوردستان ( کەرکوک )
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
هاشم شەمامکی
( ف - ت )
١٩٥٨ لەدایك بووە .
١٩٩٠/٩/١٩ بە پارتیزانی
لە دەشی هەولێر شەهید بووە



شەهیدی نەمر

دەشتی موهەندیس

( ج- ف - ت )

١٩٥٦ لەدایك بووە .

١٩٨٧/٩/٣ لە داستانی سماقوڵی

شەهید بووە .



شەهیدی نەمر

شەهریار صاڵح حەمید

( ف - ك )

١٩٥٧ لەدایك بووە .

١٩٨٧ لە دۆڵی خەلەکان

شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
محەمەد شینە ( ف - ت )
١٩٨٨ لە شەڕی بالیسان
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
نەوزاد جەمال مستەفا ( ج - ف - ت )
١٩٦٢ لە کۆیە
لەدایک بووە .
١٩٩١/٣/٣١ لە کەلەکی یاسین
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
رەنجدەر ( ف - ك )
١٩٥٧ لەدایك بووە .
١٩٨٦/٧/١٠ شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
رمووەند ( مشعان سەلیم )
١٩٥٦ لە گوندی قوچی بە عەرەبکراو
لەدایك بووە .
١٩٨٥/١٢/٢٢ لە بەرانەتی شەهید بووە



شەهیدی نەمر
هەمزە بارم
١٩٩١/٤/١١ لە بەڕانەتی
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
باقی بارزانی
( ف - ك )
١٩٨٥/٣/٧ لە شەڕی ئازایەنەدا
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر

حەسەن سەلیم نێرۆەیی

١٩٦٠ لەدایك بووە .

١٩٩١/٤/٣ لە گەلی بێسرێ

شەهید بووە .



شەهیدی نەمر

عەبدولمەسیح پوڵص صلیوا

١٩٥٧ لەدایك بووە .

١٩٨٨ شەهید بووە .



شەهیدی نەمر

تەحسین عوسمان

( ف - ك )

١٩٥٦ لەدایك بووە .

١٩٨٦/٥/٢ شەهید بووە.



شەهیدی نەمر

خاڵە یوسف

( ف - ك )

١٩٥٥ لەدایك بووە .

١٩٨٦/١٠/٢٢ لە شەڕی ئیلنجاغ

شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
کوێخا بێتواتەیی
( ف - ك )
١٩٦٦ لەدایك بووە .
١٩٨٧/٤/٢١ لە گۆجاڕ
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
حەسەن نەنومر ( مامۆستا کاوە )
١٩٤٨ لەدایك بووە .
١٩٨٠/١٢/٦ لە شەڕی قەڵاسنج
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
ئازاد صابر داربەسەری
( ف - ك )
١٩٦٢ لەدایك بووە .
١٩٨٧/٦/٢٧ لە شەڕی گرتنی
تەق تەق شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
حاجی ئەحمەد
١٩٦٠ لە گوندی سینا
لەدایك بووە.
١٩٩١/٤/٣ لە گەلی بێسریَ
شەهید بووە .



**شەهیدی نەمر**

**ڕەوەند**

**( ف - ك )**

**- ١٩٦٥ لەدایك بووە .**

**٣- ١٩٨٧/٤/٤ لە شەڕی ڕەبیەكانی**

**هەولێر- كەركوك**

**شەهید بووە .**



**شەهیدی نەمر**

**حاجی**



شەهیدی نەمر
حەمید قادر حەمەد
لێپرسراوی ناوچەی خۆشناوەتی
١٩٥٠ لە گوندی سەید عوبێد
لەدایك بووە .
١٩٨٢/١/٤ لە زەیارات شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
کەریم مەولود ئەحمەد( پۆلا )
رابەر سیاسی
١٩٦١ لە گوندی قورشاغلو
لەدایك بووە .
١٩٨٨/٥/٢٧ لە کێل کێل
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
فوئاد محەمەد صاڵح
( ف - ك )
١٩٦٢ لەدایك بووە .
١٩٨٧/٦/٤ لە رەبایەی شێراوە
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر
عومەر عەوێنە
( ف - ك )
١٩٥٧ لە گوندی عەوێنە
لەدایك بووە.
١٩٨٧/٧/١١ لە جادەی موسڵ
شەهید بووە .



شەهیدی نەمر

مەجیدە سور

( ج - ف - ت )

١٩٨٥/٤/٢٣ لە کەپەنە رەش

شەهید بووە .



شەهیدی نەمر

دهام حەمەد باوە

( ف - ك )

١٩٥٢ لەدایك بووە .

١٩٨٨/٧/١٠ شەهید بووە .

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٨ی
# بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێڕ | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٥٦٠ | گۆڤاری هەنار ژمارە (٢٤) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٥٦١ | گۆڤاری هەنار ژمارە (٢٥) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٥٦٢ | سەدو هەشتا رۆژ چاوەڕوانی | د.هێرش محمد ئەمین | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٥٦٣ | گرێوەی مەرگ | فایەق ئامز | شیعر | چاپکردن |
| ٥٦٤ | بلانسی ژن لەنێو کارێزمای نووسیندا | شیرین تاهیر | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٦٥ | چەند لێکۆڵینەوەیەک و بابەتی دەروونی | جەلال خەلەف | دەروونی | چاپکردن |
| ٥٦٦ | ژیانی فەقێ و دەنگی فەقێ | مەحمود عەزیز حەسەن | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٥٦٧ | رۆژنامە لەکێندا | نەوزاد عەلی ئەحمەد | رۆژنامە | چاپکردن |
| ٥٦٨ | شکستی نووسین | نەجات نوری عەول | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٥٦٩ | پێکەنین و گریان و لەگشت شەوێکمدا | حەسەن مەحمود رەسوڵ | چیرۆک | چاپکردن |
| ٥٧٠ | بۆ کەلتووری شارەکەم | مارف ناسراو | رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٥٧١ | پانزەو سی و پێنج خولەک | ئیبراهیم هەورامانی | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٥٧٢ | لەودیو هەناسەکانی شیعرەوە | جەبار سابیر | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٧٣ | ئەدی رەقیب لەنێوان جەستەی زمان و جەستەی ئەتەوەدا | عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٧٤ | گۆڤاری هەنار ژمارە ٢٦ | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٥٧٥ | عەبدوڵڵای حەسەن زادە ژیان و رۆڵی سیاسی و.. | کوردستان نستانی | ژیاننامە | چاپکردن |
| ٥٧٦ | دەق و راڤەکاری | ئاوات محمد | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٧٧ | بیبلۆگرافیای چاپ و بڵاوکردنەوە | ئاشنا جەمال | بیبلۆگرافیا | چاپکردن |
| ٥٧٨ | لەدەروونشیکارییەوە بۆ لێکدانەوە | ئەحمەد رەزا | رەخنە | چاپکردن |
| ٥٧٩ | شنەی بەهاری | نیلهان رەحیمی | چیرۆک | چاپکردن |
| ٥٨٠ | لاو... بونەوەرێکی پەراوێز خراو .... | هەڵگورد جەلال | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٨١ | الارهاب- ارکانه- اسبابه- اشکاله | د.هیملاد مەجید عەلی | ماجستێر | چاپکردن |
| ٥٨٢ | براکوژی | و. عەبدولکەریم شێخانی | رۆمان | چاپکردن |
| ٥٨٣ | پیاوێکی کۆپیکراو | و. دلاوەر عەبدوڵڵا | رۆمان | چاپکردن |
| ٥٨٤ | بەرەو کۆنگرە | محمد عەبدولکەریم سۆڵەیی | رامیاری | چاپکردن |
| ٥٨٥ | فیلموگرافیای کوردی | ئەبوبەکر کاروانی | فیلموگرافیا | چاپکردن |
| ٥٨٦ | میرات | سالح رۆستەم سالح | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٥٨٧ | بازرگانی مەرگ | عەلی مەحمود | رامیاری | چاپکردن |
| ٥٨٨ | گۆڤاری هەنار ژمارە (٢٨) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٥٨٩ | دۆکیومێنت | ئەنوەر حسێن | کۆمەڵە وتار | چاپکردن |
| ٥٩٠ | ئەفسانەی هەنگاری | و. عەزیز گەردی | چیرۆک | چاپکردن |
| ٥٩١ | لەکیشوەری جوانەکاندا | موحسین ئاوارە | شیعر | چاپکردن |
| ٥٩٢ | رۆژنانی کردار لەزاری هەورامیدا | یسرون حەسەن | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٩٣ | ئایین و زمان و رەچەڵەکی کورد | و. رەفعەت مورادی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٩٤ | لێکچوون و جیاوازی لای گۆران و نیما | د. ئەبوبەکر خۆشناو | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٩٥ | تیرۆریزم و جیهانی ئەمڕۆ | عەدالەت عەبدوڵڵا | رامیاری | چاپکردن |
| ٥٩٦ | تالاسیمیا و چەند زانیارییەک | ئەژین سابیر | زانستی | چاپکردن |
| ٥٩٧ | القضية الكردية في الصراع البريطاني العراقي | عمر محمد كريم | رامیاری | چاپکردن |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٥٩٨ | پێویستە خۆت بپارێزیت | [illegible] | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٥٩٩ | خانووی سەرگردەکە | و: فرمێسکشان غەفوور | چیرۆک | چاپکردن |
| ٦٠٠ | گۆڤاری هەنار (٢٩) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٦٠١ | سەفەری پارە ڕووتەکان | ئاکۆ کەریم | چیرۆک | چاپکردن |
| ٦٠٢ | ڕێنوێن | ئا: محەمەد پشدەری | پەندو وتەی بەسود | چاپکردن |
| ٦٠٤ | حاجی بابە شێخ سەرۆک وەزیرانی یەکەم حکومەتی کوردستان | عومەر فاروقی | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٦٠٥ | وێنشکە بەمین چێڕاوەکان | نەبەز تالیب | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٦٠٦ | ئەوینی دەریا | ئەحمەد قادر سەعید | چیرۆک | چاپکردن |
| ٦٠٧ | جیهانێکی ئازاد | میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری | شیعر | چاپکردن |
| ٦٠٨ | گۆڤاری هەنار (٣٠) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٦٠٩ | هەورازە ڕێ | عەلی بچکۆل | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٦١٠ | کوردستان پێش لەرووخانی نەینەوا | کەمال سەید ئیبراهیمی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٦١١ | لوسەرانو هەڵبژاردنی مەرگ | ئارام سدیق | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٦١٢ | بەجیهانیبوونو پێناسەکەی | عومەر رەسول خدر | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٦١٣ | لەبازنەی ئەفقەدوسدا | زێنەب یوسفی | چیرۆک | چاپکردن |
| ٦١٤ | خوێندن یان نەخوێندن | د.شیرکۆ فتح الله | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٦١٥ | گۆڤاری هەنار ژمارە (٣١) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٦١٦ | وەرچەرخان لەبیرکردنەوە | هەندرێن | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٦١٧ | پێنەنگی و کۆکوژیی | حەمەی کاکە رەش | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٦١٨ | دووگۆم | عەبدوڵلا ئەحمەد | رۆمان | چاپکردن |
| ٦١٩ | شیعرە بڵاونەکراوەکانی نەسیری | د.ئیسماعیل ئیبراهیم | شیعر | چاپکردن |
| ٦٢٠ | گۆڤاری هەنار ژمارە (٣٢) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٦٢١ | گۆڤاری هەنار ژمارە (٣٣) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٦٢٢ | گۆڤاری هەنارە ژمارە (٣٤) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٦٢٣ | نادیاری | فەرەیدون عەبدول بەرزنجی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٦٢٤ | مەجبوور | شیرزاد هەینی | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٦٢٥ | طلاء الاظافر | لینۆس فائق | شیعر | چاپکردن |
| ٦٢٦ | پڕم لەئێشقی تۆ | فەرەیدون سامان | شیعر | چاپکردن |
| ٦٢٧ | ئەزموونی رۆژنامەوانی | و: کارزان محەمەد | رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٦٢٨ | خونچە گوڵ | بێرێن سەعید محەمەد | شیعر | چاپکردن |
| ٦٢٩ | وەرقول | جەمال پێندار | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٦٣٠ | کوردێ سابڵ | عەلی مەحمود | راهیاری | چاپکردن |
| ٦٣١ | کورد لەسەفەردا | هێرش پێتوشی | فەرهەنگ | چاپکردن |

نوسەری شەهید لەچەند دێڕێکدا

# رفعەت عەبدوڵا پیرداود

## ( شەهید ڕێباز )

- ١٩٥٢ لە شاری هەولێری دێرین لە بنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەر لەدایك بووە .
- ١٩٦٥ پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بە نازناوی ڕەنجاو .
- ١٩٦٩ بە هۆی کارو چالاکی ڕێکخستنەوە لەلایەن ڕژێمەوە زیندانی کراوە .
- ١٩٧٠ لە دوای بەیانی ١١ی ئازار چالاکانە بەشداری کاریگەری هەبووە لە ڕێکخستن و خەباتی خوێندکاران و جەماوەر.
- ١٩٧٢ ئامادەیی کشتوکاڵی هەولێری تەواو کردووەو پەیوەندی کردووە بە شۆڕشی ئەیلولەوەو لە دەزگا جیاجیاکانی شۆڕشدا خەباتی کردووە تا نسکۆی ١٩٧٥.
- ١٩٧٥ بۆتە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ و پاشانیش پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.
- ١١ / ٥ / ١٩٧٧ لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا لەگەڵ هاوڕێی دێرینی خۆی شەهید شاخەوان بۆتە پێشمەرگە.
- کەسایەتیەکی هێمن و ڕۆشنبیرو ئازاو چاونەترس و لە خۆبوردو بووە.
- بەشداریی و سەرکردایەتی دەیان چالاکی و داستانی کردووە.
- ١٩٨٨ لەدوای ئەنفال بۆ ماوەی ١٤ مانگ سەرکردایەتی پارتیزانەکانی هەولێری کردووە.
- ١٩٩٠ لەسەر داوای مەکتەبی سیاسی ( ی.ن.ك ) گەڕاوەتەوە سەرکردایەتی بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسێکی ئەوروپادا لەسەر کێشەی کورد.
- ١٩٩١ پێش چەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕین گەڕاوەتەوە ناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان.
- لە ڕاپەڕیندا بەشداری کاریگەرو بەرچاوی هەبووە لە ڕزگارکردنی زۆربەی شارو شارۆچکەکانی سەر بە پارێزگای هەولێرو سلێمانی هەروەها ڕۆڵی کاریگەریشی

هەبووە لە ڕزگارکردنی شاری کەرکوك بە تایبەتی لە گرتنی ڕەبیەکانی زنجیرە گردی دومەڵان.

- لە دوای ڕاپەڕین لەبەرەی کوردستانیدا لیپرسراوی سەربازی بووە بۆ چەسپاندنی یاساو خزمەتکردنی هاوڵاتیان.
- ١٩٩٣ بۆتە جێگری قیادەی منطقەی دهۆك لە وەزارەتی پێشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان.
- نووسەری کتێبی قەندیل بەغدای هەژاند بەشی یەکەم و دووەمو ، دوو بەش ئرکەی کوردستانە.
- ٧ / ٥ / ١٩٩٤ دوای کاروانێکی پڕ لە سەروەری بە دیلی شەهید دەکرێت.
- ١٤ / ١١ / ١٩٩٤ تەرمی پیرۆزی لە کەرنەڤاڵێکی جەماوەری گەورەدا گەیەنرایەوە گۆڕستانی گردە ڕەشە لە شاری هەولێرو بەخاك سپێردرا.
- لە لایەن بەڕێز هەڤاڵ مام جەلال مەدالیای پارتیزانی بۆ شەهید ڕێباز بەخشراوە بە بنەماڵەکەیان.

بەڕێوەبەرێتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی
نرخی ( ٥٠٠٠ ) دینار